www.alibapir.com

# مەوسوعەی قورئانی

# ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامی

## لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

خۆشویستنی خوا
پاکی
ڕاستی
خۆڕاگری
دڵ ڕوونی
وریایی
پەند وەرگرتن
دڵ ساغیی
بەئەدەب بوون
زانیاری
پارێزکاری
هیممەت بەرزی
پاڕانەوە
خوا بەیەکگرتن
لە خوا ترسان
دڵنیایی
بە دەماربوون




عەلی باپیر


التفسير



# مەوسوعەی ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامی

لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا


**نووسـیـنـی**
عەلی باپیـر

**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە و بـەرگ**
نەوزاد شەهاوانی

**خـــەت**
نـەوزاد کۆیـی

**قەبارەی کتێب**
١٧×٢٤- ( ٦٧٧ ) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەکەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز

**تـــیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی ( ١٩٠ ) ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە





**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پاڵاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice



# مەوسوعەی ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامی

## لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

نووسینی

عەلی باپیر



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ٤ ﴾ القلم.

{إِنَّما بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكارِمَ الأَخْلاق}

أخرجه البيهقي: ٢٠٥٧١، والبزّار ٨٩٤٩، وصحّحه الألباني.

{ إِنَّكُم لا تَسَعُون النَّاسَ بِأَمْوالِكم، ولكن يَسَعُهُمْ منكم بَسْطُ الوَجْه، وحُسْن الخلق }

أخرجه البزّاز في مُسندِهِ: { ٩٦٥١ المحاملي في الأَمالي: ١٦٨، وقوام السنة (الترغيب والترهيب): ١٢٠٨، وحسَّنه المحافظ في (الفتح) (٤٥٩/١٠)، والحافظ الذهبي في (السِّيَر) (٣٠٣/٨) }

## پێشکەش بێ

به هەر کەسێ بەردەوام کار لەسەر خۆی دەکات.
خۆی له خوو خدەی خراپ و، ڕەفتاری بەد بژار بکات و،
ڕەوشتی خۆی جوانتر بکات و ئاکاری خۆی پەسندتر بکات و
سەرەنجام ئیسپاتی دەکات: که بەندەیەکی ڕەسەنی خوایەو،
شوێنکەوتوویەکی ڕاستی پێغەمبەری پێشەوایە
(صلى الله عليه وسلم).

# پێشەكی

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كَلَامُ اللَّهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٍ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّار.

**خوێنەری بەڕێز!**

ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند لە ئیسلامدا، پلەو پایەو پێگەیەکی یەکجار بەرزو گرنگی هەیەو، دەتوانین بڵێین: {خووو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە}[1]، منیش لە مێژ بوو سەرقاڵی ئامادەکردنی بەرهەمێك بووم لەو بارەوە، تاکو لەگەڵ هەردووك بەرهەمی:

{ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا} و {خوا پەرستیی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا}، ببنە سێ کوچکەیەك بۆ پەروەردە کردنی تاکی مسوڵمان، لە هەرسێك بواری سەرەکیی دینداریی و مسوڵمانەتییدا: ئیمان، عیبادەت، ئەخلاق.

هەتا ئەوەبوو مانگی ڕەمەزانی ساڵی ڕابردوو: (١٤٣٦ك) کەناڵی ئاسمانیی پەیام داوایان لێکردم، کە بەرنامەیەکی سی (٣٠) ئاڵقەییان بۆ ئامادە بکەم کە لە شەوانی ڕەمەزاندا پێشکەشی بکەن، منیش ئەوەم بە دەرفەت زانی، کە پرۆژەی ناوبراوی پێشتر لەدڵ گیراوو کار لەسەر کراو، بخەمە دوو توێی ئەو بەرنامە (٣٠) ئاڵقەییەوە.

شایانی باسیشە، کە لەبەر فراوانیی بابەتەکەو، کەمیی ماوەی بەرنامەکەو، سووربونیشم لەسەر جێکردنەوەی پرۆژەکە لەو (٣٠) ئاڵقەیەدا، ناچار بووم زۆربەی باسەکان بگوشم و کورت بکەمەوە، بە ڕاددەیەك کە هەندێکیان لەشێوەی سەردێڕو ناوو نیشاندا بن!

هەڵبەتە خۆ ئامادە کردنیشم بۆ پێشکەش کردنی پرۆژەی: (ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت)دا، تەنها لە سەرو بەندی تۆمار

---

(١) ئەمە دەقی ناوونیشانی وتارێکی بەندەیە لەبارەی ڕەوشت و ئاکاری بەرزو جوانەوە، کە دواتر هەر بەو ناوو نیشانەش کرایە نامیلکەیەك و، وەك ئاڵقەیەك لە زنجیرەی: {بابەتە هەنووکەییەکان} چاپ و بڵاو کرایەوە.

كردن و پێشكەش كردنی ئەو بەرنامە (٣٠) ئاڵقەییەدا نەبووە، بەڵكو ساڵانێكی دوورو درێژ بوو، سەرگەرمی ئەو كارە بووم و، وەك پێشتر ئاماژەم پێكرد: هەر لەو كاتەوە، كە كارم لەسەر هەردوو پڕۆژەكەی: {ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی}و {خوا پەرستیی ئیسلامیی} دەكرد، كاریشم لەسەر پڕۆژەی: {ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامیی}ش دەكرد.

ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە، كە لەمێژە ئەو ڕاستییەم بۆ دەركەوتوە، كە: كەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمان (شَخْصية الإِنسان المُسلِم) سێ پێكهێنەری بنەڕەتیی هەن:

**١- ئیمان و عەقیدەی ڕاست.**
**٢- خوا پەرستیی ساغ.**
**٣- ڕەوشتی پەسند.**

وە ئەو سێیەش پەیوەندییەكی دووسەرەی پتەویان بەیەكەوە هەیەو، هەر كامیان كاریگەریی بۆ سەر ئەوی دیكەیان هەیە، بەم شێوەیە:

مرۆڤی مسوڵمان: هەتا ئیمان و عەقیدەی ڕاستترو دامەزراوتر بێ، خوا پەرستییەكەی چاكترو ساغتر دەبێ و، هەتا خواپەرستییەكەیشی چاكترو ساغتر بێ، ڕەوشت و ئاكاریشی جوانترو پەسندتر دەبێ.

ئنجا جارێكی دیكەش لە بەرانبەردا: هەركام لە خواپەرستیی و ڕەوشت و ئاكاری پەسند، كاریگەریی باشیان لەسەر ئیمان و عەقیدە دەبێ، وە هەركام لەو سێیانە بەوانی دیكە كارتێكراو (مُتَأَثر) دەبێ و كارتێكەر (مُؤثر)یشیان دەبێ.

ئەوەی گوتیشمان هەردووك ئایەتی (٢٤، ٢٥)ی سووڕەتی: (إبراهیم) زۆرباش بەرجەستەو نمایانیان كردوە، كە ئەمەش دەقەكەیانە:

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

واتە: ئایا سەرنجت نەداوە! چۆن خوا وێنەی بە درەختێكی پاك و چاك و بەرهەمدار هێناوەتەوە، بۆ وشەیەكی پاك و چاك - كە وشەی لا إله إلاّ الله یە-، ئەو درەختە بنك و ڕیشەكەی - لە زەمیندا - چەسپاوە، وە لق و پۆپەكانی بەرەو سەرێ چوون، هەمیشە بە مۆڵەتی پەروەردگاریەوە، بەرەكەی (میوەكەی) دەدات، وە خوا وێنان بۆ خەڵكی دێنێتەوە، بەڵكو پەند وەربگرن و بیر بكەنەوە.

شایانی باسسیشە زۆربەی توێژەرانی قورئان گوتوویانە: مەبەست لە (كلمة طیبة) لێرەدا وشەی خوا بەیەكگرتن (كلمة التوحید)ە، واتە: (لا إله إلاّ الله)، ئنجا چۆنیەتی بەراورد كردنی خوا بەیەكگرتن و وێچوێنران (تشبیه)ی بە درەختێكی بەردار، بەم شێوەیە:

**درەختەكە سێ بەشە:**

١- بنك و ڕەگ و ڕیشە {أَصْلُهَا ثَابِتٌ}.
٢- قەدو لق و پۆپ {وَفَرْعُهَا فِي ٱلسَّمَآءِ}.
٣- بەرو میوە {تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ}.

**مسوڵمانەتیی و خوا بەیەكگرتنیش بە گشتی سێ بەشە:**

١- ئیمان و عەقیدە.
٢- خوا پەرستیی و فەرمانبەریی.
٣- ڕەوشت و خووی پەسند.

ئنجا هەرچی ئیمان و عەقیدەیە بۆ مسوڵمانەتیی، وەك ڕەگ و ڕیشەو بنك وایە بۆ درەختەكە.

وە خوا پەرستیی و فەرمانبەریی (العبادة والطاعة)، وەك قەدو لق و پۆپ و گەڵاوایە، بۆ درەختەكە.

وە ڕەوشت و ئاكاری پەسندیش، لەجێی بەرو میوەی درەختەكەیە.

ئاشكراشه وەك چۆن هەتا درەخت، ڕەگ و ڕیشەو بنكەكەی چەسپاوتر بێ، قەدو لق و پۆپ و گەڵای بەرزتر هەڵدەچێ و، بەرو میوەشی زیاترو باشتر دەبێ، بەهەمان شێوەش: مرۆڤی مسوڵمان، هەتا ئیمان و عەقیدەی ڕاستترو دامەزراوتر بێ، خواپەرستیی و گوێڕایەڵیی ساغترو زیاترو، ڕەوشت و ئاكاریشی پەسندترو جوانتر دەبێ.

**ئنجا بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر چۆنیەتی هاتنەدی ئەم كتێبە، دەڵێم:**

كە ئەم پرۆژەیەی باسی (ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامیی)ە، بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەكەم:**

ئەوە بوو كە لە ساڵی (١٤٠٨ك-١٩٨٨ز)دا لە بنكەی هێزی حەمزەدا، لە بناری قەندیل (گوندی قەڵاتووكان) كە ئەو كاتە بەندە فەرماندەی (هێزی حەمزە) بووم نووسیم و، ئێستا دەستنووسەكەیم ماوەو لە ژێر ناوونیشانی: (جۆرەكانی خوو ڕەوشتی پەسند)دا، بابەتێكم نووسیوە، كە لە پێنج باس پێكهاتوە، بەم ناوونیشانانە:

باسی یەكەم:

ئاكارە بەرزو جوانەكانی مسوڵمان، هەر لە تەپڵی سەریەوە تا بەری پێی.
كە بەپێی ئەندامەكانی جەستەی مرۆڤ، باسی ئاكارو هەڵسوكەوتە كەسییەكانی مرۆڤی مسوڵمانم كردوە.

باسی دووەم:

خەسڵەت و ڕەوشتە پەسندەكانی مرۆڤی مسوڵمان.

كە سەرجەم شەست و سێ (٦٣) خەسڵەتی بەرزو پەسندم سەرژمێر كردوون، بە ژمارەی ساڵەكانی تەمەنی موبارەكی پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلی الله علیه وسلم)، كە بەرجەستەكەری ڕەوشتی بەرزو پەسندە.

باسی سێیەم:

هەڵسوكەوتی ڕۆژانەی مسوڵمان.

كە لە هەشت (٨) خاڵاندا باسی كۆمەڵێك هەڵسوكەوت و ڕەفتاری ڕۆژانەی مرۆڤی مسوڵمانم كردوە.

باسی چوارەم:

ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكانی مرۆڤی مسوڵمان.

كە لە نۆ (٩) خاڵاندا باسی هەڵسوكەوتە كۆمەڵایەتییەكانی وەك: مامەڵە لەگەڵ باب و دایك، هاوسەر، منداڵ، خزمان، دراوسێ...هتدم، كردوە.

باسی پێنجەم:

ڕەوشتە جیهادییەكان.

كە لە یازدە (١١) خاڵدا باسی كۆمەڵێك خەسڵەت و ئاكاری پەسندم كردوە، كە لە بواری جەنگ و بەرەنگار بوونەوەی دوژمناندا، پێویستە ڕەچاو بكرێن. شایانی گوتنە، كە بەتەمام لەداهاتوودا بۆ پرۆژەیەك بەناوی: (ئەدەبە ئیسلامییەكان) وەك كەرەسەیەكی خاو سوود لەو بابەتە -كە وەك گوتم هەتا ئێستاش هەر دەستنووسە- وەربگرم، بە تایبەت باسەكانی: یەك و سێ و چوار، چونكە دووەمییان، وەك كەرەسەیەك بۆ ئەم كتێبە: (ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامیی) سوودی لێ بینراوە، باسی پێنجەمیش بۆ شوێنی دیكە گونجاوترە.

**قۆناغی دووەم:**

كە لە ساڵی (١٤٢٢ك - ٢٠٠١ ز) دا كتێبێكم بە ناوونیشانی: (خووو ڕەوشتی مسوڵمان) دەست پێكردوەو، دامناوە، لە حەوت (٧) بابەتدا بینووسم، بەڵام تەنیا بابەتی یەكەم و دووەمم لێنووسیون، بە ناوو نیشانی:

**بابەتی یەکەم:** خووڕەوشتی بەرزو پەسند، چییەو چۆنە؟

**بابەتی دووەم:** ئەدەب و ڕەوشتی مسوڵمان، لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) دا.

دیارە ئەم دوو بابەتەش دەخەینە نێو ئەم کتێبەوە ( ئاکارو ڕەوشتی ئیسلامیی ) وە لەگەڵیدا ئاوێتەیان دەکەین.

**قۆناغی سێیەم:**

کە بریتیە لەو سی (٣٠) ئاڵقەیەی لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٦) کۆچیی و (٢٠١٥) زایینیدا، سەرەتا بۆ کەناڵی ئاسمانیی پەیام تۆمارکران و، دواتر نووسرانەوەو تایپ کران و بوونە پێکهێنەری هەرە زۆرو بنەڕەتیی ئەم کتێبە.

ئەم ڕوونکردنەوەیەشم بۆ ئەوە بوو، کە بزانرێ ماوەیەکی باشە دەوری بیست و هەشت (٢٨) ساڵە، کار لەسەر ئەو پرۆژەیەی (ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی) دەکەم و، هیوادارم لەم ماوە زۆرەدا باش گەیشت بێ و ئامادە بووبێ.

**هەڵبەتە هەر کام لە کتێبەکانی[1]:**

١- ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون.

٢- گەڕانەوە بۆ لای خوا.

٣- گیانی ژیان

یش پەیوەندیی زۆریان بەبابەتی (ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی)یەوە هەیە، چونکە بابەتی تەزکیەی نەفس، باسی دیوی پەنهان و نێوەوەی مرۆڤەو بێگومانیش ئاکارو خەسڵەتە پەنهان و شێرراوەکانی مرۆڤ، باش بن یان خراپ، ڕەگ و ڕیشە و هەوێن و هەناوی ڕەشت و هەڵسوکەوتە ڕواڵەت و ئاشکراییەکانني.

---

(١) هەر کام لە کتێبەکانی ( ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون) و (گەڕانەوە بۆ لای خوا) هەتا ئێستا، یەکی پێنج جار چاپ کراونەوە، ( گیانی ژیان) یش ئەم ساڵ (٢٠١٥)ز چاپی یەکەمی کرا.

هیواداریشم ئەم كتێبە[1]، ئەو ئامانجەی بۆی نووسراوە، بپێكێ و كەلێنێكی باش بگرێ، چونكە بەڕاستی یەكێك لە قەیران و كێشە زلەكانی مسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە لە هەموو ئاستەكاندا، بریتیە لە قەیران و كێشەی ڕەوشت و ئاكارو، لەو بوارەدا كەم و كوڕیی و كرچ و كاڵیی و كەلێن و بۆشاییەكی گەورە هەیە! لەكۆتایی ئەو پێشەكییەشدا دڵسۆزانە ڕوو دەكەمە مسوڵمانان و دەڵێم:

با هەموو لایەكمان بەیەكەوەو تاك تاكیشمان هەوڵ بدەین: هێندە ئاكارو ڕەوشتێكی بەرزو پەسندمان هەبێ، كە لێمان بوەشێتەوەو شایستە بین بڵێین: ئۆممەت و شوێنكەوتووی پێغەمبەری خاتەمین (صلی الله علیه وسلم)، كە خوای بەرزو مەزن بە ڕەوشتی بەرزو مەزن پێناسەی كردوە:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم.

وە خۆیشی ڕایگەیاندوە، كە بۆ تەواو كردن و لەخۆدا بەرجەستەكردن و درەوشاندنەوەی ڕەوشت و ئاكارە بەرزو جوانەكان ڕەوانە كراوە:

{إِنَّما بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صالِحَ الأَخْلاقِ} أخرجه أحمد: (٨٩٣٩)، وابن سعد: (١٩٢).

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

٢٥ محرم ١٤٣٧ك

٧ تشرینی دووەمی ٢٠١٥ز

---

(١) بە پێویستی دەزانم پێزانین و سوپاسی زۆر بۆ برای بەڕێزو دڵسۆزم كاك (قاسم سەلام) بخەمە ڕوو، خوا بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە، كە سەرجەم ئەو سی (٣٠) ئاڵقەیەی تایپ كردوەو ڕێكخستوەو، فەرموودەكانیشی (تەخریج) كردوون.

# ڕێخۆشکردن

ئەم کتێبە بە گشتی بۆ دوازدە (١٢) بەش دابەشکراوە، بەم ناوو نیشانانەی خوارێ:

بەشی یەکەم: پێناسەی ڕەوشت و ئاکاری پەسند.

بەشی دووەم: گرنگیی پێگەو پایەی ڕەوشت و ئاکاری پەسند.

بەشی سێیەم: ئەنجام و بەرهەمی ئاکارو ڕەوشتی بەرزو پەسند.

بەشی چوارەم: مەترسیی و زیانەکانی خوو خدەو ڕەفتاری خراپ و دزێو.

بەشی پێنجەم: پەیوەندیی ڕەوشت و ئاکاری جوان، بە ئیمان و، عیبادەت و، تەقوا و، دەستگرتن بە کتێبی خواو، شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم) و، تەزکیەی نەفسەوە.

بەشی شەشەم: چۆن ڕەوشت و ئاکاری جوان دەزانین و وەدەست دێنین؟

بەشی حەوتەم: سێ ڕاستیی گەورەو گرنگی قورئان، لەبارەی ڕەوشتی بەرزو جوانەوە.

بەشی هەشتەم: ئەدەب و ڕەوشتی مسوڵمان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا.

بەشی نۆیەم: بازنەو بوارەکانی ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند.

بەشی دەیەم: بازنەی یەکەم: پەیوەندیی لەگەڵ خۆدا: ڕەوشتە بنەڕەتییەکان.

بەشی یازدەم: بازنەی دووەم: پەیوەندیی لەگەڵ خوادا: ئاکارە مەعنەوییەکان.

بەشی دوازدەم: بازنەی سێیەم: پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکدا: ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان.

**سەرچاوەی ئەم كتێبەش:** پاش ئایەتەكانی قورئانی بەرزو بەپێزو دەقەكانی سوننەتی پێغەمبەری پێشەواو بەڕێز (صلى الله عليه وسلم)، بریتیە لە:

**١- كتێبی نۆیەم لە مەوسووعەی:**

{الإِسْلام كَما يَتَجَلّى فِي كِتابِ الله} بە ناوونیشانی: {الإِهْتِداءُ بِهُدى الله تَعالى أَو الإِلْتِزامُ الفَرديُّ بِشَريعَةِ اللهِ تَعَالى}[1]، كە كاتی خۆی لە زیندانی ئەمریكییەكاندا نووسیومە.

**٢- {نضرة النَّـعـيـم} :**

كە مەوسوعەیەكی دوازدە بەرگییەو، كۆمەڵێك لەزانایان ئامادەیان كردوەو، هەتا ئێستا فراوانترین سەرچاوەیە بۆ سەرژمێر كردن و پێناسە كردنی ڕەوشت و ئاكارە بەرزو پەسندەكان و خووخدەو ڕەفتارە خراپ و نزمەكان.

شایانی باسیشە كە فەرمایشتی بەرزو بێوێنەی خوای بێ هاوتا (سبحانە و تعالى)، وە سوننەتی پێغەمبەری كۆتایی (محمد) (صلى الله عليه وسلم)، لەبواری ڕەوشت و ئاكاریشدا، وەك هەردووك بواری ئیمان و خواپەرستیی (الإيمان والعبادة) نوختەیان خستۆتە سەر پیتان و، هەرچی پێویستە لەو بوارەدا باسیان كردوە، بە پێچەوانەی بوارەكانی:

حوكم و سیاسەت و، ئابووریی و ژیان و گوزەران و، جەنگ و ئاشتییەوە، كە بەدانانی چوارچێوەیەكی فراوان و چەند بنەمایەكی گشتی، وازیان هێناوەو، بۆشایی زۆریان بەجێهێشتوە، تاكو مرۆڤ بەگوێرەی پێداویستییەكانی خۆی لە كۆمەڵگا گۆڕاوو، هەل و مەرج و واقیعە جۆراو جۆرەكاندا، پڕی بكاتەوە لە ڕێی بەكارهێنانی عەقڵی و كۆششكردنەوە، لەبەر تیشكی دەقە كەمەكانی قورئان و سوننەت لەو بوارانەدا، كە تەنیا بەشی دیاریكردنی چوارەچێوەیەكی فراوان و، دانانی چەند بنەمایەكی گشتییان كردوە.

---

(١) دیارە ئەوە لە چاپی دووەمیدا، ئەگەرنا لە چاپی یەكەمیدا، كتێبی نۆیەم (الفصل الأول)ە، لە (المجلد السادس).

## أ لە ڕوانگەی شارەزایانی زمان و زاراوەكانەوە

بۆ ڕوونكردنەوەی چەمك و واتای {ڕەوشت و ئاكاری پەسند} و پێناسە كردنی، لە ڕوانگەی زاناو شارەزایانی زمان و زاراوەكانەوە، دوازدە (١٢) پێناسەم هێناون، كە یازدەیان هی زانایانن، یەكێكیشیان هی خۆمە، ئنجا با سەرنج بدەین، داخۆ ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامییانە[1] چییەو چۆنە؟:

**١- (إِبن فارس) ئاوا پێناسەی ڕەوشت و ئاكار دەكا، دەڵێ:**

{الأَخلاق في اللُّغة: جَمع خُلُق، والخُلُق إِسم لِسَجيّة الإِنسان وطَبيعتِهِ الَّتي خُلِق عَلَيها، وَهوَ مَأخوذ مِن مادَّة (خ، ل، ق) الَّتي تَدلُّ على تَقدير الشَّيء، ومِن هذا المَعنى: الخُلُق، وهوَ السَجيّة لأَن صاحِبَهُ قَد قُدِّرَ عَليهِ.. وخُلِقَ بكذا: أَي قادِر عليهِ وَجَديرٌ بِهِ... والخَلاق: النَّصيب}[2].

واتە: وشەی (الأَخلاق) لە زماندا، كۆی (خُلُق)ە، (خُلُق)یش بریتیە لەو سروشتەی، لەو فیترەتەی، كە ئینسانی لەسەر دروست كراوە، وشەی (خُلُق) لە ماددەیەكی سێ پیتیی: (خ، ل، ق) وەرگیراوە، كە لە ئەصلی زماندا دەلالەت دەكا لەسەر ئەندازەگیریی شتێك، هەر لێرەشەوەیە، كە گوتراوە: (خُلُق)، واتە:

---

(١) لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێم: كە ڕەوشت و ئاكار بە كوردیی، لە زمانی عەرەبیدا مانای: (أخلاق) یاخود (خُلُق)ە، ئنجا ئەگەر بویسترێ بگوترێ: ڕەوشتی جوان دەگوترێ: (الخُلُق الحَسن)، یان (الأخلاق الحَسَن).

(٢) مقاييس اللغة، ج٢ ص٢١٤.

ئەو سروشتەی كە خاوەنەكەی بۆی دیاریی كراوە، یان لەسەری خوڵقێنراوە، وە دەگوترێ: (خليقٌ بكذا) واتە: لەسەر ئەو شتە بەتوانایە، یان شایستەی ئەو شتەیە، وشەی (خَلاق)یش بەمانای پشك و بەش دێ، واتە: ئەو بەشەی كە بۆ ئەو ئینسانە دیاریی كراوە.

٢- (راغب الأصفهاني) دەڵێ:

{الخَلق، والخُلُق، والخُلْق: في الأَصل واحِد، كالشَّرب والشُّرب، والصَّرم والصُّرم، لكِن خَصَّ الخَلق بِالهَيئات والأَشكال والصُّوَر المُدرَكة بالبَصَر، وخُصَّ الخُلُق بِالقِوى، والسّجايا المُدرَكة بالبَصيرة}[1].

واتە: وشەی (خَلْق) كە بەمانای دروست بوونە، وە وشەی (خُلُق) وە وشەی (الخُلْق)، هەر سێكیان دەچنەوە بۆ یەك ڕیشە، بەڵام وشەی (خَلْق) تایبەت كراوە بەو شێوەو دیمەنانەوە، كە بەچاو دەبینرێن، وە وشەی (خُلُق) یان (خُلْق) تایبەت كراوە، بەو سروشتەوە كە بەبەصیرەت و بە عەقڵ دەبینرێ.

بۆیە سوننەتە كاتێ مرۆڤ سەیری ئاوێنەی كرد بڵێ:

{اللهُمَّ كَما أَحْسَنتَ خَلْقي فَأَحْسِنْ خُلُقي}، أخرجه أحمد برقم: ٢٤٤٣٧، قال الهيثمي ١٧٣/١٠: رجاله رجال الصحيح، قال شعيب الأرنؤوط : صحيح.

واتە: خوایە! وەك چۆن دیمەنت جوان كردووم (ڕواڵەت و جەستەمت باش خوڵقاندوە)، ڕەوشت و ئاكاریشم جوان و پەسند بكە.

٣- (القُرطـبي) دەڵێ:

{حَقيقةُ الخُلُق في اللُّغة : هُوَ ما يَأْخُذُ بِهِ الإنسانُ نَفسهُ مِنَ الأَدبِ، ويُسَمّى خُلُقاً لأَنَّهُ يَصير كَالخِلقَة فيه}[2].

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص١٥٨.

(٢) الجامع لأحكام القرآن، ج١٨، ص٢٢٧.

واتە: وشەی (الخُلق) لە زماندا مانا ڕاستەقینەکەی بریتیە لەو ئەدەب و هەڵس و کەوتەی کە مرۆڤ لەسەر خۆی پێویست دەکا، بۆیەش وای پێگوتراوە، چونکە دەبێ بەبەشێك لە سروشت.

٤- (الطاهر ابن عاشور) دەڵێ:

{الخُلُقُ: السَّجيّة المُتمَكِّنة في النَّفس، باعِثة عَلى عَمَل يُناسِبها مِن خَيرٍ أَو شَر، وَتَشْمُلُ طَبَائِع الخَيرِ وَطَبَائِع الشَّر، ولِذلكَ لا يُعرَف أَحَدُ النَّوعين مِن اللَّفظِ إلاَّ بِقيد يُضَمُّ إليهِ، فيُقال: خُلُق حسَن، وفي ضِدِّه: خُلُقٌ قَبيح، فإذا أُطْلق عن القيَد، انصرف إلى الخُلُق الحسن}.[1]

واتە: وشەی (خُلُق): بریتیە لەو سروشتەی کە لە نەفسی ئینساندا ڕۆچووەو جێگیر بووە، دەبێتە پاڵنەرێك بۆ جۆرە کردەوەیەك لەگەڵیدا بگونجێ، ئنجا چاك بێ یان خراپ بێ، وە ئەو سروشتە هەم ئاکارە باشەکان دەگرێتەوە، هەم ئاکارە خراپەکانیش دەگرێتەوە، هەر بۆیە لەکاتێکدا کە وشەی (خُلُق) بەکاردێ، نازانرێ مەبەست پێی کامیانە، {مەبەست پێ ڕەوشتی بەرزو پەسندە، یاخود مەبەست پێ ئاکاری خراپ و دزێوە}، مەگەر قەیدێکی بخرێتە سەرو بگوترێ: (خُلُقٌ حَسَن) ڕەوشتێکی جوان، یاخود پێچەوانەکەی (خُلُقٌ قَبیح) ئاکارو ڕەفتارێکی ناشیرین و ناقۆڵا، بەڵام کاتێ بە ڕەهایی دەگوترێ: (خُلُق) ئەوە زیاتر بۆ مانا ئیجابییەکەی دەچێ، کە بریتیە لە ڕەوشتی جوان.

٥- (الجاحظ)[2] دەڵێ:

{هوَ حالُ النَّفس بِها يفعَل الإنسانُ أَفعالَه بِلا رَويّة وَلا اخْتيار، والخُلُق قَد يَكونُ في بَعضِ النّاس غَريزةً وَطَبعاً، وَفي بَعضِهم لا يَكونُ إلاَّ بِالرِّياضَةِ والإجتِهاد...}[3].

---

(١) التحرير والتنوير، محمد الطاهر بن عاشور، ج١٩، ص١٧١-١٧٢.

(٢) (الجاحظ) ئەدیبێکی گەورەو نووسەرێکی زەبر دەست بووە، هەرچەندە لە ڕووی فیکرەوە سەر بە قوتابخانەی (موعتەزیلە)یە، کە زیاتر ئیعتیمادیان لەسەر عەقڵ بووە.

(٣) تهذيب الأخلاق، الجاحظ، ص١٢.

واتە: (خُلُق): بریتیە لە حاڵی نەفس کە بەهۆیەوە ئینسان کردەوەکانی خۆی بەبێ بیرکردنەوەو بەبێ هەڵبژاردن دەکا، {واتە: (خُلُق) حاڵەتێکە کە لە ئینساندا جێگیر دەبێ، بۆ وێنە کەسێ بیەوێ ڕاستیی بڵێ، یان بیەوێ ئەمانەت پارێز بێ، یاخود بیەوێ خۆڕاگر بێ، هەموو جارێ بێئەوەی بیەوێ بیر لەو ڕەوشتانە بکاتەوە، وەك چۆن هەناسە دەدا، یاخود بە چاو دەبینێ، یاخود بەگوێ دەبیستێ، بەهەمان شێوە ئەو ئاکارانەش تێیدا بوون بە شتێکی ڕۆچوو}[1]، وە ڕەوشت و ئاکار (دیارە مەبەستی پێ ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسندە) لە هەندێ کەسدا وەك غەریزەو سروشتێکی لێهاتوە، بەڵام لە هەندێکیاندا، مەگەر بە مەشق بەخۆ کردن و خۆ ڕاهێنان و کۆشش لەگەڵ خۆدا کردن، ئەگەرنا ناتوانێ ڕازاوە بێ بە ڕەوشتی جوان و ئاکاری پەسند.

٦- (الجرجاني) دەڵێ:

{خُلُق: عِبارَة عَن هَيئَةٍ لِلنَّفسِ راسِخَةٍ تَصدُر عَنها الأَفعالُ بِسُهُولةٍ ويُسر، مِن غَير حاجَةٍ إلى فِكر ورَوِيّة، فإن كانَ الصّادر عَنها: الأَفعال الجَميلة، سُمِّيَت الهَيئةُ خُلُقاً حسناً، وإن كانَ الصّادِر عَنها: الأَفعالُ القَبيحة، سُمِّيَت الهَيْئةُ الَّتي هِيَ مَصدَر ذلك: خُلُقاً سَيِّئاً}[2].

واتە: (خُلُق): بریتیە لە حاڵەتێکی ڕۆچوو لە نەفسدا کە کردەوەو ڕەفتارەکانی بە ئاسانیی لێوە پەیدا دەبن، بێ ئەوە پێویستی بەوە بێ بیر بکاتەوەو ڕابمێنێ، ئنجا ئەگەر ئەو کردەوانەی لەو حاڵەتەی نەفس پەیدا دەبن، کردەوەی باش بن، ئەوە بەو حاڵەتە دەگوترێ: ڕەوشتێکی جوان، بەڵام ئەگەر کردەوەکانی خراپ و ناقۆڵا بن، ئەو کاتە ئەو حاڵەتەی نەفس پێی دەگوترێ: ڕەوشتی خراپ.

---

(١) نێوان کەوانەکە زیادەی خۆمە.

(٢) التعريفات للجرجاني، ص ١٠٤.

**٧- (عبدالرحمن بن حسن بن حبنكة الميداني) دەڵێ:**

{الخُلُق: صِفةٌ مُستَقِرَّةٌ في النَّفسِ فِطريَّةً أَو مُكتَسبَة ذاتُ آثارٍ في السُّلوكِ، مَحمودةٍ أَو مذمومةٍ}[١].

واتە: (خُلُق): بریتیە لە سیفەتێکی جێگیر لە نەفسدا، کە بەشێوەی خوارِسك (واتە: بێ ئەوەی ئینسان دەستی تێدا هەبووبێ، بۆ وێنە: هەندێ کەس هەر بە سروشت هێمن و ئارامە، یان هەر بە سروشت تەنگە پرێسکەو دڵ بچووکەو زوو توورە دەبێ}[٢]، لەسەریان سروشتێنرابێ، یاخود وەدەست هێنراو بن، وە ئەو سیفەتە چەند شوێنەوارێکی لە ڕەوشت و ئاکاری ئینساندا هەیە، چ چاك بن، چ خراپ بن. {لێرەدا نووسەر وشەی (خُلُق)ی بەمانا گشتییەکەی بەکار هێناوە، کە مەگەر دوایی قەیدی بخرێتە سەر، ئەگەر نا، نازانرێ مەبەستی پێ ڕەوشتی جوانە، یان خراپ؟}[٣].

**٨- (إبن منظـــور)یش لەوبارەوە گوتوویەتی:**

(الخَلِيقةُ: الطَّبيعة التي يُخلَق بها الإِنسان، والجمع الخَلائق... والخِلْقةُ: الفِطْرة، إِنه لكريم الطَّبيعة والخَلِيقةِ والسَّلِيقةِ، بمعنى واحد ...، الخُلُق: الخَلِيقة أَعني الطَّبِيعة، والجمع أَخْلاق لا يُكسّر على غير ذلك، والخُلْق والخُلُق: السَّجِيّة والسجية وحقيقته أَنه لِصورة الإِنسان الباطنة، وهي نفْسه وأَوصافها ومعانيها المختصَّةُ بِها، بمنزلة الخَلْق لصورته الظاهرة وأَوصافها ومعانيها، ولهما أَوصاف حسَنة وقبيحة، والثوابُ والعقاب يتعلّقان بأَوصاف الصورة الباطنة أَكثر مما يتعلقان بأَوصاف الصورة الظاهرة).

واتە: (خلیقە) ئەو سروشتەیە، کە مرۆڤی لەسەر دروستکراوەو، کۆیەکەی (خلائق)ە.. وە (خلْقە) بە مانای (فطرة)ە، یانی: خوارِسك، وە دەگوترێ: فڵان کەس سروشت و سەلیقەیەکی باشی هەیە. وە (خلق) بەمانای (خلیقە)یە، یانی

---

(١) الأخلاق الإسلامية وأسسها، عبدالرحمن بن حسن حبنكة الميداني، ج١ ص٧-٨.

(٢) نێوان کەوانەکە زیادەی خۆمە.

(٣) نێوان کەوانەکە زیادەی خۆمە.

(طبيعة)، وە کۆی (خُلُق) (أخلاق)ە، هەر بەو جۆرەش کۆ دەکرێتەوە، وە (خُلُق)و (خُلْق) بەمانای (سجيَّة) دێ، وە (خُلُق) بۆ دیوی پەنهانی مرۆڤ، کە بریتییە لە ڕووحی مرۆڤ و سیفەتەکانی و مانایەکانی، وەك وشەی (خَلقْ) وایە، بۆ دیوی ڕواڵەت و دەرەوەی مرۆڤ و سیفەت و ئاکارەکانی.

وە هەر کام لە ڕووحی مرۆڤ و جەستەکەی، سیفەتی چاك و خراپیان هەن، بەڵام پاداشت و سزا زیاتر بە سیفەت و ئاکارە پەنهانەکانەوە پەیوەستن، هەتا ڕواڵەت و بەرهەستەکان.

**٩- خاوەنی (المعجم الوسيط)یش لەبارەی پێناسەی وشەی گۆرینەوە نووسیویەتی[١]:**

(الخُلُقُ: حال للنفس راسخة تصدر عنها الأفعال من خير أو شرٍ، من غير حاجة الى فكر وروِيَّةٍ).

واتە: (خُلُق) حاڵەتێکی دامەزراوی نەفسە، کەرەفتارو کرداری چاك، یان خراپی لێوە سەرچاوە دەگرن، بێئەوەی پێویستی بە بیرکردنەوەو ڕامان بێ.

**١٠- هەروەها (الرازي) خاوەنی (مُختار الصحاح)یش هەمان مەبەست دووپات دەکاتەوە، کە لە (راغب)و (ابن منظور)ەوە نەقڵمان کرد[٢].**

**١١- (مقداد يالجين) دەڵێ:**

{الأَخلاق في نَظريَّة الإِسلام: مَجْموعَةُ المَبادِيء وَالقَواعِد المُنَظِّمة لِلسُّلوكِ الإِنساني، الَّتي يُحَدِّدُها الوَحيُ لِتنْظيمِ حَياةِ الإِنسان، وتَحديد عِلاقَتِه بِغَيْرِه، عَلى نَحوٍ يُحقِّق الغايَة مِن وجودِهِ في هذا العَالم عَلى أَكْمل الوُجوه}[٣].

واتە: ئاکارو ڕەوشتەکان (دیارە لێرەدا مەبەستی پێ ڕەوشتی جوانە) بریتیە: لە کۆمەڵێك پرەنسیپ و بنچینەی ڕێکخەر بۆ هەڵس و کەوتی مرۆڤ، کە

---

(١) (المعجم الوسيط) ص ٢٥٢، طبعة دار الدعوة.

(٢) (مختار الصحاح) ص ٢٧٢.

(٣) التربية الأخلاقية الإسلامية، مقداد يالجين، ص ٧٥.

وەحی ئەو كۆمەڵە پرەنسیپ و بنچینانە دیاریی دەكا، بەمەبەستی ڕێكخستنی ژیانی ئینسان، وە دیاریی كردنی چۆنیەتی پەیوەندیی لەگەڵ غەیری خۆیدا، بەشێوەیەك كە ئەو ئامانج و مەبەستەی لەم دنیایەدا بۆی هێنراوەتە دی، بەباشترین شێوە بێنێتە دی. {ئەو ئامانجەی كە مرۆڤی بۆ دروست كراوە، بریتیە لە بەندایەتیی بۆ خواو، جێنشینایەتیی كردنی خوا، بەهۆی ئەو ڕەوشت و ئاكارە بەرزو جوانانەوە، كە ئیسلام فەرمانیان پێ دەكا، كە لە وەحی خوادا هەن، ئینسان بەباشترین شێوە ئەو ئامانجە بێنێتە دی}[1].

١٢- منیش دەڵێم:

{ الأخلاق الإسلامية: هي الفضائل والخِصالُ الحَميدةُ الّتي دَلَّ عَليها النَّقلُ والعَقل يَتَحلَّى بِها الإنسانُ في ذات نَفْسه، وفي تعامُلِهِ مَعَ الله تعالى، ومع النَّاس، بُغيَةَ نَيل مرضاة الله}.

واتە: ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامییانە بریتیە: لەو سیفەتە پەسندو ئاكار ستایش كراوانەی كە نەقڵ و عەقڵ دەلالەتیان لەسەر دەكەن {واتە: دەقەكانی قورئان و سوننەت، وە عەقڵی سەلیم} وە مرۆڤ خۆییان پێ دەڕازێنێتەوە، هەم لە خودی خۆیدا، هەم لە هەڵس و كەوتی لەگەڵ خوادا (سبحانە و تعالی)، وە هەم هەڵس و كەوتی لەگەڵ خەڵكدا، بەمەبەستی ئەوە كە ڕەزامەندیی خوا بەدەست بهێنێ.

چونكە وەكو دواییش باسی دەكەم: وشەی (أخلاق) كە بە كوردیی دەبێتەوە بەڕەوشت، یان ڕەوشت و ئاكار، هەر ئەوەندە نیە، كە ئینسان چۆن لەگەڵ خەڵكدا مامەڵە دەكا؟ بەڵكو سێ بازنەی هەن: لەگەڵ خۆیدا، وە لەگەڵ خوادا (سبحانە و تعالی)، وە لەگەڵ خەڵكیشدا.

ئنجا بێگومان كە دەڵێین: ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامیی - كە ئێمە ناوو نیشانی گشتی دەرسەكانمان ئەوەیە -، واتە: ڕەوشتە بەرزو پەسندەكانی، كە ئیسلام فەرمانی پێ كردوون.

---

(١) نێوان كەوانەكە زیادەی خۆمە.

وە كۆتایی ئەم باسەشمان كە بریتی بوو لە: پێناسەی ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامیی، بە دوو قسەی نەستەق و بەڕەونەقی شێخ عەبدولقادری گەیلانیی دەهێنین (ڕەحمەتی خوای لێبێ):

قسەی یەكەم:

{كُن مَعَ الحَقِّ بِلا خَلْق، ومَعَ الخَلْقِ بِلا نَفس}.

واتە: لەگەڵ حەق دابە بەبێ خەڵك، وە لەگەڵ خەڵك دابە بەبێ نەفس.

مەبەستی ئەوەیە: لە مامەڵە كردنت لەگەڵ خوادا (سبحانە و تعالى)، سەرنجی خەڵك مەدەو خەڵك مەهێنە نێوانتان، شتێك كە بۆخوا ئەنجامی دەدەی، ئەگەر نوێژە، ئەگەر ماڵ بەخشینە، ئەگەر جەنگ و جیهادە لە پێناوی خواداو لەكاتی خۆیدا، هەر شتێك كە لەبەر خوا ئەنجامی دەدەی، سەرنجی خەڵك مەدەو تەنیا خوا ببینە، وە لەهەڵس و كەوتت لەگەڵ خەڵكدا، نەفسی خۆت، خودی خۆت، مەهێنە نێوان، لەكاتێكدا هەڵس و كەوت لەگەڵ خەڵكدا دەكەی، بابەتییانە هەڵس و كەوت بكە، نەك خودییانە، وە نەفس و سیفەتە خراپەكانی نەفس، مەهێنە نێوان، لەكاتێكدا كە لەگەڵ خەڵكدا هەڵس و كەوت دەكەی.

قسەی دووەم:

{الإسلام: صِدقٌ مَعَ الحَق، وخُلُقٌ مَعَ الخَلْق}

واتە: ئیسلام لە دوو وشەدا خوڵاصە دەبێتەوە: ڕاستیی لەگەڵ خوادا، چاكیی لەگەڵ خەڵك.

ئنجا لەڕاستییدا، ڕاستیی لەگەڵ خوادا، چاكیی لەگەڵ خەڵكیش بەرهەم دێنێ، كەسێ بەندەی ڕاست بێ بۆ خوا، هیچ گومانی تێدا نیە، كە كەسێكی باشیش دەبێ، وە ڕەوشت بەرزو ئاكار پەسند دەبێ لەگەڵ خەڵكی خوادا.

دیارە ئەوەی، كە عەبدولقادر (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، گوتوویەتی: لە دەقەكانی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) وەریگرتوە،

بۆ وێنە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿...فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ .. ﴿١﴾﴾ الأنفال.

واتە: پارێز لە خوا بكەن، وە پەیوەندیی نێوانتان چاك بكەن، پەیوەندیی نێوان چاك بوون، بەرهەمی بۆ خوا پارێزكار بوونە.

هەروەها دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾﴾ النحل.

بێگومان خوا لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە پارێز دەكەن (واتە: لە مامەڵەیان لەگەڵ خوادا پارێزكارن)، وە لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە چاكەكارن، یانی: چاكە كار بوون لەگەڵ خەڵك، بەرهەمی پارێزكار بوونە لەگەل خوا. هەروەها دەفەرموێ:

﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ .. ﴿١٢٥﴾﴾ النساء.

واتە: دینداریی كێ لەهی كەسێك باشترە، كە خۆی تەسلیمی خوا كردوە، {بۆ خوا ملكەچە خۆی بۆ خوا ساغ و یەكلا كردۆتەوە}، وە چاكەكاریشە؟!.

بۆیە من لە هەندێ لە كتێبەكانی خۆمدا گوتوومە: ئیسلام لە دوو وشەدا خولاصە دەبێتەوە: {خوا پەرستیی و، خەڵك دۆستیی}، وە لە ڕاستییدا خەڵك دۆستیی و سوود بەخش بوون بۆ خەڵك، بەرهەمی خوا پەرست بوونە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٧٧﴾﴾ الحج.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ڕكووع (بۆخوا) بەرن و، سەجدە ببەن، وە پەروەردگارتان بپەرستن و، چاكە بكەن (چاكە لەگەڵ خەڵكی خوادابكەن) بەڵكو سەرفراز بن.

ئنجا ئێستا لەبەر تیشكی قسەو توێژینەوەی پسپۆڕانی زمانەوانییدا، دەتوانین دەربارەی چەمك و واتای ئەصڵیی و زمانەوانیی وشەی (خُلُق) بڵێین:

یــــەك:

وشەی (خَلُق، خُلْق) واتە: بە بۆر (ضمە) یان زەنە (سكون)ی (لْ) كەی، كۆیەكەی (أخلاق)ەو، تەنیا بەم شێوەیەش كۆ (جمع) دەكرێتەوە.

دوو:

وشەی (خُلُق و خَلْق) وەك وشەكانی (شَرْب و شُرْب) وە (صَرْم و صُرْم) لە ئەصڵدا یەك واتایان هەیە، بەڵام وشەی (خَلْق) تایبەتە بە شێوەو دیمەن و وێنەی ماددیی و بەر هەست(محسوس)ی شتان و، (خُلُق)یش تایبەتە بە خووو خدەو خەسڵەت و ئاكارە خوارسكەكانەوە، كە ئینسانیان لەسەر بنیات نراوە.

ســێ:

هەر كام لەوشەكانی: (فطرة و طبیعة و سجیة و خلیقه و خِلْقة و سلیقة و غریزة)ش هەمان ماناو مەبەستیان هەیە لەگەڵ جیاوازییەكی كەمدا.

چــوار:

كەواتە: وەك چۆن وشەی (خَلْق) ئاوێنەی جەستەی مرۆڤ و ئەندامە دیارو ڕواڵەتییەكانیەتی، وشەی (خُلُق)یش ئاوێنەی ڕووح و جەوهەری ئینسان و خەسڵەتە ون و پەنهانە مەعنەوییەكانیەتی.

## ب ■ لە ڕوانگەی شەرعەوە

لەبەر چەند هۆو حیكمەتێك كە لێرەدا مەودای توێژینەوەیانمان نیە[1]، خوای كاربەجێ و زانا بە ئاشكراو پەنهان، ویستی وابوو كە دوایین ئایین و بەرنامەی خۆی لەنێو گەلی عەرەبدا و بە زمانی عەرەبی و، بەپێغەمبەرێكی نەخوێندەوار (نبي أُمِّي)دا بنێرێ، جا هەم خوای زانا لە قورئانی بەڕێز (كريم)ی داو، هەم پێغەمبەری داناش لەسوننەتی بەپێز (مبارك)ی دا، بۆ خستنە ڕووی ڕاستییەكانی ئیسلام و ڕاگەیاندنی حوكم و یاسایەكانی، هەر ئەو وشەو زاراوایانەیان بەكار هێناون كە عەرەبەكان بەكاریان دەهێنان. ئەوەندە هەیە ژمارەیەك لەو زاراوانەی كە ئیسلام بۆ دەربڕین و خستنە ڕووی مەبەستە نوێ و تایبەتییەكانی بەكاری هێناون، وێڕای چەمك و واتا پێشووو ئەسڵییەكانیان، مەبەست و چەمكی دیكەشی لێ زیاد كردوون و، لە وشەیەكی سادەو ئاساییەوە گێڕاونی بە وشەو زاراوەیەكی تایبەتی ئیسلامیی!

جا یەكێك لەو جۆرە وشە و زاراوانە، وشەی ڕەوشت و خوو (خُلُقْ)یە، چونكە وشەی(خُلُقْ) كە كۆیەكەی (أخلاق)ە، لەزاراوەی شەرعدا، لەجوغزی تەسك و كەمبەری مانا زمانییەكەیدا نەماوەتەوەو، پان و بەرین كراوەو لەیەك كێشراوەتەوەو، وای لێكراوە كە سەرجەم خەسڵەت و ئاكارو ڕەفتارو هەڵسوكەوت و جم و جۆڵەكانی ئینسان بگرێتەوە، بە مەعنەویی و ماددیی و، تاكیی و كۆمەڵیی و، وردو درشتەوە.

---

(١) لە كتێبی: ( سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا) چاپی سێیەم، تا ڕاددەیەك ئەو مەسەلەیەمان توێژیوەتەوە، بڕوانە لاپەڕە (٩٨) تا (١٠٩)، بە ناوو نیشانی: ( بۆچی دوایین بەرنامەی خوا لە نێو گەلی عارەبدا هاتە خوار؟!).

**ئەمەش چەند دەقێکی قورئان و سوننەت، کە ڕاستیی ئەوەی گوتمان دەسەلمێنن:**

**یەکەم:**

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: {الْبِرُّ: حُسْنُ خُلُقٍ..} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٦٦٨)، وَالبُخَارِي في "الأدب المفرد" برقم: (٢٩٥)، وَمُسْلِم برقم: (٢٥٥٣)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٢٣٨٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح.

واتە: (چاکەکاریی بریتیە لە ڕەوشت و خووی جوان و پەسند)، وەك دەبینین پێغەمبەری پێشەوامان (چاکەکاریی)و (ڕەوشتی جوان)ی خستوونە دوو تای تەرازووێکەوەو پێکەوە یەکسانی کردوون: {الْبِرُّ: حُسْنُ الْخُلُقِ...} مادام وابێ، هەرچی چەمك و واتای وشەی (بِرّ) بیگرێتەوە، دیارە وشەی: (حُسْن الخُلُق)یش دەیگرێتەوە.

ئنجا خوای کاربەجێ لەئایەتی ژمارە (١٧٧)ی سوورەتی (البقرة)دا، وشەی (البر)ی بە (١٩) خەسڵەتی گەورە گەورە تەفسیر کردوە:

﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾.

واتە: چاکەکاریی ئەوە نیە، کە ڕووتان بکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا (لەکاتی نوێژو خواپەرستییدا)، بەڵکو چاکەکاریی (ڕەفتاری) کەسێکە، کە بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی و فریشتان و کتێبەکان و پێغەمبەران هەبێ، وە ماڵ و سامانێك کە خۆشیشی دەوێ، بیدات بە خزمان و هەتیوان و نەداران و ڕێبوارو سواڵکەران و کۆیلان، وەنوێژ بەرپا بکات و، زەکاتێ بدەن، وەکەسانێك پەیمانێکی دەیدەن، دەیبەنە سەر، وە خۆڕاگران لەبەردەم تەنگدەسیتی و نەخۆشیی و کاتی بەرەنگارییدا، ئا ئەوانەن ڕاستان و، هەرئەوانیشن پارێزکاران.

**ئنجا با سەرنج بدەین:**

**یــەك:** جارێ پێنج خەسڵەتی سەرەتا (ئیمان بەخواو ڕۆژی دوایی و فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانی) ئەوە پێنج پایەو بنەڕەتە گەورەكانی بیروبڕوان.

**دوو:** وە شەش سیفەتی دوای ئەوان (ماڵ بەخشین بەخزم و هەتیوو نەدارو ڕێبوارو سواڵكەرو كۆیلە) ئەوە شەش جۆرە هاوكاریی و بەخشینن، بە شەش جۆرە خەڵكی موستەحەق.

**ســێ:** وە خەسڵەتی دوازدەو سێزدەش (نوێژ بەرپاكردن و زەكات دان) دوو دروشمی هەرە گەورەو گرنگی تاك و كۆمەڵی مسوڵمانانن.

**چــوار:** وە خەسڵەتەكانی: چواردەش (بەڵێن بردنە سەرو وەفاداریی) یەكێكە لەڕەوشتە هەرە بەرزو جوانەكانی ئینسانی مسوڵمان.

**پێنــج:** وەخەسڵەتی پازدەو شازدەو حەڤدە (خۆڕاگریی لەكاتی نەداریی و نەخۆشیی و جەنگ)دا، دیسان سێ ڕەوشت و ئاكاری گەورەو گرنگی هەر مرۆڤێكی دیندارو مسوڵمانن.

**شــەش:** وە هی هەژدەهەم (ڕاستیی) كە بێگومان ڕاستیی زمان و دڵ و كردەوە، لەگەڵ خۆو خواو خەڵكدا ڕاست بوون، دەگرێتەوە، بڕبڕەی پشتی مسوڵمانەتییە.

**حــەوت:** وە سیفەتی نۆزدەیەم و كۆتایی (پارێزكاریی) كە كۆكەرەوەی هەموو ئەوانەی پێش خۆیەتی، بە ڕووح و جەوهەرو كاكڵی مسوڵمانەتیی دادەنرێ.

كەواتە: مادام چاكەكاریی (البر) هاو تەرازووی ڕەوشت بەرزیی (حسن الخلق) بێ و، چاكەكارییش، هەم ئیمان و عەقیدەو، هەم ماڵ بەخشین و هاوكارییكردن و، هەم دروشمەكانی مسوڵمانەتیی و، هەم ڕەوشت و خەسڵەتە بەرزو پەسندەكانی، وەك (الوفاء) و (الصبر) و (الصدق) و، هەم پارێزكاریی (التقوی)، بگرێتەوە: كەواتە: ڕاستە چەمك و واتای وشەی (خُلُق و أخلاق) لە ئیسلامدا یەكجار فراوانەو، لە واتاو چەمكی وشەی خواپەرستیی (عبادة)ەوە نزیكە، ئەوەندە هەیە وشەی

(عبادة) زیاتر بۆ پەیوەندیی نێوان خواو بەندەکانی بەکاردێت و (أخلاق) یش زیاتر بۆ پەیوەندیی نێوان ئینسان و ئینسانەکان بەکاردێت.

**دووەم:**

هەروەها (عائیشە)ی دایکی بڕواداران خوا لێی ڕازی بێت، لە وەڵامی کەسێکدا کە لێی پرسیبوو خووو ڕەوشتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چۆن بوو؟ گوتوویەتی:

{كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٣٤١)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

واتە: خوو ڕەوشتی وی قورئان بوو!

ئاشکراشە کە قورئان سەر لەبەری ئایینی خوای تێدایە، کەواتە: خوو وڕەوشتی جوان و تێرو تەواو، ئەوەیە کە ئینسان لەوردو درشتی ژیان و گوزەرانیدا، بەپێی کتێبی خوا بەڕێوە بچێ، کەواتە: لەم فەرمایشتەش دا دیسان چەمك و واتای فراوان و گشتگیری ئەخلاق دەردەکەوێ.

**سێیەم:**

وە ئەگەر سەرنجی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا بدەین، وەك (راغب الأصفهانی) ئاماژەی پێکردوە[1]، جارێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خوو ڕەوشتی جوان (حُسْنُ الخُلُق)ی کردۆتە ناو بۆ خووو خەسڵەت و ئاکارە پەسندو بەرزەکانی نێو دڵ و دەروون، وە جارێکیش کردوویەتە ناو بۆ ئەو کردەوەو ڕفتارە جوان و پەسندانەی، کە لەو خەسڵەت و سیفەتانەوە، پەیدا دەبن و سەرهەڵدەدەن، بۆ وێنە:

---

(١) بڕوانە: (الذريعة إلى مكارم الشريعة) ص ٣٩.

أ- {عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَفْضَلُ مَا أُعْطِيَ الْمُسْلِمُ؟ قَالَ: خُلُقٌ حَسَنٌ} أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٢٥٨٢٤)، وَالطَّبَرَانِيّ فِي الكبير برقم: (٤٧٠)، وَإِبْنُ حِبَّان برقم: (٤٧٨)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

واتە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! چ شتێك چاكترین شتە كە بە ئینسانی مسوڵمان بە خشرابێ؟ فەرمووی: ڕەوشتی پەسندە.

كە بێگومان لێرەدا زیاتر حاڵەتی خەسڵەت بوون و بە نەفس دەروونەوە پەیوەست بوون، بۆ خووو ڕەوشت ڕەچاو كراوە.

ب- {عَن عَلِي أَن النَّبـي صَلى لله عليه وسلم قَالَ: أَلاَّ أدلّكم عَلَى أَكْرمِ أَخلاقِ أَهْلِ الدّنيا والآخِرَة: أَن تَصِلَ مَن قَطَعَكَ، وتُعطي مَن حرمكَ، وَتَعْفُو عَنْ مَنْ ظَلَمَكَ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٦٥٦)، وَالطَّبَرَانِي برقم: (٤١٣)، وقال الهيثمي (١٨٩/٨): فيه زبان بن فائد، وهو ضعيف، وَأَخْرَجَهُ الخرائطي في المكارم برقم: (٢٩٥)، والديلمى برقم: (١٤٣٥)، وقال المناوي (٤٦/٢) : قال العراقى: سنده ضعيف، وضعفه شعيب الأرنؤوط.

واتە: ئایا بەڕێزترین ڕەوشتی خەڵكی دنیاو دوارۆژتان پێ بڵێم؟ ئەوەیە كە پەیوەندیی لەگەڵ كەسێكدا بەردەوام بكەی، كە ئەو پچڕاندوویەتی، وە بەكەسێك ببەخشی، كە ئەو تۆی بێبەش و فەرامۆش كردوە، وە لەكەسێ ببووری كە ستەمی لێت كردوە!

دیارە لەم فەرمایشتەشدا حاڵەتی كردارو ڕەفتار بوون، بە خوو و ڕەوشت لەبەر چاو گیراوە، چونكە هەر كام لە (پەیوەندیی گەیاندن و پاراستن) و (بەخشین) و (لێبوردن و چاوپۆشییكردن) كردەوەو ڕەفتارن.

**چـــوارەم:**

ئنجا بۆ ئەوەی چەمك و واتای وشەی ڕەوشت و خووی پەسند (حُسْنُ الخُلُق) چاكترو زیاتر ڕۆشنبێتەوە، بە چاكی دەزانم، سەرنجێكی وەسف و پێناسەی ژمارەیەك لە زاناو شەرعزان و پێشەوایانمان بدەین، داخۆ چی یان گوتوە؟:

- **(الحسن البصری) گوتوویەتی:** (حُسنُ الخُلُق: الكَرَمُ، والبذلَةُ، والإحتمال) واتە: خووو ڕەوشتی جوان بریتیە لە: بەخشندەیی و، پۆشاك سادەیی و[1]، تەحەممولکردن و خۆڕاگریی[2].

- **(عبدالله بن المبارك)یش گوتوویەتی:** (حُسْنُ الخُلُق: هُوَ بَسْطُ الوَجهِ، وبَذلُ المعروفِ، وكَفُّ الأذى)، واتە: خوو و وڕەوشتی پەسند، بریتیە لە: ڕووکراوەیی و گەشیی و، ماڵ بەخشین و، خۆپاراستن لە ئەزیەت دانی خەڵکی.

- **(إمام أحمد)یش گوتوویەتی:** (حُسنُ الخُلُق: أن لا تغضب ولا تَحْتَدَّ)، واتە ڕەوشت بەرزیی ئەوەیە کە تووڕە نەبی و هەڵنەچی.

- **وە هەندێك لە زانایان وەك (ابن رجب الحنبلی) هێناویەتی[3]، گوتوویانە:**

(ڕەوشت جوانیی بریتیە لە: لەبەر خوا ڕق و تووڕەیی خۆ کپ کردنەوە، پێشاندانی ڕووخۆشیی و کراوەیی، مەگەر لەگەڵ بابای بیدعەتچیی و خراپەکاردا، وە چاوپۆشییکردن لە بەهەڵەدا چوان، مەگەر بۆ تەمبێ کردن و سزای شەرعیی لەسەر جێبەجێکردن، وە ئازار گێڕانەوە لەهەر بابایەکی مسوڵمان، یان خاوەن پەیمان (معاهد)، مەگەر لەکاتی لابردنی ناشەرعیی و هەق ئەستاندنەوە بۆ ستەم لێکراوێکدا، بەبێ تێپەڕاندن).

- **وە هەر کام لە (أبو حامد الغزالی) و (ابن قَیم الجوزیة)ش لەبارەی پایەو بنەڕەتەکانی خوو ڕەوشتی بەرزو جوانەوە، گوتوویانە[4]:**

(حُسنُ الخُلُق يقوم على أربعةِ أركان، لا يُتصوَرُ قيامُ ساقِهِ إلا عليها: الصَّبرُ، والعِفَّةُ،

---

(١) دەشگونجێ بەمانای بەخشین بێ بە دڵخۆشییەوە، بڕوانە (المعجم الوسیط) ص ٤٥، ٤٦.

(٢) تەحەممول و خۆڕاگریی و سنگ فراوانیی، لە بەرانبەر نەفامیی نەفامان (جهل الجاهلین)دا.

(٣) بڕوانە: (جامع العلوم والحکم)ص ٢٢٦، ٢٢٧، پێناسەکانی (الحسن) و (ابن المبارك) و (أحمد) یشم هەر لەوێ وەرگرتوون.

(٤) بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ج٣ ص ٥٧-٥٩، وە بڕوانە: (مدارج السالكين)ی إبن القيم، ج٢ ص ٣٠٨-٣١١.

والشجاعة، والعَدلُ)، واتە: وە ڕەوشتی پەسەندو چاك، لەسەر چوار پایە وەستاوە، بەبێ وان ناگونجێ ڕابوەستێ: خۆڕاگریی و، پاكیی و بێ تەماعیی و، ئازایەتیی و، دادگەریی.
بەڵام (غزالی) لە جیاتی (صبر)، (حكمة)ی داناوە.

**پێنجەم:**

**منیش وای تێدەگەم كە پایەو بنەڕەتەكانی خوو ڕەوشتی پەسەند و چاك، ئەم شەشەن:**

١- كاربەجێیی (الحكمة).

٢- خۆڕاگریی (الصبر).

٣- پاكیی و بێتەماعیی (العِفَّة)

٤- ئازایەتیی و بوێریی (الشجاعة والجرأة).

٥- بەخشندەیی و سەخاوەت (الكرم والسخاء).

٦- دادگەریی و هاوسەنگیی (العدل والتوازن).

**بەڵگەشم بۆ سەلماندنی ڕاستیی بۆچوونەكەم، ئەوەیە كەئینسان بەگشتی سێ جۆرە هێز (القوة)ی خواڕسكی پێدراون:**

١- عەقڵ (العقل)، كە شتی پێدەزانێ و دەناسێ و كەشف دەكا.

٢- ئارەزوو (الشهوة)، كە بەرژەوەندییەكانی خۆی پێدەهێنێتە دی و، پێداویستییەكانی جەستەو گیانی پێ دابین دەكات.

٣- تووڕەیی (الغضب)، كە بەرگریی پێ لەخۆی دەكات و زیان و مەترسییەكانی پێ لەخۆی وە دوور دەخات.

ئنجا بێگومان هەر كام لەو سێ هێزە، چ بەباری كورت هێنان و بەزایەدان (التقصير والتفريط)دا لابدەن، چ بەباری زیادەڕۆیی و تێپەڕاندن (المبالغة والإفراط)دا، ئەوە ڕەوشت و ڕەفتاری مرۆڤ تیكدەچێ، با بزانین چۆن؟!

١- جاریٚ لادانی عەقڵ بەباری تێپەڕاندندا، سەر دەكێشێ بۆ جەربەزەیی و فەلسەفەو سەفسەتە كردن و خەڵك فریودان و چەواشەكاریی، وەلادانیشی بەباری بەزایەداندا، دەبێتە مایەی فەقیر حاڵیی و كەودەنیی و گەمژەیی و فێڵ لێكران!

٢- دیسان لادانی هێزی ئارەزوو (القوة الشهوانية)بە باری زیادەڕۆییدا، دەبێتە هۆی ئارەزوو بازیی و بێ بەندو باریی و كەرامەت ڕووشان و ئابڕوو تكان، وەبەباری كەم تەرخەمییشدا، بێهەست و نەستیی و سستیی (خُمول) و پەستیی، لێ پەیدا دەبێ.

٣- هێزی تووڕەیی (القوة الغضبيه)یش كاتێك بەلای زێدەڕۆییدا لادەدات، خاوەنەكەی دووچاری ستەم و زۆر (ظلم) و، لەكاتی كورت هێنانیشدا، تووشی ترسنۆكیی (جبن) و بێ زیپكیی و بێهەڵوێستیی، دەكات.

ئنجا هەرچی هێزی ژیریی (القوة العقلية)یە، بەخەسڵەتی كار بەجێی (حِكمة) دێتە سەر ڕاستەهێڵ و، هێزی تووڕەیی (القوة الغضبيية)یش بە هەردووك خەسڵەتی، خۆڕاگریی و ئازایەتیی و بوێریی (الصبر والشجاعة والجُرأة) ڕێی ڕاست دەگرێتە بەرو، هێزی ئارەزوو (القوة الشهوانية)ش بەهۆی هەردووك خەسڵەتی پاكیی و بێ تەماعیی و، بەخشندەیی و سەخاوەت (العفَّة وقِلّة الطمع والكرم والسخاء)ەوە، لە لادان و ترازان دەپارێزێ.

وە دادگەریی (عدل) یش دەبێتە مایەی: هاوسەنگ بوون و بەتەرازوو ڕاگیرانی سەرجەم هێزەكانی عەقڵ و تووڕەیی و ئارەزوو.

بەڵام بێگومان بەبێ تەسلیم بوون بەشەرع و، ملكەچ بوون بۆ یاساو دەستوورەكانی و، پابەندیی بە ڕێڕوونییەكانیەوە، مەحاڵە ئینسان بتوانێ ئەو سێ هێزە كۆنترۆڵ بكات و، مەودایان نەدات كە بەملاو لای بەزایەدان و تێپەڕاندن (تفريط وإفراط)دا لابدەن و، خاوەنەكەیان دووچاری چەندان جۆرە خەسڵەتی پیس و بەد (رَذائِلْ)ی بكەن و، لە خەسڵەتە بەرزو پەسەندەكان (فضائِل)ی بێ بەش بكەن و، عەیبداری لای خەڵك و، و گوناحباری لای خوا بێت و، ڕوو ڕەشی ئێرەو ئەولاش بێت !

دەتوانین زۆر بەڵگان لەسەر ئەوە بهێنینەوە، کە ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند لە ئیسلامدا شتێکی زۆر گەورەو بایەخدارەو، پێگەیەکی گەورەو گرنگی هەیە، بەڵام بە حەقیقەت ئێمە لە هەموو ئەو باسانەدا نەمانویستوە ئەوەی کە پێویستە بگوترێ، بیڵێین، بەڵکو ئەوەی کە دەگونجێ بیڵێین، دەیخەینە ڕوو، بەڵام هەوڵ دەدەین بە گوشراویی و بە پوختیی بێ، کە سەرجەم یازدە بەڵگەن:

■ بەڵگەی یەکەم ■

## باسی مەدح و ستایشی سیفەتە بەرز و پەسندەکانی خوا

خوا (سبحانه و تعالى) ستایش و مەدحی خۆی کردوە، بە خستنە ڕووی سیفەتە بەرزو پەسەندەکانی، وە ناوە هەرە چاکەکانی، با سەرنج بدەین:

١- خوا (سبحانه و تعالى) لە سوڕەتی (الحَشر) لە ئایەتەکانی (٢٢-٢٤)دا، لەو سێ ئایەتە موبارەکەدا (١٧) لە ناوو سیفەتە بەرزو پەسندو جوانەکانی خۆی دەخاتە ڕووو دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحشر.

وەك گوتمان: ئەو سێ ئایەتە موبارەکە (١٧) لە ناوو سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوای پەروەردگاریان گرتوونە خۆیان، وە خوا (سبحانه و تعالى) خۆی بەو چەند سیفەتە بەرزو پەسندە، پێناسە دەکا:

سیفەتی یەكەم: ( هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ) ئەو خوایەكە، كە جگە لەو هیچ پەرستراو نین.

سیفەتی دووەم: (عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ) زانای پەنهان و ئاشكرایە.

سیفەتی سێیەم و چوارەم: (هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ) ئەو خاوەنی بەزەییە، وە خاوەنی میهرەبانییە.

سیفەتی پێنج و شەش و حەت و هەشت و نۆو دەو یازدەو دوازدە: ( هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُ )، واتە: ئەو خوایەكە، بێجگە لەوی، هیچ پەرستراوێك نیە، (الملك): حوكمڕان و پادشای ڕەهایە، (ٱلۡقُدُّوسُ ) پاك و بێ عەیبە، بێ هەڵەو بێ پەڵەیە، (ٱلسَّلَٰمُ ) سەرچاوەی ئاشتیی و سەلامەتییە، (ٱلۡمُؤۡمِنُ ) دڵنیاكەرە، (ٱلۡمُهَيۡمِنُ ) خاوەن دەستەڵاتە، (ٱلۡعَزِيزُ) زاڵە، (ٱلۡجَبَّارُ ) مل پێكەچكەرە، (ٱلۡمُتَكَبِّرُ ) خۆی پێ گەورەیە، (سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ) پاكیی بۆ خوا لەوەی، كە دەیكەن بە هاوبەشی.

سیفەتی سێزدەو چواردەو پازدە: ( هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ ) ئەو خوایەكی بەدیهێنەری، پەیداكەری، وێنە كێشە، (لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ) ناوە هەرە چاكەكانی هەن، (يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ) هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە بەپاكی دەگرێ.

سیفەتی شازدەو حەڤدە: (وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ) وە خوا زاڵی كاربەجێیە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (الروم) ئایەتی (٢٧)دا دەفەرموێ:

﴿ ... وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾ الروم.

(ٱلۡمَثَلُ ) واتە: سیفەت، یانی: خوا وەسف و سیفەتی هەرە بەرزی هەیە لە ئاسمانەكان و زەویدا، وەخوا زاڵی كاربەجێیە.

ئەوە بەڵگەی یەكەم، چونكە دیارە ڕازانەوە بەو سیفەتە بەرزو جوانانە، شتێكی گەورەیە، بۆیە خوا (سبحانه و تعالى) خۆی بەو سیفەتانە پێناسە دەكا.

■ بەڵگەی دووەم ■

## باسی مەدح و ستایشی سیفەتە بەرز و پەسندەكانی فریشتەكانی خوا

خوا (سبحانه و تعالی) دیسان فریشتەكانی خۆی مەدح دەكا بە سیفەتە بەرزەكانیان، فریشتەكان بەگشتی، بەتایبەتیش جبریل (سەلامی خوای لێبێ)، بۆ وێنە:

١- لە سورەتی (عَبَس) لە ئایەتەكانی: (١١-١٦)دا دەفەرموێ:

﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾﴾ عبس.

واتە: نەخێر وانیە (وەك هاوبەش بۆخوا دانەرەكان دەیڵێن)، بەڵكو ئایەتەكانی ئەم قورئانە بیرخەرەوەن، بۆ هەر كەسێ بیەوێ بیری بكەوێتەوە، (واتە: ئەو ڕاستییانەی بیر بكەوێتەوە كە وەحی خوا هێناونی سەبارەت بە مامەڵە كردن لەگەڵ خوادا، وە مامەڵە كردن لەگەڵ خەڵكی خوادا)، لە چەند لاپەڕەیەكی زۆر ڕێز لێگیراودا، بەرزن و پاكن، (ئایا ئەو پەڕانە بەدەست كێوەن و ئەو وەحییە كێ هێناویەتی؟) بەدەستی چەند نوێنەرێك، {(سَفَرَةٍ) كۆی (سَفیر)ە، واتە: نوێنەر، كە مەبەست پێی فریشتەكانن}، (كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ)، (كِرَامٍ) كۆی (كریم)ە واتە: بەخشندە، بەڕێز، خاوەن حورمەت، (بَرَرَةٍ) كۆی (بَرّ) (بَرّ) و (بارّ) واتە:

چاكەكار، لێرەدا خوای پەروەردگار بە گشتی ستایشی فریشتەكان دەكات، بەو سیفەتە بەرزانەیان.

٢- لە سورەتی (الإنفطار) ئایەتەكانی: (١٠- ١٣)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئێوە چەند پارێزەرێكتان بەسەرەوەن، زۆر بەڕێزن، نوسەرن (واتە: كردەوەكانتان تۆمار دەكەن)، وە ئەوەی كە ئێوە دەیكەن دەیزانن (لە هەمووی ئاگادارن، چ پەیوەندیی بە دڵتانەوە هەبێ، چ بە زمانتان، چ بە ئەندامەكانتان).

٣- لە سوورەتی (التكوير) ئایەتەكانی (١٩-٢١)دا خوای پەروەردگار باسی جبریل دەكات و بەچەند سیفەتێكی بەرزو جوانی وەسفی دەكات، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئەو قورئانە قسەی ڕەوانە كراوێكی بەڕێزە، {كە مەبەستی پێ جبریلە (سەلامی خوای لێبێ)، واتە خوا جبریلی ڕەوانە كردووە ئەو قورئانەی پێدا ناردوە، لێرە خوای زانا بەرپەرچی موشریكەكان دەداتەوە، ئەوان دەیانگوت: شەیتان فێری دەكاو شەیتانەكانن، كە وەسوەسەی بۆ دەكەن، بەڵام خوا بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ: قورئان قسەی ڕەوانە كراوێكی بەڕێزە كە (جبریل)ە} زۆر خاوەن هێزە، لەلای خاوەن عەرش پێگەو پلەیەكی باشی هەیە، (واتە: خوای كارزان ڕێز لە جبریل دەگرێ)، هەروەها لەوێ (واتە: لەلای خوای خاوەن عەرش، یاخود لە ئاسمانەكان) بە قسەی دەكرێ، گوێڕایەڵیی بۆ دەكرێ (و فریشتەكان لەبەر دەستیدان)، وە ئەمینداریشەو خیانەت ناكا.

■ بەڵگەی سێیەم ■

## باسی مەدح و ستایشی سیفەتە بەرزو پەسندەكانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)

خوا (سبحانە و تعالى) ستایشی پێغەمبەران و ڕەوانەكراوانی خۆی (علیهم الصلاة والسلام) بە گشتی و بە تایبەت پێغەمبەری خاتەم (صلى الله علیه وسلم) دەكات و، بە باس كردنی ئاكارو ڕەوشتە بەرزو جوانەكانیان، وەسف و پێناسەیان دەكات.

دەتوانین لەو بارەوە ئاماژە بەزۆر ئایەتان بكەین، كە خوا (سبحانە و تعالى) مەدح و ستایشی پێغەمبەرانی خۆی دەكات، هەڵبەتە پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لێبێ)، بەندە هەڵبژێردراوەكانی خوان، وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ .. ﴿٥٩﴾ ﴾ النمل.

واتە: بڵێ ستایش بۆخواو، سەلامی خوا لەسەر ئەو بەندانەی، كە هەڵیبژاردوون. بەڵێ، پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، گوڵبژێری نێو مرۆڤایەتیین، ئێمە چەند ئایەتێك بە نموونە دەهێنینەوە:

١- خوا (سبحانە و تعالى) لە سوورەتی (الشعراء) ئایەتەكانی: (١٠٦-١٠٧)دا دەربارەی (نوح) سەلامی خوای لێبێ دەفەرموێ:

﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ ﴾.

واتە: كاتێ كە نووحی برایان بە گەلەكەی خۆی گوت: ئایا پارێز لە خوا ناكەن؟ من بۆ ئێوە ڕەوانەكراوێكی ئەمیندارم (واتە: خیانەتتان پێ ناكەم).
یەكێ لە سیفەتە بەرزەكانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، بریتی بووە لە ئەمیندارو دەستپاك بوون.

٢- هەروەها لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٦٨)دا خوای پەروەردگار باسی (هود) دەكا (سەلامی خوای لێبێ)، كە بۆ لای گەلەكەی (عاد) ڕەوانە كراوە، دەفەرموێ:

﴿ .. وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ ﴾.

واتە: وەمن بۆ ئێوە دڵسۆزێكی ئەمیندارم (نَاصِحٌ) واتە: دڵسۆز، بەتەنگەوە بوو، بەپەرۆش.

٣- هەروەها لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٦٢)دا خوای بەرزو مەزن باسی پێغەمبەر (صالح) دەكا، دوای ئەوەی كە دەچێ بۆ لای گەلەكەی خۆی كە گەلی (ثمود)ە، وە ئەوەی خوا پێیدا ناردوە، پێیان ڕادەگەیەنێ، ئەوانیش دەڵێن:

﴿ قَالُوا يَا صَالِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَذَا .. ﴿٦٢﴾ ﴾.

واتە: ئەی صالح! تۆ پێش ئەمە (واتە: پێش ئەوەی باسی پێغەمبەرایەتیی بكەی) لەنێو ئێمەدا جێی ئومێد بووی!

دیارە (جێی ئومێد بوون) كۆمەڵێ سیفەتی باش دەگرێتە خۆی، چونكە خەڵك ئومێدی خێریان بە كەسێك هەیە، كە خاوەنی سیفەتی بەرزو جوان بێ.

٤- هەروەها لە سوورەتی (النمل) ئایەتی (٥٤)دا خوای بێ هاوتا باسی (لوط) دەكا (سەلامی خوای لێبێ)، ئنجا پاش ئەوەی كە پێغەمبەر (لوط) بانگەوازی گەلەكەی خۆی كرد، گەلەكەی بەو شێوەیە وەڵامیان دایەوە:

﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ النمل.

واتە: وە وەڵامی گەلەكەی هەر ئەوە بوو كە گوتیان: دەریان بكەن لە ئاوەدانیی خۆتان، چونكە ئەوان كۆمەڵێكن خۆیان پاك ڕادەگرن.

یانی: (لوط) (سەلامی خوای لێبێ)، وە ئەوانەش كە لەگەڵیدا بوون لە ئیمانداران، چاویان لە ژیانێكی پاك و چاك بووە.

٥- هەروەها خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (هود) لە ئایەتی (٨٤)دا باسی (شُعیب) دەكا، دەفەرمویێ:

﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ .. ﴿٨٤﴾ ﴾ هود.

دوایی لە درێژەی باسەكەدا شوعەیب بەگەلەكەی دەڵێ:

﴿ ...إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ .. ﴿٨٨﴾ ﴾ هود.

واتە: من تەنیا چاكسازییم دەوێ ئەوەندەی بتوانم. كەواتە: پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) هاتوون بۆ چاكسازیی.

٦- هەر لە سوورەتی (هود) لە ئایەتی (٧٥)دا، خوای پاك و تاك باسی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ) دەكا، دەفەرمویێ:

﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ ﴾

واتە: بێگومان ئیبراهیم زۆر هێدیی و مەند بوو، زۆر بەسۆزو بەزەیی بوو، وە لەناخەوە زۆریش دەگەڕایەوە بۆ لای خوا.

وەك دەبینین: خوا بەسێ سیفەتی بەرز وەسفی ئیبراهیم دەكا.

٧- هەروەها لە سوورەتی (مریم) لە ئایەتی (٢٤)دا، خوای زاناو توانا، باسی ئیسماعیل (سەلامی خوای لێبێ) دەكا دەفەرمویێ:

﴿ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا (٥٤) ﴾ مريم.

واتە: لە كتێبدا باسی ئیسماعیل بكە، كە بەڵێنی زۆر ڕاست بوو، وە ڕەوانە كراوو پێغەمبەری خوا بوو.

٨- لە سوورەتی (یوسف) لە ئایەتەكانی: (٢١-٢٢)دا خوای پەروەردگار باسی یوسف دەكا، (سەلامی خوای لێبێ)، دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِن مِّصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَىٰ أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا .. (٢١) ﴾

دوایی دەفەرموێ: ﴿ .. وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٢٢) ﴾ یوسف.

واتە: وە بەو شێوەیە پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە.

كەواتە: یەكی دیكە لە سیفەتە پەسندەكانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، بریتییە لە چاكەكاریی.

٩- لە سوورەتی (الدخان) ئایەتەكانی: (١٧و١٨)دا خوای بەخشەر باسی (موسى) دەكا (سەلامی خوای لێبێ)، دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَاءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ (١٧) أَنْ أَدُّوا إِلَيَّ عِبَادَ اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٨) ﴾.

واتە: لەپێش ئەواندا (واتە: لەپێش ئەو قەومەی، كە پێغەمبەری خاتەمیان (صلی الله علیه وسلم) بۆ ڕەوانە كرا: عەرەبە بت پەرستەكان) گەلی فیرعەونمان تاقی كردەوە، وە پێغەمبەرێكی بەڕێز هات بۆ لایان.

(كَرِيمٌ) واتە: خاوەن ڕێزو حورمەت، كە مووسایە (سەلامی خوای لێبێ)، (پێی گوتن): بەندەكانی خوام لەگەڵ بنێرن {چی دیكە مەیانچەوسێننەوە، وەك لە شوێنی دیكەدا هاتوە، پێیان دەڵێ: ئەشكەنجەیان مەدەن، سۆغرەو بێگاریان مەكەن}.

﴿..إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾﴾ واتە: بێگومان من بۆ ئێوە نێرراوێكی ئەمیندارم.

كەواتە: بەڕێزو حورمەت بوون، خەسڵەتێكی دیكەی بەرزو پەسندی پێغەمبەرانە، (سەلامی خوایان لێبێ).

١٠- وە لە سوورەتی (مَريم) ئایەتەكانی: (١٢-١٤) خوای بێ هاوەڵ باسی پێغەمبەر (يحيى) (سەلامی خوای لێبێ) دەكات و، بەچەند سیفەتێك وەسفی دەكات، دەفەرموێ:

﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾ وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ﴿١٣﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ﴿١٤﴾﴾ .

دوای ئەوەی كە باسی ئەوە دەكا: چۆن زەكەریبا لەخوا دەپاڕێتەوە: كوڕێكی پێ ببەخشێ، لەكاتێكدا خۆی كەوتۆتە نێو تەمەنەوەو خێزانەكەشی نەزۆكە، وەخوای پەروەردگاریش موژدەی كوڕێكی پێ دەداو ناوەكەشی لێدەنێ، وەك دەفەرموێ:

﴿يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ﴿٧﴾﴾مريم.

واتە: ئەی زەكەریبا! ئێمە موژدەی كوڕێكت پێ دەدەین، ناوی یەحیایە، ناوی ئاوامان لەمەوپێش بەكارنەهێناوە، خوای پەروەردگار ناوەكەشی بۆ دیاریی دەكا، ئنجا لە درێژەی ئەوەدا خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ ..﴾ واتە: ئەی یەحیا! كتێب بە توندیی بگرە، بۆ ئەوەی لێت نەكەوێ، واتە: بە جیددیی ئیشی پێ بكە، پاشان دێتە سەر سیفەتەكانی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە:

**سیفەتی یەكەم:** ﴿...وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾﴾ (ٱلۡحُكۡمَ) لێرەدا بەمانای حیكمەت دێ، واتە: جارێ هەر منداڵ و نەباڵغ بوو، كە حیكمەتمان پێی دابوو.

**سیفەتی دووەم:** ﴿وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا .. ﴿١٣﴾﴾ واتە: وە لەلایەن ئێمەوە خاوەن حەنان بوو، (حَنان): واتە: پەرۆش و سۆز، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، كە خوای بەخشەر

زۆر لە سیفەتە باشەکان، خۆی دەیانبەخشێ بە مرۆڤەکان، بۆ کەسێ کە شایستەبێ.

**سیفەتی سێیەم:** ﴿وَزَكَوٰةً﴾ واتە: وە خاوەنی نەفسێکی پاك بوو.

**سیفەتی چوارەم:** ﴿وَكَانَ تَقِيًّا﴾ واتە: وە پارێزكار بوو.

**سیفەتی پێنجەم:** ﴿وَبَرًّا بِوَٰلِدَيْهِ﴾ واتە: وە لەگەڵ دایك و باببیدا زۆر چاك بوو.

**سیفەتی شەشەم:** ﴿وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا﴾ واتە: وە خۆ بەزلگرو سەرپێچییکار نەبوو.

١١- هەروەها هەر لە سوورەتی (مریم) ئایەتەکانی: (٣٠ و ٣١ و ٣٢)دا، خوای پەروەردگار باسی عیسا (سەلامی خوای لێبێ)، دەکا دەفەرمویێ:

﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾﴾.

واتە: (عیسا سەلامی خوای لێبێ) گوتی: من بەندەی خوام، كتێبی پێ داوم و گێڕاومی بە پێغەمبەر، وە منی موبارەك كردوە، (مُبَارَكًا) واتە: بە پیز، پیتدار، بەرهەمدار)، لە هەرجێیەك بم خاوەن بەرەكەتم، وە خوا منی ڕاسپاردوە بە نوێژو بە زەكات، هەتا زیندوو بم و ژیانم لەبەردابێ، وە منی گێڕاوە بە چاكەكار لەگەڵ دایكمدا (چونكە عیسا بابی نەبووە)، وە منی نەگێڕاوە بە كەسێكی خۆ بەزلگری خۆ فەرزكەری خەڵك چەوسێنەری خراپەكاری بێبەش.

■ بەڵگەی چوارەم ■

# باسی مەدح و ستایشی سیفەتە بەرز و پەسندەکانی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)

١- لە سوورەتی (القلم) ئایەتەکانی: (١-٤)دا خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ:

﴿ نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ۝١ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ۝٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ۝٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾.

واتە: نوون (ن) {کە پیتێکە لەو پیتانەی قورئانیان لێ پێک هاتوە}، سوێند بە قەڵەم و بەو دێڕانەی، کە پێی دەنووسن، تۆ (ئەی موحەممەد!) بەهۆی چاکەی پەروەردگاتەوە، شێت نی، {واتە: بەهۆی ئەو نیعمەتی پێغەمبەرایەتییەوە کە خوا بەتۆی داوە، تووشی شێتیی نەبووی، واتایەکی دیکەی ئەوەیە: سوێند بە نیعمەتی پەروەردگارت، تۆ شێت نی}، وە تۆ پاداشتێکی نەبڕاوەت هەیە، {(غَيْرَ مَمْنُونٍ) واتە: غَيرَ مَقطوع}، ئنجا ئایا بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی، کە تۆ شێت نی و پێغەمبەری خوای؟! ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾ واتە: وە بێگومان تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی.

کەواتە: خوای کارزان ڕەوشت بەرزیی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوە، کە پێغەمبەرەو شێت نیە، وە جادووگەرو فاڵچیی

نیه، وەك لە شوێنەکانی دیکە لە قورئاندا پەروەردگار ئەو جۆرە تۆمەت و بوختانانە لە کافرەکانی دەگێڕێتەوە، ئەمەش بەڵگەیەکی یەکجار گەورەو پتەوە لەسەر ئەوە، کە ڕەوشت و ئاکاری پەسندو جوان لە ئیسلامدا، پێگەیەکی یەکجار بەرزی هەیە.

٢- لە سوورەتی (آل عمران) لە ئایەتی (١٥٩)دا خوای میهرەبان دیسان باسی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەکا، دەفەرموێ:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾.

واتە: تۆ بەهۆی بەزەییەك لەخواوە بۆیان (بۆ خەڵکەکە) نەرم بووی، {کەواتە: نەرم و نیانیی یەکێکە لە سیفەتە بەرزو پەسندەکان، کە پێغەمبەری خاتەم پێی ڕازاوەتەوە}، وە ئەگەر تۆ قسە زبرو دڵ ڕەق بوای، لە دەورت دەپرژان، دەجا لێیان ببوورە، وە داوای لێبووردنیشیان بۆ لەخوا بکە، وە لەکارو باریشدا ڕاوێژیان پێ بکە، بەڵام دوای ئەوەی {ئەنجامی ڕاوێژ کردن دەرچوو} بڕیارت دا، پشت بەخوا ببەستەو {بڕیارەکەت جێبەجێ بکە}، چونکە خوا ئەوانەی خۆش دەوێ کە پشتی پێ دەبەستن.

٣- لە سوورەتی (التوبة)ش ئایەتی (١٢٨)دا، خوای بەرز ئاوا باسی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەکا دەفەرموێ:

﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾.

واتە: بێگومان لە خۆتان ڕەوانە کراوێکتان بۆ لا هاتوە، زۆر لەسەر دڵی قورسە هەر شتێك ئێوە ناڕەحەت بکا، زۆر سوورە لەسەرتان (تاکو سوودتان پێ بگەیەنێ)، وە بەرامبەر بە بڕواداران بە پەرۆشی بەبەزەییە.

٤- وە خوای بێ هاوەڵ لە سوورەتی (الأنبياء) ئایەتی (١٠٧)دا، ئاوا باسی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەکا دەفەرمویێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر بەزەیی خوا بی بۆ هەموو جیهانییان.
کەواتە: ڕەحمەت بوونی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ خەڵکی، یەکێکە لە سیفەتە هەرە بەرزەکانی.

٥- وە خوا لە سوورەتی (التوبة) لە ئایەتی (٦٢)دا، ئاوا باسی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکا، دەفەرمویێ:

﴿ وَمِنۡهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٞۚ قُلۡ أُذُنُ خَيۡرٖ لَّكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡۚ .. ﴿٦١﴾ ﴾.

واتە: وە هەیانە {لەمونافیق و دەغەڵ و دڵ نەخۆشەکان} کە ئازاری پێغەمبەری خوا دەدەن، وە دەڵێن: ئەو هەر گوێیە! {پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆر ڕەوشت بەرزو ئاکار پەسند بووە، بێگومان لە لووتکەی ڕەوشتی جواندا بووە، وە یەکێ لە ڕەوشتەکانی ئەوەبووە، کە خەڵکی ڕووشکێن نەکردوە، کەسێ هاتوە درۆی بۆ کردوە، یاخود عوزری بەدرۆی بۆ هێناوەتەوە، یاخود کەسێ هاتوە بەجۆرێ قسەی کردوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زانیویەتی ڕاست ناکا، بەڵام یەکسەر نەیفەرمووە: تۆ درۆ دەکەی، بۆیە کافرەکان پێیان گوتوە: (هُوَ أُذُنٞۚ) واتە: ئەوە هەر گوێ دەگرێ، بەڵێ، گوێ دەگرێ، لەبەر ئەوەی لەخۆی ناوەشێنێتەوە قسەی ناشیرین بە خەڵك بڵێ، لەخۆی ناوەشێنێتەوە خەڵك ڕووشکێن بکا، بۆیە کافرەکان گومانی خراپیان پێ بردوە}، ئنجا خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: ﴿ ..قُلۡ أُذُنُ خَيۡرٖ لَّكُمۡ.. ﴿٦١﴾ ﴾ واتە: بڵێ: ئەو، گوێی چاکەیە بۆ ئێوە. {یانی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەتانناسێ، بەڵام هەرگیز لەخۆی ناوەشێنێتەوە هەر کەسێ درۆی بۆ بکا، پێی بڵێ: درۆت کردو قسەی ناڕاستت کرد، ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

ئەوە هەڵناگری}، ﴿..يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ..﴿٦١﴾﴾ واتە: بڕوای بەخوا هەیە وە ئیماندارانیش بەڕاست دەزانێ، وە ڕەحمەت و بەزەییە بۆ ئەوانەتان، کە ئەهلی ئیمانن.

بەڵام ئەوانەی کە مونافیق و دەغەڵ و دڵ نەخۆشن با خەیاڵی وا نەکەن، کە پێغەمبەریان هەڵخەڵەتاندوە! بەڵکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەهۆی ڕەوشت بەرزیی خۆیەوە، خۆی بەسەرەوە نەبردوە[1] وەك زانایان گوتوویانە: (الإغضاءُ عَمّا كانَ يَكْرَه) واتە: چاوپۆشیی و چاو نووقاندنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە شتێك، کە پێی ناخۆش بووە، قسەیەك کرابێ ڕەفتارێك نوێنرابێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە پێویستی نەزانیبێ ڕاستی بکاتەوە، چاو پۆشیی لێکردوە، ئەوە لەبەر ڕەوشتی بەرزو جوانی خۆی بووە، نەك لەبەر بێئاگایی، یان ناهۆشیاریی، یان لەبەر ئەوەی، کە خەڵك توانیبێتی، فێڵی لێ بکا!



---

(١) بەسەر خۆی نەهێناوە.

■ بەڵگەی پێنجەم ■

# باسی مەدح و ستایشی چەند سیفەتێکی بەرزو پەسندی هاوەڵانی بەڕێز خـوا لێیــان ڕازی بـێ

١- خوای بێ وێنە لە سوورەتی (الفتح) ئایەتی (٢٩)دا، دەفەرمویٚ:

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ...﴿٢٩﴾ ﴾ .

واتە: موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وە ئەوانەی لەگەڵیدان، لەسەر کافران {ئەو کافرانەی کە شەڕ بە مسوڵمانان دەفرۆشن} توندو تیژن، لەنێو خۆیاندا بە ڕەحم و بەزەیین، هەمیشە دەیانبینی ڕکووع دەبەن و سەجدە دەبەن، {واتە: نوێژکەری زۆر چاکن} وە بەخششی خواو ڕەزامەندیی خوا داوا دەکەن، نیشانەیان بەدەم و چاویانەوە دیارە، بەهۆی کڕنووش بردنەوە[1].

---

(١) هەندیٚ پێیان وایە مەبەست ئەوەیە، کە دەبیٚ مرۆڤ سەر لەسەجدە زۆر ڕۆبگریٚ، تاکو نیشانەی بەنێوچەوانەوە بەدیار دەکەویٚ، بەڵام خوا نەیفەرمووە: (سِيماهُم في جِباهِهِم) نیشانەیان بە نێوچەوانیانەوەیە!، بەڵکو دەفەرمویٚ: (سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم) کە مەبەست پێی ئەوەیە، کە ئەگەر ئینسان نوێژکەری باش بوو، خوا پەرست بوو، صالح بوو، حاڵەتێکی شەفافیەت و دەم و چاو ڕوونیی تێدا دەردەکەویٚ و، ئەو ئیمان و نوورەی، کە لە دڵدا جێگیر دەبیٚ، لەسەر دەم و چاویش عەکس دەبێتەوە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (الحشر) لە ئایەتەکانی (٨ و ٩)دا، خوای پەروەردگار بەهەمان شێوە مەدحی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکاو، بەچەند سیفەتێکی بەرزو پەسەند ستایشیان دەکاو دەفەرموێ:

﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾.

خوای پەروەردگار لەو دوو ئایەتەدا لە ئایەتی (٨)دا باسی کۆچکەران و، لە ئایەتی (٩)شدا باسی پشتیوانان دەکاو، بەچەندین سیفەت و ڕەوشتی بەرزو جوان وەسفیان دەکا، کە ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوە، کە ڕەوشتی بەرزو پەسندو ئاکاری جوان پێگەیەکی گەورەو گرنگی هەیە لە ئیسلامدا، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەگشتی لە دوای پێغەمبەران لە هەموو کەس باشترو پلە بەرزترن، بەبەڵگەی ئەوە کە ئەو سیفەتانەی خوای کارزان ئەوانی پێ وەسف کردوون، پاش پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) هیچ کەسی بەو وەسفانە پێناسە نەکردوە، با سەرنج بدەین:

بۆ هەژارانی کۆچکەر، ئەوانەی لە خانووبەرەو ماڵ و سامانیان وەدەرنراون، بەخشش و ڕەزامەندی خوا دەخوازن، وەخواو پێغەمبەرەکەی سەردەخەن، ئائەوانەن ڕاستان.

وە ئەوانەی پێش ئەوان (کۆچکەران) لە مەنزڵگای ئیماندا نیشتەجێ بوون، (یانی پشتیوانان) ئەوانەیان خۆش دەوێ، کە کۆچیان بۆ لا دەکەن، وە بەرانبەر بەوەی، کە پێیان دراوە (لەدەستکەوت وەك هاوکاریی) لە سینەیاندا هەست بەپێویستیی ناکەن (چاوی تێنابڕن) وە هەرچەندە خۆشیان زۆر ئاتاج بن، ئەوان

بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن (كە هاوكاریی بكرێن) وە هەركەس لە چرووكیی دەروونیی خۆی بپارێزرێ، ئا ئەوانەن سەرفرازان.

٣- خوای بەبەزەیی بەكەسی نەفەرمووە: لێیان ڕازیم و ڕازیشیان دەكەم، مەگەر بە هاوەڵان وەك دەفەرموێ:

﴿...رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ .. ﴿١٠٠﴾﴾ التوبة.

واتە: خواش لەوان ڕازییە، ئەوانیش لەخوا ڕازیین، دیارە هاوەڵانی بەڕێزو هەركەسێكیش كە بەڕێگای ئەواندا هەنگاو دەنێ، وە بەر ئەو موژدەیەی خوای بەبەزەیی دەكەوێ، چونكە خوای زانا دەفەرموێ:

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ .. ﴿١٠٠﴾﴾ التوبة.

واتە: پێشكەوتووە یەكەمەكان لە كۆچكەران و لە پشتیوانان، وە ئەوانەی بەباشیی شوێن ئەوان كەوتوون، {دیارە ئەوانەی بەباشیی شوێنی ئەوان كەوتوون، تا كۆتایی دنیا دەیگرێتەوە} خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لەخوا ڕازیین.

■ بەڵگەی شەشەم ■

## خوای پەروەردگار بەندە چاکەکانی خۆی
## بە ڕەوشتە جوان و پەسندەکان پێناسە دەکا

خوای بەرزو مەزن، بەندە هەڵبژێرراوو چاکەکانی خۆی، کە بەناوی خۆیەوە ناوی ناون، یاخود بە پارێزکار وەسفی کردوون، بە ڕەوشتە جوانەکان پێناسەیان دەکا، بۆ وێنە:

١- لەئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی (الفرقان)دا، لە ئایەتی (٦٣)وە تا کۆتایی، خوای زانا بەمجۆرە پێناسەی ئەو بەندانەی دەکات، کە بە (عِبادُ الرَّحمن) وەسفی کردوون:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ ﴾.

واتە: بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی، ئەوانەن کە بەئارامیی بەزەویدا دەڕۆن، وە کاتێك خەڵکی نەفام قسەیان لەگەڵ بکا، ئەوان قسەی سەلامەتیان لەگەڵ

دەکەن، (یاخود خوا حافیزییان لیٚ دەکەن)، وە ئەوانەی کە بەشەوگاری درێژ لە خزمەت خوادا دەمێننەوە بە سەجدە بردوویی، وە بە قورئان خوێندن و بەپاوەستاویی.. تا کۆتایی ئایەتەکان، کە خوای پەروەردگار شازدە سیفەتی لە بەندە چاکەکانی خۆی باس دەکا، ئنجا کە خوای بیٚ وێنە دەفەرمویٚ: ( وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ ) بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی، ئەو کەسانەن، کە ئاوا دەکەن و ئاوا دەکەن، کەواتە: دیارە خوا (سبحانه و تعالى) مەدحی ئەو کەسانە دەکات، کە پاڵیان دەداتە لای خۆی، وە دیارە بەهۆی ئەو سیفەت و ئاکارە بەرزو پەسندانەشیانەوەیە، کە خۆشیدەوێن و پەسندیان دەکات.

٢- هەروەها لە سوورەتی (آل عمران) لە ئایەتەکانی: (٣٣ و ٣٤)دا خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ:

﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ ﴾.

واتە: وە خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە، وەبەهەشتێك کە پانایییەکەی بەقەدەر ئاسمانەکان و زەوییە، بۆ پارێزکاران ئامادە کراوە، (ئنجا ئایا ئەو پارێزکارانە کێن؟):

یەك: ( ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ): ئەوانەی کە ماڵی خۆیان دەبەخشن لەکاتی خۆشیی و ناخۆشییدا، لەکاتی فەرحانیی و لەکاتی گرانییدا، لەکاتی دەوڵەمەندیی و لەکاتی نەدارییدا، لە کەمی کەم و لە زۆری زۆر، دەبەخشن.

دوو: (وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ ): ئەوانەی کە ڕقی زۆری خۆیان کپ دەکەنەوە (قووت دەدەنەوە).

سیٚ: (وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ ) ئەوانەی کە لە خەڵك دەبوورن و چاوپۆشیی لە خەڵکی دەکەن.

چــوار: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ وە خوا چاکەکارانی خۆش دەوێن.

کەواتە: ئەوانەی خۆیان بەو سیفەت و ئاکارە بەرزو پەسندانە بڕازێننەوە، شایستەی لێبوردن و بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی خوان.

ئەوەش سەلمێنەری گەورەیی و گرنگیی ڕازانەوەی مرۆڤە بەڕەوشت و ئاکاری بەرزو جوان و، بژار کرانی لە خوو خدەو ڕەفتاری خراپ و دزێو.

■ بەڵگەی حەوتەم ■

## چەند فەرموودەیەکی
## پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە بۆخۆی لە لووتکەی ڕەوشتی بەرزو جواندا بووە، وە خوای پەروەردگار ڕەوشتی بەرزو جوانی موحەممەدی (صلى الله عليه وسلم) کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەوە، کە پێغەمبەری خوایەو، وەك نەیارو ناحەزەکانی گوتوویانە: جادووگەرو شێت و کاهین نیە، با بزانین ئەو پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت بەرزە، چۆن باسی ڕەوشت و ئاکاری جوان و پەسند دەکا؟!:

**١- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ:**

{إِنَّ الْمُؤمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ الخُلُقِ دَرَجة القائِمِ الصَّائِمِ} أخرجه أبو داود برقم: (٤٧٩٨)، وابن حبان برقم: (٤٨٠)، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم: (٢٤٦٣٩)، قال الألباني: صحيح.

واتە: بێگومان بڕوادار بە ڕەوشتی جوانی، دەگاتە پلەی کەسێك کە هەمیشە بەڕۆژوویە، وە هەمیشە شەویش شەونوێژ دەکا.

واتە: کەسێك کە هەمیشە ڕۆژانە بەڕۆژوویە (ڕۆژووی سوننەت)، وە شەوانەش شەونوێژ دەکا، بابای ڕەوشت جوان دەگاتە پلەی وی، واتە: با ڕۆژووی سوننەت و شەونوێژیشی نەبێ، مادام ڕەوشتی جوان بوو، دەگاتە پلەی ئەو کەسە لە پاداشتدا.

**٢- هەروەها دەفەرموێ:**

{أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا} أخرجه أبو داود برقم: (٤٦٨٢)، وأحمد برقم: (٧٣٩٦)، والدارمي برقم (٢٧٩٢)، وابن حبان برقم (٤٧٩)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٧٩٧٦)، والحاكم برقم (١)، وأخرجه أيضا: إبن أبي شيبة برقم (٢٥٣٢١)، والبيهقي برقم (٢٠٥٧٢).

واتە: ئیمان تەواوترینی بڕواداران، ڕەوشت جوانترینیانە.

یانی: کێ ڕەوشتی جوانتر بێ، مانای وایە ئیمانیشی تێرو تەواوترە.

بەڵێ، لە ڕاستییدا ئیمانی تێرو تەواو، وەك دوایی باسی دەکەین، دەبێتە هۆی ئەوە، کە مرۆڤ عیبادەت و تاعەتی باشی بۆ خوا هەبێ، وە هەر کەسێکیش عیبادەت و تاعەتی باشی بۆخوا هەبوو، ئاکارو ڕەوشتیشی جوان دەبێ لەگەڵ خەڵکی خوادا.

**٣- هەروەها دەفەرموێ:**

{مَا مِنْ شَيْءٍ يُوضَعُ فِي الْمِيزَانِ، أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ}، أخرجه الترمذي برقم (٢٠٠٣) وقال : غريب، قال الألباني: صحيح.

واتە: هیچ شتێك لە ڕۆژی قیامەتدا، کە لە تەرازوودا دادەنرێ، لە ڕەوشتی جوان قورستر نیە.

**٤- هەروەها دەفەرموێ:**

{إِنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحَاسِنَكُمْ أَخْلَاقًا} أخرجه الترمذي برقم (٢٠١٨) وقال: حسن غريب، قال الألباني: صحيح.

واتە: لەوانەتان کە لەهەموو کەس لەلام خۆشەویستترن، وە لە ڕۆژی قیامەتدا، شوێنی دانیشتنیان لەمن نزیکترە، ئەوانەن کە ڕەوشتیان جوانترەو ئاکاریان پەسندترە.

**٥- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك كەسێك هات بۆلای بەناوی (أشَجِّ عبدالقَيس)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو:**

{إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالْأَنَاةُ} أخرجه مسلم برقم (١٨)، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (١١١٩١)، والبيهقي برقم (٢٠٥٩١).

واتە: بێگومان تۆ دوو سیفەت (ڕەوشت)ت تێدان، كە خوا خۆشی دەوێن، ئەوانیش بریتین لە: ئارامیی و لەسەرەخۆیی.

(حِلم) پێچەوانەی ئەوەیە ئینسان زوو تووڕە بێ، (أناة)یش پێچەوانەی پەلە كردنە.

**٦- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ:**

{إِنَّ مِنْ خِيَارِكُمْ أَحْسَنَكُمْ أَخْلَاقًا} أخرجه البخاري برقم (٣٥٥٩)، ومسلم برقم (٢٣٢١).

واتە: بێگومان لە چاكترینتان، ئەوانەن كە ڕەوشتیان جوانترە.

**چ مسوڵمانێك لەنێو مسوڵماناندا باشترە؟**

بێگومان ئەوانەیان كە ڕەوشتیان جوانترە، ئاكاریان بەرزو پەسندترە، بەڵام وەك دوایی باسی دەكەین: ئاكاری بەرزو پەسەند بەس ئەوە نیە لەگەڵ خەڵكدا ڕەوشتت جوان بێ! بەڵێ، مرۆڤ لەگەڵ خەڵكدا بەتەئكید دەبێ ڕەوشتی بەرزو جوان بێ، بەڵام بێگومان لەگەڵ خوای پەروەردگاریشدا دەبێ بە كۆمەڵێك سیفەت خۆی بڕازێنێتەوە، وە لەخودی خۆشیدا دەبێ كۆمەڵێك سیفەتی بەرز لە خۆیدا بهێنێتە دی، ئنجا دەتوانێ لەگەڵ خەڵك ڕەوشت و ئاكاری بەرزو جوان بێ، بەڵكو وەك پێشتر باسمان كرد، ڕەوشت جوانیی لەگەڵ خەڵكدا، بەرهەمی بەندایەتیی باشە بۆ خوا (سبحانه و تعالى).

٧- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ} أخرجه أحمد برقم (١٧٦٦٨)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٢٩٥)، ومسلم برقم (٢٥٥٣)، والترمذي برقم (٢٣٨٩) وقال: حسن صحيح، وأخرجه أيضًا: الحاكم برقم (٢١٧٢) وقال: صحيح الإسناد.

واتە: چاکەکاریی (یاخود دینداریی باش) بریتیە لە ڕەوشتی جوان، وە گوناهیش شتێکە لەدڵدا بێت و بچێ (واتە: لە حاڵەتی دڵە ڕاوکە دابی)، وە پێشت ناخۆش بی خەڵك پێی بزانێ.

کەواتە: هەر شتێك پێی نائاسوودە بووی و پێت ناخۆش بوو خەڵك بیزانێ، ئەوە دیارە کە گوناحە.

■ بەڵگەی هەشتەم ■

## ڕەوشت جوانیی دروشم و نیشانەی پارێزكاران (متقین) و چاكەكاران (محسنین)ە

خوای خاوەن ناوو سیفەتی هەرە چاك و پەسند فەرموویەتی:

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤﴾ آل عمران.

واتە: وە خێرایی بكەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە، ڕووەو بەهەشتێك، كە پانایيەكەی هێندەی ئاسمانەكان و زەوییە، بۆ پارێزكاران ئامادەكراوە، كەسانێك كە لە كاتی خۆشیی و سەغڵەتییدا دەبەخشن، وە ڕق و تووڕەیی خۆ كپكەرەوان و، چاوپۆشیی لە خەڵكی كاران، وە خوا چاكەكارانی خۆشدەوێت.

■ بەڵگەی نۆیەم ■

## ڕەوشتی جوان و مەزنی پێغەمبەری خوا، بەڵگە و ئیسپاتی ڕاستییەتی

وەك پێشتریش باسمان كرد:

خوای پەروەردگار كە لە سیاقی بەرپەرچ دانەوەی گومان و تۆمەتەكانی كافرو هاوبەش دانەرەكاندا فەرموویەتی:

﴿نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾ القلم.

ئنجا ئەمە وەك پێشتریش باسمان كردوە، ئەوە دەگەیەنێ، كە خوای زانا خووو ڕەوشتی بەرزو جوان و ئاكارو ڕەفتاری ڕەندو پەسندی پێغەمبەری نەخوێندەواری خۆی، كردۆتە بەڵگەو شایەدی ڕاستێتیی وی، وە بەدرۆ خستنەوەی گومان و تۆمەت و پڕوپاگەندەی كافرە دڵڕەش و ناحەزەكانی!

ئنجا بێگومان (محمد المصطفى) سەڵات و سەلام و بەرەكاتی خوای لەسەر بێ، هەموو سیفەت و خەسڵەت و حاڵەتەكانی، لەوپەڕی بەرزیی و تەواوییدا بوون و، نە هیچ كەس عەقڵ و تێگەیشتنی وی و، نەزانست و زانیاری ئەوو، نەخواپەرستیی و پارێزكاریی و، نە...، هندی ئەوی نەبووە، كە خوای دادگەرو كاربەجێش خووو ڕەوشتی بەرزو پەسندو گەورەی ئەو زاتەی كردۆتە بەڵگەو شایەدی پێغەمبەرایەتییەكەی، مانای وایە هیچ شتێك ئەوەندەی خووو ڕەوشتی بەرزو جوان، نابێتە سەنگی مەحەك و تەرازووی هەڵسەنگاندنی كەسایەتیی ئینسان!

## بەڵگەی دەیەم

# ڕەوشت جوانیی مایەی نیزیکیی و خۆشویسترانه له لایەن خواو پێغەمبەرەوەو، نیشانەی چاکیی ئینسان و کامڵ بوونی ئیمانیشیەتی

ئەمەش چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا لەو بارەیەوە:

١- {أَحَبُّ عِبَادِ اللهِ إلى اللهِ، أَحْسَنُهُمْ خُلُقَاً} أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ برقم: (٤٧١)، قال المنذري: رواته محتج بهم في الصحيح، وقال الهيثمي (٢٤/٨): رجاله رجال الصحيح، وَأَخْرَجَهُ أَيْضَاً إِبْنُ حِبَّان برقم: (٤٨٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (٨٢١٤)، وَسَكَتَ عَنْهُ الذَّهَبِي.

واته: خۆشەویستترین بەندەکانی خوا لە لای خوا، ڕەوشت چاکترینیانن.

٢-{أَفْضَلُ الْمُؤْمِنِينَ أَحْسَنُهُمْ خُلُقَاً} أَخْرَجَهُ أَبِي يَعْلَى برقم: (٥٩٢٦)، وَغَيْرُهُ، قَالَ حُسين سليم أسد: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

واته: چاکترینی بڕواداران، خووخدە جوانترینیانن.

٣-{أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٨٢)، وَأَحْمَد برقم: (٧٣٩٦)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧٩٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٩)، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (٧٩٧٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (١)، وَغَيْرُهُمْ وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني.

واته: ئیمان تەواوترینی بڕواداران، ڕەوشت جوانترینیانن.

٤- {إِنَّ خِيَارَكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقًا} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٨١٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٦٨٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٢١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٧٥) وَغَيْرُهُمْ.

واتە: چاكترینتان، ڕەوشت باشترینتانن.

٥- {إِنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ، أَحْسَنُكُمْ أَخْلَاقًا} أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٥٤٩).

واتە: لەنێو ئەوانەتاندا كە لە هەموو كەس لەلام خۆشەویست ترن، ئەوانەتانن كە ڕەوشتیان جوانترە.

٦- {خَيْرُكُمْ إِسْلَامًا، أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقًا إِذَا فَقِهُوا} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٨١٨)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

واتە: ئەوانەتان كە ڕەوشتیان چاكترە، ئیسلامەتییەكەیان لە هەمووتان باشترە، بەمەرجێك شارەزاو تێگەیشتووبن.

٧- {إِنَّ أَحَبَّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبَكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقًا} أَخْرَجَهُ البُخَارِي في الأدب المفرد برقم: (٢٧٢)، وَأَحْمَد برقم: (٦٧٣٥) وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي.

واتە: لەوانەتاندا كە لە هەموو كەس خۆشترم دەوێن و، ڕۆژی قیامەتێ شوێنیان لێمەوە نزیكترە: ئەوانەتانن كە ڕەوشت و خوویان جوانترو پەسندترە.

بەڵگەی یازدەم

## ڕەوشت و خووی بەرز و پەسند، هاوتای تەقوایەو چاکترین هۆکاری چوونە بەهەشتە

لەو بارەشەوە پێغەمبەری ڕەوشت بەرزو مەزن زۆرشتی فەرمووە، بۆ وێنە:

١- {مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي مِيزانِ المؤمِنِ يَوْمَ الْقِيامَةِ، مِنْ خُلُقٍ حَسَنٍ} أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٠٢) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح.

واتە: لە ڕۆژی قیامەتیٚ لە تەرازووی بڕواداردا، هیچ شتێك لە خووو ڕەوشتی جوان قورستر نیە.

٢- {إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٩٨)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٨٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: بێگومان بڕوادار بە ڕەوشتی جوان و پەسندی، دەگاتە پلەی شەوو نوێژکەری ڕۆژووگری بەردەوام.

٣- کاتێك پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا: چ شتێك لە هەموو شتان زیاتر دەبێتە هۆکاری چوونە بەهەشتیٚ؟! فەرمووی:

{تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٦٩٤)، وَالبُخَارِي في الأدب المفرد برقم:

(٢٩٤)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٢٠٠٤) وَقَالَ: صَحِيح غَرِيب، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٩١٩) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٦).

واتە پارێزکاریی خواوو ڕەوشتی بەرزو جوان.

٤-{مَنْ كَانَ سَهْلاً هَيْنَاً لَيناً حَرَمَهُ الله عَلَى النَّار} أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٤٣٥) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم وَصَحَّحَه الأَلبَاني.

واتە هەرکەسێ ڕەوشت و ئاکاری ئاسان و، هێدیی و مەندو، نەرم و نیان بێ، خوا لە ئاگری دۆزەخێ قەدەغەی دەکات.

**وە لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێم:**

بێگومان خوای کاربەجێ و پێغەمبەری داناو زانای، بەبێ هودە و بێ حیکمەت نیە کە ئەوهەموو گرنگیی و بایەخەیان بەڕەوشت و ئاکاری بەرزو جوان داوەو، بەسەنگی مەحەکی دینداریی و مسوڵمانەتیی و، هۆکاری سەرەکیی لەلای خواو پێغەمبەر، بەڕێزو خۆشەویست بوون و، چوونە نێو بەهەشت و، بە گرنترین چاکەی نێو تەرازووی خێرو چاکەکانی ئینسانی مسوڵمانیان داناوە!

کەواتـە:

با ئێمەش زۆر وریاو هۆشیار بین و، لە قسەو وتارو گفت و لفت و هەڵسوکەوت و سەرجەم جم و جۆڵ و چالاکیەکانمان دا، هەمیشە ئاگادارو بێدار بین و، پێمان وا نەبێ، کەتەنیا نوێژو ڕۆژووو باقی خواپەرستییە تایبەتییەکان، کاری مسوڵمانییەتییمان تەواو دەبێ و، مەداریی دنیاداریی‌مان ساز دەبێت!

هەروەها با دڵنیا بین، کە گەلێك کەس دەتوانێ بە ڕاست، یان بە درۆو ڕیا، نوێژ بکات و ڕۆژوو بگرێ و، بەر سمێڵ بکات و، ڕدێنی پان و درێژ بکات و، بگرە چەکیش لەشانی بکات، بەشداریی جەنگ و جیهادیش بکات و، بەو شتانە ئیخفاڵمان بکات و چەواشەمان بکات! بەڵام قەناعەت بکەن و بە تەجرەبەو تاقی کردنەوەی درێژخایەن بۆم دەرکەوتوە، مەگەر چۆن، دەنا هیچ کەس ناتوانێ

هەتا سەر خاوەنی خووو ڕەوشت و ئەدەب و ئاکاری بەرزو پەسند بێت، بێجگە لە ئینسانی دین دامەزراوو ئیمان تەواوو، بەڕەشەبای شوبهەو شەهوەت نە لەخشاو!

بۆیە پێم وایە ئەگەر بێت و پاش ئیمان و ئیسلامیەتیی و خواپەرستییە تایبەتیی و درووشمییەکان، خوو ڕەوشت و ئەدەب و ئاکاری پەسندو جوان بکەینە سەنگی مەحەك و تەرازووو پێوەری مسوڵمانیەتیی خۆمان و خەڵکی، کەمتر دووچاری هەڵەو پەڵەو هەڵخەڵەتان دەبین.

دیارە ئاكارو ڕەوشتی پەسندو جوان، مایەی خێرو خۆشیی و هێزو پێزو بەختەوەریی و سەرفرازیی و بە مرادو ئامانج گەیشتنی ئینسانە، لەدنیاو دواڕۆژداو، وەك لەبەشی دووەم دا بینیمان، بابای ڕەوشت بەرزو ئاكار جوان و بەئەدەب، خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەكەی (صلی الله علیه وسلم) و، سەربەرزو بەختەوەری دنیاو دواڕۆژە.

ئنجا ئێمە بۆ چاكتر ڕۆشن بوونەوەی مەبەست، {ئەنجام و بەرهەمی ڕەوشت و ئاكاری پەسند} لەچەند خاڵێكی كورتدا دەیخەینە ڕوو:



■ بەرهەمی یەکەم ■

## ئەدەب و ڕەوشتی بەرز و جوان، بەڵگە و نیشانەی ئیمانی تەواوە

لەبەشی دووەمدا چەند فەرموودەیەکمان لەوبارەیەوە هێنانەوەو، ئەمەش فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەری خوایە لەو بارەوە:

{أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا، وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٨٢)، وَأَحْمَد برقم: (٧٣٩٦)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧٩٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٩)، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (٧٩٧٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (١)، وَغَيْرُهُمْ وَصَحَّحَهُ الأَلْبَاني.

واتە: ئیمان تەواو ترینی بڕواداران، ڕەوشت چاکترینیانن، وە چاکترینتان چاکترینتانن بۆ ژنەکانیان.

کەواتە:

ڕەوشت و خووی پەسندو ئاکارو ئەدەبی بەرز، هەم هۆکارو فاکتەری کامڵ بوونی ئیمان و، هەم بەڵگەو نیشانەی تێرو تەواوییشە، چونکە بێگومان وەك چۆن خواپەرستیی لە سەرچاوەی ئیمان و عەقیدەوە هەڵدەقوڵێ، دەشبێتە مایەی بەهێزو پێز بوون و پتەو بوونیشی، وەك چۆن نەوت و دارو تەختە، بەهۆی بڵێسەی ئاگرەوە گڕدەگرن، بەڵام دوایش دەبنە هۆی ئایسانی[1] ئاگرەکەو

---

(١) ئایسان: داگیرسان، هەڵکردن، پێکردن، هەڵگیرسان.

بەردەوامبوونی و کلّپەو بلّێسە بەرزبوونەوەی!

ئنجا خوو ورەوشتی بەرزو پەسندیش، هەم ئەگەر چەمك و واتای ڕاستەقینەو فراوانی خواپەرستیی (عبادة) بگرین، بەشێکە لە خواپەرستیی[1] و، وە هەم ئەگەر چەمك و واتای خووو ڕەوشتیش بەتایبەت وەربگرین، ئەدەب و ڕەوشتی بەرز، هاوتاو بارتەقای چاکترین جۆری خوا پەرستییە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٩٨)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٨٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني.

هەڵبەتە هیچ بەرهەمێکیش لەوە چاکتر نابێ، کە لە سۆنگەی خوو ڕەوشتی بەرزو پەسندەوە، ئینسان ئیمانی کامڵ بێت و، بەڵگەو نیشانەی ئەو ئیمان کامڵ بوونەشی دەستگیر ببێ.



---

(١) بۆ چاك تێگەیشتن لە چەمك و واتای ڕاستەقینە و فراوان و، تەسك و عورفیی، وشەی خواپەرستیی، واباشە سەرنجی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستیی ئیسلامیی) بدرێ، هەروەها سەرنجی بەرگی دووەم و شەشەمی: {الإسلام: كما يتجلّى في كتاب الله} بدرێ.

■ بەرهەمی دووەم ■

## وە دەستهێنانی ئامانج و مەبەستی نێررانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

{إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلاَقِ} أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي برقم: (٢٠٥٧١) وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: تەنیا بۆ ئەوە ڕەوانەکراوم، کە ڕەوشتە چاکەکان تەواو بکەم.

ئنجا مادام وابێ، دیارە هەر کەسێ بتوانێ ڕەوشت و ئەدەب و ئاکارە بەرزو شیرین و پەسەندەکان لە خۆیدا بهێنێتەدی، ئەوە مانای وایە ئامانج و مەبەستی هاتن و ڕەوانەکرانی پێغەمبەری کۆتایی (النبي الخاتم)ی هێناوەتەدی!

بەڵام پێویستە بزانرێ، کە تەنیا پێغەمبەری کۆتایی ژمارەی پێوانەیی (الرقم القياسي)ی ئەدەب و ڕەوشتە بەرزو جوانەکانی شکاندوە، هیچ کەس نەگەیشتوە ناگاتە ئەو ئاستە بەرزەی وی، بەڵام دەبێ هەوڵ بدرێ، هەرچی زیاتر خۆ لەو ئاستە بڵندەی وە نزیك بخرێ!

دیارە هەربۆیەشە، کە پێغەمبەری نەخوێندەوار (النبي الأمي) موژدەی پێداوین و هانی داوین، کە بە ئەندازەی ڕەوشت و خووی بەرزو شیرینمان، لە دوارۆژدا لێی نزیك دەکەوینەوە لەلای خۆشەویست دەبین:

{إِنَّ أَحَبَّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبَكُمْ مِنِّي مَجْلِساً يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَحَاسِنُكُمْ أَخْلاَقًا} أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ في الأدب المفرد برقم: (٢٧٢)، وَأَحْمَد برقم: (٦٧٣٥) وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي.

**بەڵێ خوێنەری خۆشەویستم!**

لەدنیادا چەندە لە پێغەمبەری خواوە نزیك بی و چەندەی لەخزمەت دابی، لە قیامەت و لەڕۆژی دواییشدا هێندەی لێ نزیك دەبی، چونکە خۆی ئەو موژدەیەی بە هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی داوەو فەرموویەتی:

{الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٠٣٢)، والبُخَارِيُّ برقم: (٥٨١٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٣٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١٢٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٨٥) وَغَيْرهُم.

واتە: ئینسان لەگەڵ ئەو کەسە دایە لە دواڕۆژدا، کە لە (دنیادا) خۆشیویستوە! ئاشکراشە، کە لاف لێدانی خۆشەویستنی پێغەمبەری خواش، بەبێ شوێن پێ هەڵگرتنی و کردنی بە سەرمەشق (أُسوَةٌ)، دەعوایەکی نەسەلمێنراوو بێبەڵگەو شایەدە، وەك خوای زانا فەرموویەتی:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾، آل عمران.

**هەروەها شاعیریش گوتوویەتی:**

تَعْصِي الإِلَهَ وَأَنْتَ تُظْهِرُ حُبَّهُ     هَذَا لَعَمْرِي فِي الْقِيَاسِ بَدِيعُ
لَوْ كَانَ حُبُّكَ صَادِقًا لأَطَعْتَهُ     إِنَّ الْمُحِبَّ لِمَنْ يُحِبُّ مُطِيعُ

■ بەرهەمی سێیەم ■

## هەمیشە لە خواپەرستیی و طاعەت دابوون و، قورس بوونی تا تەرازووی خێرو چاكە

لە باسی دووەمدا چەند فەرمایشتێكمان هێنانەوە، كە پێغەمبەری خوا ڕەوشت و ئاكاری بەرزو پەسندی بەقورسترین تاعەت و خێرو چاكەی نێو تەرازووی بڕوادار لەقەڵەم داوە، ئەمەش فەرموودەیەكی دیكەیە لەو بارەوە:

{مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي مِيزانِ المؤمِنِ يَوْمَ الْقِيامَةِ مِنْ خُلُقٍ حَسَنٍ} أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٠٢) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح.

هەروەها پێغەمبەری خوا هەواڵی داوە، كە بابای ڕەوشت و خوو بەرزو جوان، خێرو پاداشتی: بابای خوا پەرستی هەمیشە شەو نوێژكەری بەردەوام ڕۆژووی سوننەت گری، هەیە، جا لە سۆنگەی ئەوەوە، كە خووو ڕەوشتی بەرزو پەسند، بۆ هەموو كات و شوێن و حاڵەتەكان، هەر پێویستەو بەردەوامیشە، بۆیە بابای ڕەوشت جوان، هەمیشەو دایم لە طاعەت و خواپەرستیی دایە لە سایەی ڕەوشت و خووە پەسندەكەیەوە!

■ بەرهەمی چوارەم ■

## ئەدەب و ڕەوشتی ڕەندو پەسند، ئەوەیە کە بابای ڕەوشت بەرز، سەرجەم یاساو بەها بەرزەکانی ئیسلام لە خۆیدا بەرجەستە دەکات

هەڵبەتە ئەوەش وێڕای ئەوەی، کە مایەی سەرفرازیی دنیاو دوارۆژە، مرۆڤی مسوڵمان بەو جۆرەش بەچاکترین و سەرکەوتووترین شێواز (أنجحُ أُسلوب) خەڵکی بۆ لای ئیسلام و، بەندایەتیی بۆ خوا کردن، بانگەواز دەکات، کە بریتیە لە بانگ کردن بەزمانی کردارو حاڵ (الدعوة بلِسان العمل والحال)، دیارە فەرموودەی خوای پەروەردگاریش، کە فەرموویەتی:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة.

هەر ئەوەی لێدەفامرێتەوە، چونکە وەك چۆن پێغەمبەری ڕەوشت مەزن، بەهۆی دینداریی کردنی ڕاست و دروست و، ڕەوشت و ڕەفتاری بەرزو مەزن و شایستەیەوە، بەڵگەو شایەدی ڕاستیی و تەواویی ئایین و بەرنامەی خوایە بەسەر ئۆممەتەکەیەوەو، بیانووی بڕیون! پێویستە شوێن کەوتووەکانیشی هەروا

بن و، شایستەی بەجێهێنانی ئەو ئەرکە و هێنانەدی ئەو ئامانج و مەبەستە بن، تاکو ئەو چاکتر بوون (خَيريَّة)ی خۆیان ئیسپات بکەن، چونکە خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿١١٠﴾﴾ آل عمران.

واتە: ئێوە (ئەی ئۆمەتی ئیسلام!) چاکترین کۆمەڵن، کە بۆ خەڵکی (بۆ مرۆڤایەتیی) ڕەخسێنراون، فەرمان بە پەسند دەکەن و ڕێگریی لەخراپە دەکەن و، ئیمان بەخوا دێنن.

ئاشکراشە کە ئەرکی گەورەو گرنگی فەرمان بە پەسند کردن و ڕێ لەخراپە گرتن (الأمر بالمعروف والنَّهي عن المنكر) تەنیا بەکەسانێك - وەك پێویست - جێبەجێ دەکرێ، کە خۆیانیان لە ناشەرعییەکان (المنكرات) بژارکردبێ و، بە چاکەکان (المعروفات)یش ڕازابنەوەو، بە زاراوەی ئەهلی تەزکیەو عیرفان پڕۆسەی (تَخلية وتَحْلية) یان لەخۆیاندا ئەنجام دابێت، واتە: لە (رَذائِل) پاك و بە (فَضائِل) چاك بووبن، ئەگەرنا هیچیان بۆ بەهیچ ناکرێ.

■ بەرهەمی پێنجەم ■

## خوا لەگەڵ بوون و
## بە بەهەشت شاد بوون

بەرهەمێكی دیكەی گرنگی ڕەوشت و خووی جوان و ئەدەب و ئاكاری پەسند، ئەوەیە كە بابای خووو خدە جوان و، خەسڵەت پەسند، خوای پەروەردگارو بەخشەرو بەبەزەیی، پشتی دەگرێ و لەگەڵی دەبێت، چونكە ڕێزی دەگرێ و خۆشی دەوێت:

ئەم دەقانەش ڕاستیی ئەوەی گوتمان، وەك ڕۆژی ڕوون لێدەكەن:

- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢ ﴾ البقرة.
- ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٣٦ ﴾ التوبة.
- ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٦ ﴾ آل عمران.
- ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٤٨ ﴾ آل عمران.
- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ١٥٩ ﴾ آل عمران.
- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨ ﴾ النحل.

ئنجا بەبەهەشت شادبوونی خوو ڕەوشت بەرزانیش، وەك پێشتریش باسمانكردوە، دەقی قورئان و سوننەتی زۆری لەسەرن، بۆ وێنە:

خوای پەروەردگارو کاربەجێ لەکۆتایی سوورەتی (الفُرقان)دا، بەندە چاك و پاك و هەڵبژاردەو دانسقەکانی خۆی بە (عبادُ الرَّحْمن) ناو دەبات و، پاشان بەدەوری شازدە (١٦) سیفەتی بەرزو پەسند، پێناسەو وەسفیان دەکات، کە بە دوو خەسڵەتی ئەخلاقیی دەست پێدەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾.

واتە: وە بەندە هەڵبژاردەکانی خوای بە بەزەیی ئەوانەن، کە بەئارامیی و ویقارە وە بە زەویدا دەڕۆن، وە کاتێك نەفامەکان بیاندوێنن، دەڵێن: سەلامتان لێبێ!

پاشان لە کۆتایی ژماردنی تێکڕای خەسڵەتە بەرزەکانیاندا فەرموویەتی:

﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: ئەوانە کۆشکە بەرزەکانیان لە پاداشتدا دەدرێنێ، بەهۆی خۆڕاگرییانەوەو، بە سڵاو لێکردن پێشوازییان دەکرێ، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوەو، بێگومان بەهەشتیش چاکترین شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون و مانەوەیە.

■ بەرهەمی شەشەم ■

## خووو ڕەوشتی جوان و پەسندی مسوڵمانان، دەبێتە مایەی تۆكمەیی و پتەویی كۆمەڵ و كۆمەڵگایان

بەڵێ بەڕێزان!

بەرهەمێكی دیكەی گەورەی ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو جوانی تاك تاكی مسوڵمانان، ئەوەیە كە لە سایەی خۆ بژاركردنیان، لە خووو خدە نزم و پەستەكان و، ڕازانەوەیان بە خەسڵەتە شیرین و پەسندەكانەوە، دەبنە كۆمەڵ و كۆمەڵگایەكی تۆكمە و تەواوو ڕیزپێكەوە جۆشدراو، ئاخر كۆمەڵ و كۆمەڵگایەك سەرجەم تاك و ئەندامەكانی بە دڵ و دەست و زمان، خۆیان لە ئازارو زیانی یەكدی بپارێزن و، لە هەوڵی یەكدی بەختەوەر كردن و، سوودو كەڵك بەیەكدی گەیاندندا بن، چۆن تۆكمە و توندو تۆڵ و پێكەوە جۆشدراو نابێ؟!

**ئنجا با بۆ زیاتر دڵنیایی لەو بارەوە، سەرنجی ئەم چەند دەقەش بدەین:**

١- {مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ، مَثَلُ الجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الجَسَدِ بِالسَّهَرِ والحُمَّى} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٤٠٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٨٦).

واتە: وێنەی بڕواداران لە یەکدی خۆشەویستنیان و، بەزەیی بەیەکدی داهاتنەوەیان و، سۆزو پەرۆشییان بۆ یەکدی، وەك جەستە وایە، هەرکاتێك ئەندامێکی ئازاری بوو، تێکڕای جەستە بە شەو نخوونیی و تا بەشداریی دەکات.

٢- {الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ} أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي برقم: (١٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٤٨١)، وَالنَّسَائِي برقم: (٤٩٩٦).

واتە: مسوڵمان کەسێکە، کە مسوڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەت بن.

٣- {لاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ وَلا يُكْذِبُهُ وَلاَ يَحْقِرُهُ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٧١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٦٤).

واتە: حەسوودیی بەیەکدی مەبەن و،یەکدی مەبوغزێنن و، فێڵ و[1] فەرەج لەیەکدی مەکەن و، پشت لەیەکدی مەکەن، وە بەسەر سەودای یەکدییەوە سەودا مەکەن، وە ئەی بەندەکانی خوا! برای یەکدی بن، مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێ ناکات و، پشتی بەرنادات و، درۆی لەگەڵ ناکات و، بەکەم سەیری ناکات.



---

(١) وشەی ( نجش) لە ئەسڵدا بە مانای زیادکردنی نرخی شتێکە لە کاتی سەودا کردندا، بەمەبەستی فریودانی کڕیارەکانی، نەك بەمەبەستی کڕینی، بەڵام بەگشتی مانای فێڵ (غش) یش دەگەیەنێ، بڕوانە ( جامع العلوم و الحكم)ص ٣٩٩.

■ بەرهەمی حەوتەم ■

## مرۆڤی ڕەوشت و خوو جوان، بەختەوەرو ئاسوودەیەو، نەعەییداری لای خـەڵك و، نە گوناحباری لای خوایە

بەرهەمێكی دیكەی یەكجار گرنگی خوو ڕەوشتی بەرزو جوان، ئەوەیە كە خاوەنەكەی هەمیشە بەختەوەرو دڵئارام و ئاسوودەیەو، هەموو دەمێ سەر بەرزو بێباكە، چونكە ئینسان تەنیا كاتێك ڕەوشت و ئاكاری بەرزو جوان دەبێ، كە توانیبیەتی خۆی لەگوناح و هەڵەو پەڵەكان بپارێزێ و، كارێك نەكات كە ببێتە مایەی عەیبداریی و گوناهباریی، ئنجا هەر بەوەندەش وازنەهێنێ و، هەوڵیش بدات بە عەقڵ و دڵ و دەست و زمان و ماڵ و سامان، هاوكاریی و خزمەتی خەڵكی بكات و، دڵیان خۆش بكات و، بەختەوەریان بكات و، گرفت و كێشەكانیان چارەسەر بكات و، پێداویستیی و بەرژەوەندییەكانیان دابین بكات، ئنجا دیارە بابای ئاواش هەمیشەو دایم هەست بەبەختەوەریی و شادیی دەكات و، هەمیشە دڵی ئاسوودەو ئارام و خۆش و گەش و شادمانە، بە پێچەوانەی بابای خووو خدە بەدو نەخۆش، بەهۆی بوغزو غەرەزو كینەو حەسەدو بەد گومانیی و خۆ بەزلگیرییەوە، وە سەر بە تەشقەڵەو گێچەڵ و هەرا، بەهۆی: درۆكردن و غەیبەت و دووزمانیی و جنێو دان و زمان شڕیی و گاڵتەو جەفەنگ بەخەڵك كردن و توانج و پلار تێگرتنیان ...هتدەوە، كە هەمیشەو دایم گیرۆدەی خەم و

خەفەت و دڵەڕاوکە (قلق)و ترس و لەرزو شەرمەزاریی و ئازارو ئەشکەنجەی دەروونیی و ویژدانیین و، هیچ کات بەختەوەرو ئاسوودەو دڵنیاو ئارام نین!

**بەس بۆ وێنە دەڵێم:**

بابای ئێرەیی بەر (حاسِد)، چونکە هەمیشە بەهەبوون و نازو نیعمەتی خەڵکی نارەحەت دەبێ و، دیارە خوای بەخشەریش بەردەوام چاکەو نیعمەت و خێرو خۆشییەکانی بەسەر بەندەکانی دا دەڕێژێ، بەڵێ بابای حەسوود، دەبێ بەردەوام خەریکی خەفەت و مەراق و ئێش و ژان بێت، لە نێو خۆیدا بکوڵێ و بتوێتەوەو گەندەڵ بێت!

هەر بۆیەش گوتراوە: (للهِ دَرُّ الحسدِ ما أعْدَلَهُ! بَدَأَ بصاحِبِهِ فقَتَلَهُ!!)

واتە: ماشەڵڵا حەسوودیی چەند دادگەرە! لە خاوەنەکەیەوە دەستی پێکردوەو کوشتوویەتی!!

دیارە خەسڵەت و خوو خدە پیسەکانی دیکەش، هەر وان و، بەر لەهەموو کەس زیان بە خاوەنەکەیان دەگەیەنن و دەیانفەوتێنن[1]!

**کۆتایی ئەم خاڵەش بەم فەرموودەیە دێنم:**

{مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنيَا، نَفَّسَ الله عَنْهُ كُربَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ القِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّر عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ الله عَلَيهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً، سَتَرَهُ الله فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، والله فِي عَونِ العَبْدِ مَا كَانَ العَبْدُ فِي عَونِ أَخِيه} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٧١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٩٤٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٤٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٤).

---

(١) بە بیرم دێ کە منداڵ بووم کاتێك لە کۆڕ و مەجلیسدا باسی سیفەت و خووی خراپی یەکێك دەکرا، کە ئازاری مسوڵمانان دەدا، نەنکم - دایکی دایکم خوا لێیان خۆشبێ و جێگایان بەهەشت بێ- دەیگوت: ڕۆڵە گیان! لێی بگەڕێن و باسی مەکەن: ماری باخەڵی خۆی دەیخوات! واتە: سیفەت وخەسڵەتی بەد و خراپی ئەو کەسەی بە مارێك دادەنا!

واتە: هەرکەسێك خەم و گرفتێك لە خەم و گرفتەکانی دنیا لە بڕوادارێك لابەرێ، خوا خەم و گرفتێك لە خەم و گرفتەکانی ڕۆژی قیامەتی لێ لادەبا، وە هەرکەسێك کاری ئاڵقاوی و بابایەکی سەغڵەت و گرفتار ئاسان بکات، خوا لە دنیاو دوارۆژدا کار ئاسانیی بۆ دەکات، وە هەر کەسێك عەیبی مسوڵمانێك بپۆشێ، خوا لە دنیاو دوارۆژدا دەیپۆشێ، وە هەتا بەندە هاوکاریی برایەکەی بکات، خواش یاریدەی دەدات...

هەڵبەتە ئەم بابەتە هەویرێكی ئاو خوازە، بەڵام ئێمە لە بنەڕەتدا ئەو كتێبەمان بۆ ئەوەیە كە ڕەوشتی جوان و ئاكاری پەسند بخەینە ڕوو، ئنجا لەبەر ئەوەی پێچەوانەی ڕەوشت و ئاكاری جوان، بریتیە لە: خووو خدەی خراپ، بۆیە هەروا ئاماژەیەكی كورت بە باس كردنی مەترسیی و زیانەكانی ڕەوشتی خراپ، دەكەین:

# ڕەوشتی خراپ (سُوء الخُلُق) چییە؟!

{سُوء الخُلُق: عِبارَة عَن هَيئَةٍ راسِخةٍ في النَّفس تَصْدرُ عَنها الأَفعالُ القَبيحة بِسُهولَة وَيُسر مِن غَيرِ حاجَةٍ إلى فِكر وَرَوِيّة}[1].

واتە: ڕەوشتی خراپ بریتیە لە حاڵەتێك، كە ڕۆچوویەو لە نەفسدا جێگیر بووە، كردەوەی خراپی لێ پەیدا دەبن بە ئاسانیی، بێ ئەوەی كە پێویستیی بەوەبێ بیریان لێ بكاتەوە.

كابرای درۆزن هەر لەخۆوە درۆ دەكا، ئینسانی زمان شڕ، پێویست بەوە ناكا بیر بكاتەوە، چ جنێوێك بڵێ، هەر لەخۆوە سینەی پڕە لە جنێو، سینەی پڕە لەوشەی بریندارکەر، پڕە لە وشەی بێ نەزاكەت.

هەروەها بابای فێڵباز، پێویست بەوە ناكا زۆر بیر بكاتەوە: چۆن فێڵێ بكا؟ وا پێوەی ڕاهاتوە هەر بەئاسانیی دەتوانێ قۆڵی خەڵك ببڕێ.

بەڵێ بەڕێزان!

وەك چۆن ڕەوشت و ئاكاری بەرزو پەسند، دوای ئەوەی دەبێتە حاڵەتێك لە نەفس و دەبێتە بەشێك لە سروشت، پێویست ناكات بابای ڕەوشت جوان هەمیشە بیر بكاتەوە چۆن ڕاستی بڵێ؟ چۆن چاكە بڵێ؟ چۆن قسەی خۆش بێ؟ بەڵكو لێی بۆتە سروشت.

بەهەمان شێوە ڕەوشتی نزمیش هەروایە، خووو خدەی خراپیش دەبێتە بەشێك لە سروشتی ئینسان و، هەمیشە بە ئاسانیی و بەبێ بیر لێكردنەوە، ئەو ڕەفتارو

---

(١) التعريفات، الجرجاني ص ١٠٦.

ڕەوشتە خراپانەی لێ دەردەکەون، خوای شارەزا لەزۆر شوێنێ لە قورئاندا، باسی کەسانێك دەکا کە ڕەوشت و ئاکارو سیفەتی خراپیان هەیە، هەروەها پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەکانیدا ئاماژەی پێداوە:

**نمونەی یەکەم:**

ئایەتەکانی: (١٠ تا ١٣)ی سوورەتی (القلم) خوای کارزان باسی یەکێ لە کافرەکان دەکا، باسی کەسایەتییەك دەکا، کە مەرج نیە دیاریی کراوبێ، بەڵکو سیاقی ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنێ، کە هەرکەسێ ئەو سیفەتانەی تێدا بن، تۆ ئاوا مامەڵەی لەگەڵدا بکە، دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ ﴾

دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە (صلى الله عليه وسلم)، وە لەهەر کەسێکیش کە قورئان دەخوێنێ، واتە: فەرمانبەریی کەسێ مەکە کە زۆر سوێند دەخوا، وە زۆریش سووکە، {بە عادەت وایە هەر کەسێ زۆری سوێند خوارد، مانای وایە متمانەی بەخۆی نیەو هەمیشە سوێند دەخوا، بۆ ئەوەی خەڵك متمانەی پێ بکا، بۆیە لە ئەنجامی ئەوەشدا سووك دەبێ}، وە عەیبگرە لە ڕوودا {یاخود پاشەملە خەڵك دەشکێنێ}، هەمیشە قسە دەهێنێ و دەباو نێوان خەڵکی تێك دەدا، وە هەر خێرو چاکەیەك لە دەستی بێ، دەست دەگرێتەوە، زۆر سنوور بەزێنە، گوناهبارە، زۆر خۆ بەزل گرە، دڵ ڕەقە، نامەردە، {وشەی (زَنِيمٍ) هەندێ لە زانایان بەوە لێکیان داوەتەوە، کە کوڕی بابی خۆی نیە، بەڵام نەخێر، بەڕای من ئەویش یەکێکە لەو سیفەتە خراپانەی وی[1]، دوایی دەفەرموێ: هەر لەبەر ئەوەی کە خاوەنی ماڵ و سامانەو خاوەنی کوڕانە،

---

(١) مختار الصِّحاح، ص ٢٧٦، (زَنيم: قالَ عِكرمة: هوَ اللّئيم الّذي يعرف بِلُؤمِهِ)، بۆیە من (زنیم)م بەنامەرد مانا کردوە، چونکە پێچەوانەی (کریم)ە، کە بەمانای (جوامێر)ە بە کوردیی.

تۆ بەقسەی مەکە، کاتێ ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێنرێنەوە دەڵێ: ئەفسانەی پێشینانە.

وەك دەبینین: خوای پەروەردگار کۆمەڵێ سیفەتی خراپ لە کەسێکی کافر هەڵدەدا، کە بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ بە قسەی مەکەو، نەکەویە ژێر کاریگەریی وی، هەر لەبەر ئەوەی ماڵ و سامانی هەیەو دەوری قەرەباڵغە.

**نمونەی دووەم:**

لە فەرمایشتێکدا هاتوە: {سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَن أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ؟ فَقَالَ: {تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ} وَسُئِلَ عَن أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ؟ فَقَالَ: {الْفَمُ وَالْفَرْجُ}، أخرجه أحمد برقم (٩٦٩٤)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٢٩٤)، والترمذي برقم (٢٠٠٤) وقال: صحيح غريب، والحاكم برقم (٧٩١٩) وقال: صحيح الإسناد، وابن حبان برقم (٤٧٦)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٧٥٦)، وأخرجه أيضا: ابن ماجة برقم (٤٢٤٦)، قال الألباني: حسن الإسناد.

واتە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کرا: دەربارەی ئەوە کە چ شتێك زیاتر خەڵك دەخاتە بەهەشت؟ ئەویش فەرمووی: {پارێز کردن لە خوا، وە ڕەوشتی جوان}، پارێز لەبەرانبەر خوادا (تقوى)، وە ڕەوشتی جوان لەگەڵ خەڵکدا، لەهەموو شتێ زیاتر مرۆڤ پێی دەچێتە بەهەشت، وە پرسیاری لێکرا: چ شتێك زیاتر خەڵك دەباتە دۆزەخەوە؟ فەرمووی: {زار (زمان) و داوێن}. ئەو گوناهانەی بە زار دەکرێن: درۆ غەیبەت، بوختان، خۆهەڵکێشان، زۆر شتی خراپ بەزار دەکرێ، وە داوێن، کە داوێن پیسیی پێ دەکرێ.

**نمونەی سێیەم:**

هەروەها لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گێردراوەتەوە کە فەرموویەتی: {اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الْأَخْلَاقِ وَالْأَعْمَالِ وَالْأَهْوَاءِ}، أخرجه الترمذي برقم (٣٥٩١) وقال: حسن غريب، قال الألباني: صحيح.

واتە: ئەی خوایە! من پەنا دێنمە بەر تۆ، لە ڕەوشتە دزێوەکان، وە لە کردەوە خراپەکان، وە لە ئارەزووە خراپەکان.

کەواتە: ڕەوشتی دزێوو خراپ و ئاکاری ناپەسند، هێندە خراپە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پەنای لێ بەخوا گرتوە، شتێك هێندە خراپ بێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پەنای پێ لێ لەخوا بگرێ و پەنا بەرێتە بەر خوا بۆ ئەوەی لێ بپارێزرێ، مانای وایە زۆر خراپە.

**نمونەی چوارەم:**

ئنجا بێگومان خووڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند چەندە چاکە، پێچەوانەکەشی هێندە خراپە، با سەیری ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بکەین:

{ إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يَكُونَ صِدِّيقًا، وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّاباً}، أخرجه البخاري برقم (٥٧٤٣)، ومسلم برقم (٢٦٠٧)، وأخرجه أيضًا: أبو يعلى برقم (٥١٣٨)، وابن حبان برقم (٢٧٣)، والبيهقي برقم (٢٠٩٢٧).

واتە: بێگومان ڕاستیی ئینسان ڕێنمایی دەکا بەرەو چاکەکاریی، وە چاکەکارییش ئینسان ڕێنمایی دەکا بۆ بەهەشت، وە پیاوی وا هەیە هێندە ڕاست بێژەو ڕاستیی دەڵێ، هەتا لە لای خوا دەنووسرێ ڕاستبێژ (صِدّیق)[1]، {ئەو نازناوەی وەك خەڵات پێ دەدرێ}، بە پێچەوانەشەوە: بێگومان درۆ ئینسان بەرەو تاوانباریی و گوناح دەبا، وە تاوانباریی و گوناهیش ئینسان بەرەو ئاگری دۆزەخ دەبا، وە پیاوی وا هەیە هەر درۆ دەکاو درۆ دەکا، تاکو لەلای خوا دەنووسرێ درۆزن (كذّاب). {واتە: بەزۆر درۆزن لەقەڵەم دەدرێ، هەرکەسێ یەکجاریش درۆ بکا پێی دەگوترێ: درۆکەر، بەڵام درۆزن کەسێکە، کە درۆی لەلا بووە بە عادەت}.

---

(١) (صدیق) واتە: کەسێك هەمیشە ڕاست بێژە، هەروەك بەمانای ئەوەش هاتوە: هەر کەسێ پێغەمبەری خوا زۆر بەڕاست دەزانێ و (تصدیق)ی دەکا.

# بەشی پێنجەم

## پەیوەندیی ڕەوشت و ئاکاری جوان بە:
## ئیمان و، عیبادەت و، تەقواو، دەست گرتن
## بە کتێب و، سوننەت و، تەزکیەی نەفسەوە

ئایا ڕەوشت و ئاكار جوان، چ پەیوەندییەكی هەیە بە: ئیمان و، عیبادەت و، خۆپارێزیی و، دەست گرتن بە قورئان و، وە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم)، وە تەزكیەی نەفسەوە؟

بەتەئكید ڕەوشتی بەرزو جوان، پەیوەندیی بە هەر كام لەو شەشانەوە هەیە، با تەماشا بكەین:

■ یەکەم ■

## پەیوەندیی ڕەوشتی بەرزو جوان بە ئیمانەوە

١- ئیمان سەرچاوەی هەموو ڕەوشتە بەرزو جوانەکانە {الإيمان يَنبُوع الفَضائِلِ كُلِّها}، بەڵێ: هەرچی ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسندە، پەیوەندیی بە ئیمانەوە هەیە، هەتا ئیمانت باشتر بێ، ڕەوشتت جوانتر دەبێ، وەك لەو فەرموودەیەدا، کە پێشتریش هێنامان هاتوە: {أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا}[١].

واتە: بڕوا تەواوترینی بڕواداران، ڕەوشت جوانترینیانە، تاکو ئیمانت زیاتر بێ، ئاکارو ڕەوشتت بەرزتر دەبێ.

٢- لە سووڕەتی (المؤمنون) ئایەتەکانی: (١ تا ٩)دا خوای پەروەردگار وەسفی ئیمانداران دەکا، دەفەرموێ:

﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴿٨﴾

---

(١) پێشتر تەخریج کراوە.

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ۝٩ ﴾.

واتە: بێگومان ئیمانداران سەرفرازن بەختەوەرن، ئەوانەی بەملکەچیی نوێژەکانی خۆیان دەکەن، وە ئەوانەی کە خۆیان لە قسەو کردەوەی پووچ دەپارێزن و پشتی تێدەکەن، وە ئەوانەی کە خۆیان تەزکیەو پاك و چاك دەکەن، وە ئەوانەی کە داوێنی خۆیان دەپارێزن...هتد.

وەك دەبینین: بە ئیمان دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: بەڕاستی بڕواداران سەرفرازن، ئنجا ئیماندارانی سەرفراز کێن؟ ئەوانەن کە خاوەنی ئەو سیفەتانەن، کە لەسەرەوە باسیکردوون، کە سەرجەم حەوت سیفەتی مەزنن:

١- ملکەچی لە نوێژدا.

٢- پشت لە قسەو ڕەفتاری پووچ کردن.

٣- خۆ تەزکیە کردن، یان زەکات دان.

٤- داوێنی خۆ پاراستن لە حەڕام.

٥- پاراستنی سپاردە.

٦- وەفاداریی بە پەیمان.

٧- پارێزگاریی کردن لە نوێژەکان.

٣- هەروەها لە سووڕەتی (الشوری) ئایەتەکانی: (٣١ تا ٣٩)دا خوای پەروەردگار کۆمەڵێك سیفەت ڕیز دەکا، کە ئیماندارانیان پێ وەسف دەکا، دەفەرموێ:

﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٣٦ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ۝٣٧ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣٨ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ۝٣٩ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٤٠ ﴾.

واتە: هەرچی پێتان دراوە ڕابواردنێكی كەمی دنیایە، وە ئەوەی لەلای خوایە، باشترە وە زیاتریش دەمێنێتەوە، بۆ ئەوانەی كە ئیمانیان هەیە، وە پشت بەخوا دەبەستن، وە ئەوانەی خۆیان لە گوناهە گەورەكان و گوناهە ناقۆڵایەكان دەپارێزن، وە كاتێ تووڕە دەبن، لێبوردنیان هەیە، وە ئەوانەی كە بەدەم بانگەوازی خواوە دەچن و نوێژ بەرپا دەكەن، وە كاروباریان بەڕاوێژ بەڕێوە دەبەن، وە لەوەی پێمان داون دەبەخشن، وە ئەوانەی كە ستەمیان لێكرا، بەرگریی لە خۆیان دەكەن ...هتد.

وەك دەبینین:

ئیمان سەر ڕشتەی هەموو كردەوە باشەكان و خەسڵەتە بەرزەكانە.

دووەم

## پەیوەندیی ڕەوشتی بەرز و جوان بەخـوا پەرسـتییەوە

عیبادەت ئاکە وەسیلەیە، کە ئینسان پێی لەخوا نزیك ببێتەوە، ئێمە هیچ موناسەبەتێکمان لەگەڵ خوادا نیە، ئەوە نەبێ کە ئێمە دروستکراوی خواین، وە لە ڕێی بەندایەتیی کردن بۆ خواوە، دەتوانین لەخوا نزیك ببینەوە، بەڵێ، ئینسان بەهۆی عیبادەتەوە لە خوا نزیك دەبێتەوە، ئنجا هەر کات لەخوا نیزیك بووی، مانای وایە تۆ لە هەموو سیفەتێکی بەرزو جواندا، کە لەگەڵ ئینساندا بگونجێ، پشك و بەشت دەبێ، با تەماشای ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الماعون) بکەین، کە خوا (سبحانە و تعالى) دەفەرموێ:

﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾﴾.

واتە: دەزانی کێ بڕوای بە ئایین نیە؟ یان دەزانی کێ بڕوای بە سزاو پاداشت نیە؟ ئەو کەسەی کە پاڵ بە هەتیوەوە دەنێ، وە خەڵك هان نادات بۆ خواردن دان بە هەژارو نەدار، سزای سەخت بۆ ئەوانەی کە لەنوێژەکانیان بێ ئاگان، ئەوانەی کە ڕیابازیی دەکەن، وە هاوکاریی لە خەڵك دەگرنەوە.

تەماشا دەكەین پێشی دەفەرموێ: (ٱلَّذِی یُكَذِّبُ بِٱلدِّینِ ) چونكە مرۆڤ، كە بڕوای بە ئایین، یان سزاو پاداشت نەبوو، ئنجا سیفەتە خراپەكانی دیكە پەیدا دەبن، وەك پاڵ بە هەتیوەوە نان و، خۆ لێتووڕە كردنی و، یارمەتی نەدانی هەژارو نەدارو، ڕیابازیی لە نوێژداو، دەست گرتنەوە لە هاوكاریی خەڵك و ...هتد، هەرچی سیفەتی خراپە، بەدوای كوفردا دێ، وەك چۆن هەرچی سیفەتی بەرزو جوانە، بەدوای ئیماندا دێ.

■ سێیەم ■

## پەیوەندیی ڕەوشت و ئاكاری بەرزو جوان بە پارێزكاریی (التقوی)[1]ەوە

تەقوا بناغەی ڕەوشتی بەرزو جوانە، چونكە لە قورئاندا لە چەندان شوێندا، خوای پەروەردگار: تەقواو نێوان لەگەڵ خەڵك چاك بوون، یاخود تەقواو چاكەكاریی، پێكەوە هێناوە، وە تەقواشی هەر پێش خستوە، مەگەر سیاقەكەو موناسەبەتەكە وای خواستبێ غەیری تەقوا پێش تەقوا كەوتبێ، ئەگەرنا هەمیشە تەقوا لەپێشەوەیە، با تەماشا بكەین:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأنفال) ئایەتی (١)دا دەفەرموێ:

﴿... فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ .. ﴿١﴾﴾.

---

(١) تەقوا كە دواتر بە وردیی پێناسەی دەكەین، بەڵام كورتەی پێناسەكەی ئەوەیە: كە ئینسان خۆی لە هەرشتێ بپارێزێ، كە خوا پێی ناخۆشە، ئنجا خوا (سبحانه و تعالى) بەگشتی دوو شتی پێناخۆشن:

١- ئەو شتانەی پێویستی كردوون بیانچوێنێ. ٢- وە ئەو شتانەی قەدەغەی كردوون بیانشكێنێ. بۆیە یەكێ لە پیاوچاكان دەڵێ: {التقوى: هُوَ أَن لا يَفتَقِدَكَ اللهُ حَيثُ أَمَرك، وَأن لا يَجِدَكَ حَيثُ نَهاك}، واتە: تەقوا ئەوەیە، كە تۆ لە شوێنێك غائیب نەبی، كە خوا فەرمانی پێكردووی، وە لەشوێنێكیش ئامادە نەبی، كە خوا قەدەغەی لێكردووی.

واتە: پارێز لەخوا بکەن، وە پەیوەندییەکانی نێوانتان باش بکەن، کەواتە: پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان باش بوون، بەرهەمی پارێزکار بوونیانە، ئەگەر ئەهلی تەقوا بن، پێکەوە تەبا دەبن.

٢- لە سوورەتی (النحل) ئایەتی کۆتاییدا، خوا عز وجل دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾.

واتە: بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەدایە، کە پارێز دەکەن، وە لەگەڵ ئەوانەدایە، کە چاکەکارن، تەقوا لەگەڵ خوا، وە ئیحسان و چاکەکاریی لەگەڵ خەڵکی خوا.

٣- خوا لە ئایەتی پێش کۆتایی سوورەتی (الحج)دا دەفەرموێ:

﴿ .. وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾.

واتە: وە پەروەردگارتان بپەرستن وە چاکە بکەن، بەڵکو سەرفراز بن. یانی: خوا پەرستیی و خەڵك دۆستیی.

٤- لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (٢)دا خوا (سبحانه و تعالی) دەفەرموێ:

﴿ .. وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ .. ﴿٢﴾ ﴾.

لێرەدا وشەی (ٱلْبِرِّ ) پێش (وَٱلتَّقْوَىٰ ) کەوتوە، کە گومانی تێدا نیە (تقوی) لە پێش (بِرّ)وەیە، چونکە تەقوا واتە: چۆنیەتی پەیوەندیی لەگەڵ خوادا (سبحانه و تعالی)، بەڵام سیاقەکەو موناسەبەتەکە وای خواستوە، کە چاکەکاریی پێش بخات و بفەرموێ: هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی، چاکەکاریی لەنێوان خۆتاندا، وەك مرۆڤەکان، وە پارێزکاریی بۆ خوای پەروەردگار.

٥- لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتەکانی ( ١٣٣- ١٣٥)دا خوای بێوێنە فەرمان دەکا بە بڕواداران و دەفەرموێ:

﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ

لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾.

واتە: خێرایی و پێشبڕکە بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە، وە بەهەشتێك کە پانایییەکەی بەقەدەر ئاسمانەکان و زەوییە، ئامادە کراوە بۆ پارێزکاران.

دوایی وەسفی پارێزکاران بەو سیفەتانە دەکا:

یەك: ( ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ) ئەوانەی، کە ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن لە کاتی فەڕحانیی و لە کاتی گرانییشدا.

دوو: (وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ ) ئەوانەی ڕق و تووڕەیی خۆیان کپ دەکەنەوەو قووتی دەدەنەوە.

سێ: (وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ ) ئەوانەی چاوپۆشیی لە خەڵك دەکەن.

چوار: (وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ) وە خوا چاکەکارانی خۆش دەوێ، کەواتە: ئەوانە چاکەکاریشن.

پێنج: ( وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ ) وە ئەوانەی کە گوناهێك دەکەن و ستەم لە نەفسی خۆیان دەکەن، یادی خوا دەکەن و داوای لێبوردن لەخوا دەکەن، بۆ گوناهەکانیان.

شەش: (وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ) وە بەردەوام نابن لەسەر ئەو گوناهەی کە ئەنجامیانداوە، لەکاتێکدا کە دەزانن ئەوە خراپەیەو گوناهە.

کەواتە: سەرەتا دەبێ تەقوا هەبێ، ئنجا ڕەوشتی بەرزو جوان پەیدا دەبێ.

■ چوارەم ■

## پەیوەندیی ڕەوشتی بەرز و جوان
## بە دەست گرتن بە كتێبی خواوە

بە كورتی دەڵێین: كتێبی خوا (قورئان) سەرچاوەی هەموو خێرێكە، وە مرۆڤایەتیی لە هەموو شەڕو خراپەیەك دەپارێزێ، چونكە خوای بەبەزەیی هیچ خێرو چاكەیەك نیە لە قورئاندا بە ئێمەی نەفەرمووبێ، مادام ژیانی ئێمە پێویستیی پێ بێ، وە لە مەودای عەقڵدا نەبێ، بۆیە كە دەفەرمویٰ:

﴿.. وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ .. ﴿٨٩﴾﴾ النحل.

یانی: هەر شتێ كە لەمەودای عەقڵی ئینساندا نەبێ، وە ئینسان بۆ ژیانی دنیای پێویستی پێبێ، قورئان ڕوونی كردۆتەوە، نەك بە ڕەهایی (مطلق)ی قورئان هەموو شتێكی تێدا بێ، قورئان هەموو شتێكی تێدایە، كە لەمەودای عەقڵی ئینساندا نیەو ئینسان لە ڕێگای عەقڵ و ئەزموونەوە پێی ناگا، وە ژیانی دنیای پێویستیی پێیەتی.

ئنجا بەتەئكید ژیانی دنیای ئینسان پێویستی بەوەیە، كە ئینسان ڕازاوە بێ، بە ڕەوشتە بەرزو جوانەكان، وە دوور بێ لە ڕەوشتە دزێوو خراپەكان، كەواتە: قورئان هەرچی ڕەوشتی بەرزو جوانە، تێیدایە، وە ئاگادار كردنەوەی ئێمەشی تێدایە لە هەرچی خووو خدەی خراپ و دزێوە.

**با سەرنج بدەین:**

١- لە سوورەتی (الإسراء) لە ئایەتی (٩)دا خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئەم قورئانە ئینسان ڕێنمایی دەکا بۆ ژیانێك (یان بۆ هەر خەسڵەتێك) کە باشترین و ڕاسترین و چاکترینە، وە موژدە دەدا بەو ئیماندارانەی کە کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، کە پاداشتێکی گەورەیان هەیە لە خزمەت خوادا.

کەواتە: قورئان ڕێنماییکارە بۆ هەموو ڕەوشت و خەسڵەت و ئاکارو شێوە ژیانێکی باشترو ڕاسترو چاکتر.

٢- لە سوورەتی (التكوير) ئایەتەکانی (٢٥ - ٢٨)دا، خوای پەروەردگار باسی قورئان دەکاو دەفەرموێ:

﴿ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

واتە: ئەم قورئانە قسەی شەیتانێکی ڕەجم کراوو دوور خراوە نیە (لە ڕەحمەتی خوا)، بۆ کوێ دەچن؟ (ئەوە چ ئەگەرێکە داتان ناوەو، چ فێڵێکە شەیتان لێی کردوون، قورئان کەی لەگەڵ وەسوەسەی شەیتانەکاندا دەگونجێ؟ قورئان) جگە لە بیرخەرەوە (یاخود جگە لە ناوبانگ و شەرەف)[1] بۆ جیهانییەکان هیچی دیکە نیە، بۆ هەرکەسێ لە ئێوە کە بیەوێ ڕاست بێ.

---

(١) چونکە وشەی (ذکر) هەم بەمانای بیرخەرەوە دێ، هەم بەمانای شەرەف و ناوو ناوبانگ دێ، بڕوانە: مختار الصِّحاح، ص ٢٢٢، ٢٢٣. کە (ذکر)ی بە (ضدُّ النِّسيان)و بە (الصِّيت والثناء) لێکداوەتەوە.

کەواتە: قورئان هاتوە بۆ ئەوە کە خەڵك ڕاستبکا: {دڵیان، زمانیان، ڕواڵەتیان، لە زاتی خۆیاندا، لەگەڵ خەڵکدا، لەگەڵ خوادا، لەکاتی جەنگدا، لەکاتی ئاشتییدا، لە کەسابەتدا، لە سیاسەتدا، لە عادەتدا، لە عیبادەتدا، لە هەموو ڕەهەندەکانی ژیانیاندا، ڕێك و ڕاست و ساغ بن}، ئنجا دیارە کەسێ ئاوا ڕێك و ڕاست و ساغ بێ، خاوەنی ڕەوشتێکی بەرزو جوانیش دەبێ، کەواتە: دەست گرتن بە قورئانەوە، وا لە ئینسان دەکا ڕاست و ساغ و چاك بێ.

■ پێنجەم ■

## پەیوەندیی ڕەوشت و ئاكاری بەرز و جوان، به شوێن كەوتنی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)

١- پێشتر باسمان كرد كه پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) له لووتكەی ڕەوشتی بەرزو جواندا بووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ٤ ﴾ القلم.

واته: به دڵنیایی تۆ لەسەر ڕەوشتێكی مەزنی، زانایان دەڵێن: لێرە نەیفەرمووە: (لَذُو خُلُقٍ عَظيم) واته: تۆ خاوەنی ڕەوشتێكی بەرزو جوانی، بەڵكو دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ٤ ﴾ وەك ئەوەی ڕەوشتی بەرزو جوان، وڵاخێك بووبێ و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سواری بووبێ، یاخود ڕەوشتی جوان و پەسند لووتكەیەكی زۆر بەرز بێ و، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) له ترۆپكی ئەو لووتكەیە وەستابێ.

هەڵبەته شوێنكەوتنی پێغەمبەرێكی ئاواش مایەی ڕەوشت و ئاكار بەرزو جوان بوونە.

٢- هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرجەستەكەری هەموو ڕەوشتە بەرزو جوانەكان بووە، وەك له فەرمایشتێكدا خۆی دەفەرموێ:

{إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الْأَخْلَاقِ} أخرجه البيهقي برقم (٢٠٥٧١) قال الألباني صحيح.

یاخود لە ڕیوایەتێكی دیكەدا دەفەرمویَ:

{إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صَالِحَ الْأَخْلَاقِ} أخرجه أحمد برقم (٨٩٣٩) ، وابن سعد برقم (١٩٢) قال شعيب الأرنؤوط : صحيح.

واتە: بێگومان من تەنیا بۆ ئەوە نێرراوم، ڕەوشتە بەرزو جوانەكان لە خۆمدا تەواو بكەم، ئاكارە پەسندەكان لە خۆمدا بەرجەستە بكەم بە تەواویی.

ئنجا پێغەمبەرێك ئاوابیَ، بەتەئكید هەر كەسیَ شوێنی بكەویَ و شوێن پێی هەڵبگریَ، كەم و زۆر پشك و بەشی دەبیَ لە ڕەوشتە بەرزو جوانەكانی پێغەمبەری خاتەمدا (صلی الله علیه وسلم).

٣- دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بیَ، كاتیَ پرسیاری لێكراوە دەربارەی ڕەوشت و ئاكارو هەڵس و كەوتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گوتوویەتی:

{فَإِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللَّهِ الْقُرْآنُ} أخرجه النسائي برقم (١٦٠١).

واتە: بێگومان ڕەوشت و ئاكاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قورئان بوو، یانی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ قورئاندا تەفاعول و كارلێكێكی وای كردبوو، كە قورئان چی دەفەرموو، ئەو وای دەكرد، بۆیەش هێندە ڕەوشتی بەرزو جوان بوو.

كەواتە: ئێمەش ئەگەر دەست بە قورئانەوە بگرین، پاشان شوێن پێی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەڵبگرین، كە بەتەئكید ڕیَ و شوێن و سوننەتی پێغەبەریش (صلی الله علیه وسلم) هەر بریتیە لە: تەرجەمە كردن و بەرجەستە كردنی قورئان، بێگومان ئەو كاتە پشك و بەشمان دەبیَ لە هەموو ڕەوشتێكی بەرزو جواندا، بە ئەندازەی جددییەتمان لە دەست گرتن بە قورئانەوە، بەئەندازەی جیددیی بوونمان لە شوێن پیَ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم).

■ شەشەم ■

## پەیوەندیی ڕەوشت و ئاکاری جوان به تەزکیەی نەفسەوە[1]

پەیوەندییەکەیان ئەوەیە، کە ئەگەر ئینسان خاوەنی نەفسێکی پاك و چاك و گەشە کردوو بێ، ئەوە بەتەئکید ڕیشەی هەموو کردەوەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەروونی ئینسان، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جارێکیان فەرمووی:

{التَّقْوَى هَاهُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ} أخرجه الترمذي برقم (١٩٢٧) وقال: حسن غريب، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (٨٠٨٩).

سێ جاران ئاماژەی کرد بۆ سینەی موبارەکی و فەرمووی: پارێزکاریی لێرەدایە، واتە: ڕیشەی تەقواو بۆ خوا صولْحان و پارێزکاریی کردن، پەیوەندیی بەدڵ و دەروونی ئینسانەوە هەیە، ئەگەر ئینسان لە دەروونەوە پاك و چاك بوو، ڕەوشت و ئاکارو ڕەفتارەکانی پاك و چاك دەبن.

پێشینان گوتوویانە: (ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە) کانییەك ئاوەکەی سازگارو زولاڵ بێ، ئەو جۆگەلەی لێی هەڵدەگیرێ، بەتەئکید ئەویش ئاوەکەی لەقەدەر

---

(١) تەزکیەی نەفس وەك پێشتر باسمان کردوە واتە: پاك بوون و چاك بوونی نەفس، وە گەشە کردنی نەفس، وشەی تەزکیە (زَكى، يَزكو) واتە: (نَمى، يَنمو)، وە بەمانای (صَلَحَ، يَصْلُحَ) وە بەمانای (طهرَ، يَطهر)، واتە: بەمانای پاکیی و، گەشە کردن و، چاکیی دێ. بڕوانە: المعجم الوسيط، ص٣٩٦.

سەرچاوەکە دەبێ، ئنجا کردەوەکانی ئینسان و ڕەوشت و ڕەفتاری ئینسان، ئاوێکن لە سەرچاوەی دڵ و دەروونی ئینسانەوە هەڵدەقوڵن، کەواتە: ئەگەر ئینسان نەفسەکەی تەزکیە بووبێ و، دڵ و دەروونەکەی پاك و چاك بووبێ، ئەو کاتە هەڵس و کەوت و ڕەوشت و ڕەفتارەکانیشی جوان دەبن.

**با سەرنج بدەین:**

١- لە سووڕەتی (الشمس) ئایەتەکانی (٧-٩)دا خوای زاناو شارەزا باسی ئینسان دەکاو دەفەرموێ:

﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ ﴾.

واتە: سوێند بە نەفس و بەو کەسەی، کە نەفسی ئینسانی هێناوەتە دی، ئنجا خراپەکاریی و چاکەکاریی فێر کردوە، بەدڵنیایی سەرفرازە هەر کەسێ، کە ئەو نەفسەی خۆی پاك و چاك دەکا.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (الفتح) ئایەتی (٢٦)دا، خوای پەروەردگار باسی هەڵوێستی کافرەکان و هەڵوێستی ئیمانداران دەکاو دەفەرموێ:

﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾ ﴾.

واتە: یاد بکەوە کاتێ کە کافرەکان دەمارگیریی نەفامییان خستە نێو دڵی خۆیانەوە، بەڵام خوا ئارامیی ڕشتە سەر (دڵی) پێغەمبەرەکەی و سەر (دڵی) ئیمانداران وە پابەندی کردن بە وشەی تەقواوە، وە هەر ئەوان پێی شایستە بوون، وە خوا بەهەموو شتێك زانایە.

لێرەدا تەماشا دەکەین: چونکە کافرەکان دەمارگیریی و دڵگەرمیی نەفامییان لە دڵ و دەروونیان بووە، هەڵوێستەکەشیان نەفامانە بووە، بەڵام بە پێچەوانەوە:

ئیمانداران چونكە تەقوایان لە دڵ و دەروونـدا هەبووە، ئارامیی خوایان چۆتە نێو دڵ و، هەڵوێستەكەشیان لەقەدەر ئەو ئارامیی و تەقوایە بووە، كە چۆتە دڵیانەوە.

كەواتە: بەتەئكید ڕەوشتی بەرزو جوان، پەیوەندیی ڕاستەو خۆی هەیە لەگەڵ تەزكیەی نەفسداو، بە ئەندازەی ئەوە كە نەفسی ئینسان پاك و چاك دەبێ، ڕەوشت و ڕەفتاریشی جوان و پەسند دەبێ، وە بەئەندازەی ئەوە كە دەروونی ئینسان وێران دەبێ و پیس و پۆخڵ دەبێ، ڕەوشت و ئاكارەكانیشی دزێوو ناشیرین دەبن.

## ڕێ خۆشکردن

ئێمە چۆن پەی بە ڕەوشتی جوان و ئاکاری پەسند دەبەین؟ وە چۆنیش دەتوانین بەدەستی بێنین و خۆمانی پێ برازێنینەوە؟

سەرەتا دەپرسین: ئایا دەگونجێ ئینسان ڕەوشت و ئاکاری خۆی بگۆڕێ؟ چ بەباری چاکەدا، چ بەباری خراپەدا؟

لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، نەك مرۆڤ کە شاگوڵی باغی بوونەوەرە، وە جێنشینی خوایە، وە هەڵگری ئەمانەتی خوایە، وە خوا دەفەرموێ: لەباشترین شێوەدا خوڵقاندوومە، بەڵکو تەنانەت ئاژەڵ و پەلەوەرو دڕندەکانیش، دەگونجێ کە مەشقیان پێ بکرێ و ڕابهێنرێن لەسەر هەندێ شت، کە پێچەوانەی سروشتی خۆیانە: نابینن نەهەنگ، شێر، پڵنگ، وە تاژی و،باز، کە ڕاویان پێ دەکەن، چۆن ڕادەهێنرێن؟ کەواتە: مرۆڤ باشتر دەتوانێ خۆی بگۆڕێ، هەم بەباری چاکەداو هەم بەباری خراپەدا، ئەوە هیچ گومان لەوەدا نیە.

ئنجا ئایا ئێمە لە چ ڕێیەکەوە دەستمان لە ڕەوشتی جوان گیر دەبێ؟ لەحەقیقەتدا - وەك پێشتر باسمان کرد - لە ڕێی وەحی خواوە، وەحی خواش لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، وە بێگومان عەقڵ و فیترەتی ساغیش پشتگیری وەحی خوان، وە هیچ کاتێ وەحی خوا، شتێکی تێدا نیە لەگەڵ عەقڵی ساغ و فیترەتی سەلیمدا تێك بگیرێ، بەڵام بەمەرجێك ئەوەی بەوەحی دانراوە، بەڕاستیی وەحی خوابێ، ئنجا قورئان ئەوە هیچ گومانی تێدا نیەو لەڕێیەکی مسۆگەرەوە بە ئێمە گەیشتوەو بە تەواتور، بەڵام بەنسبەت سوننەتەوە، هەر کاتێ شتێکتان بینی لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)،

بەناوی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) کرا بوو، یان گوترابوو، یان پاڵ درابووە لای وە لەگەڵ عەقڵی سەلیم، یان لەگەڵ سروشت و فیترەت، یان لەگەڵ عیلم و واقیعدا تێکگیرا، بزانن کە ئەوە هی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نیە، چونکە هەمیشە عەقڵی سەلیم و فیترەتی ساغ و عیلم و واقیع، پشتگیریی ئەوە دەکەن کە لە وەحی خوادا هاتوە، بۆیە هەندێ لە زانایان دەڵێن: وەحی خوای پەروەردگار فیترەتێکی دەرەکییە، وە فیترەتێکیش کە خوا ئینسانی لەسەر خوڵقاندوە، شەریعەتێکی نێوخۆییە، خواش (سبحانه و تعالی) ئاماژە بەو ڕاستییە دەکاو دەفەرموێ:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم.

واتە: ڕووی خۆت ڕاست بکە لەگەڵ دیندا بەپاکیی، (ئنجا ئایا ئەو دینە کامەیە؟) ئەو سروشتەی کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، {یانی: ئەو دینە پاکە هەر ئەوە دەڵێ، کە فیترەتی ساغی مرۆڤەکان دەیخوازێ و عەقڵی سەلیم دەیخوازێ}، گۆڕان نیە بۆ دروستکراوی خوا، {ئەو شەریعەتەو ئەو فیترەتە، دوو ڕووی دراوێکن، دوو ڕووی هەقیقەتێکن و پشتگیریی یەکدی دەکەن}، ئائەوە بەرنامەی ڕێك و ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

کەواتە: ئێمە لەڕێی وەحییەوە، پەی بەڕەوشتە بەرزو جوانەکان دەبەین، وە عەقڵی سەلیم و فیترەتی ساغیش هەمیشە پشتگیریی ئەوەن کە وەحی فەرموویەتی، بۆیەش هەر کاتێ تێکگیرانێ لەنێوان عەقڵ و نەقڵدا دروست بوو، یان نەقڵەکە ڕاست نیە، یان عەقڵەکە تەواو نیە.

# ئەو ڕێگایانەی كە ڕەوشت و ئاكاری بەرزو پەسندیان پێ وەدەست دێ

ڕێیەكانی وەدەست هێنانی ڕەوشت و ئاكاری بەرزو پەسند، زۆرن، بەڵام من پێم وایە دە (١٠)یان لە هەموویان بنەڕەتیی ترو گرنگترن، كە ئەمانەن:

## ■ ڕێگای یەكەم ■

كارلێك كردن لەگەڵ كتێبی خوادا: بە خوێندنەوەو تێگەیشتن و بە جێبەجێ كردن. (التعامُلُ مَعَ كِتابِ اللهِ تَعالى: تِلاوَةً، وفَهْماً، وَتَطْبيقاً):

بە ئەندازەی ئەوە كە ئێمە كارلێك دەكەین لەگەڵ قورئانداو لە قورئان تێدەگەین، وە بە قورئانەوە پابەند دەبین، وە قورئان جێبەجێ دەكەین، بێگومان بەو ئەندازەیەش پشك و بەشمان دەبێ لە ڕەوشت و ئاكاری بەرزو جواندا.

ئەو چوار ئایەتانەی سوورەتی (الرعد) زۆر بەجوانیی دەربڕی ئەو ڕاستییەن، خوا دەفەرموێ:

﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ

رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ ﴾.

واتە: ئایا كەسێك كە دەزانێ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە، حەقە، وەك كەسێك وایە كە كوێرە؟! كەواتە: سەرەتای كەوتنە سەر سكەی ڕەوشتی پەسندو جوان، ئەوەیە كە تۆ بزانی و ئیمانت هەبێ كە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا دابەزیوە، هەقەو ڕاستە، ئەوە هەنگاوی سەرەتایە، بەڵام هەركەسێ كوێر بێ لە ئاست قورئاندا، بەتەئكید وێرانیش دەبێ لە بواری ئاكارو ڕەوشتدا، بەڵام هەركەسێ بینەر بێ لە ئاست ناسینی هەقدا، ئەو هەقە كە خوا بۆ پێغەمبەری خاتەمی ناردۆتە خوار، بەرچاوی پێی ڕوون بێ، بە تەئكید ئاوەدانیش دەبێ لەڕووی ئاكاری بەرزو پەسندو جوانەوە، چونكە دوایی خوای كارزان دەفەرموێ: (إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ) واتە: تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن.

**ئنجا ئایا ئەو خاوەن عەقڵانە كێن؟! خوا بە كۆمەڵێ ڕەوشت و ئاكاری جوان، پێناسەیان دەكا:**

**یەكەم:** ( ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ) واتە: ئەوانەی پابەندن بە پەیمانی خواوەو پەیمانی خوا هەڵناوەشێننەوە.

**دووەم:** (وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ) واتە: وە ئەوانەی كە هەموو ئەو پەیوەندییانە دەگەیەنن، كە خوا فەرمانی پێكردوە بگەیەنرێن، لەگەڵ باب و دایكیاندا، لەگەڵ خزمیاندا، لەگەڵ ماڵ و منداڵیاندا، لەگەڵ دەرو دراوسێیاندا، لەگەڵ میواندا، لەگەڵ هەموو چین و توێژەكانی خەڵكدا.

**سێیەم:** (وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ) واتە: وە بەگەورە گرتنەوە لە پەروەردگاریان دەترسێن.

**چوارەم:** (وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ) وە لە لێپرسینەوەی خراپی ڕۆژی دوایی دەترسێن.

پێنجەم: ( وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ ) وە ئەوانەی کە لەبەر ڕووو ڕەزامەندیی پەروەرد گاریان خۆڕا گرن.

شەشەم: ( وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ) وە نوێژ بەرپا دەکەن.

حەوتەم: (وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ) وە بەنهێنیی و ئاشکرا لەوەی پێمان داون، دەبەخشن.

هەشتەم: (وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ) وە لەبەرامبەر خراپەدا چاکە دەکەن، خراپە بەچاکە پاڵ پێوە دەنێن.

(أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ) واتە: ئا ئەوانە سەرەنجامی مەنزڵگای دواڕۆژیان هەیە.

کەواتە: کەسێ کە بزانێ قورئان هەقە، وە کەسێك کە کارلێك بکا لەگەڵ قورئاندا: ڕازاوە دەبێ بە هەموو ڕەوشتێکی بەرزو جوان، ئەوە هەنگاوی یەکەم و ڕێگای یەکەم بۆ بەدەست هێنانی ڕەوشتی بەرزو جوان، کە بریتیە لە زانینی ڕاستیی قورئان و لێ دڵنیا بوونی و ئیمان پێهێنانی و، پاشان دەست پێوە گرتنی و کارلێك کردن لەگەڵیدا.

بەڵێ، قورئان فەرمایشتی بەرزو پیرۆزو بەڕێزو بەپیت و پێزی خوای بێوێنەیە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى.

کە بێگومان چوار سیفەتەکانیشی کت و مت وەك زاتی بێ وێنەو هاوتان، بۆیە پێویستە تەواو تەواو دڵنیاو مسۆگەر بین، کە ئەو کاریگەرییەی فەرمایشتی خودا (کلام الله) هەیەتی لە هەموو ڕوویێکەوە، هیچ شتێکی دیکە نیەتی، هەربۆیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت و ڕەفتاری بەپێی قورئان بووە، وەك پێشتریش باسمان کردو لە زاری هاوسەری بەڕێزو خۆشەویستی و پاك و چاکییەوە عائیشە: (صديقة بنت الصديق) خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێت، گێڕامانەوە، کە گوتوویەتی:

{كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٣٤١)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

جا ئێمە خوا یاربێ دواتر باسی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ قورئاندا دەکەین، بەڵام لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم: کە مەبەست لە قورئان کردنە هاودەم و هاوڕاز، تەنیا ئەوە نیە کە بیخوێنین، بەڵکو وێڕای خوێندنی، دەبێ تەفاعولیشی لەگەڵدا بکەین و تێی بگەین و، تێیەوە ڕابمێنین و، لێی ورد بینەوەو پێیدا قوڵ بینەوەو، پاشان ئاڕاستەو فەرمانەکانیشی جێبەجێ بکەین، بۆ وێنە:

گێڕراوەتەوە کە جارێکیان عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێت)، قورئانی خوێندەوە، کاتێك گەیشتۆتە ئایەتی:

﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران.

واتە: ناگەنە پلەی چاکەکاریی، تاکو لەوەی خۆشتان دەوێ، نەبەخشن، وە بێگومان هەر شتێکیش ببەخشن، ئەوە خوا پێی زانایە، ئیدی کەگەیشتۆتە ئێرە، یەکسەر قورئان (مُصحَفْ)ەکەی پێکەوە ناوەتەوەو، چۆتەوە ماڵ و بەینێکی پێچووەو ئەوجار گەڕاوەتەوەو، دووبارە دەستی بەقورئان خوێندنەکەی کردۆتەوە! ئنجا کە لێیان پرسیوە، گوتوویەتی: ئەوە پۆشاکێکم هەبوو خۆشمدەویست، کە ئەو ئایەتەم خوێند، بۆ جێبەجێ کردن (تطبیق)ی چووم پۆشاکەکەم بەخشی و، ئەوجار هاتمەوە بۆ قورئان خوێندنەکەم !

کۆتایی ئەم خاڵەش بە تەفسیرو لێکدانەوەیەکی کورتی ئایەتی ژمارە (١٩٩)ی سوورەتی (الأعراف) دێنین، کە ئیمام (جَعْفر الصادق) خوا لێی خۆشبێ گوتوویەتی:

(أمرَ اللهُ نبيَّهُ (صلى الله عليه وسلم) بِمَكَارِمِ الأَخْلاَقِ، وَلَيسَ فِي القُرْآنِ آية أَجْمَعَ

لِمَكَارِمِ الأَخلاقِ مِنْ هَذِهِ الآيَة)[1].

ئایەتەكەش ئەمەیە:

﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾.

واتە: ئەوەی ئاسانە وەری بگرەو، فەرمان بە چاكە بكەو، ڕوو لە نەفامان وەرگێڕە!

چۆنیەتی دەلالەت كردنی ئەم ئایەتەش لەسەر ڕەوشتە جوانە بنەڕەتییەكان، ئاوایە: بێگومان هەموو ئینسانێك هەم ئەو مافی لەسەر خەڵكی هەیەو، هەم مافی ئەوانیشی لەسەرە، ئنجا ئەو مافەی كەلەسەر ئەوانی هەیە، یان پێی دەدەن، یان نا، كەواتە سێ حاڵەت دروست دەبن:

**حاڵەتی یەكەم:** مافێكی ماددیی و مەعنەویی كە لەسەریانی هەیە، وەئامادەشن كەم و زۆر بۆی جێبەجێ بكەن، ئەوە دەبێ چۆن ئاسانەو بۆیان جێ بەجێدەكرێ، لێیان قبووڵ بكات و، بەنەرمیی و ئاسانیی لەگەڵیان بجووڵێتەوە: (خذ العَفْوَ)، چونكە وشەی (عَفو) هەم بەمانای لێبوردن و چاو پۆشیی دێت و، هەم بەمانای شتی ئاسان (السَّهل، الميسور)یش، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ البقرة.

**حاڵەتی دووەم:** مافی ئەوان كە لەسەریەتی و، ئەركی سەرشانی بەرانبەریان، پێویستە بەتێرو تەواویی بۆیان جێ بەجێ بكات و، هیچ كەمتەرخەمیی تێدا نەكات و، هەرچی خێرو چاكەیەو بۆیان بەكەڵكە، ئاڕاستەیان بكات: ﴿ ..وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ.. ﴿١٩٩﴾ ﴾، چونكە كاتێ فەرمان بەچاكەو خەڵك ئاڕاستە كردن و ڕاسپاردن بە چاكەو خێری لێ جوانە، كە بۆ خۆی هەرچی خێرو چاكەیە، پێشتر كردبێتی و لەخۆیدا هێنابێتیە دی.

---

(١) بڕوانە ( صلاح الأمة في عُلوِّ الهِمَّة) ج٥ ص ٢٢٦.

حاڵەتی سێیەم: لە کاتێکدا کە ئەوان ئامادە نەبوون مافی خۆی پێبدەن و، بگرە بێ ئەدەبیی و نەفامیی و سپڵەییشیان بەرانبەر کرد! ئەوە نابێ وەك ئەوان بکات و، پێویستە پشت گوێیان بخات: (وأعرِض عن الجاهلين)، یان وەك لە شوێنی دیکەدا فەرموویەتی:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾ الفرقان.

هەروەها خوێندنەوەو لێوردبوونەوەو تێوەڕامانی بەسەرهاتی پێغەمبەرانی خوا لەگەڵ گەلەکانیان، کە خوا لە قورئاندا باسی کردوون، گەلێك گەلێك دەرس و پەندی گەورە گەورەی ئەخلاقییان تێدا هەن.

## ڕێگای دووەم

شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و خۆ ڕازاندنەوە بە ڕەوشت و ئاکارە بەرزو جوانەکانی:

١- پێشتر باسمان کرد کە خوا (سبحانه و تعالی) لە ئایەتی (٤)ی سورەتی (القلم)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾.

واتە: بێگومان تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی، کەواتە: ئێمەش بە ئەندازەی ئەوە کە بەڕێی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دەچین، وە وەك ئەو دەچین: ڕەوشت و ئاکارەکانی ئەو لە خۆماندا دێنینە دی.

٢- لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٢١)دا خوا (سبحانه و تعالی) ڕێنمایی ئیمانداران دەکاو دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) باشترین سەرمەشق هەیە، بۆ هەرکەسێ کە بە ئومێدی خواوە دیداری خوابێ، وە زۆریش یادی خوا بکا.

هەرکەسێ بە ئومێد بێ بەخزمەت خوا بگات، سەربەرزانە بەخزمەتی بگا، وە بە ئومێدبێ لە دوارۆژدا سەربەرزو سەرفراز بێ، وە زۆریش یادی خوا بکا، ئەوە پێغەمبەری خوا باشترین سەرمەشق و چاوساغیەتی، دیارە لە هەموو ڕووەکانەوە، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان، ئاکارو ڕەوشتی بەرزو پەسندە.

٣- لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتەکانی (٣١و ٣٢)دا خوا (سبحانه و تعالى) پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەدوێنێ و دەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

واتە: تۆ بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن، وە لە گوناهەکانتان دەبووری وە خوا لێبووردەی میهرەبانە، بڵێ: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بێگومان خوا کافرانی خۆش ناوێن.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە ئێمە بە ئەندازەی ئەوەی شوێن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکەوین، ئیسپاتی خۆشەویستیی خۆمان بۆ خوا دەکەین، وە خۆشەویستیی خواش بۆخۆمان وەدەست دەهێنین، یانی: شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەوتۆتە نێوان دوو خۆشەویستییان: شوێن پێ هەڵگرتنی ئێمە بۆ پێغەمبەری خاتەم، بەڵگەی خۆشەویستییمانە بۆ خوا، وە هۆکاری خۆشویسترانمانە لەلایەن خواوە، واتە: شوێن کەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەولاو ئەولای خۆشەویستییە، یەکەمیان: خۆشەویستیی بەندە بۆ خوا، ئیسپاتی دەکا، چونکە بەدوای خۆشەویستەکەی دەکەوێ، دووەمیان: هۆکاری ئەوەیە کە خوا ئەو ئینسانەی خۆش بوێ، کە بەدوای خۆشەویستەکەی دەکەوێ، کە موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم).
دوایی دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

واتە: پێیان بڵێ: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە خوا کافرانی خۆش ناوێن، کەواتە: هەرکەسێ ڕەفزی ڕێ و شوێنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکا، ئەوە بێبڕوایەو کافرەو

خوا خۆشی ناوێ، بەڵام ڕەفزی یەکجارەکیی، ئەگەرنا کەسێ سوننەتێکی پێغەمبەری خوا جێبەجێ نەکا، ئەوە تەنها خێرێکی لەدەست دەچێ، ئەگەر ئەو کارە (مندوب) بێت و (تطوع) بێ، بەڵام ئەگەر واجب بێ، ئەوە گوناهێکی تووش بووە، بەڵام کەسێ بە گشتی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕەفز بکا، ئەوە مانای وایە بێبڕوایە، وە خوای پەروەردگاریش بە تەئکید بێبڕوایانی خۆش ناوێن.

ئنجا دەڵێین:

بێگومان قورئانی بە پیت و پێز، وشە بە وشەو ئایەت بەئایەت لە خواوە، بەهۆی جوبرائیل (روح الأمین)ەوە، دابەزیوەتە سەر دڵ و دەروونی موبارەکی پێغەمبەری بەڕێز:

﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ ﴾ الشعراء.

مادام وابێ، بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەهەموو کەس چاکترو قووڵترو زیاترو ڕاستتر لە فەرمایشتی خوا تێگەیشتوە، بە تەئکید لەهەموو کەسیش چاکترو ڕاستتر زیاتر جێ بەجێ (تطبیق)ی کردوە، بۆیە هەر کەسێك بەڕاستیی ئەو زاتە بەرزو ناوازەیە، بکاتە پێشڕەوو سەرمەشقی خۆی، لەهەر بوارێکدا، بە تایبەت لە بواری ئەدەب و ئاکارو ڕەوشت و ڕەفتاری بەرزو جوان و پەسنددا، ئەوە مسۆگەر هەتا ئەو کەسە بتوانێ و بڕ بکات، پێغەمبەری کۆتایی (صلی الله علیه وسلم) بەو پەڕی لێوەشاوەیی و لیاقەت و کارامەییەوە، پێشڕەویی و مامۆستایەتیی و چاوساغیی دەکات:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

ئنجا شایانی باسیشە کە سەرمەشقێتیی[1] پێغەمبەری خوا، چ لە هەر

---

(١) کتێبی (الشمائل)ی (ترمذي) سەرچاوەیەکی زۆر نایابە بۆ زیاتر ئاشنا بوون بەڕەوشت و ئاکاری بەرزو شیرینی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

بواری ڕەوشت و خووی بەرزو جوان و، چ لە هەر بوارو مەیدانێکی دیکەشدا، هێندە هەمەلایەنەو فراوان و دەوڵەمەندە، بۆ هەموو کەسێك و سەرجەم چین و توێژەکانە، بۆ نموونە:

هەژارو قەرزدارو، دەوڵەمەندو پارەدار!

چەوساوەو بێ دەسەڵات و، دەستەڵاتدارو حوکمڕان!

ئاوارەو کۆچکەرو، نیشتەجێ و خاوەن ماڵ و مەنزڵ!

هاوسەرو خاوەن خێزان و، خێزان و هاوسەر لێ مردوو!

بابی کوڕو کیژو، کوڕو کچ لێ مردوو!

لە جەنگدا سەرکەوتووو، لە جەنگدا شکاوو سەرنەکەوتوو!

شادو دڵخۆش و ڕازیی و، خەفەتبارو دڵتەنگ و تووڕەبوو!

قسە پێگوتران و بوختان بۆ کران و ئازار دران و، مەدح و ستایش کران و ڕێزو حورمەتی زۆر لێگیران! ..هتد.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا لە هەموو ئەو حاڵەتانەو گەلێکی دیکەش دا، چاکترین و بێگەردترین پێشڕەوو سەرمەشقەو، هەر کەسێك ڕێبازەکەی بگرێ، هەتا خوا حەزبکات پاکی دەکات و چاکی دەکات و، بەرەو لووتکەی بەرز بەرزی دەبات.



هەروەها لە کتێبی: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا)ش لە چاپی سێیەمیدا، لەبەشێکی تایبەتدا: باسی خەسڵەت و ڕەوشتە بەرزەکانی ئەو زاتە بەرزەمان کردوە.

■ ڕێگای سێیەم ■

کردنە سەرمەشقی ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆیشتوون، چ لە هاوەڵانی بەڕێزی، چ لە زانایان و پێشەوایانمان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ:

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التوبة) لە ئایەتی (١٠٠)دا دەفەرموێ:

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ (١٠٠)﴾.

واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران و پشتیوانان وە ئەوانەی کە بەچاکیی شوێنیان کەوتوون، خوا لێیان ڕازییە، وە ئەوانیش لەخوا ڕازیین، وە چەند بەهەشتێکی بۆ داناون، ڕووبار بەژێر کۆشکەکانیاندا دەڕۆن، ئەوەش سەرکەوتنی مەزنە.

کەواتە: خوا (سبحانە و تعالی) وەك چۆن ڕازی بووە لە پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران و پشتیوانان، بەهەمان شێوە ئەوانەش کە بەچاکیی شوێنی وان دەکەون، خوا لەوانیش ڕازییە، بەتەئکید بۆیەش خوا لە پشتیوانان و کۆچکردوان ڕازیبووە، چونکە ڕازاوە بوون بە هەموو ڕەوشتێکی بەرزو جوان، وە هەر کەسێکیش بەڕاستی شوێنی وان بکەوێ، ڕازاوە دەبێ بە ڕەوشتی بەرزو جوان، بۆیە ئەو ڕازیبوونەی خوای پەروەردگار، بۆ ئەوانیش دەستەبەرو مسۆگەر دەبێ.

## ڕێگای چوارەم

هاوەڵایەتیی كردن و نزیكیی كردنی چاكان:

١- لە سوورەتی (الفرقان)دا خوا (سبحانه و تعالی) دەفەرموێ:

﴿ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ٢٩ ﴾.

واتە: وە ئەو ڕۆژەی كە بابای ستەمكار هەردوو دەستی خۆی دەگەزێ، {دەگوترێ: كابرا پەنجەی پەشێمانیی دەگەزێ، بەڵام خوا سبحانه وتعالی بۆ ئەوەی دەریخات كە كابرا چەند پەشێمانە، نەك هەر بە پەنجەكانی واز ناهێنێ، بەڵكو دەفەرموێ: هەر دە پەنجەكەی دەگەزێ}، وە دەڵێ: ئەی خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ڕێگام بگرتایە بەر، وە خۆزگە لەگەڵ فلان كەسدا دۆستایەتییم نەگرتبایە، بێگومان منی لە یادو بەرنامەی خوا لادا، وە بێگومان شەیتان هەڵخەڵەتێنەری ئینسانەو، كاتێ كە فریویشیدا لێی دوور دەكەوێتەوەو هاوكاریی ناكات و پشتی بەردەدا.

٢- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەكیدا زۆر جوان وێنای ئەو ڕاستییەمان بۆ دەكا، كە دۆستایەتیی كردنی مرۆڤی باش، چ سوودێك بە مرۆڤ دەگەیەنێ، وە بەپێچەوانەشەوە: دۆستایەتیی و نزیكیی لەمرۆڤی خراپ، چ زیانێكی لێ دەدا، لە فەرموودەیەكدا دەفەرموێ:

{مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ والجَليس السُّوءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً} أخرجه البخاري برقم (٥٢١٤)، ومسلم برقم (٢٦٢٨).

واتە: وێنەی هاوەڵی باش و هاوەڵی خراپ، وەك هەڵگری میسك و فووكەر لە مووشەدەمە {واتە: ئاسنگەر} وایە، هەڵگری میسك {واتە: عەتر فرۆش، یان ئەوەی كە بۆنی خۆشی پێیە}، یان دەتداتێ {بۆنێكت لێدەدا دەڵێ: بزانە چۆنە؟} یان لێی دەكڕی، یاخود هەر بەلای دابێی، بۆنی خۆشت بۆدێ، وە ئەو كەسەی كە فوو لە مووشەدەمە دەكا {بۆ ئەوەی ئاگرەكە خۆش بكاو ئاسنی پێ نەرم بكاو پاشان بیكوتێ} ئەگەر لێی نزیك بی، یان بەرگەكەت دەسووتێنێ بەپڕیشكەكانی، یاخود بۆنێكی ناخۆشت بۆدێ {بۆنی ئاسن و دووكەڵ و شتی سووتاو}.

كەواتە: دۆست و ڕەفیقی باش، هەر چۆنبێ بە شێوەیەك لە شێوەكان، لێی بەهرەمەندی، وە دۆست و ڕەفیقی خراپیش، هەر چۆن بێ، بە شێوەیەك لەشێوەكان، لێی زەرەرمەندی.

٣- وە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەكی دیكەدا دەفەرموێ:

{الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ } أخرجه أبو داود برقم (٤٨٣٣)، والترمذي برقم (٢٣٧٨) وقال : حسن غريب قال الألباني : حسن.

واتە: پیاو[1] (واتە: مرۆڤ) لەسەر ئایینی خۆشەویستەكەی خۆیەتی، بۆیە هەركام لە ئێوە با سەرنج بدا، بزانێ لەگەڵ كێدا خۆشەویستیی دەكات و دۆستایەتیی دەگرێ.

واتە: تۆ بتەوێ و نەتەوێ كارلێكراو دەبی بەو كەسەی، كە تێكەڵیی لەگەڵ دەكەی، دۆستایەتیی لەگەڵ دەكەی، ئنجا چاك بێ، یان خراپ بێ.

---

(١) لێرەدا كوڕەكە كوڕی پیاوان بووە. ئەگەرنا بۆ ئافرەتانیش هەر وایە.

## ڕێگای پێنجەم

پەند وەرگرتن لە هەڵان:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ}، أخرجه أحمد برقم (١٣٠٧٢)، والترمذي برقم (٢٤٩٩)، وقال: غريب، وإبن ماجة برقم (٤٢٥١)، والدارمي برقم (٢٧٢٧)، والحاكم برقم (٧٦١٧)، وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٧١٢٧)، قال الألباني: حسن.

واتە: هەموو ئادەمیزادەکان خەتاکارن، باشترین خەتاکارانیش گەڕاوەوانن، {ئەوانەی کە بۆلای خوا دەگەڕێنەوەو پەشیمان دەبنەوە}.

کەواتە: مرۆڤ ناتوانێ ببێتە فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵە، مرۆڤ کەم و کوڕیی هەر دەبێ، خوای بەبەزەیی دەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾

آل عمران.

واتە: وە ئەوانەی کاتێك شتێکی ناقۆڵا دەکەن، یاخود ستەم لە خۆیان دەکەن، خوایان دەکەوێتەوە یاد، داوای لێبوردن دەکەن، وە بێجگە لە خوا، کێ لە گوناهان دەبووری؟ وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی کردوویانە، لە کاتێکیشدا دەزانن کە خراپە.

کەواتە: ئینسان کە هەڵەی کرد، دەبێ پەندی لێ وەربگرێ، وە بگەڕێتەوە بۆلای خواو داوای لێبوردن لەخوا بکا، وەك دوایی لە فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوادا دەیهێنین، کە فەرموویەتی: (بەدوای خراپەدا چاکە بکە، دەیسڕێتەوە).

ئینسان دەبێ پەند لەهەڵەو کەم و کوڕییەکانی خۆی وەربگرێ.

دەگێڕنەوە لە لوقمانی حەکیمیان پرسیوە، ئەو عەقڵ و حیکمەتەت لەکوێ هێنا؟

گوتوویەتی: لە هەڵەکانی خۆمەوە.

گوتوویانە: چۆن؟

گوتوویەتی: قسەیەکی هەڵە، یاخود ڕەفتارێکی هەڵەم دەکرد، خەڵك زەمی دەکردم و پێی ناشیرین دەبووم، پەندم لێی وەردەگرت، ئەو هەڵەیەم دووبارە نەدەکردەوە، لە ڕاستییدا هەر کەسێ هەڵەیەکی کرد، دووبارەی نەکاتەوە، دەبێتە خاوەنی ڕەوشتێکی بەرزو جوان.

بەڵام گرفتی ئێمە ئەوەیە، کە هەڵەکان نەك دووبارە، بەڵکو چەند بارە دەکەینەوە، بەڵکو جاری وا هەیە ئەو هەڵەو کەم و کوڕییانە لێشیان زیاد دەکەین، نەك هەر وەك خۆیان دووبارەیان بکەینەوە، بەڵکو بەزیادەوەش دووبارەیان دەکەینەوە.

## ڕێگەی شەشەم

پەند وەرگرتن لە هەڵەی خەڵكی:

لە قورئاندا خوای بەرزو مەزن ئاماژەی بەوە داوە، وەك لە سوورەتی (الحشر) لە ئایەتی (٢)دا دەفەرمویٙ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مِن دِيَـٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا۟ ۖ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُوا۟ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿٢﴾ ﴾.

ئەو ئایەتانە دەربارەی هۆزی (بنی النضیر)ی جوولەکە هاتنە خوار، کە لە مەدینە بوون، وە پەیمان شکێنییان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، وە سەرەنجام وەك سزایەك بۆ پەیمان شکێنییان، لە مەدینە دەرکران، ئنجا خوای دادگەر باسی ئەوەمان بۆ دەکاو دەفەرمویٙ: خوا ئەو کەسەیە کە ئەوانەی بیٙ بڕوا بوون لە خاوەن کتێبەکان لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەری کردن، بۆ یەکەمین جارێك کە کۆبوونەوە بەرەو شام، دوایی لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرمویٙ: ( فَٱعْتَبِرُوا۟ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ ) واتە: دەجا پەند وەربگرن ئەی خاوەن عەقڵان! واتە: پەند لە هەڵەی ئەوان وەربگرن.

ئەها! هەرکەسیٙ هەڵەی کرد، دەبیٙ باجەکەی بدا، هەرکەسیٙ خیانەتی کرد، دەبیٙ سزا بدریٙ، ئێوەش خیانەت مەکەن، بۆ ئەوەی باجی نەدەن و لەسەری سزا نەدرێن، عەرەب گوتوویانە: (السَّعيد مَن اتَّعظَ بِغيْرِه) واتە: بەختەوەر کەسێکە پەند لە غەیری خۆی وەربگریٙ، ئەگەر ئینسان پەند لە غەیری خۆی وەربگریٙ، بەتەئکید زۆر باشترە لەوە، کە پەند لە هەڵەی خۆی وەربگریٙ، هەرچەند پەند لە هەڵەی خۆشی وەربگریٙ هەر باشە، بەڵام ئەو هەڵەیە کە غەیری تۆ دەیکا، تۆ پەندی لێوەربگری، بۆ ئەوەی ئەو هەڵەیە نەکەی، ئەوە بەتەئکید زۆر باشترە.

## ڕێگای حەوتەم

لەگەڵ خۆدا تێکۆشـان:

با سەرنجی ئەو چەند ئایەت و فەرموودەیە بدەین لەو بارەوە:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ النازعات.

واتە: ئنجا هەر کەسێك لە پایەی پەروەردگاری ترسا (یاخود لە ڕاوەستانی بەردەم دادگای پەروەردگاری خۆی ترسا)، وە نەفسی خۆی لە ئارەزووە نارەوایەکانی گێڕایەوە، ئەوە بەهەشت جێگاو ڕێگایەتی، کەواتە: دەبێ ئینسان نەفسی خۆی لە ئارەزووەکانی بگێڕێتەوەو، جڵەوی نەفسی خۆی توند بکا، وەك یەکێ لە زانایان لە شیعرێکی زۆر جوانیدا دەڵێ:

وَمَن أَباحَ النَّفْس ما تَهْواهُ فَـإِنَّـمـا إِلهُـهُ هَـواهُ

واتە: هەر کەسێ نەفسی چی حەزی لێبوو بۆی ڕەوا بکاو ڕێگای پێ بدا، ئەوە ئارەزوی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی.

٢- هەروەها خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (النجم) لە ئایەتەکانی: (٣٩و٤٠) دا دەفەرموێ:

﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾.

واتە: وە بێگومان هیچ بەرهەمێك بۆ مرۆڤ نیە، مەگەر تێبکۆشێ و هەوڵ بداو خۆی ماندوو بکا، ئەگەرنا هیچی دەستگیر نابێ، وە بەرهەمی کۆششەکەشی

لەمەودوا دەبینرێ (هەم لەلایەن خۆیەوە، هەم لەلایەن خەڵکەوە، هەم لەلایەن خواوە).

٣- وە لە سوورەتی (العنكبوت) ئایەتی (٦)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَن جَاهَدَ فَإِنَّمَا يُجَاهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ... ﴿٦﴾ ﴾.

واتە: وە بێگومان هەر کەسێ هەوڵ بداو تێبکۆشێ، ئەوە تەنیا بۆ نەفسی خۆی تێدەکۆشێ، واتە: سوودەکەی بۆخۆیەتی.

٤- پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە کە ئینسان دەبێ هەوڵ بداو تێبکۆشێ، وە ڕاهێنان بەخۆی بکاو خۆی ئەزیەت بدا، ئنجا ڕەوشتی بەرزو جوانی دەستگیر دەبێ، دەفەرموێ:

{وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفُّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ} أخرجه مالك برقم (١٨١٢)، وأحمد برقم (١١٩٠٨)، والدارمي برقم (١٦٤٦)، والبخاري برقم (١٤٠٠)، ومسلم برقم (١٠٥٣)، وأبو داود برقم (١٦٤٤)، والترمذي برقم (٢٠٢٤) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٢٥٨٨)، وابن حبان برقم (٣٤٠٠).

واتە: بێگومان هەر کەسێ خۆی لەسەر پاکیی ڕابهێنێ، {(عِفَّة) پاکیی، چ پەیوەندیی بە لایەنی داوێن پاکییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە ماڵ و سامانەوە هەبێ}، خوا پاکی دەکا، وە هەرکەسێ خۆی لەسەر بێنیازیی ڕابهێنێ، چاوی لەدەستی خەڵکی نەبێ، خوا بێنیازی دەکاو دڵی دەوڵەمەند دەکا، وە هەرکەسێ خۆی لەسەر ئارامیی ڕابهێنێ، خوا ئارامیی پێ دەبەخشێ.

کەواتە: دەبێ کار لەسەر خۆت بکەی و خۆت ئەزیەت بدەی، ئەگەرنا لەخۆوە پاکیی و ئارامیی و بێنیازییت دەست ناکەوێ، بەڵکو خوای پەروەردگار ئەو سیفەتانە بە کەسێ دەبەخشێ، کە لەگەڵ خۆیدا خەریك بێ و کار لەسەر خۆی بکا.

٥- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ:

{إنَّما العِلمُ بِالتَّعلُّم، وَإِنَّما الحِلم بِالتَّحلُّم، وَمَن يَتَحرَّ الخَيْرَ يُعْطَهُ، وَمَن يَتَّقِ الشَّرَّ يُوقَهُ} أخرجه الطبراني في الأوسط برقم (٢٦٦٣)، قال الهيثمي (١٢٨٩/١): فيه محمد بن الحسن بن أبي يزيد وهو كذاب، والخطيب (٢٠١/٥)، وابن عساكر (٩٧/١٨)، قال الألباني حديث حسن.

واتە: بێگومان زانیاریی بە فێربوونە، {دەبێ خۆت فێر بکەی فێرخواز بی و هەوڵ بدەی، ئنجا فێر دەبی، هەر لەخۆوە زانستت بۆ پەیدا نابی}، هێدیی و مەندییش بە خۆ لێراهێنانە، بە مەشق بەخۆ کردنە، وە هەرکەسێ بەدوای خێرو چاکەدا بگەڕێ، پێی دەدرێ، هەر کەسێ خۆی لە خراپە بپارێزێ، دەپارێزرێ.

کەواتە: دەبێ بەدوای خێردا بچی، ئنجا خێرت پێ دەدرێ، وە دەبێ خۆت لەشەڕ لابدەی، ئنجا شەڕت لێ دوور دەبێ.

٦- هەروەها خوا (سبحانه و تعالى) لە سووڕەتی (العنكبوت) ئایەتی (٦٩)دا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾.

واتە: وە بێگومان ئەوانەی لەپێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ئێمە ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، وە بە دڵنیایی خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە، کەواتە: بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان تێدەکۆشێ و خۆی ماندوو دەکا، پێی دەبەخشرێ.

**(جهاد)** واتە: (بَذل الجُهد) توانای خۆت خەرج بکەی و بەکاری بهێنی، بەئەندازەی ئەوە کە ئینسان توانای خۆی بەکار دەهێنێ و، هەوڵ و کۆششی خۆی دەدا، ئەنجامی دەستگیر دەبێ.

لێرەدا خوا دەفەرموێ: ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، بۆیە فەرموویەتی: ڕێبازەکانمان (سُبُلَنَا) چونکە لەزۆر ڕێیانەوە ڕەزامەندیی خوا بەدەست دێ، لەزۆر ڕێیانەوە بەهەشتی خوا بەدەست دێ، هەموو ئەو ڕێیانەی کە ڕێی تاعەتن، ڕێگای بەدەست هێنانی بەهەشتن، ڕێگای وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوای پەروەردگارن، هەر کەسێ خۆی ماندوو بکا، بەدڵ ڕوو لەخوا بکاو کار لەسەر خۆی بکا، خوای میهرەبان دەیخاتە سەر ئەو ڕێیانەی، کە بەرەو بەهەشتی دەبەن، خوای بەخشەر بە لوتفی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ.

## ڕێگای هەشتەم

### پاراستنی تەمەن و ئەندامەکان و سامان و زانست، لە شتی بێ هوودەو پووچ و خراپ:

ڕێگای هەشتەمی وەدەست هێنانی ئەدەبی بەرزو جوان و ڕەوشت و ئاکاری ڕەندو پەسند، ئەوەیە کە ئینسان لەو چوار شتانە وریا بێت، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ڕۆژی قیامەتێ هیچ کەس مەودای نادرێ، دوو پێی بەملاو بەو لادا بچن، هەتا دەربارەیان پرسیاری لێنەکرێ!:

{لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلاهُ} أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤١٧) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٧٤٣٤)، وَأَبُو نعيم في الحلية (ج١٠، ص٢٣٢)، أيضاً عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: {لا تَزُولُ قَدَمَا ابْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عِنْدِ رَبِّهِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ خَمْسٍ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَ أَفْنَاهُ، وَعَنْ شَبَابِهِ فِيمَ أَبْلاهُ، وَمَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ، وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَمَاذَا عَمِلَ فِيمَا عَلِمَ}.

واتە: لە ڕۆژی دواییدا دوو پێی هیچ بەندەیەك (لەبەردەم دادگای خوادا) ناجووڵێ و بەملاو لادا ناچێ، هەتا دەربارەی پێنج شتان پرسیاری لێ نەکرێ:

**یەك:** لەتەمەنی، داخۆ لە چیدا بەڕێی کردوە؟!

**دوو:** وە لە زانیارییەکەی، داخۆ چی پێکردوە؟!

**سێ و چوار:** وە دەربارەی ماڵ و سامانی، داخۆ لە کوێی پەیدا کردوەو، لە چیدا خەرجی کردوە؟!

**پێنج:** وە لەبارەی جەستە (و ئەندامەکانی)یەوە، داخۆ لە چی دا بەکاری هێناوە؟!

ئنجا پێویستە بشزانرێ، كە كاری مرۆڤ تەنیا بەوەندە پێك نایەت كە: تەمەن و جەستەو زانست و ماڵ و سامانەكەی، لەخراپەو گوناح و شتی پووچ و بێ هوودەدا بەكار نەهێنێ، بەڵكو دەبێ زۆر بەوریایی و بێدارییەوە، بەردەوامیش سەرگەرمی ئەوە بێ كە تاعەتی زیاترو چاكتریان پێ ئەنجام بدات و، پاداشتی باشتریان پێ دەستگیر بكات، ئەگەرنا، تەنیا نەكردنی گوناح، بەبێ چاكەكاریی و طاعەت، بە (فضیلة) دانانرێ و هیچی لێ هەڵناوەرێ، دەنا دەبوایە دارو بەرد لە هەموو كەس دیندارترو مسوڵمانتر بوونایە!!

لەباسەكانی داهاتووشدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم مەسەلەیەو، لێرە بەم ئەندازەیە لێی دەگەڕێین.

## ڕێگای نۆیەم

لێپرسینەوە لەگەڵ خۆدا کردن و، بەسەر هەڵەو پەڵان دا ڕانەبوردن:

شتێکی ئاشکراو ڕوونە، کە هیچ شتێك بەبێ ئەرك و زەحمەت کێشان و ڕەنج دان نابێ و، خۆ بژار کردن لە خوو خدە بەدەکان و، خۆ ڕازاندنەوەش بەخەسڵەت و ئاکارە بەرزو جوان و پەسندەکانیش، پێویستی بە خەم و مشوور خواردن و هەوڵ و تەقەللا هەیە، پێغەمبەری خوا (صل الله علی وسلم) فەرموویەتی:

{إِنَّمَا العِلْمُ بالتَّعَلُّمِ، وَإِنَّمَا الحِلْمُ بالتَّحَلُّمِ، ومَنْ يَتَحَرَّ الخَيْرَ يُعْطَهُ، ومنْ يَتَّقِ الشَّرَّ يُوَقَّهُ} أخرجه الطبراني في الأوسط برقم (٢٦٦٣)، والخطيب (٢٠١/٥)، وابن عساكر (٩٧/١٨)، وَحَسَّنَهُ الأَلباني.

واتە: بێگومان زانیاریی تەنیا بە فێربوونەو، هێمنیی و ئارامییش، بەس بەخۆڕاهێنانە لەسەر هێمنیی و مەندیی، وە هەر کەسێك لە چاکە بخەفتێ، پێی دەبەخشرێ و، هەر کەسێکیش خۆی لە خراپە بپارێزێ، دەپارێزرێ.

کەواتە: لەگەڵ خۆدا خەریك بوون و، لەخۆخەفتان و وریا بوون، ڕێگایەکی گەورەو بنەڕەتیی وەدەستهێنانی ئەدەب و ئاکاری بەرزو پەسندە، وە بەبێ ئەوە، ڕێگاو شێوازەکانی دیکەش، ئینسان پێیان بە ئامانج ناگات.

ئنجا بەبێ لێپرسینەوە (محاسبة) لەگەڵ خۆدا کردن و، لەخۆ پێچانەوەش، ئینسان پرۆسە (عملية)ی تەزکیەو لەگەڵ خۆدا خەریك بوونی بۆ ئەنجام نادرێ، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا لەخۆپرسینەوە (محاسَبة النَّفس)ی بەکارو ڕەفتاری مرۆڤی عاقڵ و دووربین داناوەو، خۆ وێڵ کردن (إهمال النّفس)یشی بە پیشەی بابای کەودەن و دەستە پاچەو نەزان داناوە:

{الْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا، وَتَمَنَّى عَلَى اللَّهِ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧١٦٤)، وَالتِّرمِذِي برقم: (٢٤٥٩) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٦٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٩١) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي.

واتە: عاقڵ ئەو کەسەیە، کە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا دەکات و، بۆ پاش مردنی کار دەکات، نەفام و دەستە پاچەش کەسێکە، کە نەفسی دەخاتە دوای ئارەزووەکانی و خۆزگەو ئاواتیش لە خوا دەخوازێ.

کۆتایی ئەم خاڵەش بەم گفت و گۆیەی خوارەوە دێنین، کە لە نێوان (فُضیل بن عیاض)و پیاوێکدا ڕووی داوە[1]:

(فُضیل) پێی گوت: تەمەنت چەندە؟

کابرا گوتی: شەست ساڵ.

(فُضیل) گوتی: کەواتە: تۆ ماوەی شەست ساڵە بەرەو خوا دەچی و نزیکە بیگەیە.
کابرا گوتی: (إنّا للهِ وإنّا إلَيهِ راجِعون).

(فُضیل) گوتی: دەزانی مانای چی یە؟ دەڵێی: من بەندەی خوام و بۆلای وی دەگەڕێمەوە، ئنجا کەسێك بزانێ بەندەی خوایەو، بۆ لایشی دەگەڕێتەوە، دەبێ بزانێ کە ڕادەوەستێنرێ، وە مادام دەزانی ڕادەگیرێ، با بزانێ کە لێی دەپرسرێ، کەسێکیش بزانێ لێی دەپرسرێ، با وەڵامی پرسیارەکان ئامادە بکات!
کابرا گوتی: ئنجا چارەو تەگبیر چی یە؟!

(فُضیل) گوتی: ئاسانە.

کابرا گوتی: چۆنە؟

(فُضیل) گوتی: لەوەندە تەمەنەتدا کە ماوتە، چاکەکاریی بکە، لەوەی گوزەراندووتە چاوپۆشییت لێدەکرێ، بەڵام ئەگەر ئەوەندەش کە ماوتە، هەر خراپەی تێدا بکەی، لەسەر ئەوەش کە ڕابردوەو لەسەر ئەوەش کە ماوە، سزا دەدرێی.

---

(١) بڕوانە (جامع العلوم والحكم)ی ابن رجب، ص ٤٦٤.

■ ڕێگای دەیەم ■

مامۆستایەكی زاناو بەسۆز، یان
دۆست و برادەرێكی دانا و دڵسۆز:

دەیەمین ڕێگای چۆنیەتی وەدەست هێنانی ئەدەب و ئاكاری بەرزو پەسند، بریتیە لەوە، كە ئینسان مامۆستاو چاو ساغ و ڕێڕوونیی كارێكی بە پەرۆش و مشوورخۆر، یان بەلای كەمەوە دۆست و ڕەفیقێكی داناو دڵسۆزی هەبێ و، بەردەوام بیخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوە، لە هەر هەڵەو كەم و كورییەك ئاگاداری بكاتەوە، بۆ ئەنجامدانی هەر كارو ڕەفتارێكی پەسندو باش، بێداری بكاتەوە.

ئنجا هەرچی مامۆستاو چاوساغە، ئەوە ڕۆڵێكی یەكجار گرنگ دەگێڕێ لەبواری تەزكیەی نەفس و فێربوونی ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو جواندا، چونكە بەتەئكید دەتوانێ زۆر قۆناغان ڕێ بۆ ئینسان كورت بكاتەوە، گەلێك گرفت و گرێ و گۆڵی بە زەحمەتی بۆ بكاتەوە، لە زۆر ناهەمواریی ڕزگاری بكات، چونكە بابای مامۆستاو شارەزا، پێشتر ئەو ڕێیەی بڕیوەو ئەو ئەزموونەی دیوە!

دیسان دۆست و برادەری داناو دڵسۆزییش، لەو جۆرانەی كە لەبارەیانەوە گوتراوە: (صَديقُكَ مَنْ صَدَقَكَ، لا مَنْ صَدَّقَكَ). برادەرت كەسێكە لەگەڵت ڕاست بكات، نەك هەرچی گوتت بڵێ ڕاستە! بەڵێ دۆست و ڕەفیقی دڵسۆزو وەفاداریش، كە پێغەمبەری خوا صلى لله عليه وسلم لەو بارەوە فەرموویەتی:

{الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ فَإِن رَأَى فيهِ عَيْباً أَصْلَحَهُ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد برقم: (٤٩١٨)، وَحَسَّنَهُ الألباني.

واتە: بڕوادار ئاوێنەی بڕوادارە، ئنجا هەركات نارێكییەكی تێدا بینی، لێی لادەبات. پێشینانیش ڕاستیان گوتوە: (دۆست ئەو كەسەیە كەدەتگریەنێ و، دوژمنیش كەسێكە كە دەتهێنێتە پێكەنین).

بەڵێ، دۆست و هاوەڵی دڵسۆزو وەفاداریش، كاریگەریی گەورەی هەیە لەسەر گەشە پێدانی ڕەوشت و ئاكاری مرۆڤ.

# بەشی حەوتەم

## سێ ڕاستیی گەورە و گرنگی قوڕئانیی لە بارەی ڕەوشتی بەرزو جوانەوە[1]




ئێمە لەم بەشەماندا سێ ڕاستیی، گەورەی قوڕئانیی، كە لەبارەی ڕەوشت و ئاكاری بەرزو جوانەوە خستوونیە ڕوو، باس دەكەین:

---

(١) هەڵبەتە من تەنیا سێ ڕاستییم لێ دەرهێناون، ئەگەرنا، قوڕئان، زۆر ڕاستیی بێ سنووری تێدان، لە هەموو ڕوویەكەوە.

■ ڕاستیی یەکەم ■

## ئیمان دەبێتە هۆی تاعەت و فەرمانبەری بۆ خوا، وە تاعەت و فەرمانبەریی بۆ خوا دەبێتە هۆی پەیدا بوونی ڕەوشتی بەرزو جوان

با لەو بارەوە تەماشای ئەو بەڵگانەی خوارەوە بکەین:-

١- لە سووڕەتی (إبراهیم) ئایەتەکانی: (٢٤و ٢٥) دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

واتە: ئایا سەرنج نادەی خوا چۆن وێنەی هێناوەتەوە بۆ وشەیەکی پاك و چاك، بە درەختێکی پاك و چاك {درەختێکی بەردار، بەپیز} کە ڕەگ و ڕیشەکەی، قەدەکەی، چەسپاوە، وە لق و پۆپەکەی بەرز بۆتەوە بەرەو سەرێ، هەموو کاتێ بە فەرمانی پەروەردگاری بەرو میوەی دەردەکا، وە ئاوا خوا وێنان بۆ خەڵکی دەهێنێتەوە، تاکو پەند وەربگرن.

لێرەدا خوای پاك و بێوێنە باسی درەختی کردووە، سێ شتی لە درەختەکە باس کردوون، وە ئەو درەختەی کردوە بە وێچوێنراوی (مُشَبَّهٌ به) وشەی چاك و پاك، کە زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست لە (كَلِمَةً طَيِّبَةً) وشەی خوا بەیەکگرتنە، خوای پەروەردگار باسی (أصل)ی کردوە بۆ درەختەکە، ئەصڵ: واتە ڕەگ و ڕیشە، بنك،

ئەوە چەسپاوە، وە باسی (فرع)ی کردوە واتە: قەدو لق و پۆپ و گەڵا، کە بەرز بۆ تەوە بۆ سەری، ئنجا باسی (أُكُل)ی کردوە واتە: بەرو میوەو دەفەرموێ: (تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذۡنِ رَبِّهَاۗ ) واتە: هەمیشە میوە دەردەکا بە فەرمانی پەروەردگاری.

دەگونجێ بڵێین: خوای زاناو شارەزا بەراوردی کردوە لەنێوان ئەو درەختەو ئەو وشە بەرزو پەسندو چاکەدا، کە دەگونجێ بڵێین: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، لەجێی بنك و ڕەگ و ڕیشەی ئەو درەختەیە، وە تاعەت و فەرمانبەریی بۆ خوا، لەجێی ئەو قەدو لق و پۆپەکەیە، وە ڕەوشتە بەرزو جوانەکان و ئاکارە پەسندەکان، لەجێی ئەو بەرو میوەیەن، کە ئەو درەختە دەری دەکا، دیارە: هەتا درەخت ڕەگ و ڕیشەو بنکی نەبێ، قەدو لق و پۆپی نابێ، وە هەتا قەدو لق و پۆپیشی نەبێ، بەروبوومی نابێ، ئنجا مسوڵمانەتییش: هەتا ئیمان و عەقیدە نەبێ، فەرمانبەریی و تاعەت و عیبادەت نابێ، وە هەتا تاعەت و فەرمانبەریی بۆخوا نەبێ، ڕەوشتی بەرزو جوانیش نابێ، هەمیشە ئەخلاقی بەرزو ڕەوشتی جوان، هی کەسانێکە کە بۆخوا صوڵحاون، وە کەسانێکیش بۆ خوا دەصوڵحێن، کە ئیمان و عەقیدەیان لەدڵدا دامەزرابێ.

٢- وە ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (المؤمنون)دا، کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ٣ ﴾.

ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوەی ئیمان و عەقیدە، وە تاعەت و عیبادەت، وە ڕەوشتی بەرز، هەرسێکیان بەیەکەوە پەیوەستن، بەم شێوەیە:

- (قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ) واتە: بەڕاستیی بڕواداران سەرفرازن (ئەوە ئیمان و عەقیدە).

- ( ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ) ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا ملکەچن (ئەوەش عیبادەت).

-(وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ) وە ئەوانەی کە واز لە قسەی پووچ و شتی پووچ دەهێنن و پشتی تێ دەکەن (ئەوەش ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند).

کەواتە: کەسێك واز لە قسەی پووچ و کاری پووچ دەهێنێ، کە نوێژێکی خاشیعانەی هەبێ، کەسێکیش نوێژی خاشیعانەی دەبێ، کە ئەهلی ئیمان بێ.

■ ڕاستیی دووەم ■

## خوای كاربەجێ بە تێكهەڵكێشیی باسی: ئیمان و، عیبادەت و، ڕەوشت، دەكا لە قورئـــاندا

بە تێكهەڵكێشیی واتە: جاری وا هەیە كە باسی ئیمان دەكرێ، كە بێگومان ئیمان وەك بنچینەیە بۆ دینداریی، یاخود باسی تەقوا دەكرێ، ئنجا باسی عیبادەت و تاعەت بۆ خوا دەكرێ، وەدواتر باسی ڕەوشت و ئاكارە بەرزو جوانەكان دەكرێ، وە جاری وا هەیە پاش و پێش بەوانە دەكرێ، بەپێی ئەو سیاقە كە دەیخوازێ، بۆ وێنە:

١- وەك پێشتریش هێنامان لە سوورەتی (الشورى) لە ئایەتەكانی (٣٦-٣٩)دا، خوای پاك و تاك، ئاوا دەفەرموێ:

﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾.

لێرەدا خوا (سبحانه و تعالى) ئەوە دەخاتە ڕوو، كە هەرچی خۆشیی و لەززەتە پێتان دراوە، ڕابواردنێكی كەمی دنیایە، بەڵام ئەوەی لەلای خوایە

باشترە وە زیاتریش دەمێنێتەوە بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە.

پێشێ باسی ئیمان دەکا، ئنجا باسی ئەوە دەکا، کە ئەوانە پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، دوایی باسی ئەوە دەکا، کە ئەوانە خۆیان لە گوناهە ناقۆڵاو دزێوەکان دەپارێزن، پاشان باسی ئەوە دەکا، کە ئەوانە لە کەسێك دەبوورن، کە لێی تووڕە بوون، دوایی باسی ئەوە دەکات کە بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە دێن، وە نوێژ بەرپا دەکەن، وە کاروباریان بە ڕاوێژ ئەنجام دەدەن، وە لەوەی پێیداون دەبەخشن، وە پاشان باسی ئەوە دەکا، کە ئەوانە کاتێك ستەمیان لێ دەکرێ و دەستدرێژییان دەکرێتە سەر، تۆڵە دەستێننەوەو بەرگریی لەخۆیان دەکەن.

**وەك دەبینین:** پێشێ خوا باسی ئیمان دەکا، ئنجا خۆ پاراستن لە گوناح و خراپە، دوایی کپ کردنەوەی تووڕەیی، پاشان بەدەم بانگی خواوە چوون، ئنجا باسی نوێژ دەکا، دوایی باسی کاروبار بە ڕاوێژ بەڕێوەبردن، ئنجا باسی ماڵ و سامان بەخشین دەکات، دوایی باسی تۆڵە ستاندنەوە لە کەسێك، کە دەستدرێژیی دەکا، واتە: سیفەتەکان هەموویان تێکهەڵکێشن، ئایا ئەوە لەبەرچی وایە؟!

لەبەر ئەوەی ژیانی ئینسانیش هەروایە، بۆ وێنە: کە مانگی ڕەمەزان دێتە پێش، وەنەبێ هەر ڕۆژوو گرتن بێ، مرۆڤ ڕۆژوو دەگرێ، دوایی نوێژی تەراویح دەکا، ئنجا ماڵ دەبەخشێ، کارو کەسابەت دەکا، دوایی پەیوەندیی خزمایەتیی جێبەجێ دەکا، کە وتار دەدرێ، گوێ دەگرێ .. هتد.

کەواتە: ژیانیش خۆی تێکەڵەو هەمەڕەنگە، بۆیە خوای کارزان بابەتەکانی لە قورئاندا کە خستوونە ڕوو، بە هەمەڕەنگیی و بەتێکەڵیی خستوونیە ڕوو، نەك ئینسان کاتێ کە خەریکی ڕۆژوو گرتنە، هەر خەریکی ڕۆژوو گرتنەکەی بێ، یان بۆ وێنە: مرۆڤ دەچێ بۆ حەج، هەر حەج کردنەکە نیە، ماندوو برسیی دەبێ، نان دەخوا، دێ و دەچێ، لەگەڵ خەڵك دادەنیشێ، واتە: هەمیشە تاعەت و عیبادەت بۆ خوا، لەگەڵ هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکی خوا، لەگەڵ چالاکییە جۆراو جۆرەکان، لەگەڵ هەڵس و کەوت لەگەڵ خۆدا، هەموو ئەوانە تێکەڵن و لەیەك دابڕاو نین.

٢- هەروەها لە ئایەتەکانی: (١٩- ٢٢)ی سوورەتی (الرعد)دا، کە پێشتریش ئاماژەمان پێدان و لێرەش دووبارەیان دەکەینەوە، کە دەفەرموێ:

﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾﴾.

باسی هەشت نۆ سیفەتی جوان و باش کراوە، دیسان بە تێکەڵیی و هەمەڕەنگیی.

٣- وە لە سوورەتی (الفرقان) ئایەتەکانی (٦٣-٧٤)دا خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾.

لەم دوازدە ئایەتەشدا خوای زاناو شارەزا باسی شازدە (١٦) سیفەتی گەورەو گرنگی بەندە هەڵبژاردەکانی خۆی دەکات، کە بەپێی ڕیزبەندیی ئایەتەکان، ئەمانەن:

١- بەهێمنیی بەڕێدا ڕۆیشتن.

٢- قسەی سەلامەت لەگەڵ نەفاماندا کردن و، واز لێهێنانیان.

٣- شەوگار بردنە سەر بە کڕنووش بۆ خوای پەروەردگار بردن و، قورئان خوێندن بە پێوە.

٤- لەخوا پاڕانەوەو پەنا پێبردنی لە ئاگری دۆزەخ.

٥ و ٦- لەکاتی ماڵ و سامان خەرج کردندا زێدەڕۆیی نەکردن و، چرووك و ڕژد نەبوون.

٧- لەگەڵ خوادا نەپاڕانەوە لە هیچ پەرستراوێك.

٨- نەکوشتنی هیچ کەسێك مەگەر بەهەقی شەرعیی ڕوون.

٩- زینا نەکردن.

١٠ و ١١- گەڕانەوە بۆ لای خواو، کردەوەی باش ئەنجام دان.

١٢ و ١٣- ئامادە نەبوون لە کۆڕو مەجلیسی گوناهو درۆداو، بەڕێزەوە ڕابردن بەلای قسەو ڕەفتاری پووچدا.

١٤- کەڕو کوێرانە مامەڵە نەکردن لەگەڵ ئایەتەکانی خوادا، بیستراو بن، یان بینراو.

١٥ و ١٦- پاڕانەوە لە پەروەردگار کە هاوسەرو وەچەیان مایەی شادمانییان بن، وە ببنە پێشەواو سەرمەشقی پارێزکاران.

■ ڕاستی سێیەم ■

## خۆ بژار کردن لە ئاکاری خراپ، وە خۆڕازاندنەوە بە ئاکاری بەرز و پەسند، لە قورئاندا بە حیکمەت[1] ناونراوە

بەڵگەشمان ئەوەیە کە:

لە سووڕەتی (الإسراء) ئایەتەکانی: (٢٣-٣٩)دا، کە ئەمە دەقەکەیانە:

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ

---

(١) زانایان زۆر مشتومڕیان بووە لەو بارەوە، کە ئایا حیکمەت یانی چی؟ دەگونجێ حیکمەت ئەگەر بە یەك وشە مانای بکەین بڵێین: (کارامەیی، دانایی، وەستایی، قسەو کرداری بەجێ).

رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَاقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ ۖ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلَا يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ ۖ إِنَّهُ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُ ۚ وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ ۖ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ۚ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ﴿٣٦﴾ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ مِمَّا أَوْحَىٰ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتُلْقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾ ﴾

خوای پەروەردگار لەو شازدە ئایەتەدا باسی دوازدە (١٢) سیفەتی بەرزو جوان دەكا، كە مرۆڤ دەبێ خۆییان پێ برازێنێتەوە، هەروەها باسی دوازدە (١٢) سیفەتی خراپیش دەكا كە دەبێ خۆییان لێ بپارێزێ، وە لە كۆتایی ئەو (٢٤) سیفەتەدا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ مِمَّا أَوْحَىٰ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ ۗ ... ﴿٣٩﴾ ﴾

سەرەتا خوای كاربەجێ ئاوا دەست پێ دەكا:

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾.

لێرەش خوای تاك و پاك، بە خوا بەیەكگرتن (توحید) دەست پێ دەكاو دەفەرموێ: پەروەردگارت بڕیاری داوە كە جگە لەوی كەسی دیكە نەپەرستن، خوا بپەرستە هیچ شتێكی دیكە مەكە هاوبەشی، دوایی یەكسەر باسی ئەوە دەكا كە چاكە لەگەڵ دایك و بابتاندا بكەن، ئنجا دوایی باسی یارمەتیدانی خزمان و هەژاران و نەداران و، ...هتد بە كورتیی: دوازدە سیفەتی باش باس دەكا، كە دەبێ خۆیان پێ بڕازێنرێتەوە، پاشان دوازدە ئاكارو سیفەتی خراپ دەخاتە ڕوو، كە دەبێ دووریيان لێ بكرێ، وە لە كۆتاییدا دەفەرموێ:

﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ ... ﴿٣٩﴾﴾.

واتە: ئەوە لەو حیكمەتەیە، كە پەروەردگارت بۆتۆی سروش كردوە.

كەواتە: حیكمەت بژار كرانە لە سیفەتە خراپەكان، وە ڕازێنراوەیە بە سیفەتە باشەكان، ئەو حەڤدە (١٧) ئایەتە موبارەكەی سوورەتی (الإسراء) ئەوەمان پێ دەڵێن.

**ئەو دوازدە سیفەتە باشانەش، كە فەرمانیان پێكراوە، كە ئینسان خۆییان پێ بڕازێنێتەوە، بە ڕیز ئەمانەن:**

سیفەتی یەكەم: تەنها خوا پەرستن.
سیفەتی دووەم: چاكە كردن لەگەڵ دایك و بابدا.
سیفەتی سێیەم: بە ڕێزەوە دواندنی باب و دایك.
سیفەتی چوارەم: میهرەبانیی نواندن لەگەڵ دایك و بابدا.
سیفەتی پێنجەم: لەخوا پاڕانەوە بۆ دایك و باب.
سیفەتی شەشەم: بەخشین بە نزیكان.
سیفەتی حەوتەم: بەخشین بە نەدار.
سیفەتی هەشتەم: هاوكاریی كردنی بابای ڕێبوار.
سیفەتی نۆیەم: قسەی ئاسان كردن لەگەڵ هەژاراندا، كاتێ كە نالوێ هاوكارییان بكرێ، قسەی خۆشیان لەگەڵ بكرێ.

سیفەتی دەیەم: پەیمان بەجێ هێنان.
سیفەتی یازدەیەم: كێشان بەشێوەیەكی تەواو.
سیفەتی دوازدەیەم: پێوان بە شێوەیەكی تەواو.

**ئەو دوازدە سیفەتەش كە قەدەغە كراون، ئەمانەن:**

سیفەتی یەكەم: قسەی ناخۆش كردن لەگەڵ دایک و بابدا.
سیفەتی دووەم: تێوە خوڕین لە دایک و بابدا.
سیفەتی سێیەم: ماڵی خۆ بەفیڕۆ دان.
سیفەتی چوارەم: دەست نووقاندن، چرووكیی و ڕژدیی.
سیفەتی پێنجەم: دەست بڵاو بوون.
سیفەتی شەشەم: منداڵی خۆ كوشتن لەترسی هەژاریی.
سیفەتی حەوتەم: توخنی زینا كەوتن.
سیفەتی هەشتەم: كوشتنی بە ناهەق.
سیفەتی نۆیەم: نزیك كەوتنەوە لە ماڵی هەتیو بەشێوەی زیان لێدان.
سیفەتی دەیەم: شوێن كەوتنی شتێك كە نایزانی.
سیفەتی یازدەیەم: بەفیز بەڕێگادا ڕۆیشتن.
سیفەتی دوازدەیەم: پەرستراوی دیكە لەگەڵ خوادا پەرستن (هاوبەش بۆخوا دانان).

**وەك دەبینین:**

خوای پەروەردگار فەرمانی بەو دوازدە (١٢) سیفەتە بەرزو پەسندەی پێشێ كردوە، وە ئەو دوازدە (١٢) سیفەتە خراپەی دوایەی قەدەغە كردوون، وە ئەوەشی ناو ناوە (حیكمەت)، كەواتە: حیكمەت: یانی خۆڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەكان، وە دووریی گرتن و خۆپاراستن لە ڕەوشت و ڕەفتارو ئاكارە دزێوەكان.

# ڕێ خۆشکردن

**خوێنەری سەنگین و شیرین!**

بناغەی نەك تەنیا خووو ڕەوشتی بەرزو جوان و پەسند، بگرە تێکڕای ئایین و مسوڵمانێتیی، بریتیە لە بەئەدەب بوون لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) داو، بەشەرم و شکۆو بەڕێزو حورمەت بوون لەخزمەتیان دا.

یەکێك[1] لە پیاوچاکان گوتوویەتی: دینداریی و مسوڵمانێتیی لەدوو شتاندا کورت دەبێتەوە:

(صِدْقٌ مَعَ الحَقِ، وخُلُقٌ مَعَ الخَلقِ) لەگەڵ خوادا ڕاست بوون و، لەگەڵ خەڵکدا بەڕەوشت بوون.

هەڵبەتە بناغەی لەگەڵ خەڵکدا چاکبوون و ڕەوشت و ئاکار بەرزبوونیش، بریتیە لە لەگەڵ خوادا ڕاست بوون، چونکە هەرکەسێك لەگەڵ خوادا ڕاست بێت و بەڕاستیی بەندەی خوا بێت، ناتوانێ لەگەڵ خەڵکی دا چاك و پاك و ڕاست و ڕێك نەبێ.

هەر بۆیەش خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿...فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بَيْنِكُمْ... ①﴾ الأنفال.

واتە: پارێز لەخوا بکەن و پەیوەندیی نێوانتان باش بکەن.

---

(١) کە (عبد القادر)ی گەیلانیی یە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

ئیدی خوا بەكەرەمی خۆی یارمەتیمان بدات، كە وەك پێویست لەگەڵ خۆی و پێغەمبەرەكەی (صلى الله علیه وسلم) دا، بەئەدەب بین و، هەمیشەو دایم بەشێوەیەك لەخزمەتیان دابین كە شایستەیانەو لێیان دەوەشێتەوە، تاكو لەبەرەكەتی ئەدەب و ڕێزمان لەگەڵ خوای بەرزو مەزن و پێغەمبەرەكەی (صلى الله علیه وسلم) دا، ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو جوان و پەسند ببێتە كاڵای باڵامان، لەهەموو حاڵێك و لەگەڵ هەموو كەس و چین و توێژێك دا.

شایانی باسیشە ئێمە لە دوو توێی سێ (باس)دا، باسی ئەدەب و ڕەوشتی مرۆڤی مسوڵمان لەگەڵ خوا (عز وجل) و پێغەمبەرەكەی (صلى الله علیه وسلم)دا دەكەین:

باسی یەكەم: چەمك و واتا و گرنگی ئەدەب و ڕێز.
باسی دووەم: بە ئەدەب بون لەگەڵ خوادا.
باسی سێیەم: بە ئەدەب بون لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم).

باسی یەكەم

# چەمك و واتاو گرنگیی ئەدەب و ڕێز

١- پێناسەی ئەدەب:

أ- پێناسەی ئەدەب لە ڕووی زمانەوانییەوە:

شارەزایانی زمانی عەرەبی دەربارەی وشەی ئەدەب (أَدَبْ) كە وشەیەكی عەرەبی یە، گوتوویانە:

{أَدَبَ يَأْدُبُ أَدْباً: صَنَعَ مَأْدُبَةً، وَأَدَبَ القَومَ: دعاهُم إلى مَأْدُبَتِهِ ... وَأَدَبَ يَأْدِبُ فُلاناً: راضَهُ على مَحاسِنِ الأَخلاقِ والعاداتِ ... وَأَدُبَ فُلانٌ يَأْدُبُ أَدَباً: راضَ نَفسَهُ على المَحاسِنِ. وَحَذَقَ فنونَ الأَدَبِ، فَهُوَ أَديبٌ ... وَ أَدَّبَهُ: راضَهُ على مَحاسِنِ الأَخلاقِ، وَأَدَّبَهُ: لَقَّنَهُ فنونَ الأَدَبِ. وَأَدَّبَهُ: جازاهُ على إساءَتِهِ، وَيُقالُ: أَدَّبَ الدابَّةَ: رَوَّضَها وذَلَّلَها. وَتَأَدَّبَ: تَعَلَّمَ الأَدَبَ، وَيُقالُ: تَأَدَّبَ بآدابِ القرآنِ أو أدبِ الرّسولِ: إِحْتَذاهُ... والأَدَبُ: رياضَةُ النَّفْسِ بالتَّعليمِ والتَّهذيبِ على ما ينبَغي، والأَدَبُ: جُملَةَ مايَنبَغي لِذي الصَّناعَةِ أَوِ الفَنِّ أَنْ يَتَمَسَّكَ بِهِ، كَأَدَبِ القاضي، وَأَدَبِ الكاتِبِ والجميل مِنَ النَّظمِ والنَّثرِ... }[1].

---

(١) بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٩، هەروەها بڕوانە: (لسان العرب) لإبن منظور ج١ ص٩٣،٩٤، طبعة ملوّنة وَمُصحَّحه.

**كە دەتوانین پوختەی ئەوەی سەرەوە، لەم چەند خاڵەدا تەرجەمە بكەین:**

١- وشەی (أَدَبَ يَأْدِبُ) یانی: دەعوەتی غەیری كردو سفرەو خوانی ڕازاندەوە.

٢- وشەی (أَدَبَ يَأْدِبُ) واتە: غەیری خۆی فێری ڕەوشت و خووو خدەو نەریتی چاك و پەسندكردو، ڕای هێناو باری هێنا لەسەری.

٣- وشەی (أَدُبَ فُلانٌ يَأْدُبُ أَدَباً) یانی فڵان كەس فێری ئەدەب بووو، خۆی لەسەر خووو خدەو ئاكارو ڕەوشتی بەرز ڕاهێنا، هەروەها بەمانای فێربوون و پسپۆڕبوون لە هونەرەكانی ئەدەبیشداو بوون بەئەدیب (أديب)یش هەردێ.

٤- هەروەها وشەی (أَدَّبَ فُلانٌ فُلاناً)یش وەك هی پێشوویەو هەمان دوو واتای ڕەوشت و ئاكاری پەسند فێركردن و هونەرەكانی ئەدەب فێركردن دەگەیەنێ.

دیسان وشەی (أَدَّبَهُ تَأْدِيباً) بە مانای سزادان و تەمبێ كردن و تۆڵە لێ وەرگرتنەوەش و، بەمانای مەشق پێ كردن و ڕاهێنان و بارهێنانی وڵاخیش دێ.

٥- وەكە دەگوترێ: (تَأَدَّبَ بِآدَابِ القرآنِ، أو أَدَبِ الرَّسولِ) واتە: بەدوایان كەوت و بەپێی ئەوان (قورئان و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) بەڕێوە چووو ڕەفتاری كرد.

**پوختەی قسان:**

**وشەی (أَدَبْ) بەگشتی سێ مانایان هەڵدەگرێ:**

**یـەك:** ڕاهێنانی نەفس و پەروەردەكردنی بەفێركردن و تەزكیەكردن، لەسەر ئەو ڕەوشت و ئاكارو ڕەفتارە بەرزو جوان و پەسندانەی، كە عەقڵ و شەرع بەچاكیان دەزانێ.

**دوو:** هەموو ئەو شتانەی، كە بۆ ئەهلی هەر كارو پیشەیەك پێویستن وەك: ئەو ڕەوشت و ئاكارانەی، كە بۆ بابای قاضی یان نووسەر، جوان و پێویستن.

**ســێ:** سەرجەم ئەو پەخشان و شیعرو هەڵبەستە جوان و نایابانەی كەعەقڵ و سەلیقەی مرۆڤ بەرهەمی هێناون.

ب- پێناسەی ئەدەب لە ڕووی زاراوەی شەرعییەوە:

ئێستاش با بۆ زیاتر ڕۆشن بوونەوەی چەمك و واتای وشەی ئەدەب (الأَدَبْ) بەمانا شەرعییەکەی، کەمانای ئەسڵیی وشەی ناوبراویشە، سەرنجی قسەو پێناسەی ژمارەیەك لە زاناو پێشەوایانی پێشینمان بدەین:

١- (**الأَحْنَف بن قَيس**) گوتوویەتی[1]: (الأَدَبْ نُورُ العَقلِ، كما أَنَّ النّارَ في الظُّلْمَةِ نُورُ البَصَرِ) واتە: وەك چۆن ئاگر لە تاریکییدا ڕووناکیی چاوە، ئەدەبیش ڕووناکیی عەقڵە.

٢- هەروەها (**إبن القيم**) لەو بارەوە گوتوویەتی[2]: (حُلِيُّ الرِّجالِ مايُحسِنونَهُ، وحُلِيُّ النِّساءِ مايَلبَسونَهُ..) واتە: خشڵی پیاوان قسەو کردەوەو ئاکارە چاك و پەسندەکانیانەو، خشڵی ئافرەتانیش ئەوەیە کە دەبەرخۆیانی دەکەن.

هەروەها گوتوویەتی[3] : (..والأَدَبُ هو الدِّينُ كلُّهُ، فَإِنَّ سَتْرَ العَوْرَةِ مِنَ الأَدَبِ، والوضوءَ وغُسْلَ الجنابة من الأَدَبِ، والتطهُّرَ من الخَبَثِ من الأَدَبِ ..) واتە: ئەدەب بریتیە لە: تێکڕای ئایین، چونکە عەوڕەت داپۆشین لەئەدەبەو، دەستنوێژو خۆشۆردن لەلەش پیسیی بەشێکە لە ئەدەب و، خۆخاوێن کردنەوە لەپیسیی بەشێکە لەئەدەب.

٣- دیسان (**إبن قيم الجوزية**) بۆ پێناسەی ئەدەب گوتوویەتی[4]: (وحقيقة الأَدَبِ: إستعمالُ الخُلُقِ الجميل، ولهذا كان الأَدَبُ: إسْتِخراجُ مافي الطبيعة في الكمال، من القوّةِ إلى الفِعلِ) واتە: جەوهەری ئەدەب بریتیە لە بەکارهێنانی ڕەوشتە جوانەکان، بۆیە ئەدەب: دەرهێنانی خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانی سروشت و فیترەت و گۆڕینیانە لە حاڵەتی ئامادەییەوە بۆ حاڵەتی کردارو پشکوتن.

---

(١) بڕوانە: ( عَينُ الأَدَبِ و السياسة وزَين الحَسَبِ والرِياسَة )ی إبن هُذيلْ، ص ١٢٠

(٢) بڕوانە: ( صلاح الأمة في علوّ الهِمَّة ) ج٥ ص ٦٢١.

(٣) هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ٦٣٤.

(٤) هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

٤- (یوسف بن الحسین)یش ئاوا پێناسەی ئەدەبی كردوە[١]: (بالأَدَبِ يُفهَمُ العِلمُ، وبالعِلمِ يَصِحُّ العَمَلُ، وَبالعَمَلِ تُنالُ الحِكمَةُ، وبالحِكمَةِ يُقامُ الزُّهدُ، وبالزُّهدِ تُتْرَكُ الدُّنيا، وبتَرْكِ الدُّنيا يُرغَبُ في الآخِرَةِ، وبالرغبَةِ في الآخِرَةِ تُنالُ الرتبة عِندَ الله) واتە: بەهۆی ئەدەبەوە لەزانیاریی (شەرعیی) تێدەگەین، وە بەهۆی زانیاریی (شەرعیی)یەوە كردەوە ڕاست (صحیح) دەبێ، وە لەسۆنگەی كردەوەی (چاك)ەوە حیكمەت دەست دەخرێ، وەلەئەنجامی حیكمەتەوە، دنیا بەكەمگرتن دێتەدی و، لەئاكامی دنیا بەكەم گرتنیشەوە، دنیا[٢] وازی لێدەهێنرێ و، بەهۆی واز لە دنیا هێنانیشەوە، تامەزرۆیی دواڕۆژ سەرهەڵدەدات و، لەئەنجامی دڵ بەدواڕۆژدا چوونیش دا، پلەو نزیكی لەلای خوا چنگ دەكەوێ.

٥- (شیخ الإسلام الهَرَوی)یش لەپێناسەی ئەدەبدا گوتوویەتی: (الأَدَبُ: حِفظُ الحَدِّ بَينَ الغُلُوِّ والجَفاءِ، بِمَعرِفَةِ ضَرَرِ العُدْوانِ) واتە: ئەدەب بریتیە لە پاراستنی سنووری نێوان زیاد ڕۆچوون و كەمتەرخەمیی، بەدڵنیابوون لەزەرەر و زیانی لادان و ترازان.

٦- (إبن القیم)یش لە شەرحی ئەم پێناسەیەداو لە (مَدارِجُ السّالكین شرح منازل السّائرین)دا گوتوویەتی[٣]: {ئەمە چاكترین پێناسەیە، چونكە لادان بە هەردووك لای تێپەڕاندن و بەزایەداندا، كەم ئەدەبییەو، ئەدەب بریتیە لە ڕاوەستان لە نێوەندی هەردووك لایاندا، نە وابێ كە لەسنوورەكانی شەرع كورتبێنێ و، نەواشبێ كە لەوسنوورانەی شەرع كێشاونی، تێبپەڕێنێ، چونكە هەردووكیان دەستدرێژیی و لادانن و، خواش لادەرانی خۆش ناوێن و لادانیش بێ ئەدەبییە}.

---

(١) بڕوانە: ( صلاح الأمة في علوّ الهِمّة ) ج٥ ص ٦٢١.

(٢) دیارە بەیەكجاریی دەست لەژیانی دنیا، هەڵگرتن، نە شەرعیی یەو، نە ماقووڵ و گونجاویشە.

(٣) بڕوانە: ( صلاح الأمة في علوّ الهِمّة ) ج٥ ص ٦٢٣.

## ٢- گرنگیی و بایەخی ئەدەب:

**شاعیرێك لەبارەی گرنگیی ئەدەبەوە گوتوویەتی[(١)]:**

كُنْ ابنَ مَنْ شِئْتَ وَاكْتَسِبْ أَدَباً ... يُغْنِيَكَ مَأْثورُهُ عـن الحَسَـــبِ
إن الفتى من يقـول هـــا أنا ذا ... ليسَ الفَتَى مَنْ يقـولُ كان أبي

واتە: كوڕی كێ دەبی، ببە، بەڵام ئەدەب وەدەست بهێنە، ئەو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزە تۆ لە بنەماڵەو وەجاخ بێنیاز دەكات.

چونكە بێگومان كوڕ ئەو كوڕەیە بڵێ، ها ئەوە منم! نەك ئەو كوڕەی، كە دەڵێ: بابم فلان كەس بووو ئاواو ئاوا بوو!

**ئێستاش با گوێ لەزاناو پێشەوایانمان بگرین، داخۆ لەبارەی گرنگیی و بایەخی ئەدەبەوە، چییان گوتوە؟:**

١- **(أنس بن مالك)** خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی[(٢)]: (الأَدَبُ في العَمَلِ عَلامةُ القبُولِ) واتە: ئەدەب بەكارهێنان لە طاعـەتدا، نیشانەی قبووڵ كران و وەرگیرانیەتی.

٢- **(عبدالله ابن المبارك)**یش ڕەحمەتی خوای لێبێ گوتوویەتی[(٣)]: (مَنْ تَهاوَنَ بالأَدَبِ عوقِبَ بِحرمانِ السُّنَنِ، وَمَن تَهاوَنَ بِالسُّنَنِ، عوقِبَ بِحرمانِ الفَرائِضِ، وَمَنْ تَهاوَنَ بالفَرائِضِ، عوقِبَ بِحرمانِ المَعرِفَةِ) واتە: هەركەسێك لەئەدەبدا كەم تەرخەمیی بكات، بە بێبەش بوون لە سوننەتان سزا دەدرێ، وە هەركەسێك كەمتەرخەمیی لەسوننەتاندا بكات، بەچواندنی فەرزان سزا دەدرێ، وە هەركەسێك كەمتەرخەمیی لە فەرزاندا بكات، بە بێ بەش كران لە ناسینی خوا سزا دەدرێ.

---

(١) بڕوانە (عين الأدبِ والسياسة ..) ص ١٢٥ .

(٢) بڕوانە: ( صلاح الأمة في علوّ الهِمّة ) ج٥ ص ٦٢٣.

(٣) بڕوانە: ( صلاح الأمة في علوّ الهِمّة ) ج٥ ص ٦٢٣.

٣- (**ذو النون المصري**)یش گوتوویەتی[١]: (إذا خَرَجَ المُريدُ عن اسْتِعمالِ الأَدَبِ، فَإِنَّهُ يَرْجِعُ مِنْ حَيْثُ جاءَ) واتە: هەرکاتێك مورید شیرازەی ئەدەبی پچڕاند، ئەوە لەکوێوە هاتوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ.

٤- (**سُفيان الثوري**)یش گوتوویەتی[٢]: (كان الرَّجُلُ إذا أَرادَ أَنْ يَكْتُبَ الحَديثَ، تَأَدَّبَ وَتَعَبَّدَ قَبلَ ذٰلِكَ بِعشرين سَنَةٍ) واتە: کاتی خۆی ئەگەر پیاوێك ویستبای فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بنووسێ، بەر لەوە بەماوەی بیست (٢٠) ساڵ خەریکی ئەدەب وەرگرتن و خواپەرستیی دەبوو.

٥- (**شهاب الدِّين القَرافی**)یش لەبارەی گرنگیی و گەورەیی ئەدەبەوە، گوتوویەتی[٣]: (وَمِنْ نَفاسَةِ الأَدَبِ وكثرة جَدواهُ، أَنَّ قَليلَهُ خَيْرٌ مِنْ كثيرِ العَمَلِ، ولذلِكَ هَلَكَ إِبليسُ لَعَنَهُ اللهُ وضاعَ أَكثَرُ عَمَلِهِ بِقِلَّةِ أَدَبِهِ) واتە: وە بۆ ئیسپاتی گرنگیی و بایەخی ئەدەب و کەڵك و سوودی زۆری، ئەوەندە بەسە کە کەمێك لە ئەدەب چاکترە لەزۆرێك لەکردەوە(ی چاك)، هەربۆیەش ئیبلیس لەعنەتی خوای لێبێ، ئەو هەموو کردەوە چاکانەی بەهۆی کەم ئەدەبیی یەوە فەوتان.

٦- (**محمد بن الحنفية**)ش خوا لێی ڕازی بێت گوتوویەتی[٤]: (أَفضَلُ ماوَرَّثَ الآباءُ الأَبناءَ: الأَدَبُ النّافِعُ، والثناءُ الحَسَنُ، والإِخوان الصّالِحون)، واتە: چاکترین میراتی باب و باپیران بۆ کوڕو نەوەکانیان: ئەدەبی بە کەڵك و، ناوو شۆرەتی چاك و، دۆست و برای چاکە.

٧- (**أبو علی**)یش لەبارەی گەورەیی و گرنگیی ئەدەبەوە، گوتوویەتی[٥]: (تَرْكُ الأَدَبِ يُوجِبُ الطَّرْدَ، فَمَنْ أساءَ الأَدَبَ على البِساط رُدَّ إلى البابِ، وَمَنْ أَساءَ الأَدَبَ على

---

(١) بڕوانە: (صلاح الأمة في علوّ الهِمَّة ) ج٥ ص ٦٢٢.

(٢) بڕوانە: (صلاح الأمة في علوّ الهِمَّة ) ج٥ ص ٦٢٢.

(٣) بڕوانە (عين الأدبِ والسياسة ..) ص ١٢٦.

(٤) بڕوانە (عين الأدبِ والسياسة ..) ص ١٢٦.

(٥) بڕوانە: (صلاح الأمة في علوّ الهِمَّة ) ج٥ ص ٦٢٥.

الباب، رُدَّ إلى سياسةِ الدَّوابِّ) واتە: واز لە ئەدەب هێنان مایەی دەركرانە، ئنجا كەسێك لەسەر فەرش ئەدەبی چاك نەبێ، بەرەو دەرگا دەردەكرێ، وەكەسێك لەدەرگاش ئەدەب و ڕێزی چاك نەبێ، دەگێڕرێتەوە بۆ قۆناغی وڵاخ بەخێوكردن!

٨- (أبو علی الدقّاق) دیسان گوتوویەتی[١]: (العَبدُ يَصِلُ بِطاعَةِ اللهِ إلى الجَنَّةِ، وَيَصِلُ بِأَدَبِهِ في طاعَتِهِ إلى الله تَعالى) واتە: بەندە بە فەرمانبەریی بۆ خوا، دەگاتە بەهەشتێ، بەڵام بەئەدەبی لەفەرمانبەریی كردنی خوادا، دەگاتە خوای بەرزو بێ وێنە!

٩- كاتێك (أبو حَفْص) چووە عێراق (شیخ جُنید البَغدادي) چووە سەردانی، قوتابی و هاوەڵەكانی (أبوحَفْص)ی بینی، بەسەر سەرییەوە ڕاوەستاون و فەرمانی بەجێ دێنن و، یەكیان هەڵەیەك ناكات! ئنجا (جنید) پێی گوت: ئەی (أبو حَفْص)! هاوەڵەكانت وەك هی پادشایان ئەدەب داداون! ئەویش گوتی: نەء، ئەی (أَبو القاسم) بەڵام ئەدەب و ڕێزی ئاشكراو ڕواڵەتیی، ناوونیشانی ئەدەبی دەروونیی و پەنهانە[٢].



(١) بڕوانە: (صلاح الأمة في علوّ الهِمَّة ) ج٥ ص ٦٢٥.

(٢) بڕوانە: (صلاح الأمة في علوّ الهِمَّة ) ج٥ ص ٦٢٢،٦٢٣.

## خاڵە وێكچوو جیاوازەكانی هەردوو وشـــەی (أدب) و (أخــلاق):

لەكۆتایی ئەم باسەشدا دەڵێم:

وەك لەپێناسەی پسپۆڕانی زمان و زاناو شەرعزانان دا دەردەكەوێ، وشەی ئەدەب چەمك و نێوەڕۆكەكەی زۆر لەهی ڕەوشت (خُلُق)ەوە نزیكەو، بەندە وای بۆ دەچێ كە:

ئەدەب[1] هەر بریتیە لە ڕەوشت و خووی بەرزو ئاكاری پەسند، بەڵام زیاتر حاڵەتی كردەیی و جێبەجێ كردن (الحالة العملية والإجرائية)ی تێدا ڕەچاو كراوە، واتە: ئەدەب هەر ئەخلاقی بەرزو جوانە، بەڵام لەحاڵەتی كردەیی و جێبەجێ كرانداو، لەلایەكی دیكەشەوە: چەمك و واتای ئەدەب هێندەی هی ئەخلاق فراوان نیە، چونكە ئەدەب تایبەتە بەحاڵەتی ڕەفتارو هەڵسوكەوت و پەیوەندیی ئینسان لەگەڵ غەیری خۆیدا، بەڵام ئەخلاق تایبەت نیە بەوەوە، چەمك و واتاكەی گشتیی و فراوانە.

جیاوازیی یەكی دیكەی نێوان هەردووك وشەی ڕەوشت (خُلُق) و ئەدەب، ئەوەیە كە وشەی ئەدەب، كە بە (آدابْ) كۆدەكرێتەوە، بۆ هەندێك هەڵس و كەوتی وردو پەنهان و ناسك (لَطيفْ) بەكاردێت، كە كەمتر وایە وشەی (أخلاق) بیانگرێتەوە، بۆ وێنە: ئەدەبەكانی خواردن و خواردنەوە (آدابُ الطّعام والشَّراب)، وە ئەدەبەكانی تارەت گرتن و دەست نوێژو خۆشۆردن (آدابُ الخلاء والوضوء والغُسل)، وە ئەدەبەكانی قسەكردن و بەرو مەجلیس (آداب الكلام والمجلس)و ...هتد.

---

(١) دیارە لێرەدا مانای ئەسڵیی و شەرعیی وشەی ئەدەب بەتایبەت لەبەرچاو گیراوە، نەك سەرجەم واتا و مەبەستەكانی.

بەڵام بێگومان هەردووك وشەی ڕەوشتەكان و ئەدەبەكان (الأَخْلاق والآدابْ) خاڵەكانی پێك گەیشتن (نقاط الإِلْتِقاء)یان زۆر زیاترن لە جیاوازەكان، هەر بۆیەش من زۆر جار وەك دوو وشەی هاو واتا (مُتَرادِفْ) یان تەواوكەری یەكدی بەكارم هێناون.

كۆتایی ئەم باسەش بە فەرمایشتێكی بەپێزی پێغەمبەری خاوەن ئەوپەڕی ڕێز (محمد) (صلى الله عليه وسلم) دێنین :

{مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَدَهُ أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ} أَخْرَجَهُ عَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (٣٦٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٥٢)، وَقَالَ: غَرِيب، وَهَذَا عِنْدِي حَدِيثٌ مُرْسَل، وَأَحْمَد برقم: (١٥٤٣٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦٧٩) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد، وَالبَيْهَقِي برقم: (٢١٠٦)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً البُخَارِيُّ فِي التاريخ الكبير.

واتە: هیچ بابێك دیارییەكی باشتر لە ئەدەبی بەرزو پەسندی نەداوەتە ڕۆڵەكەی. واتە: ئەگەر باب یان دایك ڕۆڵەكەی خۆی، كوڕ بێ یان كچ، لەسەر ڕەوشت و ئەدەبی بەرزو جوان پەروەردە بكات و ڕابهێنێ، ئەوە چاكترین دیاریی و خەڵاتی پێداوە.

باسی دووەم

# بەئەدەب بوون
# لەگەڵ خـوادا جل جلالە

**خوێنەری بەڕێز!**

بۆ ڕوونكردنەوەی مەبەست و واتای ئەدەب لەگەڵ خوادا سبحانە وتعالی، سەرەتا لەخاڵی یەكەمدا سێ جۆرە پێناسەی (ئەدەب لەگەڵ خوادا) دێنین، پاشان لەخاڵی دووەمدا، چەند نموونەیەك لە ئەدەب و ڕێزی بەندە چاك و هەڵبژاردەكانی خوا لەگەڵ خوادا دەخەینە ڕوو، بۆ ئەوەی هەم چەمك و واتای لەگەڵ خوادا بەئەدەب بوون و، هەم چۆنیەتی و شێوەی بەرجەستەكردن و نواندنیشی ڕوون دەبێتەوە:

■ خاڵی یەکەم ■

## لەگەڵ خوادا بەئەدەب بوون

١- (شيخ الإِسلام الهَرَوي) لەبارەی ئەدەب لەگەڵ خوادا، گوتوویەتی:[1]

{الأدب مع الله ثلاثة أنواعٍ:

**أَحدُها:** صيانة مُعاملته أَن يَشُوبَها بِنَقيصةٍ.

**الثانـي:** صيانة قَلبِهِ أن يَلْتَفتَ الى غَيرِهِ.

**الثالث:** صيانة إِرادَتِهِ أن تتعلَّقَ بِما يَمْقُتَكَ عليه}.

**واتە: ئەدەب لەگەڵ خوادا سێ جۆرە:**

**یەکەم:** پاراستنی مامەڵەکردن لەگەڵ خوا، کە هیچ کەم و کوڕیی ڕەگەڵ بکەوێ.

**دووەم:** پاراستنی دڵ و دەروونی، کە جگە لەخوا ئاوڕ لەهیچ شتێك و هیچ کەسی دیکە بداتەوە.

**سێیەم:** پاراستنی ویست و خواستی، کە بەشتێکەوە پەیوەست بێت، ببێتە مایەی توڕەبوونی خوا جل جلاله.

---

(١) بڕوانە: (صلاح الأمة في علوّ الهِمّة) ج٥ ص ٦٢٥.

٢- (إبن قيم الجوزية)ش لەوبارەوە گوتوویەتی:[١]

{الأَدب ُمع الله، حُسنُ الصُّحبَةِ مَعَهُ، بِإِيقاعِ الحركاتِ الظاهِرَةِ والباطِنَةِ على مُقتَضى التَّعظيمِ والإجلالِ والحَياءِ، كحالِ مُجالِسِ الملوكِ ومُصاحبِهِمْ}.

واتە: ئەدەب لەگەڵ خوادا بریتیە لە: چاك لەخزمەتدا بوونی، بەهۆی ئەنجامدانی تێكڕای هەڵس و كەوتە ڕواڵەت و پەنهانەكان، بەپێی داخوازیی بەمەزن گرتن و ڕێزلێ گرتن و شەرم و شكۆ لێكردن، وەك حاڵی هاونشین و هاوڕازو هاوەڵی پادشایەكان.

٣- دەشگونجێ بڵێین[٢]:

**لەگەڵ خوای بێ وێنەو هاوتادا بەئەدەب بوون، بەسێ شتان دێتەدی:**

یــەك: بەس خوا بەبەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشوورگێڕو هەمەكارەی بوون (وجود) بزانرێ و، تەنیا ئەویش بە پەرستراو (مَأْلوُه) دابنرێ، بەمانای ڕاستەقینەو فراوانی پەرستن و، لە هەردووك بواری پێشكەشكردنی درووشمەكان (تقديم الشعائر)و، وەرگرتنی بەرنامەكان (أَخذُ الشرائع)دا، تەنیا بەندایەتیی بۆوی بكرێ و بەناوو سیفەتە هەرە بەرزو چاكەكانی وەسف و ستایش بكرێ و، نە لێیان كەم و زیاد بكرێ و نەبۆ غەیری خۆیشی بەكاربهێنرێن.

دوو: تەنیاو تەنیا ئەو بەشایستەی ئەوپەڕی:

١- بەگەورەگرتن (تكبير) و

٢- بەمەزن گرتن (تعظيم) و

٣- بە بەرزگرتن (إعْلاء) و

٤- بە پاكگرتن (تَسْبيح) و

---

(١) بڕوانە: (صلاح الأمة في علوّ الهِمَّة) ج٥ ص ٦٢٥.

(٢) ئەم پێناسەیە هی بەندەیە.

٥- ستایش کردن (تحمید)، دابنرێ و لەهیچ کام لەم پێنجانەو هاو وێنەکانیشیاندا، غەیری وی بەشدار نەکرێ و بەهاوبەش دانەنرێ.

سـێ: ئەوپەڕی:

١- خۆشویستن (مَحَبَّة) و

٢- لێ ترسان (خشیة) و

٣- فەرمانبەریی (طاعة) و

٤- شەرم لێ کردن ( حیاء) و

٥- پشت پێ بەستن (توکّل) و

٦- خۆتەسلیم کردن (تسلیم) و

٧- ئومێد پێ بوون (رَجاء) و

٨- داوالێ کردن (دعاء) و

٩- خۆ بۆساغ کردنەوە (إخلاص) و

١٠- بۆلاگەڕانەوە (إنابة) و

١١- بۆ لاژیوان بوونەوە (تَوبَة)، هەر بۆ وی بێت و لەبەر وی بێت و بەپێی شەرعی وی بێت.

■ خـاڵی دووەم ■

## شێوەو چۆنیەتی بەئەدەب و ڕێز بوون لەگەڵ خوادا جلّ جلاله

لەسۆنگەی ئەوەوە كە هیچ كەس هێندەی پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا (علیهم السلام) ئەدەب بەرزو جوان نەبوونە، چ لەگەڵ خواو چ لەگەڵ غەیری خواشدا، بەپێویستی دەزانم ئەو چەند نموونەیە، كە بۆ خستنەڕووی حەقیقەت و چۆنیەتیی لەگەڵ خوادا بەئەدەب بوون، هەڵیان دەبژێرین، لەهەڵوێست و ڕەفتارە بەرزو ناوازەكانی ئەوان، گوڵبژێریان بكەین و، پاشانیش سەرو نموونە لە هەركام لەفریشتەكان (الملائكة) و جندەكان (الجنّ) دێنینەوە، لە سێ بڕگەدا:

بڕگەی یەكەم:

ئەدەبی پێغەمبەرانی خوا (علیهم السلام) لەگەڵ خوادا:

١- ئــادەم علیه السلام:

دوای ئەوەی بابە ئادەممان (سەلامی خوای لێبێ)، بەهۆی خوتخوتەی ئیبلیسەوە فریوی خواردو تووشی هەڵەی (لەدرەختی قەدەغەكراوی بەهەشت خواردن) بوو، وەخوای كاربەجێ و میهرەبان ئاگاداری كردەوەو سەركۆنەی كرد، نەك وەك ئیبلیسی نەگریس، ملهوڕانە لەسەر هەڵەكەی خۆی سوور نەبووو

پینەو پەڕۆی نەكرد، بەڵكو زۆر بەشێوەیەكی خۆبەكەمگرانە و بەئەدەبانەوە، دانی بەهەڵەو پەڵەی خۆیدا هێنا و فەرمووی:

﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ الأعراف.

واتە: پەروەردگارمان! ستەممان لەخۆمان كرد، وە ئەگەر لێمان نەبووری و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، مسۆگەر لە زیانباران دەبین.

سەرنج بدەن!

ئادەم چەند بەئەدەب و ڕێزو خۆ بەكەمگریی یەوە پاڕاوەتەوە! ئنجا ئەم ئەدەب و ڕێزو خۆ بەكەمگرییەی ئادەم بەراورد بكەن لەگەڵ هەڵوێستی بێ ئەدەب و ڕێزو خۆبەزلگرانە و چەقاوەسوانەی ئیبلیسدا، كە پاش فەرمان شكاندنی خواو كڕنووشی ڕێزلێ گرتن نەبردن بۆ ئادەم و لێپرسینەوەی خوا، گوتوویەتی:

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾﴾ الإسراء.

واتە: وە یاد بكەوە كاتێك بە فریشتانمان گوت: كڕنووش بۆ ئادەم ببەن، ئنجا هەموویان كڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس، (ئیبلیس) گوتی: چۆن چۆنی كڕنووش بۆ كەسێك بەرم كە لەقوڕێ دروستت كردوە؟! گوتی: ئائەوە دەبینی كەبەسەر مندا هەڵت بژاردوە! ئەگەر هەتا ڕۆژێ قیامەتێ بم هێڵیەوە، ئەوە بێگومان كەمێك نەبێ، وەچەكەی هەموو ڕیشەكێش دەكەم!

بەڵێ، ئیبلیسی پیس و نەگریس، لەباتی ئەوەی لە هەڵەی خۆی پەشێمان بێتەوەو داوای لێبوردن بكات، پینەو پاساوی بێجێ بۆ هەڵوێستە هەڵەكەی دەكات و، ڕەخنەش ئاڕاستەی خوا دەكات و، داوای هێشتنەوەو تەمەن درێژییش دەكات، تاكو دەرفەتی سەرپێچیی كردنی زیاتر بێت و، بشتوانێ كوڵی دڵی خۆی بە ئادەم و وەچەكەی بڕێژێ!

### ٢- نـــووح (علیه السلام):

دوای ئەوەی خوای دەرووکەرەوە بەهانای نووحەوە (سەلامی خوای لێ بێ) هات و، خۆی و ئەوانەی بڕوایان پێ هێنابوو - بە پێی بەڵێنی خوا - قوتاریان بووو، کافرە ملهوڕەکانی گەلەکەی، سەرجەمیان لە تۆفانی بێ ئاماندا خنکان، نووح لەسەر بناغەی ئەوە کە خوا گفتی ڕزگارکردنی خۆی و ماڵ و خێزانی (جگە لەژنەکەی) پێ داوە:

﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ المؤمنون.

بۆ کوڕە لاسارەکەی[1] لەخوا پاڕایەوەو فەرمووی:

﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ هود.

واتە: پەروەردگارم! بێگومان کوڕەکەم لەئەهلی منەو بەڵێنی تۆش مسۆگەر ڕاستەو، تۆش کاربەجێ ترین فەرمانڕەوای.

**ئنجا تەماشای ئەو هەموو ئەدەب سەلیقەیەی نووح (علیه السلام) بکەن:**

جارێ لەلایەکەوە: وەك هەر (باب)ێکی ئینسان، پەرۆشی کوڕە جگەر گۆشەکەیەتی و بە تەنگیەوەیە، کەئایا چارەنووسی چیە، ماوە یان خنکاوە؟!

بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە: هەرچەندە خوا گفت و بەڵێنی داوەتێ، کە ماڵ و خێزانەکەی، جگە لە ژنەکەی قوتار بکات، لەبەر ئەوەی نازانێ ئایا کوڕەکەی لەدوایین قۆناغی ژیانیدا ئیمانی هێناوە، یان هەر لەسەر کوفرو کەللە ڕەقیی خۆی ماوەتەوە؟!

---

(١) مێژوو نووسان گوتوویانە ناوی ( کنعان ) بووە.

بۆیە زۆر بەوریایی و لە پەردەداو بە شەرم و ئەدەبەوە، لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە، کە چارەنووس و سەرەنجامی کوڕەکەی پێشان بدات.

بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە مەسەلەی ئیمان و کوفر، ڕێی هیچ جۆرە خاترو خوایشتێکی تێدا نیە، خوای دادگەر پێی دەفەرموێ:

﴿قَالَ يَـٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَـٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾﴾ هود.

واتە: ئەی نووح! ئەو -کوڕ- ە لەخێزانی تۆ نیە، چونکە - خاوەنی - کردەوەی باش نیە، داوای شتێکم لێ مەکە کەشارەزای نیت، بۆیە من ئامۆژگارییت دەکەم کە لەنەفامان نەبی!

ئنجا نووح زۆر بەئەدەب و شەرمەوە، عوزر دێنێتەوەو داوای لێبوردن دەکات و دەفەرموێ:

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾﴾ هود.

واتە: گوتی: پەروەردگارم! من پەنات دێنمە بەر لەوەی، کە داوای شتێکت لێ بکەم کەشارەزای نیم، وە ئەگەر لێم نەبووری و ڕەحمم پێ نەکەی، مسۆگەر لە زیانباران دەبم.

٣- شوعەیب (علیه السلام):

شوعەیب (سەلامی خوای لێ بێ)، پاش ئەوەی پەیام و بانگەوازی خوا بەگوێی گەلەكەی، گەلی (مَدْيَنْ)دا دەدات و، هەرچی دەكات بۆی نایەنە ژێر باری هەق و، سەرەنجام زۆر بێ ئەدەبانەو قسەڕەقانە دەیدوێنن و پێی دەڵێن:

﴿ قَالُواْ يَـٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَـٰكَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ ﴾ هود.

واتە: گوتیان ئەی شوعەیب! لەزۆربەی قسەكانت حاڵی نابین، وە ئێمە لەنێوماندا بەبێ دەسەڵاتت دەبینین، وە ئەگەر خزمەكانت نەبوونایە، بەرد بارانمان دەكردی، وە تۆمان لەلا بەڕێزو هەیبەت نیە.

بەڵێ، دوای ئەم قسانە، شوعەیب كەلەمەوبەر زۆر بەنەرمیی و ئارامیی قسەی دەكرد، ئەمجارە زۆر توند گەلەكەی دەدوێنێ و لەسەر خۆی نا، بەڵام لەسەر خوا، كە گەلەكەی هەروا بەئامانژەو لەپەردەشدا بێ ئەدەبییان بەرانبەر كردوە! وەدەنگ دێ و وەك شێر لێیان ڕادەپەڕێ و پێیان دەفەرموێ:

﴿ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَهْطِىٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّا ۖ إِنَّ رَبِّى بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٩٢﴾ وَيَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَـٰمِلٌ ۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَـٰذِبٌ ۖ وَٱرْتَقِبُوٓاْ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ ﴾ هود.

واتە: گوتی: ئەی گەلەكەم! ئایا خزمان و كۆمەڵەكەمتان لەلا باڵادەست ترە لەخوا، وە ئەوتان پشت گوێ خستوە؟! بێگومان پەروەردگارم دەورەدەری ئەوەیە كەدەیكەن. وە ئەی گەلەكەم! ئێوە چیتان لەدەست دێ بیكەن و درێغی مەكەن، منیش كاری خۆم دەكەم، ئنجا لەمەودوا دەزانن، كە كێ ئازارێكی بۆدێ، زەبوون و ڕیسوای بكات و كێ درۆزنە! وە چاوەڕێ بن و منیش هەر چاوەڕێم!

وەك دەبینن: شوعەیب بەتەنیا وشەیەكیش لەسەر خۆی ناكاتەوەو، لەبەرانبەر ئەو هەمو قسە بێ نەزاكەت و ساردو سووكانەدا، كە ئاڕاستەی كراون وەدەنگ نەهاتوە، بەڵام تەنانەت لەسەر بێ ئەدەبییەكی ئاماژەو لەپەردەش دا، كە ئاڕاستەی خوای بەرزو مەزن كراوە، نەك هەر وەدەنگ هاتوە، بگرە شەڕی گەیاندۆتە قۆپ و هیچی تێدا نەهێشتۆتەوە!!

٤- ئیبراهیم (علیه السلام):

ئیبراهیم علیه الصلاة والسلام لە گەرمەی وتووێژی لەگەڵ گەلەكەیدا، لەبارەی خوای بێوێنەی پەروەردگارەوە، فەرموویەتی:

﴿ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّىٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: ئایا ئەوانەتان بینیوە، كە دەیانپەرستن! خۆتان و باب و باپیرانی كۆنتان! بێگومان ئەوانە تێكڕایان دوژمنمن، بێجگە لەپەوەردگاری جیهانەكان. ئەو كەسەی كە دروستی كردووم و هەر ئەویش هیدایەتم دەدات. وە ئەو كەسەی كە خواردن و خواردنەوەم دەداتێ، وە كاتێك نەخۆش كەوتم، هەر ئەو چاكم دەكاتەوە ...

وەك دەبینن: (خلیل الرَّحمن) (سەلامی خوای لێ بێ)، هەموو شتە باشەكانی، وەك هیدایەت و، خۆراك پێدان و، ئاو پێدان و، شیفا بەخشین، پاڵ دەداتە لای خوا، بەڵام نەخۆش كەوتن پاڵ دەداتە لای خۆی، هەرچەندە بێگومان هەر خوای بێ وێنەو هاوتا، بەدیهێنەر (خالِقْ)و پەیداكەر (مُبْدِع)ی هەموو دروست كراو (مخلوق)ێكە، بەڵام بە جوانی نازانێ بفەرموێ: خوا نەخۆشی كردم (أَمْرَضَني الله)، چونكە ئەو جۆرە تەعبیرە پێچەوانەی ئەدەبە لەگەڵ خوادا!

٥- مووســا علیه السلام:

مووسا (علیه الصلاة والسلام) پاش ئەوەی کابرای (قِبْطي) دەکوژێ و لە فیرعەون و داروودەستەکەی قاچاغ دەبێ و، بەرەو مەدیەن دەچێ و، لەوێش یارمەتی دوو کچە ئاژەڵدارەکە دەدات و ئاژەڵەکانیان بۆ ئاو دەدات، دیارە برسیی دەبێت، بەڵام کە لەخوای ڕۆزی دەر دەپاڕێتەوە، یەکسەرو بەڕاشکاویی داوای خواردنی لێ ناکات و، باسی برسیەتیی زۆر بۆهێنەرو شپرزەکەری خۆی ناکات، بەڵکو زۆر بەئەدەبەوەو هەر بەهێماو ڕەمز ئەو شتانە دەڵێ و دەفەرموێ:

﴿ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴿٢٤﴾ ﴾ القصص.

واتە: پەروەردگارم! من ئاتاجم بۆ نیعمەتێك، کە بۆت ناردووومە خوارێ!

٦- ئەییوب (علیه السلام):

ئەییوبیش (علیه الصلاة والسلام)، کە ماوەیەکی دوورو درێژ نەخۆشییەکی سەختی گرتوە، پاش ماوەیەکی زۆر لە خوا پاڕاوەتەوە، زۆر بەشەرم و شکۆوە ئەدەبەوە، لەو بارەوە لە خوا پاڕاوەتەوە، یەکسەرو بەڕاشکاویی نەیفەرمووە: چاکم بکەوە (إِشْفِني) یان (عافِني) بەڵکو فەرموویەتی:

﴿ وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: وە ئەییوب کە بانگی پەروەردگاری کرد: پەروەردگارم! من ناڕەحەتییم تووش بووە، تۆش بەبەزەییترینی بەبەزەییانی!

٧- یوســف (علیه السلام):

ئەمیش (سەلامی خوای لێبێ)، پاش ئەو هەموو گرفتاریی و ناڕەحەتییە، کە بەسەری هات و، لەکاتی پێك شادبوونەوەیان لەگەڵ باب و دایکی و برایەکانیدا، با سەرنج بدەین! چەند بەئەدەب و ڕێزێکی بەرزەوە لەگەڵ بابیدا - کە یەعقووبە سەلامی خوای لێ بێ- دواوەو دەفەرموێ:

﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾ يوسف.

واتە: وە باب و دایكی خستە سەر كورسییەكەو بۆی چەمینەوەو گوتی: ئەی بابەگیان! ئەم (حاڵ و وەزع)ە، ئەنجام و ئاكامی ئەو خەونەكەمە لەمەوپێش دیتبووم، ئەوە پەروەردگارم هێنایەدی، وە بەڕاستی (خوا) لوتف و چاكەی لەگەڵم كرد، كە لەحەپسخانە دەری هێنام، وە ئێوەشی لەدەشت و بیابانەوە هێنایە ئێرە، دوای ئەوەی شەیطان نێوانی من و برایەكانمی تێك دا، بێگومان پەروەردگارم بۆ هەرشتێك كەبیەوێ، بەتەگبیری وردو پەنهان ئەنجامی دەدات، چونكە زۆر زانای كاربەجێ یە.

**لەم ئایەتەدا یوسف (علیه السلام) ئەم حەوت ئەدەب و وردەكاریی یانەی بەكارهێناون:**

**ئەدەبی یەكەم:** زۆر بەنەرم و ناسكیی بابی دەدوێنێ و، بۆ ئەوەی بزانرێ، كە تەعبیركردنی یەعقووب بۆ خەونەكەی وی ڕاست دەرچووە، كە كاتی خۆی پاش گێڕانەوەی خەونەكەی پێی گوت:

﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦﴾ ﴾ يوسف.

چونكە بێگومان یەعقووب زۆر تووشی ناڕەحەتیی بوو بوو، بەتایبەت بەهۆی قسەو توانج و پلاری كوڕەكانی یەوە، كەچەند جارێك تۆمەتی بەهەڵەدا چوون و نەپێكانیان دابووە پاڵی!

﴿ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗا ﴾.

واتە: ئەی بابەگیان! ئەمە تەعبیری خەونەکەی ڕابردوومە (کە تۆ تەعبیرت کرد) پەروەردگارم هێنایە دی.

بەڵام وەك دەبینین، وێڕای مەدح و ستایشی بابی، لەبیری ناچێ کە ئەو چاکەو نیعمەت و لوتف و بەخششە، تەنیا لەپەروەردگاری بزانێ و بەس بۆ وی بگێڕێتەوە.

**ئەدەبی دووەم:** کاتێکیش دەیەوێ باسی چاکەو نیعمەتی خوای بەخشەر بکات، کە هەمیشە لە تەنگانەو سەغڵەتییەکاندا، دەستی لوتف و پشتگیریی و پاراستنی بەپشتیەوە بووەو، لە ناڕەحەتییەکان قوتاری کردوە، تەنیا باسی ڕزگاربوونی لە حەپسخانەی کردوە:

﴿ ..وَقَدْ أَحْسَنَ بِيٓ إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجْنِ .. ﴾

وە هیچ بەلای خرانە بیر (جُبّ)و لێ قوتاربوونیدا نەچووە، هەرچەندە ئەویش لە قوتاربوونی لەحەپسخانە کەمتر نەبووە! لەبەر چی؟! بۆ ئەوەی برایەکانی، کە بەفێڵ و پیلان خستیانە چاڵەوە، ناڕەحەت و شەرمەزار نەبن!.

**ئەدەبی سێیەم:** هەروەها هیچ ئاماژەیەکی بە حاڵ و وەزعی نالەبارو شپرزو نەدارییان نەکردوە، کە باسی هاتنیانی بۆ میسرِی کردوە، بەڵکو بەس ئەوەندەی گوتوە، کە خوا لەبیابانەوە هێناونی:

﴿ ...وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ .. ﴾

چونکە باسکردنی وەزعی شپرزو ناڕەحەتیی و نەداریی و ئاتاجییان، دەبێتە مایەی جۆرێك لەمنەت کردن و دڵشکاندنیان!

**ئەدەبی چوارەم:** دیسان کە ئاماژەش بەکێشەو گرفتی برایەکانی دەکات، زۆر جوامێرانەو بەئەسپایی لەوبارەوە دەدوێ و، وای پیشان دەدات، کە گرفت و کێشەیەك بووە، بەهۆی خوتخوتەی شەیتانەوە کەوتۆتە نێویان، ئنجا خۆیشی پێش دەخات لەبرایەکانی، وەك ئەوەی شەیتان کاریگەریی زیاتری لەسەر وی بووبێ! لە حاڵێك دا، کە کێشەکە گرفتێکی یەك لایەنە بووەو، هیچ دەستی یوسوفی تێدا نەبووە:

﴿.. مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ ... ﴾.

ئەدەبی پێنجەم: ئنجا هەركام لە هێنانەدی خەونەكە:

﴿وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ ﴾

و دەرهێنانی خۆی لە حەپسخانە:

﴿..وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ .. ﴾

و ماڵ گواستنەوەی بابی و برایەكانی لە بیایان و دەشتەوە بۆ شاری میصر

﴿.. وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ ... ﴾.

بەڵێ ئەمانە هەرسێكیان بۆ لای خوای دەگێڕێتەوەو بەكاری ئەویان دادەنێ، چونكە هەرسێكیان خێرو چاكەو نیعمەتن، بەڵام هی چوارەم كە بەین تێكچوونیەتی لەگەڵ برایەكانی، چونكە شتێكی خراپ و بێ خێرە، دەیگێڕێتەوە بۆ شەیتان و، بەپیلان و خوتخوتەی وی دادەنێ:

﴿..مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ ... ﴾.

بەپێی یاسای: (الْخَيْرُ بَيْنَ يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْك).

ئەدەبی شەشەم: پاشان لەسۆنگەی ئەوەوە كە لوتف و پەنهان كاریی و وردەكاریی نەخشەو تەگبیری خوا لەژیان و بەسەرهاتی یوسوفدا، زۆر دیارو بەرچاوە، ئاماژە بە لوتفی خوای پەروەردگار دەكات:

﴿... إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ١٠٠ ﴾.

ئەدەبی حەوتەم: وە لەكۆتاییدا ئاماژە دەكات، بۆ دوو لەسیفەتە هەرە چاك و پەسندەكانی خوا - كە زۆر پەیوەستن بەژیان و بەسەرهاتی یوسفەوە - كەبریتین لە: زانیاریی و كاربەجێی (العِلم وَالحِكمة)، ﴿...إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ١٠٠ ﴾.

٨- عیسا (علیه الصلاة والسلام):

عیسای کوڕی مەڕیەمیش (سەلامی خوایان لێبێ)، کاتێك خوای پەروەردگار لەڕۆژی قیامەتێداو، لەکاتی دادگایی کردن لەبارەی ئەوەوە، کە ئایا نەصرانییەکان ڕاست دەکەن، کە دەڵێن: عیسای مەسیح پێی گوتووین: من و دایکم لەجیاتی خوا بکەنە پەرستراو[1]، بەم شێوە پڕ ئەدەب و ڕێزو نەزاکەت و نەجابەتە دەدوێ و، وەڵام دەداتەوە:

﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ المائدة.

واتە: وە یاد بکەوە کە خوا فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەڕیەم! ئایا بەخەڵکت گوتوە: کە خۆم و دایکم لەجیاتی خوا بکەنە دوو پەرستراو؟! گوتی: تۆ پاك و بێگەردی، من بۆم نیە کە شتێك بڵێم، هەقم نەبێ، ئەگەر بێت و گوتبێتم، بێگومان زانیوتە، چونکە تۆ ئەوەی لەدەروونم دایە دەیزانی، بەڵام من نازانم چیت لەدەروون دایە، بێگومان بەس تۆی زانای سەرجەم نهێنی یە شێرراوەکان. من هەر ئەوەندەم پێ گوتوون، کە تۆ فەرمانت پێ کردبووم: کەخوای پەروەردگاری خۆم و خۆتان بپەرستن، وە من هەتا لەنێویان دابووم، ئاگام لێیان بوو، بەڵام دوای ئەوەی بردتمەوە، تۆ خۆت بەسەریانەوە چاودێر

---

(١) ئاشکرایە کەخوای زانای پەنهان و ئاشکرا، زانیویەتی، کە عیسا وای نە گوتوە، بەڵام چونکە ئەو قسەو تۆمەتە، دەعوای نەصرانییەکانە، هەردەبێ لەدادگای خوادا وەك خۆی بخرێتە ڕوو.

بووی، وە تۆ ئاگاداری هەموو شتێکی. ئنجا ئەگەر سزایان بدەی ئەوە بەندەی خۆتن و، ئەگەر لێشیان ببووری، بێگومان هەر تۆی باڵادەستی کاربەجێ.

لەم قسەو وەڵامەی عیساش (علیه الصلاة والسلام)دا، ئەم هەشت ئەدەب و ڕێزو حورمەتانە لەبەرانبەر خوای پایە بەرزو خاوەن بارەگای مەزن (ذُو الْعَرْشِ الْعَظِيم)دا دەبینرێن:

ئەدەبی یەکەم: بەرلەهەر وشەیەك پاك و بێگەردیی خوای ڕاگەیاندوە: (سُبْحَانَكَ...) ئەوجار فەرموویەتی کە من - مادام پێغەمبەری خوام - مافی قسەی هەڵەو ناڕاستم نیە:

﴿قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّ﴾.

ئەدەبی دووەم: پاشان لەجیاتی تەعبیری: نەمگوتوە (ماقُلْتُه) تەعبیری: ئەگەر گوتبێتم زانیوتە: ﴿إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥ﴾ی هەڵبژاردوە، کەبێگومان ئەوەی هەڵیبژاردوە، لەگەڵ ئەدەبی پێغەمبەراندا (علیه الصلاة والسلام) دەگونجێ .

ئەدەبی سێیەم: ئەوجار ڕایگەیاندوە، کە خوا نهێنی نێو دڵ و دەروونی بەندەکان، دەزانێ، بەڵام ئەوان نهێنییەکانی خوا نازانن:

﴿تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَ﴾.

ئەدەبی چوارەم: ئنجا ڕایگەیاندوە، کە خوا تێکڕای نهێنیی و پەنهانەکان دەزانێ، نەك تەنیا شێرراوەکانی نێو دڵ و دەروونی بەندەکانی:

﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ١١٦﴾.

ئەدەبی پێنجەم: ئەوجار خستوویەتە ڕوو، کە ئەو - عیسا علیه السلام - بێجگە لەوەی، کە خوا فەرمانی پێکردوە، پێیان ڕابگەیەنێ، کە خوا بەیەکگرتن (التوحید)ە، هیچ شتێکی دیکەی پێ نەگوتوون:

﴿مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡ﴾.

ئەدەبی شەشەم: پاشان ڕایگەیاندوە، کە هەتا خۆی لەنێویاندا بووە، ئاگاداریان بووەو چاودێرییانی کردوە، بەڵام پاش دنیا بەجێ هێشتنی، ئاگای لێیان نەماوەو، بەس خوا بۆ خۆی چاودێرو ئاگاداریان بووە:

﴿ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡ ﴾.

ئەدەبی حەوتەم: ئەجار فەرموویەتی: ﴿ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَ ﴾، ئەگەر سزایان بدەی، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن! یانی: هەقی خۆتەو، ئەگەر موستەهەق نەبوونایەو لاسارو نالەبار نەبوونایە، بێگومان سزاو ئازارت نەدەدان، ئاخر پەرستراو (مَعبودْ)ێك خاوەنی ئەوپەڕی چاکەو لوتف و کەرەم بێت، چۆن سزای بەندەکانی دەدات، ئەگەر خۆیان کوتەکی نەدەنە دەست؟!

ئەدەبی هەشتەم: پاشان لە کۆتاییدا فەرموویەتی:

﴿ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١١٨ ﴾.

وە ئەگەر لێشیان ببووری، ئەوە بێگومان تۆی زاڵ و کاربەجێ! وەك دەبینین: لێرەدا عیسا (علیه السلام) لەکاتی باسی لێبوردنی خوادا، کە بەڕواڵەت هەق وابوو سیفەتی ڕەحمەت و لێبوردن (الرحمة والمغفرة) باس بکرێن، باسی زاڵیی و کاربەجێیی (العزة والحكمة)ی کردوە! بۆچی؟! چونکە مەقام و حاڵ وادەخوازێ و لەکاتی تووڕە بوون و دادگایی کردن و لێپرسینەوەو سزادان دا، بۆ تاوانباران (مجرمین)ێکی کافرو هاوبەش دانەر، جوان نیە باسی بەزەیی و بەخشین بکرێ، چونکە ئەو کاتە وادێتە بەرچاو، کە عیسا (علیه السلام) لایەنگریی دوژمنانی خوا بکات و، لەکاتێك دا کە خوا زۆر لێیان تووڕەیەو حاڵ و مەقام وا دەخوازێ بەسیفەتی دادگەریی و عیززەت و حیکمەتی خۆی مامەڵەیان لەگەڵ بکات و، سزاو جەزرەبەیان بدات، ئەو بەپێچەوانەوەی حاڵ و مەقام و کەش و هەوا (الجَوّ والمناخ)ی ئەوکاتەوە، بیەوێ ڕەحمەت و بەزەیی و بەخششیان بۆ داوا بکات!!

### ٩- موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) :

بێگومان موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا (صلى الله عليه وسلم) كە گەورەی ئادەمیزادان (سَيِّدُ وَلَدِ آدم )[١] و سەروەرو كۆتایی پێغەمبەرانە (خاتم النَّبِيين)[٢] (عليهم الصلاة والسلام)، لە چڵەپۆپەو لووتكەی هەرە بڵندی ئەدەبدا بووەو، لەو ڕووەشەوە وەك سەرجەم لایەنەكانی دیكەی ژیانی لە سەرووی هەموو كەسێكەوە بووە.

جا ئێمە بۆ ئیسپاتی ئەو ڕاستییە، تەنیا دوو نموونە لەئەدەبی بەرزی پێغەمبەری كۆتایی عليه الصلاة والسلام دێنینەوە، یەكێكیان لەحاڵێكدا كەلەبەرزترین پایەو مەقامدا بووە، كە پایەو مەقامی شەوڕۆو بەرزبوونەوە (الإسراء والمِعراج)یەو، یەكێكیشیان لەحاڵێكدا كە لەناخۆشترین و سەغڵەتترین وەزعدا بووە، كە بریتیە لە گەڕانەوەی بەنائومێدیی و سووكایەتیی پێ كراویی لەلای خەڵكی (طائِفْ).

بۆیەش ئەو دوو نموونەیەم هەڵبژاردوون، چونكە نزیكترین حاڵەت بۆ دەرچوونی مرۆڤ لە شیرازەی ئەدەب و سنوور بەزاندنی، هەردووك حاڵەتی بەرزیی و سەركەوتن و، تێشكاویی و سەغڵەت بوونە، ئنجا ئەگەر ئینسان بتوانێ لەو دوو حاڵەت و كاتەدا، دەست لەئەدەب بەرنەدات و، لەیادی نەكات، ئەوە بێگومان لەحاڵەتە ئاساییەكاندا، چاكترو ئاسانتر دەتوانێ ئەوە بكات!

---

(١) پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: {أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣١٧٢٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٧٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٧٣)، وَرَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٣٥) بلَفْظ: (أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

(٢) ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ الأحزاب.

نموونەی یەكەم:

## ئەدەبی بەرزو بێ وێنەی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) لەكاتی میعراج دا:

خوای پەروەردگار ئاوا باسی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ی كردوە لەكاتی میعراج دا، كە تایبەت بووە بەخۆیەوەو، هیچ كام لەپێغەمبەرانی دیكە، نەگەیشتۆتە ئەو پلەوپایە:

﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾ النجم.

واتە: سوێند بە ئەستێرە كەئاوا دەبێ. هاوەڵەكەتان نەڕێی لێ بزربووەو نەمەبەستی خراپە. وە لە ئارەزووەوە نادوێ. بەڵكو ئەوەی دەیڵێ بەس وەحییە، پێی ڕاگەیەنراوە، (فریشتە)یەكی زۆر بەهێز فێری كردوە[1]. خاوەن دیمەنێكی جوانەو ڕێك ڕاوەستاوە. لەكاتێك دا كە لەئاسۆی هەرە بەرز بووە[2]. پاشان (لە موحەممەد) نزیك بۆتەوەو بۆلای شۆڕبۆتەوە[3]. هەتا هێندەی دوو كەوانە یان نزیكتریش بۆتەوە. ئەوجار (خوا) هەرچی (بە فریشتەكەدا) ناردوویەتی

---

(١) مەبەست جوبڕائیلە (سەلامی خوای لێ بێ).

(٢) مەبەست سەرەوەی ئاسمانی حەوتەمینە.

(٣) واتە (جبریل) لە (محمد) صلى الله عليه وسلم نزیك بۆتەوە، تاكو پەیامی خوای پێڕابگەیەنێ .

بەبەندەی خۆی (موحەممەد)ی ڕاگەیاندوە. دڵی (موحەممەد)یش لەوەدا كە دیتوویەتی بەهەڵەدا نەچووە[١]. ئنجا ئایا دەمەدەمی لەگەڵدا دەكەن لەبارەی ئەوەوە كە بینیویەتی؟[٢]. وە بێگومان جارێكی دیكەش لە هاتنە خوارەوەدا دیتوویەتی. لەلای درەختی كۆتایی. كە بەهەشتی تێدا مانەوەی لەلایە. ئنجا ئەو درەختە دادەپۆشێ ئەوەی كە دایدەپۆشێ[٣]. چاوی (موحەممەد) بەملاو لادا لاینەداو سنووریشی نەبەزاند. بێگومان لەنیشانە گەورەكانی پەروەردگاری خۆی بینین.

**خوێنەری بەڕێز!**

قسەكردنی تێرو تەسەل لەسەر ئەم هەژدە (١٨) ئایەتە زۆری دەوێ و لەقەرەی ئێرە نیە، بەڵام ئێمە تەنیا ئاماژە بەو ئەدەبە بەرزو ناوازەیەی پێغەمبەری كۆتایی (صلی الله علیه وسلم) دەكەین كە لەئایەتی حەڤدەیەم دا دەبینرێ: (مَازَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ).

توێژەرەوەی قورئانی مەزن، زانای بەڕێز (**عبدالرحمن بن ناصر السَّعدي**) خوا لێی خۆشبێ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، نووسیویەتی[٤]:

{(مَازَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ) (أي: ما زاغ يمنة ولا يسرة عن مقصوده (وَمَا طَغَى) أي: وما تجاوز البصر، وهذا كمال الأدب منه صلوات الله وسلامه عليه، أن قام مقاماً أقامه الله فيه، ولم يقصر عنه ولا تجاوزه ولا حاد عنه، وهذا أكمل ما يكون من الأدب العظيم، الذي فاق فيه الأولين والآخرين، فإن الإخلال يكون بأحد هذه الأمور: إما أن لا يقوم

---

(١) خوێنراویشەتەوە (ما كذب الفؤاد ..)، واتە: دڵ چاوی بە درۆ دانەناوە، لەوەدا كەبینیویەتی.

(٢) دواندن (خطاب) لەگەڵ كافرەكانە، كەپێغەمبەری خوایان لەبارەی میعراجەوە بەهەڵە دەزانی.

(٣) واتە شتێك لەدروست كراوانی خوا ئەو (سدرة المنتهى)یەی داپۆشیوە، هەر خوا دەزانێ چی یەو چۆنە؟

(٤) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان. ص ٨١٩.

العبد بما أُمِر به، أو يقوم به على وجه التفريط، أو على وجه الإفراط، أو على وجه الحيدة يميناً وشمالاً، وهذه الأمور كلها منتفية عنه صلى الله عليه وسلم)}.

واته: ﴿ مَازَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَاطَغَىٰ ﴾ یانی - چاوی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) - نە بەلای ڕاست و چەپدا لەمەبەستی لادا، وەنە لەسنووریش دەرچوو، ئنجا ئەمە ئەوپەڕی ئەدەبە لەوەوە صەڵەوات و سەلامی خوای لێبێ، کە لەو پلەوپایەدا وەستاوە، کە خوا لەوێدا دایناوەو، نەکورتی هێناوەو نەلێی تێپەڕاندوەو نە لێیشی لایداوە! کە دیارە ئەمەش تەواوترین شێوەیە لەئەدەبی مەزن، کە (موحەممەد) تێیدا پێش پێشوان و دواییینان کەوتۆتەوە!

**چونکە کەلێن تێ کەوتن (إخْلال) بەیەکێك لەم شتانە دەبێ:**

١- یان ئەوەیە کە بەندە، ئەوەی پێی گوتراوە، جێ بەجێی ناکات.

٢- یان بەنیوە چڵیی ئەنجامی دەدات.

٣- یان زیادەڕۆیی لەجێ بەجێ کردنیدا دەکات.

٤- یان بەڕاست و چەپدا لادەدات.

ئنجا (بە پێی ئەم ئایەتە) ئەم شتانە هەموویان لەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوور بووون.

**بەڵێ خوێنەری سەنگین و شیرین!**

پێغەمبەری ڕەوشت مەزن و ئەدەب بەرز، لەگەشتی شەو ڕۆو بەرزبوونەوە (سَفَر الإسْراء وَالمِعْراج)یدا کەبەرزترین و چاکترین حاڵ و مەقامە، یەکێك لەبەندەکانی خوا پێی گەیشتبێ، توانیویەتی پابەندبێت بە بەرزترین و جوانترین ئەدەبەوە، لەخزمەت خوای پەروەردگار داو، هێندەی (موو) یەك دووچاری لادان نەبووە، بەهیچ بارێك داو، بەو سنوورانەوە کەخوا بۆی دیاریی (تَحدِید) کردوون، پابەند بووە!

دیارە ئاواش بووە، بۆیە شایستەی ئەو هەموو ڕێزو حورمەت لێ گیران و بەرزکرانەوەیە بووە، بەو دەعوەت کران و گەشت و سەفەر پێ کرانەی، لە مەککەوە بۆ قودس و، پاشان بەرەو ئاسمانەکان و سەرووی ئاسمانەکانیش !!

نموونەی دووەم:

ئەدەبی بێوێنەی پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) لە نــاخۆشــترین ســەغـڵـەتیــی دا:

لە (صحيح البخاري)دا هاتوە کە دایکمان (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) پرسیوە:

(يارسول الله! هل أتى عليك يومٌ كانَ أَشدَّ من يوم أُحُدٍ؟!)

ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا هیچ ڕۆژی وات گوزەراندوون، کە لە ڕۆژی (جەنگی) ئوحود پێت سەختتر بووبێ؟! ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێ:

{لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ مَا لَقِيتُ، وَكَانَ أَشَدُّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي} أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٠٥٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٩٥).

واتە: بێگومان ڕۆژانی سەخت و دژوارم لەگەڵەکەت بەسەرهاتوون، بەڵام لەهەمووی سەختتر ئەوەبوو کە ڕۆژی (عقبة) بەسەرم هات، کە خۆمم بە (ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَال) ناساند (ڕیش سپی و دەمڕاستی طائیف) بووە، بەڵام بۆ ئەوەی لێم خواست، وەڵامی نەدامەوە، بۆیە بە خەمبارییەوە سەری خۆمم هەڵگرت و ڕۆیشتم...

ئنجا لە (طبقات ابن سعد)دا[1] باسی ئەو ئازارو نارەحەتییەی ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاوا دەکات:

{.. فقام رسولُ الله مِن عندهم وهو يَرجوهُم، أن يكتُمُوا مَقْدَمَهُ إليهم عن قُريشٍ

---

(١) بڕوانە: (طبقات ابن سعد) ج١ ص١٩٦. وە (فقه السيرة)ی محمد سعيد رمضان البوطي، ص١٣٦.

إذاً، فلم يجيبوهُ الى ذلكَ أَيضاً، ثم أَغرَوا بِهِ سُفهاءَهُم وعبيدهم يَسُبُّونَهُ ويصيحونَ بِهِ، وجعلوا يرمونَه بالحجارةِ حتى أَنَّ رِجلَي رَسول الله صلى الله عليه وسلم لَتُدميانِ، وزيدُ بنُ حارِثَة يقيهِ بنفسِهِ، حتىَّ لَقَد شُجَّ في رأسِهِ عِدَّة شجاجٍ..}

واتا: ئنجا پێغەمبەری خوا (پاش ئەوەی لێیان بێ هیوابوو) لەلایان هەستاو تکاشی لێ کردن، کەهەواڵی ئەو سەفەرو هاتنەی لە قورەیش بشارنەوە، مادام تەکلیفیشیان نەگرتەوە! بەڵام ئەو داوایەشیان قبووڵ نەکرد، وە نەفام و کۆیلە (منداڵ و پاڵ)ەکانی خۆیانیشیان لێ هانداو، دەستیان کرد بەجنێو پێ دان و هات و هاوار بەسەرداکردنی، وە دەستیان کرد بە بەردباران کردنی، هەتا خوێن بە هەردوو پێیدا هاتە خوارێ، وە زەیدی کوڕی حاریسیش خۆی دەدایەبەری، هەتا چەند شوێنێکی سەری شکا!!

بەڵێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەئاوا حاڵێکدا، باسەرنج بدەین، داخۆ بەئەدەب بوونی لەگەڵ خواداو، ڕەوشت و ئاکاری بەرزو مەزنی، چ هەڵوێست و ڕەفتارێکی بەرزو ناوازەو بێ وێنەی پێ نواندوە؟!

ئنجا ئێمە هەڵوێستەکەی پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) هەم لەکردەوەی داو، هەم لەقسەو فەرمایشتیدا، دەخەینە ڕوو:

یــەك: بەکردەوە چی کرد؟!

وە لە (صحيح مسلم)دا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەڵوێستی کردەیی (الموقف العملي) خۆیمان بەزاری موبارەکی خۆی، بۆ دەخاتە ڕووو دەفەرموێ:

{..فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلاَّ وَأَنَا بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي فَقَالَ: إِنَّ اللهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ فَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! قَد سَمِعَ رَبُّكَ قَوْل قومكَ لَك، وأَنا مَلِكُ الجِبال أَرْسَلَني رَبُّكَ إِلَيْكَ لِتَأْمُرَني بِما شِئْتَ، إن شِئْتَ، أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمُ الأَخْشَبَيْنِ؛ فَقَالَ النَّبِيُّ صلى

الله عليه وسلم: بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللهَ وَحْدَهُ، لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئَاً}[1].

واتە: هەتا (قَرن الثَّعالِب)[2] ئاگام لەخۆم نەمابوو، لەناكاو سەرم هەڵبڕی، هەورێكم بینی سێبەری لێم كردبوو، سەرنجمدا جوبرائیلی تێدابوو، بانگی كردم و گوتی: ئەوە خوای باڵادەست و بەهەیبەت، قسەی گەلەكەت، كە پێیان گوتی، بیستی، هەروەها بەرپەرچ دانەوەیان بۆتۆ، ئنجا ئەوە فریشتەی چیاكانی ناردۆتە لات، تاكو چی دەتەوێ فەرمانی پێ بكەی، فەرمووی ئنجا فریشتەی شاخەكان بانگی كردم و سەلامی لێ كردم و گوتی: ئەی موحەممەد! بێگومان خوا قسەی گەلەكەت كە پێیان گوتی، بیستی، جا منیش فریشتەی شاخانم و پەروەردگارت ناردوومیە لات، تاكو چی حەزدەكەی فەرمانم پێ بكەی، ئەگەر دەتەوێ تاكو دوو چیایەكانیان لێ وێك بهێنمەوەو بیانفەوتێنم! پێغەمبەری خواش فەرمووی: بەڵكو ئومێدم وایە، كە خوا وەچەیەكیان لەپشتێ بهێنێتەدەرێ، كە بەتەنیا ئەو بپەرستن و، هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشی!

بەڵێ، ئەمەیە هەڵوێستی كردەیی پێغەمبەری كۆتایی و، ئەمەیە ئەدەب و ڕەوشت و ڕێزی بەرزی بەرانبەر بەخوا سبحانه وتعالى، كە لە دژوارترین و سەغڵەت ترین حاڵەتیشدا، ئازارو ئەشكەنجەو نارەحەتیی مەعنەویی و جەستەیی خۆی، لە ئاست ڕەزامەندیی خواو پەیداكردنی - ئەگەر لە داهاتووشدا بێت - بەندەیەكی وەفاداریدا، لەبیرنیەو، بەكورتیی: لەبەر خواو لە پێناوی خوادا، خۆی فەرامۆش كردوەو، لەپێناوی ڕەزامەندیی خواو، بەرژەوەندیی ئایین و بانگەوازەكەیدا، ئارەزووو بەرژەوەندیی یەكانی خۆی (الحظوظ والمصالح الذاتية)ی لەبیر چۆتەوەو، بەمانای ڕاست و دروستی لەخوادا توانەوە (الفناءُ في الله)[3] لەپێناوی خوای پەروەردگارو

---

(١) صحيح مسلم: (١٧٩٥).

(٢) شوێنێكە لەنێوان طائیف و مەككە.

(٣) چونكە وەك (ابن القيم)و زانایانی دیكەی پسپۆڕی بواری تەزكیەو عیرفانیش گوتوویانە: (الفناء في الله) ئەوەنیە كەئینسان بوون (وجود)ی لەبوونی خوادا بتوێتەوە، چونكە ئەمە خەیاڵێكی مەحاڵە، بەڵكو ئەوەیە كە ئینسان لە بەرانبەر فەرمانی خوادا،

ڕەزامەندیی یەکەی دا خۆی بەخت کردوە.

ئنجا بابزانین هەڵوێستی گوتەیی چۆن بووە؟

## دوو: هەڵوێستی گوتەیی (المَوقِفُ القَولي):

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە چەنگ جنێودان و هەراو گاڵەو بەرد بارانی نەفام و گەجەرو گوجەرەکانی طائیف ڕزگاری بوو، لەژێر سێبەری مێوێکدا، دانیشت و پاش پشوودان سەری بەرز کردەوەو، ئەم دووعایەی کرد:

{أَللَّهُمَّ إِلَيْكَ أَشْكُو ضَعْفَ قُوَّتِي، وَقِلَّةَ حِيلَتِي، وَهَوَانِي عَلَى النَّاسِ، يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ! أَنْتَ رَبُّ الْمُسْتَضْعَفِينَ، وَأَنْتَ رَبِّي، إِلَى مَنْ تَكِلُنِي؟ إِلَى بَعِيدٍ يَتَجَهَّمُنِي؟ أَمْ إِلَى عَدُوٍّ مَلَّكْته أَمْرِي؟ إِنْ لَمْ يَكُنْ بِك عَلَيَّ غَضَبٌ فَلاَ أُبَالِي، وَلَكِنْ عَافِيَتُك هِيَ أَوْسَعُ لِي، أَعُوذُ بِنُورِ وَجْهِك الَّذِي أَشْرَقَتْ لَهُ الظُّلُمَاتُ وَصَلُحَ عَلَيْهِ أَمْرُ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، مِنْ أَنْ تُنْزِلَ بِي غَضَبَك ، أَوْ يَحِلَّ عَلَيَّ سُخْطُك، لَك الْعُتْبَى حَتَّى تَرْضَى، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِك}
أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ كَمَا فِي مَجْمع الزَّوائِد (٣٥/٦) قال الهيثمي (٣٥/٦): فيه ابن إسحاق، وَهُوَ مُدَلِّس ثِقَة، وَبَقِيّة رجَاله ثِقَات)[1].

واتە: ئەی خوایە! سکاڵای بێ هێزیی خۆم و بێ چارەییم و ڕێز لێ نەگیرانم لەلایەن خەڵکەوە، بۆ تۆ دێنم ئەی بەبەزەییترینی بەبەزەییان! تۆ پەروەردگاری چەوسێنراوان و پەروەردگاری منی، حەواڵەی کێم دەکەی؟ هی بابایەکی دوور، کە لەگەڵم ڕووی گرژو تاڵە، یان هی دوژمنێك، کە کاری منت خستۆتە بەردەستی؟!

---

مافی سەرپێچیی و لاملیی و تەئویل بەخۆی نەدات و، (طبع)ی تەسلیمی شەرع بێت و، (هَوی) ی ملکەچی (هُدی) ی بێت و، بەڕاستی بەندەو فەرمانبەری خوابێت .

(١) بڕوانە: (السیرة النبویة لإبن هشام) ج٢ ص٦١،٦٢. وە (فقه السیرة) ص١٣٦، ١٣٧، هەروەها بڕاوانە: (الروض الأنف) ج٢ ص١٧٢، وە (زاد المعاد في هدی خیر العباد) ج٢ ص٥٢.

ئنجا ئەگەر تۆم لێ تووڕە نەبی، بەلامەوە گرنگ نیە، بەڵام سەلامەتیی و بێ گرفتارییەك كە بۆم دەڕەخسێنی، بۆم ئاسانترو فراوانترە، پەنا دەگرم بەڕووناكی ڕووت، كە تاریكییەكانی ڕەواندۆتەوەو، كارو مەداری دنیاو دوا ڕۆژی لەسەر پێك هاتوە، كە تووڕەییتم بنێریە سەر، یان نیگەرانییت ڕووم تێ بكات.

هەتا ڕازی دەبی، داوای لێبوردنم هەیە، وە جووڵەو توانا تەنیا بەدەست تۆیە[١].

بەڵێ، ئەمە ڕازو نیازو هەست و نەستی نەرم و گەرمی پێغەمبەری كۆتاییە (صلی الله علیه وسلم) لەو كاتە سەغڵەتیی و گرفتاریی یەدا، كە مەگەر هەر سەروەری كائینات و پێشەوای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خۆی تێدا ڕابگرێ و، هەر بەوەندەشەوە نەوەستێ و، چاكترین و قووڵترین و تۆخترین ئەزموونی بەندایەتیی بۆخواكردنی تێدا تۆمار بكات!!



---

(١) مانایەكی دیكەی (لاحول ولاقوة إلا بالله) ئەمەیە: لادان لەگوناح و، توانا بۆ چاكەو تاعەت، تەنیا بەدەست خوایە.

بڕگەی دووەم: ئەدەبی فریشتەكان لەگەڵ خوادا تبارك وتعالى:

هیچ گومانی تێدانیە كەفریشتە پاك و بێگەردەكانی خوا، كەخوای زانای پەنهان و ئاشكرا بە:

﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۝٦﴾[1] التحريم.

وەسفی كردوون، هەروەها بە:

﴿..بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ۝٢٦ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ۝٢٧ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ۝٢٨﴾[2] الأنبياء.

مەدحی كردوون، وە بە: ﴿بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ۝١٥ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ۝١٦﴾[3] عبس.

ناوی بردوون، خاوەنی ئەدەب و ڕەوشت و ئاكاری یەكجار بەرزو جوانن، ئنجا ئێمە بۆ نموونەی ئەو ئەدەب و ئاكارە بەرزو جوانەی فریشتەكان، تەنیا ئەم گفت و گۆیەی نێوان خوای كاربەجێ و زاناو فریشتە پاك و چاكەكانی دەخەینەڕوو:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ

---

(١) واتە: هەرچی یەك كەخوا فەرمانیان پێ بكات، سەرپێچیی لێ ناكەن و چییان پێ بگوترێ، جێ بەجێ ی دەكەن.

(٢)واتە: بەڵكو(فریشتەكان) بەندەی بەڕێزی خوان، هیچ قسەیەك پێش مۆڵەتی ناكەن و، بەس فەرمانی وی جێ بەجێ دەكەن، ئەوەی لەپێشیانەوەیە (داهاتوو)و ئەوەی لەدوایانەوەیە (ڕابردوو) دەیزانێ، وە مەگەر كەسێك خوا لێی ڕازی بێ، ئەگەرنا تكای بۆ ناكەن، وەهەمیشە لەترسی وی وریاو هۆشیارن.

(٣) واتە: نوێنەرانێكن، بەڕێزو چاكەكارن .

أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة.

واتە: وە (یادبکەوە) کاتێك کە پەروەردگارت بەفریشتەکانی فەرموو: من جێنشینێك[1] لەزەوی دا دەگێڕم، گوتیان: جا ئایا (حیکمەت چی یە) یەکێکی تێدا (بەجێنشین) دەگێڕی کە خراپەکاریی تێدا دەکات و، خوێنی دەڕێژێ، لەحاڵێکدا کە ئێمە هەمیشە (لە هەڵەو کەم و کوڕیی) بە دوورت دەگرین و ستایشت دەکەین و پاکیی تۆ ڕادەگەیەنین؟!!

فەرمووی: بێگومان ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

---

(١) توێژەرەوانی قورئان لەو بارەوە کە ئایا مەبەست لە (خَلیفة) بوونی ئادەم، چییەو، ئایا خەلیفەی خوای بێ وێنەیە، یان هی (جن) یان..؟! کێشەو مشت و مڕیان زۆرە، بەڵام ڕای بەهێز بەلای بەندەوە، ئەوەیە کە مەبەست ئەوەیە (ئادەم) و وەچەکەی خەلیفەی خوان لەسەر زەوی، لەبەرگی یەکەمی (خواپەرستیی ئیسلامیی) لە بابەتی یەکەم دا لاباسێکی تایبەتم لەسەر نووسیوە.

(راغب الأصفهاني) لەوبارەوە قسەیەکی جوانی کردوە، گوتوویەتی: (والخِلافَةُ: النِّيابَةُ عَنِ الغَيرِ، إمّا لِغَيبَةِ المَنُوبِ عَنهُ، وإمّا لِمَوتِهِ، وَإمّا لِعَجزِهِ، وَإمّا لِتَشريفِ المُسْتَخْلَفِ، وعلى هذا الوَجهِ الأخيرِ إستَخلَفَ الله أولياءَهُ في الأرض) واتە: وە مەبەست لە (خیلافەت) جێگرایەتیی کردنی یەکێکی دیکەیە، ئنجا لەبەر ئامادە نەبوونی ئەو کەسەی جێگرەکەی هەیە، یان لەبەر مردنی، یان لەبەر نەتوانینی کارهەڵسووڕاندنی، یان لەبەر ئەوەی ویستوویەتی ڕێزو حورمەت لە جێنشینەکەی بنێ، ئنجا ئەوە کەخوا دۆستەکانی خۆی لەسەر زەوی کردۆتە جێنشین، لەجۆری چوارەمە.

بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص٢٩٤ .

وە (خوا) هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کردن، پاشان لەسەر فریشتەکانی ڕانواندن و فەرمووی: هەواڵی ناوی ئەوشتانەم بدەنێ، ئەگەر ڕاست دەکەن (کە ئێوە شایستەییەتیی جێنشینایەتیی منتان لەسەر زەوی لەئادەم و وەچەکەی زیاترە)!

(فریشتەکانیش) گوتیان: تۆ بەدوور دەگرین (لەهەر کارێکی بێ حیکمەت) ئێمە ئەوەی تۆ فێرمانت نەکردبێ، نایزانین، بێگومان هەرتۆی زانای کاربەجێ. (خوا) فەرمووی: ئەی ئادەم! هەواڵی ناوەکانیانیان بدەیە! ئنجا کاتێك هەواڵی ناوەکانیانی دانێ، (خوا) فەرمووی: ئەدی پێم نەگوتن: کەمن نهێنیی ئاسمانەکان و زەوی دەزانم و، دەشزانم هەرچی، کە دەریدەخەن و هەرچی، کە دەتانشاردەوەش؟!!

وە (یادبکەوە) کاتێك کە بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، ئنجا هەموویان سەجدە (ی ڕێزگرتن) یان برد، بێجگە لە ئیبلیس، ملی نەداو خۆی بەزلگرت و لەکافران بوو.

لەم چەند ئایەتەدا کۆمەڵێك ئەدەبی بەرز بەرزی فریشتەکان لەبەرانبەر خوای بەرزو مەزندا، دەبینرێن، بەڵام ئێمە بەر لەوەی ئاماژەیان پێ بکەین، بەچاکم زانی ڕاستییەکی گرنگ بخەمە ڕوو:

ئەویش ئەوەیە کە گەلێك کەس زۆر بەهەڵە لەم گفت و گۆیەی فریشتەکان لەگەڵ خوادا حاڵی بوون و پێیان وایە (پەنا بەخوا) فریشتەکان ڕەخنەو تێبینی یان بەرانبەر بەخوا دەربڕیوە، لەسەر ئەوە کە ئادەم و وەچەکەی کردۆتە جێنشین لەسەر زەوی!! بگرە هەندێکیان وێڕای ئەوە تۆمەتی ئێرەیی پێبردن (حَسَد)یش بۆ ئەو فریشتە پاك و چاك و بەڕێزو فەرمانبەرو بێ گوناح و لەخواترسانە، زیاد دەکەن! کە گوایە ئێرەیی یان بە ئادەم و وەچەکەی بردوە، کە خوا کردوونی بە جێنشینی خۆی لە زەوی دا!!

بەڵام بێگومان ئەو جۆرە بیرو بۆچوونانە هەڵەن و، بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو جوانی فریشتە پاك و چاکەکاندا، ناگونجێن.

ئنجا بابێینە سەر باسی ئەدەب و ڕەوشتە بەرزو جوانەكانی فریشتان، كە لەم گفت و گۆیەدا نواندوویانن، بەرانبەر بە خوای بەرزو مەزن و بێ وێنە:

**ئەدەبی یەكەم: پرسیاركردن و لێكۆڵینەوە، بۆ پەی بردن بەحیكمەت و نهێنیی فەرمانی خوا:**

یەكەمین ئەدەبی فریشتەكان، كە لەم وتووێژەیاندا دەردەكەوێ، ئەوەیە كە هەوڵیان داوە حیكمەت و نهێنیی (سِرّ)ی فەرمانی خوای كاربەجێ، لەوەدا كە ئینسان دەكاتە جێنشینی خۆی لە سەر زەوی، لە حاڵێكدا كەلێی دەوەشێتەوە خراپەكاریی بكات و خوێنێ بڕێژێ، چی یە؟!

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

ڕستەی: (أَتَجعَلُ فیها...) مادام لەفریشتانەوە بێ و بەرانبەر بە خوا بگوترێ، ماناكەی هەرئەوەیە نەك شتێكی دیكەی، وەك: (إعتراض) و (توبیخ) و (تجهیل) و .. هتد كە پێچەوانەی سروشتی پاك و ئەدەبی بەرزی فریشتانن، ئاشكرایە كە {همزة الإستفهام (أَ)}یش چەند مانایەكی هەن و بەگوێرەی (سیاق)و مەقام، لەڕستەدا دیاریی دەكرێن .

ئنجا ئاشكراشە هەر هەوڵدانی فریشتەكان بۆ زانین و پەی پێ بردنی حیكمەت و نهێنی دانانی ئادەم و وەچەكەی لەزەویدا بەجێنشین، بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوە، كە هیچ جۆرە دوو دڵییەكیان لەو مەسەلەیەدا نەبووە، كە ڕاست و دروست و بەجێیە، چونكە هیچ كەس بەدوای شتێكدا ناگەڕێ، كەقەناعەتی بەبوون (وجود)ی نەبێ !

دیارە گەڕان و هەوڵدانیش بۆ زانینی نهێنیی و حیكمەتی خوا، لەدروستكراوو فەرمانەكانیدا، بۆ بەرچاو ڕوونیی و دڵنیایی چاكترو زیاتریش، نەك هەر هەڵەو كەم و كووڕیی نیە، بەڵكو خەسڵەتێكی زۆر بەرزو پەسندیشە، ئەدی ئەوە نیە ئیبراهیمی دۆست و خۆشەویستی خوا (خلیل الله)ش علیه السلام، داوای لەخوا كردوە، كە چۆنیەتی مردوو زیندووكردنەوەی پێشان بدات و، پاساوو

ئامانجی ئەو داوایەیشی، دڵنیایی و بەرچاو ڕوونیی زیاتر بووە!

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ ﴾ البقرة.

دەجا وەك چۆن (إبراهیم) ئیمان و قەناعەتی بەوە بووە، كە خوا دەتوانێ مردوان زیندوو بكاتەوە، بەڵام ویستوویەتی ئیمانەكەی مەحكەمترو، قەناعەتەكەی قووڵتر بێت و، زانیاریی یەكەی لە (علم الیقین)وە بۆ (عین الیقین) بگۆڕێ، فریشتەكانیش لەوە دڵنیابوون كەئەو كارو بڕیارەی خوای كاربەجێ، ڕاست و پڕ بە پێست و بەجێیە، بەڵام ویستوویانە چۆنیەتی ئەو ڕاستیی و بەجێیی یەی بڕیارەكەی خوا بزانن، بەبەڵگەی ئەوە، كە هەر لەسیاقی ئایەتەكانداو، لەگەرمەی گفت و گۆیان داو، بەرلەوەش، كە خوا حیكمەتەكەیان پیشان بدات، گوتوویانە: (إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ).

**ئەدەبی دووەم:** خستنەڕووی لایەنە بێ هێزەكانی ئادەم و وەچەكەی، واقیع بینییە، نەك ئێرەیی بردن:

بەڵێ، فریشتەكان، كە ئاماژەیان كردوە بۆ خراپەكاریی (إفساد)و خوێن ڕێژیی (سفك الدم) لێوەشانەوەی ئینسان، هیچ پێویست ناكات گومانی خراپیی حەسوودیی پێ بردن و، بەسووك سەیركردن (إحتِقار)ی ئادەم و وەچەكەییان بدەینە پاڵ! چونكە:

**یەك:** فریشتەكان وەك ئینسانەكان نین، گیرۆدەی ئەو جۆرە خەسڵەتە بەدانە (رَذائِل) بووبن و، چاك و پاك و بێ هەڵەو پەڵەن.

**دوو:** واقیعی ژیانی مرۆڤیش دواتر هەر بەو شێوەیە بووە، كە ئەوان پێشبینییان كردوەو شتێكیان نەگوتوە وانەبووبێ، بەڵكو قسەو سەرنج و تێبینییەكەیان یەكجار واقیع بینانەیە.

ئنجا دواییش کەخوای پەنهان بین پێی فەرموون:

﴿..قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾﴾ البقرة.

ئەمە هیچ ئەوەی لێ نافامرێتەوە کەقسەو ڕایەکەیان لەبارەی لایەنە بێهێزەکانی ئادەم و وەچەکەیەوە، بەهەڵە دابنێ، بەڵکو هەر ئەوەندە دەگەیەنێ، کە خوا شتێك لەبارەی ئادەم و وەچەکەیەوە دەزانێ، کەفریشتەکان نایزانن، کەئەویش زانینی لایەنە بەهێزو ئیجابییەکانی ئادەم و وەچەکەیەتی، کەدواتر خوای پەروەردگار لەزانیاریی (علم)ی ئادەم بەناوەکان (الأسْماء)دا خستوویەتە ڕوو، وە لە ڕاستیدا، هەرئەو مەتەڵ و نهێنییەش بوو، کەفریشتەکان بەو گفت و گۆو پرسیارو وەڵامە، هەوڵی پێ ئاشنابوونییان داوە .

هەڵبەتە ئەدەبی فریشتەکان زۆر لەوە بەرزترە، کە بەچاوی سووك تەماشای خەلیفەی خوا بکەن، یان ئێرەیی (حَسَدْ)ی پێ ببەن و، هەرئەوەی گوتمان لەگەڵ سروشتی پاکی فریشتان و، ئەدەب و ڕێزیان لەخزمەت خوادا دەوەشێتەوە.

**ئەدەبی سێیەم:** بە خستنە ڕووی (تَسْبيح وتَحْميد وتَقْديس)ی خۆیشیان بۆ خوا، دیسان هەر مەبەستیان زانینی حیکمەت و نهێنییەکە بووە، نەك خۆهەڵکێشان:

بەڵێ، ئەمیش کە زۆر کەس لەسەر بنچینەی قیاس کردنی فریشتان لەئینسانان و، گومانی بەد پێ بردنی فریشتە پاکەکان، پێیان وایە کە ڕستەی: (وَنَحْن نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ) خۆهەڵنانەوەی فریشتەکانی تێدایە، بەوە کە هەمیشە سەرگەرمی لەهەڵەو پەڵە بەدوورگرتن (تَسْبيح) و ستایش کردن (تَحَمِيدْ)و بە پاککردن (تَقْديس)ی خوای بەرزو مەزنن!!

بەپێچەوانەوە: ئەمیش بەڵکو یەکێکی دیکەیە لەئەدەبە بەرزو جوانەکانی فریشتەکان و، هەنگاوێکی دیکەی هەوڵ و تەقەللایانە، بۆ پەی بردن و زانینی حیکمەت و پاساوو بەڵگەی بەجێنشین دانرانی ئادەم و وەچەکەی لەزەویدا، بابزانین چۆن؟!

فریشتەكان كەباسی خاڵە بەهێزەكانی خۆیانیان كردوە، كە لە (تَسْبیح وتَحَمِیدْ وتَقْدیس)یاندا بۆ خوا، خۆیان دەنوێنن، ناگونجێ مەبەستیان خۆهەڵكێشان بێ، كەخەسڵەتێكی پەست (صفة مذمومة)ەو لەگەڵ سروشتی پاكیاندا ناسازێ، بەڵكو مەبەستیان ئەوە بووە، كە ئایا مادام ئێمەی فریشتەی هەردەم سەرگەرم بەپەرستنی تۆوە، بۆ خەلیفایەتییت لە زەویدا، ناشێین! حیكمەت و نهێنی، شایستەیی و گونجانی ئادەم و وەچەكەی، بۆ ئەو كارە چی یە؟!

دیارە ئەو قسەیەی فریشتەكان ئەوەش دەگەیەنێ : كەئەی خوای بەرزو مەزن! مادام ئێمە بۆ ئەو كارە گرنگە شیاو نەبوو وین، دیارە ئەو خەلیفەیەی تۆ، وێڕای لایەنە بەهێزەكانی ئێمە كەبەندایەتیی كردنی ساغ و بێ خلّتەیە بۆتۆ، لایەنی دیكەی بەهێزیشی هەن، كەئێمە نایانزانین!

هەروەها ئەو قسەیەی فریشتەكان، ئەوەش دەگەیەنێ، كەتەنیا ئەو جۆرە كەسانەی وەچەی ئادەم لەوە دەوەشێنەوە، نازناوی جێنشینی خوا (خلیفە اللە)یان هەبێ، كەوەك فریشتەكان پاك و چاك بن و، هەوڵ بدەن هەمیشە سەرگەرمی چاكەكاریی و طاعەت بن[1].

**ئەدەبی چوارەم: بەپاككرتنی خواو دان پێداهێنانی ئەو ڕاستییە، كە هەرچی خوا فێریان نەكات، نایزانن:**

ئەدەبێكی دیكەی فریشتەكان، كە لەم گفت و گۆیەدا دەبینرێ، ئەوەیە كە دوای ئەوەی خوای كاربەجێ بۆئەوەی حیكمەت و نهێنی هەڵبژاردنی ئینسانان

---

(١) دیارە هەركام لەوەچەی ئادەم، ئەگەر بێت و بەندایەتیی خوانەكات و، شەریعەت و ئایینی خوا لەسەر زەوی پیادە نەكات، ئەوە شایستەی ئەوە نیە بەجێنشینی خوا دابنرێ، هەرچەندە لە ئەسڵ دا هەموو ئینسانەكان بۆ ئەوە خولقێنراون، بەڵام ئەگەر هات و كەسێك ئەو ئەرك و كارەی پێ ی سپێرراوە، ئەنجامی نەدا، نازناوێك كەبۆ ئەو مەبەستە لێ ی نراوە، لێ ی دەستێندرێتەوە، وەك چۆن خوا ئینسان و جندی (جن) بۆ بەندایەتیی خۆی دروست كردوون: (وَما خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإنسَ إِلاَّ لِیَعْبُدون) الذاریات -٥٦-، بەڵام بێگومان هەر كەسێك خوا نەپەرستێ، شەرەفی شۆڕەتی بەندەی خوا بوونی نیە!

بۆ جێگرایەتیی سەر زەوییان بۆ دەربخات، خستوونیە نێو تاقی كردنەوە (إمتحان)ەوە، لەگەڵ ئادەم دا خستوونیە گۆڕەپانی پێشبڕكە (مُسابقة)ی زانستییەوە، وە هەر زوو بەجێمانی خۆیان لەئادەم یان بۆ ڕوون بۆتەوە، بێ سێ و دوو گوتوویانە:

﴿ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ ﴾

واتە: تۆ لە هەڵەو پەڵە دووری، ئێمە هەر شتێك تۆ فێرت نەكردبین، نایزانین، بەتەئكید هەر تۆی زانای كار بەجێ.

ئاشكراشە، كە دان هێنان بەكەم و كورتی خۆداو، سەلماندنی چاكە (فضیلة)ی خەڵك، ئەدەب و ڕەوشتێكی یەكجار بەرزو جوانە.

**ئەدەبی پێنجەم: دەستبەجێ ئەنجام دانی فەرمانی خوا بێ لام و جیم كردن:**

ئەدەبی پێنجەم و كۆتایی فریشتەكان كە لەم گفتوگۆ پڕ ڕازو نهێنییەی نێوان خواو فریشتەكانیدا دێتە بەرچاو، ئەوەیە كەپاش دەرچوونی فەرمانی خوا، بەڕێز لێگرتنی ئادەم و كڕنووش بۆ بردنی، دەستبەجێ و بێ دواخران و ئەملاو لاكردن، سەرجەمیان كڕنووشی ڕێزو حورمەت لێنانیان بۆ ئادەم بردوە:

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ ... ﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة.

**ئنجا با سەرنج بدەین !**

فریشتەكان لەكاتی خۆیداو بەئەدەبەوە پرسیار لەخوای كاربەجێ و زانا دەكەن، دەربارەی هۆی هەڵبژاردنی ئەو دروست كراوە نوێیە (المخلوق الجدید)ە بۆ خەلیفایەتیی كردن لەزەویدا، خوای مهرەبانیش داواكارییەكەیان جێ بەجێ دەكات و، پەردەیان بۆ لەسەر ئەو مەتەڵ و نهێنییە لادەدات، بەڵام كە كار دەگاتە سەر بڕیارو فەرمان بە سەجدە بردن بۆ ئادەم، جگە لە جێبەجێ كردن (تنفیذ)ی دەست و بردی فەرمانەكەی خوا (أمر الله) هیچ قسەو وشە ورتەیەك لە فریشتەكان نابیسترێ!

کەچی ئیبلیسی پیس و نەگریس، لە کاتێکدا کە هەلومەرجی قسەو وتووێژو ڕادەربڕین سازو گونجاوە، وەك کەڕەی شەربەت گوێی خۆی ئاخنیون و زمانی گۆناکات، بەڵام لەکاتێکدا کەفەرمانی خوا دەرچووەو، هیچ مەودای قسەو باس و تێبینی و پرسیار نەماوە! زۆر بێ شەرمانەو بێ ئەدەبانە، لاملیی و سەرپێچیی لەفەرمانی خوا دەکات و، پاشانیش کەخوای کاربەجێ و دادگەر گلەیی لێ دەکات و پرسیاری هۆی فەرمان شکاندنی لێ دەکات، دەست دەکات بەپینەو پەڕۆو پاساو هێنانەوەی بێجێ، لە جیاتی پێ لێنان و دان بەهەڵەو تاوانی خۆداهێنان و داوای لێبوردن کردن!

ئنجا وەك گوتراوە: (بضدها تتميز الأشياء)، ئینسان تاکو زیاتر سەرنجی هەڵوێستی عاقڵانەو بە ئەدەبانەو، خۆ بەکەم گرانەی فریشتەکان بدات، چاکترو زیاتر هەڵوێستی نەفامانەو بێ شەرم و ئەدەبانەو خۆ بەزلگرانەی شەیتانی بەد فەڕی بۆ دەردەکەوێ:

﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ۝١٢﴾

الأعراف.

برگەی سێیەم:

ئەدەبی خوشك و برایانی جندمان (جن) لەگەڵ خوادا:

لە (صحيح البخاري) و (صحيح مسلم)دا هاتوە[1] لە (عبدالله بن عباس)ەوە، کە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا دەچووە بازاڕی (عکاظ)، وە لە سەرو حەدەشدا ڕێی گوێگرتنی قسەی فریشتەکانی ئاسمان لەجندان (جن) گیرابوو، وەبەڵێسەی ئاگران (شهب) ئاگرباران کرابوون و دەرکرابوون، جندە (جن) شەیتانەکان گەڕابوونەوەو لەبەینی خۆیاندا ڕاوێژیان کردو گوتیان: دەبێ بۆچی ڕێی هەواڵی ئاسمانمان لێ بەسترابێ و بڵێسە باران کرابین؟ گوتیان: حەتمەن بەهۆی ڕووداوێکەوە ڕێی هەواڵی ئاسمانمان لێ بەستراوە، ئنجا لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەمیندا بگەڕێن و بسووڕێن، داخۆ ئەو ڕووداوە چییە، کە قەوماوە؟ ئنجا ڕۆیشتن بۆ پشکنین و دۆزینەوەی ئەو ڕووداوە بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەمیندا گەڕان، کە بۆتە مایەی ڕێی هەواڵی ئاسمان لێ گیران.

دەڵێ: (مەبەست عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە) ئنجا ئەوانەی، کە بەرەو (تهامة) چوو بوون، ڕوویان کردە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە ئەوکات لە (نخلة) بوو دەیوست بچێتە بازاڕی (عکاظ) و نوێژی بەیانی بەهاوەڵانی دەکرد، ئنجا کاتێك گوێیان: لە قورئان بوو، گوێیان بۆ هەڵخست و گوتیان: ئا ئەوە بوو بۆتە مایەی ڕێ لێ بەسترانی هەواڵی ئاسمانتان، ئەوجار گەڕانەوە لای گەلەکەیان و گوتیان:

﴿ .. إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴿٢﴾ ﴾ الجن.

واتە: ئەی گەلەکەمان! ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسامکەر بوو، بەرەو سەر ڕاستیی ڕێنوێیی (خەڵك) دەکات، بۆیە ئیمانمان پێی هێنا، وە بە تەئکید هیچ هاوبەشێك بۆ پەروەردگار دانانێین.

---

(١) بڕوانە: (صحيح البخاري): ٧٧٣ و ٤٩٢١، وە: (صحيح مسلم): ٥٠٠١.

ئنجا لەو کاتەدا خوای زاڵ و پایە بەرز سوورەتی:

﴿ قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ ..... ﴾ بۆ پێغەمبەرەکەی نارده خوارێ، وه خوا قسەی جندەکانی (جن) بۆ ناردو پێی ڕاگەیاند.

ئێستاش دوای گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەی چۆنیەتی ئیمان هێنان و مسوڵمان بوونی جندەکان(جن)، باسەرنجی ژمارەیەك لەو ئایەتانە بدەین، کە لەبارەی ئەو دروست کراوە پەنهانەی خواوە هاتوونە خوارو، چەند ئەدەب و ڕەوشتێکی بەرزیان لێ هەڵهێنجین، کە لە بەرانبەر خوای بەرزو بێ وێنەدا نواندوویانن:

ئەدەبی یەکەم: تەنیا خێرو چاکە پاڵدانە لای خوا:

شتێکی ئاشکراو ڕونە کە خوای دادگەرو کاربەجێ، بەدیهێنەرو پەیداکەری هەموو شتێکە، چ چاك چ خراپ و، چ خێرو چ شەڕ:

﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ ﴾ الزمر.

هەر چەندە خوا خێرو چاکەی خۆش دەوێ و لێی ڕازییەو، ڕقی لەشەڕو خراپەیە، هەر بۆیەش ئەوە وا داخواز دەکات، کە ئینسان تەنیا خێرو چاکە پاڵداتە لای خواو، شەڕو خراپەو گوناح و زیان پاڵ نەداتە لای.

ئنجا جندە (جن) مسوڵمانەکان ئەو ئەدەبەیان ڕەچاو کردوە، وەك لەم ئایەتانەدا دەبینرێ:

﴿ وَأَنَّا لَمَسۡنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدۡنَٰهَا مُلِئَتۡ حَرَسٗا شَدِيدٗا وَشُهُبٗا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقۡعُدُ مِنۡهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمۡعِۖ فَمَن يَسۡتَمِعِ ٱلۡأٓنَ يَجِدۡ لَهُۥ شِهَابٗا رَّصَدٗا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدۡرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ أَرَادَ بِهِمۡ رَبُّهُمۡ رَشَدٗا ﴿١٠﴾ ﴾ الجن.

واتە: .. وە ئێمە ئاسمانمان پشکنی، دیتمان پڕکراوە لە ئێشکچیی و بڵێسە ئاگر. وە ئێمە پێشتر چەند جێ یەکمان هەبوون بۆ گوێ گرتن (لە قسەی فریشتەکان و زانینی هەواڵی ئاسمان)، بەڵام ئێستا هەرکەسێك گوێ هەڵبخات،

بڵێسە ئاگری ئامادەكراو دەبینێ (كە ئاڕاستەی دەكرێ). وە ئێمە نازانین كە ئایا خەڵكی سەرزەمین خراپەیان بۆ لە نیاز گیراوە، یان پەروەردگاریان سەر ڕاستیی و چاكەی بۆ ویستووە.

وەك دەبینین بۆ شەڕو خراپەو زیان، گوتوویانە:

﴿ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلْأَرْضِ ﴿١٠﴾ ﴾ الجن.

تاكو خراپە پاڵ نەدرێتە لای خوا، بەڵام بۆ سەرڕاستیی و چاكە، گوتوویانە:

﴿ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾ الجن.

**ئەدەبی دووەم:** بێدەنگیی و كش و مات بوون، لە كاتی بیستنی فەرمایشتی خوادا:

ئەمیش ئەدەبێكی دیكەی ئەو دروستكراوە سەرسوڕهێنەرو شێردراوانەی خوایە، وەك لەم ئایەتەدا دێتە بەرچاو:

﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحقاف.

واتە: وە یاد بكەوە كاتێك كە كۆمەڵێكمان لەجندان ناردە لات، گوێیان بۆ قورئان ڕادەگرت، ئنجا كاتێك ئامادەی (قورئان خوێندن) بوون، گوتیان: بێدەنگ بن! وە دوای ئەوەی تەواو بوون، گەڕانەوە لای كۆمەڵەكەیان و ئاگاداریان كردنەوە.

هەڵبەتە ئێستاش جندە (جن) مسوڵمانەكان لە زۆر لە مرۆڤە مسوڵمانەكان باشتر ئەم ئەدەبە ڕەچاو دەكەن و، كاتێك قورئان دەخوێندرێ، زۆر بە بێدەنگیی و ئەدەبەوە كش و مات دەبن و گوێ دەگرن.

**ئەدەبی سێیەم:** بە باشترین شێوە وەڵام دانەوەی فەرمایشتی خوا:

ئەدەبێكی دیكەی بەرزو شیرینی جندە (جن) مسوڵمانەكان، ئەوەیە كە لەكاتێكدا گوێیان لەپێغەمبەر بووە، سووڕەتی: (الرحمن)ی بەسەردا خوێندوونەوە، هەموو

جارێك لەوەڵامی[١]: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ١٣﴾ دا گوتوویانە: {لا بشيءٍ من آلاء ربنا نكذب، فلك الحمد}[٢] واتە: بێگومان بە هیچ كام لە چاكەو نیعمەتەكانی پەروەردگارمان بەدرۆ نازانین، ستایش بۆ تۆیە.

**ئەدەبی چوارەم:** لە سۆنگەی ئەوەوە، كە ئیبلیس بەرامبەر بەخوا بێئەدەبیی كردوە، جندە (جن )مسوڵمانەكان حاشایان لێی كردوەو بە گەوج و نەفام ناویان بردوە:

دیارە دۆستایەتیی گرتن و دوژمنایەتیی كردن لەپێناو خوادا (الموالاة والمعاداة في الله) یەكێكە لە پایە گەورەو گرنگەكانی دینداریی و مسوڵمانەتیی و، هیچ كەسێك بەبێ ئەوە، نەك هەر ئیمانی كامڵ نابێ، بگرە هەر نایەتە دی.

ئنجا یەكێكی دیكە لە ئەدەب و ئاكارە جوان و بەرزەكانی جند (جن) ئەوەیە، كە ئەو مەسەلە گەورەیان زۆر چاك هەڵبڕیوە، بە ئاشكرا خۆیان لە بابە گەورەیان، كە لەقورئاندا پێش سەرپێچیی كردن و نەفرین لێ كرانی بە (جان) ناوبراوە[٣]، بەری كردوەو حاشایان لێكردوەو بە نەفام و كەودەنەكەمان (سفيهنا) ناویان بردوە، وەك لەم ئایەتانەدا دەبینرێ:

---

(١) واتە ئەی ئادەمیزادو جندەكان (جن) :
كام لە چاكەو نازو نیعمەتەكانی پەروەردگارتان بە درۆ دەزانن؟!

(٢) عن جابر بن عبدلله رضي الله عنه قال: {خرج رسول الله على أصحابه فقرأ عليهم سورة الرحمن من أولها الى آخرها، فسكتوا، فقال: مالي أراكم سكوتاً!!، لقد قرأتها على الجن ليلة الجنة، فكانوا أحسن رداً منكم، كلما أتيت على قول: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ١٣﴾ الرحمن، قالوا: (لا بشيءٍ من آلاءِ ربنا نكذب، فلك الحمد} رواه الترمذي والحاكم وصححه وابن مردويه والبيهقي، وأخرجه البزار وابن جرير وابن المنذر والدارقطني، والخطيب من حديث ابن عمر، وصححه السيوطي.
بڕوانە: (فتح القدير) للشوكاني ج ٥ ص ١٥٩،٦٠.
وە بڕوانە: (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)، ص ٨٢٩.

(٣) چونكە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَالْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ٢٧﴾ الحجر، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ١٥﴾ الرحمن، كە لە تفسیرەكان گوتوویانە: (الجانُّ: أبو الجن) بڕوانە: (فتح القدير) ج٥ ١٦٣، وە بڕوانە: (تيسير الكريم الرحمن) ج٥ ص٨٢٩.

﴿ .. وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ ﴾ الجن.

واتە: ...[١] وە گەورەیی پەروەردگارمان بەرزە، هیچ هاوسەرو ڕۆڵەی پەیدا نەکردوون، وەکاتی خۆی نەفام و کەودەنەکەمان قسەی دوور لە ڕاستیی لە بارەی خواوە دەکرد. وە ئێمە پێمان وانەبوو هەرگیز مرۆڤ و جند (جن) قسەی درۆ لە بارەی خواوە بکەن.

لێرەشدا کۆتایی بەباسی: (ئەدەب لەگەڵ خوادا) دێنین و دەچینە سەر باسی سێیەم، کە بریتیە لە: (ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)).



---

(١) وشەی (جدّ) هەم بە مانای (العظمة)، وە هەم بە مانای (خير)یش دێ، بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص ١٨٨.

■ باسی سێیەم ■

## بە ئەدەب بوون لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)

خوێنەری خۆشەویست!

وەك چۆن لە باسی پێشوودا لە دوو خاڵاندا باسی بە ئەدەب بوون لەگەڵ خوامان کرد، لە یەکەمیاندا لە سێ پێناسەدا چەمك و واتای ئەدەب و ڕێز نواندن بەرانبەر بە خوای بێ وێنەمان ڕوون کردەوە، لە خاڵی دووەمیشدا بەشێوەیەکی بەرجەستەو کردەیی باسی چۆنیەتی ئەو ئەدەب نواندنەمان کرد لەسێ بڕگاندا بەم شێوەیە:

یەکەم: ئەدەبی پێغەمبەران.

دووەم: ئەدەبی فریشتان.

سێیەم: ئەدەبی جندە (جن) مسوڵمانەکان.

خوا پشتیوان بێ لەم باسەشدا، دیسان لە دوو خاڵاندا هەم چەمك و مەبەستی ئەدەب و ڕێز نواندن بەرانبەر بە پێغەمبەری خواو، هەم چۆنیەتیی و شێوەی ئەو ئەدەب و ڕێز نواندنەش دەخەینە ڕوو.

■ خاڵی یەكەم ■

## پێناسەی ئەدەب و ڕێز نواندن بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

هەر چەندە ئەدەب نواندن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا گەلێك شت دەگرێتەوە، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین لەم دە (١٠) بڕگەیەی خوارەوەدا كورتیان بكەینەوەو گرنگترینیان بخەینەڕوو:

### یەكەم: ئیمان پێ هێنانی و ڕێزلێنانی و پشتگرتنی و شوێنكەوتنی:

بەڵێ.. بناغەو بنەڕەتی ئەدەب نواندن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، ئەم چوار شتانەن: {ئیمان پێ هێنانی (الإیمانُ به)، ڕێزلێنانی (تعزیرُهُ)، پشتگرتنی (نَصْرُه)، شوێن كەوتنی (إتِّباعُهُ)}.

كە هەر چواریان لە یەك ئایەتدا هاتوون و خوای بەخشەر كردوونی بەمەرج و نیشانەی سەرفرازیی و بەختەوەریی:

﴿..فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف.

واتە: ئنجا ئەو کەسانەی کە ئیمانیان پێی هێناوە، ڕێزو حورمەتیان گرتوە، پشتگیرییان کردوە، شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون، کە لەگەڵی نێردراوەتە خوارێ، ئەوانەن سەرفرازان.

## دووەم: خۆشترویستنی لە خۆمان و لە باب و دایک و، لە هەموو کەس:

ئەدەبێکی دیکەی گرنگ بەرامبەر بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ئەوەیە کە دەبێ ئینسانی مسوڵمان، ئەوی لە خۆی و باب و دایکی و ڕۆڵەی و هەموو کەس و شتێك خۆشتربوێ، وەك لەو بارەوە فەرمووویەتی:

{لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ والِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ} أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٠١٥).

واتە: یەکێك لەئێوە ئیمان ناهێنێ، هەتا منی لە باب و دایکی و ڕۆڵەی و تێکڕای خەڵکی خۆشتر نەوێت.

دیارە خۆشترویستنی پێغەمبەری خواش، بەقسەو لاف لێدانی ڕووت پێکنایەت و، پێویستی بەبەڵگە هەیە و، پتەوترین بەڵگەش بریتیە لە شوێن کەوتنی و پابەندیی بە بەرنامەو ڕێبازەکەیەوە:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران.

## سێیەم: خۆ تەسلیم کردنی و لە ناخەوە ڕازیبون بە حوکم و بڕیاری:

ئەمەش ئەدەبێکی دیکەی گرنگ و پێویستە، کە پێویستە ئینسانی مسوڵمان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا بینوێنێ، خوای زانای پەنهان و ئاشکرا، لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء.

واتە: نەخێر سوێند بەپەروەردگارت! ئیمان ناهێنن، هەتا لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە کێشەوە، نەتکەنە دادوەر، پاشان لە بەرانبەر بڕیاری تۆدا، هەست بەهیچ دڵ سەغڵەتییەك نەکەن، وە بە تەواویی ملکەچ نەبن.

دیارە وەك هەندێك لە توێژەرەوان (مفسرین) گوتوویانە[1]:

- (يُحَكِّمُوكَ ): ئیسلامە.
- (لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ ): ئیمانە.
- (وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ): ئیحسانە.

واتە: بەبێ ڕازی بوون و ملکەچ بوون بۆ حوکم و بڕیاری پێغەمبەر، ئینسان نایەتە نێو ئیسلامەوەو بەکافر دادەنرێ! وە بەبێ لاچوونی پێناخۆش بوون و سەغڵەتیی، لەبەرانبەر بڕیارەکانیدا صلى الله عليه وسلم، ئینسان بە بڕوادار (مؤمِنْ) دانانرێ و، بۆ گەیشتنە پلەی ئیحسان (مقامُ الإِحْسانْ)یش، پێویستە دڵ ئارامگرتن و ئاسوودەیی تەواو بەرانبەر بە حوکم و بڕیاری پێغەمبەر پەیدا بێ.

---

(١) بڕوانە: (تیسیر الكريم الرحمن...) ص ١٨٥.

## چوارەم: پێش نەكەوتنەوەی پێغەمبەر و هـەنگاونـەنــان بەبـێ مــۆڵـەتـی وی:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾ ﴾ الحجرات.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هیچ شتێك پێش دەستی خواو پێغەمبەرەكەی مەخەن، وە پارێزكاریی لەخوا بكەن، بێگومان خوا بیسەری زانایە.

بەڵێ، لە دوای فەرمانی خواو پێغەمبەرەوە ڕۆیشتن و[1] هیچ قسەو بڕیارو هەڵوێستێك پێش بڕیاڕی ئەوان نەخستن، یەكی دیكەیە لە ئەدەبە گەورەو گرنگەكانی مسوڵمانەتیی و ڕەوشت و ئاكارێكی بەرزی هەڵس وكەوت و ڕەفتارە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا.

## پێنجەم: دەنگ ڕەسەر دەنگی پێغەمبەر نەخستن:

ئەم ئەدەبەش دوو واتاو چەمكی هەن:

**واتای یەكەم:** لە حاڵی ژیانی دنیای دا، دەنگ بەسەر دەنگیدا بەرز نەكردنەوە.

**واتای دووەم:** لە حاڵی ژیان و پاش مردنیشیدا، هەڵنەبژاردن و زاڵنەكردنی هیچ قسەو بۆ چوون و بڕیارێك، بەسەر فەرمایشت و بڕیارەكانیدا، خوای بەخشندەو بەخشەر فەرموویەتی:

---

(١) زۆربەی حەوت قورئان خوێنەكان (القرآء السبعة) بە (لاتُقدِّموا) واتە: پێش مەخەن، خوێندوویانەتەوە، بەڵام (عبد الله بن عباس و الضحاك ويعقوب)بە (لا تَقَدَّموا) واتە: پێش مەكەون، خوێندوویانەتەوە.
بڕوانە: (فتح القدير) للشوكاني، ج٥ ص٧١.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾ الحجرات.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دەنگی خۆتان ڕەسەر دەنگی پێغەمبەر مەخەن، وەك دەنگ هەڵێنانی هەندێکتان لەگەڵ یەکدیدا (دەنگتان لە کاتی قسە لەگەڵ کردنیدا بەرز مەکەنەوە)، نەوەك بێ ئەوەی خۆتان هەست پێبکەن، کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوە.

بێگومان ئەو کەسانەی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا دەنگیان نزم دەکەنەوە، ئەوانە خوا دڵیانی بۆ پارێزکاریی تاقیکردۆتەوە (وپاڵفتە کردوە) لێبوردنێك و پاداشتێکی مەزنیان هەیە.

ئنجا لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە، کە خوای دادگەر هەڕەشەی کردەوە هەڵوەشانەوەی (حبوط الأعمال) ئاڕاستەی ئەو کەسانە کردوە، کە ڕەچاوی ئەدەبی دەنگ بەرزکردنەوە ناکەن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، وە لەلایەکی دیکەشەوە موژدەی دڵ و دەروون پاڵێوران و خاوێن کرانەوەی بەوانە داوە، کە ئەو ئەدەبە جێ بەجێ دەکەن، بۆیە زاناو پێشەوایانمان گوتوویانە: (قليلٌ مِنَ الأدَبِ خير مِنْ كثير مِنَ العَمَلِ)، چونکە ئەوەتا بەکەم ئەدەبییەك، کردەوەیەکی زۆری مرۆڤ، دووچاری بەزایە چوون و هەڵوەشانەوە دەبێ.

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٣)ی سووڕەتی (الحجرات)دا وێڕای موژدەدانی دڵ پاڵێوران بەخاوەن ئەدەبان، ئەو ڕاستییەشی ڕاگەیاندوە، کە تەنیا بابای پارێزکار (متقي) دەتوانێ خاوەنی ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو جوانبێ، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا!

وە ئەو ڕاستییەش ڕادەگەیەنێ کە: هەموو دڵ و دەروونێك شایستەی ئەوە نیە، کە خەسڵەتی بەرزی پارێزکاریی (تقوی)ی بچێتە نێوی و تێیدا جێگیربێ،

بەڵکو ئەوە تەنیا دڵە پاك و پاڵفتەکراوەکانن، کە شیاوی ئەوەن ببنە خانە خوێ (مضیف)ی میوان (ضَیْف)ی پارێزکاریی.

ئنجا سەرباری هەموو ئەو شتانەش: ئایەتی ناوبراو خستوویەتە ڕوو، کە خاوەنانی ئەدەبی بەرزو پەسندی دەنگ هەڵنەهێنان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا، لێبوردن و پاداشتێکی گەورەو تایبەتیی و دانستەشیان هەیە!

کەواتــە:

وەك چۆن بێئەدەبیی لەخزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دا، هۆی مایەپووچ بوونی ئینسان و هەڵوەشاندنەوەی کردەوە چاکەکانیەتی، ئەدەب و ڕێزیش لەخزمەتیدا، نیشانەی تەزکیەبوون و پارێزکاریی و، مایەی لێبوردن و پاداشتی گەورەو تایبەتی خوای بەرزو تاکیشە!

## شەشەم: ناو نەهێنانی و بانگ نەکردنی وەك خەڵکی ئاسایی:

ئەدەب و ڕەوشتێکی دیکەی گەورەو گرنگی مرۆڤی مسوڵمان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا، ئەوەیە کە لەکاتی ناوهێنان و بانگ کردنی دا، وریا بێت و وەك خەڵکی دیکەی ئاسایی ناوی نەبات و بانگی نەکات، خوای پەروەردگار لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾ النور.

واتە: بانگکردنی پێغەمبەر لەنێوانتاندا، وەك بانگکردنی هەندێکتان بۆ هەندێکتان سەیر مەکەن...

**توێژەرەوانی قورئان، ئەم ئایەتەیان بە دوو جۆر تەفسیر كردوە:**

**جۆری یەكەم:** با بانگ كردنتان بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وەك بانگ كردنتان بۆ یەكدی نەبێ.

**جۆری دووەم:** بانگ كردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆتان، وەك بانگ كردنتان بۆ یەكدی تەماشا مەكەن.

ئنجا تەفسیری یەكەمیان لەگەڵ ئایەتەكانی: (٤و٥)ی (الحجرات)دا دێتەوە، كە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئەوانەی لە پشت ژوورەكانەوە[1] بانگت دەكەن، زۆر بەیان نەفامن. وە ئەگەر چاوەڕێیان كردبایە، هەتا دەردەچوویە لایان، بۆ وان باشتربوو، وەخوا لێبوردەو بەبەزەیی یە.

**توێژەرانی قورئان چەند بەسەرهاتێكیان لەبارەی هۆی هاتنەخوار (سبب النزل)ی ئەم دوو ئایەتە گێڕاونەوە، كە ئەمە یەكێكیانە:[2]**

{عَنِ الْأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ أَنَّهُ أَتى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَال: "يَا مُحَمَّد! أُخرُج إِلَيْنا فَلَمْ يُجِبْهُ، فقال: يَا مُحَمَّد إِنَّ حَمْدِي زَيْنٌ وَإِنَّ ذَمِّي شَيْنٌ، فقال: ذاكَ اللهُ}

أخرجه أحمد برقم: (١٦٠٣٤) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف.

واتە: (ئەقرەعی كوڕی حابیس) هاتە خزمەت پێغەمبەر گوتی: هۆ موحەممەد! وەرە دەرێ بۆ لامان، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، ئنجا (ئەقرەع) گوتی: هۆ

---

(١) مەبەست لە (الحجرات)كە كۆی (حجرە)یە، ژوورەكانی هاوسەرە بەڕێزەكانی پێغەمبەرن (خوا لێیان ڕازی بێ).

(٢) بڕوانە: (فتح القدير) للشوكاني، ج٥ ص٧٥، چەند ریوایەتێكی دیكەش لە (ترمذی وابن جريرو ابن المنذرو ابن أبي حاتم) وەلە (إسحاق بن راهويه وطبراني وسيوطي)یەوە هاتوون.

موحەممەد! مەدح كردنم شیرینكەرەو، زەم كردنم دزێوكەرە، ئەویش فەرمووی: ئەوەی ئاوایە، بەس خوایە! ئنجا خوا ئەمەی نارده خوارێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾

دیاره بێ ئەدەبیی ئەو جۆره كەسانەش، كەخوای دادگەر زۆربەیانی بە نەفامیی ﴿ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ ناوزەند كردوە، دوو شت بووە:

یـــەك: بەبێ سەلام كردن و لەدەرگا دان و مۆڵەت خواستن، چوونەتە نیزیك ژوورەكانی (ماڵەكانی) پێغەمبەرەوە.

دوو: بەناوی شەخسی خۆی، كە (محمد)ە، بانگیانكردوە، بەبێ ناوونیشانی پێغەمبەرایەتیی، وەك (نبي الله) و (رسول الله)!

ئنجا دیاره وەك چۆن كاتی خۆی، بانگ كردن و باسكردنی پێغەمبەر بەناوی شەخسی خۆی و، بەبێ نازناوی پێغەمبەرایەتیی، بێ ئەدەبیی بووە، ئێستاش هەر وایەو، مەگەر لەبەر ناچاریی و پێویستیی، ئەگەرنا جوان نیە بگوترێ: (محمد) وابوو، واچوو!! با صەڵاوات و سەلامیشی لەگەڵ بەكار بێت.[١]

وە بەپێی تەفسیرو لێكدانەوەی دووەمیش، بێگومان بانگ كردنی پێغەمبەر بۆ هەركام لەمسوڵمانان وەك بانگ كردنی ئەوان نیە بۆ یەكدی، بەڵكو ئەدەب لەگەڵ ئەو سەروەری كائیناتەدا، وا دەخوازێ كە یەكسەر بە دەنگیەوە بچین[٢]، ئنجا بێگومان بەدەنگەوە چوونی كاتی خۆی، هەم وەڵام دانەوەی ڕواڵەتیی بووەو، هەم وەڵام دانەوەی مەعنەوییش، كە جێبەجێ كردنی فەرمان و ڕێڕوونیی و ئاڕاستەكانیەتی، بەڵام هی ئێستا، كە تەشریفی موبارەكی بەجەستەو ڕواڵەت لە نێوانماندا نەماوە، ماوەتەوە بەدەنگەوە چوون و وەڵام دانەوەی مەعنەویی.

---

(١) چونكە صەلاوات و سەلام بۆ ناردنی، ئەدەبێكی دیكەی سەربە خۆ تایبەتە و، قەرەبووی ئەدەبی دیكە ناكاتەوە.

(٢) تەنانەت لە حاڵەتی نوێژكردنیش دا هەر پێویست بووە وەڵامی بدەنەوەو بە دەنگی یەوە بچن. بڕوانە (تیسر الكریم الرحمن في تفسیر كلام المنان) ص٥٧٦ .

## حەوتەم: سەڵاوات و سەلام بۆناردنی، لە کاتی ناوهێنانی دا:

ئەدەبێکی دیکەی گرنگ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، ئەوەیە، کە لەکاتی باس کردنی و ناوهێنانیدا، بگوترێ: (صلى الله عليه وآله وسلم) یان ((صلى الله عليه وسلم)) یان (سەڵات و سەلامی خوای لەسەر)، دیارە لەکاتی نووسینی ناوو نازناویشیدا، بەهەمان شێوە هەر سوننەتەو ئەدەبێکی بەرزیشە، کە صەڵات و سەلامی بۆ بنێررێ.

خوای پەروەردگارو بەخشەریش فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بێگومان خواو فریشتەکانی صەڵات لەسەر پێغەمبەر دەدەن، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! صەڵاتی لێ بدەن و سەلامی تەواوی لێ بکەن.

پێغەمبەریش فەرموویەتی:

{مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْراً} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٥٦٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٨٤)، وَأَبو دَاوُدَ برقم: (٥٢٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦١٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٦٧٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٩٠).

واتە: هەرکەسێ سەڵاتێکم لەسەر لێ بدات، خوا بەوە دەسەڵاتی لەسەر لێدەدات.

نەك هەر ئەوەندەش، بگرە پێغەمبەری خوا، بابای کەمتەرخەم لە ناردنی صەڵات و سەلامدا بۆی، بە ڕژد (بخيل) داناوەو، فەرموویەتی:

{إِنَّ الْبَخِيلَ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٣٦)، وَالنَّسَائِيُّ في الكبرى برقم: (٨١٠٠)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٦٧٧٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٢٨٨٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٠١٥)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم: (١٥٦٦)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٩٠٩) قال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي.

واتە: ڕژدو چرووك كەسێكە، كە باسی منی لەلا بكرێ و، صەڵەواتم لەسەر نەدات.

**ئنجا خوێنەری بەڕێز!**

لەسۆنگەی ئەوەوە، كە ئێمە ستایش بۆ خوا لەشوێنێكی دیكەدا بە تێرو تەسەلیی باسی ماناو مەبەستی سەڵات و سەلام و بەرەكات و، چۆنیەتیی و سەڵات و سەلام ناردن بۆپێغەمبەری خواو، حوكم و حیكمەتی و ..هتدمان كردوە[1]، لێرەدا دووبارەی ناكەینەوە.

بەڵام تێبینییەك هەیە بە پێویستی دەزانم بیخەمە ڕوو، ئەویش ئەوەیە، كە لە كاتی نووسینی صەڵات و سەلامدا، پێویستە هەمووی بنووسرێ، نەك بەپیت و ڕەمزێك وازی لێ بهێنرێ، وەك (صلعم) یان (ص) یان (د.خ)، هەروەها لەكاتی گوتن و نووسینیشدا، چاكتر وایە چ بە عەرەبیی، یان بەكوردیی، یان بە هەر زمانێكی دیكە، هەر دووك وشەی (صلاة) و (سلام) بگوترێن و تەرجەمە نەكرێن، وەك: درودو ئاشتی و ...هتد. چونكە ئەو جۆرە شتانە، بوونە زاراوەو دروشمێكی ئیسلامیی.

## هەشتەم: فەرمایشت و بڕیارەكانی، بۆ بیروڕاو قسەو هەڵوێست و سیاسەتی هیچ كەسێك، پشتگوێ نەخرێن:

ئەمیش ئەدەب و ڕەوشتێكی یەكجار گرنگ و پێویستە، بۆ هەر مسوڵمانێك كە بیەوێت بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دووچاری بێ ئەدەبیی كردن نەبێ.

خوای بەبەزەیی و دادگەر فەرموویەتی:

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الأحزاب.

---

(١) بڕوانە كتێبی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)، بەرگی یەكەم، چاپی دووەم.

واته: وه هیچ پیاوێكی بڕوادارو ئافرەتێكی بڕوادار بۆیان نیه، كاتێك خواو پێغەمبەرەكەی بڕیاری كارێك دەدەن، مافی هەڵبژاردن (سەر پشك بوون)یان لەبارەی خۆیانەوە هەبێ، وە هەر كەسێك سەرپێچیی خواو پێغەمبەرەكەی بكات، ئەوە مسۆگەر بە گومڕاییەكی ئاشكرا گومڕا بووە.

حیكمەت و نهێنیی ئەم ئەدەبەش ئەوەیە، كە هەر كەسێك خواو پێغەمبەرەكەی بناسێ و، ئیمانی پێیان هەبێ، دڵنیاو مسۆگەر دەبێ، كە زۆر زۆر لە خۆی بۆی دڵسۆزترو بەپەرۆشترن و، بێگومان قازانج و زیانی دنیاو قیامەتیشی چاكتر دەزانن! كەواتە: بۆچی دەبێ بۆچوون و بڕیاری خۆی، یان یەكێكی دیكە، بەسەر هی ئەواندا هەڵبژێرێ؟!

كەواتـــە:

نابێ فەرمایشت و بڕیاری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ قسەو هەڵوێست بۆ چوونی هیچ كەسێك، ئنجا چ پێشەوا (إمام)ی مەزهەب بێت، چ شێخ و ئوستادی ڕێباز (طریقه)ی تەصەووف، چ بەرپرس و حوكمڕانی سیاسەت. چ..چ.. هتد، پشتگوێ بخرێ، نەك هەر ئەوەندە، بگرە دروست نیەو نابێ قسەو هەڵوێست و بڕیاری هیچ كەسێك، لەگەڵ هی پێغەمبەری خوادا هەر بەراورد (مقارنة)ش بكرێ و، بخرێتە تەرازووشەوە.

نۆیەم: لەسەر كردنەوەی و، بەرگریی لێ كردنی و،
ڕێ نـەدان بەبێ ئـەدەبیی لە بـەرانبـەردا كردنـی:

ئەمەش ئەدەبێكی دیكەی گەورەو گرنگ و قورسی سەرشانی مسوڵمانانە، بەرانبەر بە پێغەمبەرەكەیان، كە خوای دادگەرو باڵادەست فەرموویەتی:

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا ﴿٦﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ بڕواداران لە خۆیان بۆیان لەپێشترە، وە هاوسەرەکانیشی دایکیانن ..

هەروەها هەر لەوبارەوە، کە پێویستە مسوڵمانان پێغەمبەری خوایان لە خۆیان خۆشتر بوێ و، خۆیان بکەنە سوپەرو قەڵغان و بەڵا گێڕەوەی، خوای پەنهان زان فەرموویەتی:

﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ التوبة.

واتە: نەدەبوو خەڵکی مەدینە و عارەبە خێڵەکییەکانی دەوروبەریان لە پێغەمبەری خوا بەجێ بمێنن (لە جەنگ) وە نەدەبوو گیانی خۆیانیان لەگیانی وی لەلا خۆشەویستتر بێت (و پێ لە پێشتر بێت، بۆ سەلامەتیی و پارێزران)...

**بەڵێ خوێنەری مسوڵمان!**

خۆکردنە بەڵاگێڕەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و بەرگریی لێکردنی و، لەسەر کردنەوەی و ڕێنەدان بە ناماقووڵیی کردن و بێڕێزیی نواندن لە بەرانبەری دا، یەکێکە لە ئەدەب و ڕەوشتە گەورەو گرنگەکانی ئینسانی مسوڵمان و دیندار لە بەرانبەر پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم).

ئنجا ئاشکراشە کەچۆنیەتی و شێوازی ئەو بەرگریی لێ کردن و لەسەر کردنەوەیەو، حوکمی شەرعیی ئەو مەسەلەیە، بە گوێرەی کات و شوێن و تواناو دەست ڕۆیشتن، دەگۆڕێن و جۆراو جۆرن، هەروەها شێوەو چۆنیەتیی و ئەندازەی ناماقووڵیی و بێ ئەدەبیی نواندنەکەش، دیسان جیا جیاو جۆراو جۆرەو، شێوەو حوکمی بەرەنگار بوونەوەیشی بەهەمان شێوەیە[1].

---

(١) لێرەدا بەپەسندی دەزانم ئەم ڕووداوە بگێڕمەوە کە لەڕۆژگاری (والی)یەتی (عمرو بن العاص) خوا لێی ڕازی بێ لە (میصر) ڕووی داوە:

## ئەدەبی دەیەم: خۆشویستن و ڕێزو حورمەت گرتنی هاوەڵانی دڵسۆزی و بنەماڵەی بەڕێزی:

ئەمیش كە ئێمە كردوومانە بە ئەدەبی دەیەم و كۆتایی بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)[1]، ئەدەب و ڕەوشتێكی زۆر گرنگە، بەرانبەر بەو

---

جارێكیان (غرفة بن الحارث الكندي) خوا لێی ڕازی بێ كە هاوەڵ (صحابي)ە، گوێی لەنەصرانییەك دەبێ، قسە بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەڵێ، ئەویش لێی دەدات و لووتی دەشكێنێ و، مەسەلەكە دەچێتە لای (عمرو) خوا لێی ڕازی بێ و بە (غرفة) دەڵێ: ئێمە پەیمان و بەڵێنمان لەگەڵ بەستوون! (غرفة)ش دەڵێ: پەنا بەخوا لەسەر ئەوە بەڵێنیان بدەینێ، كە بەئاشكرا قسە بەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بڵێن! بەڵكو لەسەر ئەوە پەیمانمان لەگەڵیان بەستووە، كەلێیان بگەڕێین لەكڵێسایەكانیاندا، چی دەڵێن بیڵێن، وە لەسەر ئەوە كەزیاد لەتوانایان لێیان داوا نەكەین، وە ئەگەر دوژمنێكیان هێرشی كردنە سەرێ، جەنگیان لەسەر بكەین، وە كەلێیان بگەڕێین بەپێی شەرعی خۆیان حوكم بكەن، مەگەر خۆیان بەحوكم و شەرعی ئێمە ڕازی بن و بێنە لامان و، بەپێی حوكمی خوای بەرزو مەزن و حوكمی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دادوەریی یان لەنێواندا بكەین، وە ئەگەر پێویستیان پێمان نەبوو، وازیان لێ بهێنین، (عمرو بن العاص)یش گوتی: ڕاست دەكەی (لەسەر ئەوە بەڵێنمان لەنێواندایە).

رواه البخاري في تأريخه عن نعيم بن حماد عن عبدالله بن المبارك عن حرملة: بإسناده وإسناده صحيح، بڕوانە: (الإستيعاب في معرفة الأصحاب) ج٣ ص ١٩٣، وە بڕوانە: (الإصابة في تمييز الصحابة) ج٣ ص ١٩٥، وە بڕوانە: (حياة الصحابة) لمحمد يوسف الكاند هلوي، ج٢ ص ٤٣٩ .

ئاشكراشە كە ئازادی بیروڕا لە ئیسلامدا مافێكی دەستەبەركراوە بۆ هەموو لایەك بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە، بەڵام بێگومان ئازادی بیروڕا بەكوفر، كردنیشەوە، چونكە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ...﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف، جیایە لەسووكایەتیی و بێڕێزیی پێكردن و، جنێودان بەبەرانبەر، كەئەوە لەمسوڵمانانیش بەرانبەر بەئەهلی كوفر، قەدەغە كراوە: ﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ...﴿١٠٨﴾ ﴾ الأنعام.

(١) لەبەرگی دووەمی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا بەدرێژیی باسی چەمك و واتای وشەی (آل)مان كردوەو، دەرمان خستوە، كە هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەر (صلى

زاتە ڕەوشت مەزن و ئاکار پەسندە، داوا لە خوای بەخشەر بکرێ صەڵات و سەلام و بەرەکاتی خۆی بە ڕێژنەو لێزمە بەسەردا بڕێژرێ، چونکە:

**یـەك:** هەر کەسێك بەڕاستیی کەسێکی خۆشویست و ڕێزو حورمەتی لێگرت، بێ سێ و دووو بە شێوەیەکی سروشتیی، نیزیکان و وابەستانیشی لەلا خۆشەویست و بەڕێزو بە قەدر دەبن و، ئەمەش شتێکی ڕوون و بێ چەندو چوونە، گوێ بگرە لەقسەی (مجنون) بزانە بەرانبەر بەجێ هەوارو دەرو دیواری ماڵی (لیلی)ی دۆستی، چی دەڵێ؟:

مَـــرَرْتُ بِالـدِّيــار ديـار ليْلى فَقَبَّلتُ ذا الجدارَ وذا الجِدارا
وما حُبُّ الديار شَغَفْنَ قَلبـي ولكِنْ حُبُّ مَنْ سَـكَنَ الدِّيارا

واتە: بەلای خانووو بەرەو هەوارگەی ماڵی لەیلادا تێپەڕیم و، ئەم دەرو دیوارو ئەو دەرو دیوارم ماچ کردن!

وە لەڕاستییدا خۆشەویستیی خودی ماڵ و هەوارگەکە نەبوو، کە دڵمی لێواو لێو کردبوو، بەڵکو خۆشەویستیی ئەو کەسەی، کە لەو خانووو هەوارگەیەدا نیشتەجێ بوو بوو.

**دوو:** هەر کام لە هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وئله وسلم خوا لێیان ڕازی بێ و، بنەماڵەو کەس و کارو وەچە صاڵح و پاك و فیداکارەکانیشی خوا لێیان ڕازی بێ، پاش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە هەموو کەس زیاتر چاکەو فەزڵ و منەتیان بەسەر ئۆممەتەوە هەیە، چونکە گەورەترین خزمەتیان کردوە، چاکترین فیداکاریی یان پێشکەش کردوە.

کەواتە: ئەو بەڕێزانە: هاوەڵان (الأصحاب)و بنەماڵە (أَهْلُ البَيت) خوا لێیان ڕازی بێ و ڕازیشیان بکات، هەم لەبەر خودی خۆیان و، هەم لەبەر نیزیکی

---

الله علیه وآله وسلم)، لەڕیزی پێشەوەی (آلْ)ن و، (أَهْل البیت)یش کە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەڕیزی یەکەمیانن، بەشێکن لە (آلْ)، هەروەها لە کتێبی حەوتەمی: مەوسووعەی {الإسلام کما یتجلی في کتاب الله}دا، کە لە چاپی یەکەمیدا بەرگی چوارەمیەتی، ئەو مەسەلەیەمان توێژیوەتەوە.

یان لە پێغەمبەریشەوە (صلی الله علیه وسلم)، شایستەی هەموو جۆرە ڕێزو تەقدیرو خۆشەویستییەكن.

**بەڵام نابێ لەو ڕاستییەش بێ ئاگابین كە:**

هەڵوێست و بۆچوونی هەر كام لە (رافِضة) و(ناصِبَة) كە یەكەمیان بەبیانووی خۆشویستن و لایەنگریی بنەماڵە (أَهلُ البَیت)ی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، هاوەڵە دڵسۆزەكانی دەبوغزێنن، بە تایبەت سێ خەلیفە بەڕێزەكانی: (أبوبكر الصّدیق) و (عمر الفاروق) و (عثمان ذو النورین) خوا لێیان ڕازی بێت، وە دووەمیشیان - واتە: (ناصِبَة) - بە بیانووو لەژێر پەردەی خۆشویستن و لەسەر كردنەوەی هاوەڵاندا بە گشتی و، بە تایبەت سێ خەلیفەكاندا، دژایەتیی بنەماڵەی پاك و بەڕێزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەگشتی و، بەتایبەت (علـي أسد الله)و كوڕو نەوەكانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەكەن!

بەڵێ، هەڵوێستی هەركام لەودوو پێرو تاقمە داهێنەر (مُبتَدِع)ە، بەهەڵەو بیدعەت دادەنرێ و هەڵوێست و بۆچوونی ڕاست و شەرعیی، هەر ئەوەیە كە زاناو پێشەوایانی پێشین و جەماوەری (أهلُ السُّنَّة والجَماعة) لەسەری كۆبوونەتەوە، كە وەك گوتمان:

خۆشویستن و ڕێز لێ گرتن و لایەنگریی كردنی، هەركام لە: هاوەڵان و، بنەماڵە و خزمانی بەڕێزو دڵسۆزو فیداكارو پارێزكارو دیندارو چاكەكاری پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم)، وێكڕاو پێكەوەو بەبێ لەیەك ترازاندن.

**ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ كە:**

وێڕای ڕێزو حورمەت گرتن و خۆشویستنی هاوەڵان و بنەماڵەو خزمانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دیسان ئەدەب و ڕێز نواندن بەرانبەر بەو زاتە ئاكارو ڕەوشت بەرزە، داخواز دەكات كە خۆشەویستیی و ڕێزو حورمەتمان بەرانبەر بە تێكڕای ئۆممەتیشی هەبێ، بە تایبەت زانا و پێشەوایانی ڕەسەن و فیداكارو پارێزكاری جێگرو میراتگری، كەبێگومان سێبەرو ڕەمزی مانەوەی پێغەمبەری خوان (صلی الله علیه وسلم) لە نێو مسوڵماناندا.

■ خـاڵی دووەم ■

## شێوەو چۆنیەتیی ئەدەب و ڕێزنواندن لەگەڵ پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)

وەك پێشتر گفتمان دابوو، بۆ ڕوونكردنەوەی چۆنیەتیی بەرجەستەكردن و جێبەجێ كردنی ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو جوان لەئاست پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، چەند نموونەیەكی كردەیی و واقیعیی بێنینەوە، ئنجا بێگومان چاكترین كەسانێك، كە ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەكانیان لەوبارەوە بێنینەوە، تەنیا هاوەڵە دڵسۆزو پارێزكارو فیداكارەكانی پێغەمبەرن (صلی الله علیه وسلم)، خوا لێیان ڕازی بێ.

بۆیە ئێمە ئەم خاڵی دووەمە، لە دوو بڕگەی سەرەكیدا دەخەینە ڕوو، لەیەكەمیاندا بە گشتیی باسی ئەدەب و ڕێزو خۆشەویستی هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەكەین، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، وە لە دووەمیشیاندا چەند وێنەیەك لەژمارەیەك لەو هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزانە دەگێڕینەوە:

بڕگەی یەکەم: ڕێزو ئەدەب و خۆشەویستیی هاوەڵان (أصحاب) بەگشتی لەخزمەت پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم):

لەو بارەوە چوار نموونە لەدەقەکانی سوننەت دێنینەوە:

یەکەم: {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ "أَنَّ رَسُولَ الله -صلى الله عليه وسلم- كَانَ يَخْرُجُ عَلَى أَصْحَابِهِ مِنَ المهَاجِرِينَ وَالأَنْصَار، وَهُمْ جُلُوسٌ، فِيهِم أَبُو بَكْر وَعُمَر رَضِيَ الله عَنْهُمَا، فَلا يَرْفَعُ أَحَد مِنْهُمْ بَصَرَهُ إِلاَّ أَبُو بَكْر وَعُمَر، كَانَا يَنْظُران إِلَيْهِ، وَيَنْظُرُ إِلَيْهِما، وَيَتَبَسَّمانِ إِلَيه، وَيَتَبَسَّم إِلَيْهِمَا"} أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٦٨)، وَضَعَّفَهُ الألباني.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەچووە دەرێ بۆلای هاوەڵەکانی، لەحاڵێکدا، کە دانیشتوون، چ کۆچکەران و چ پشتیوانان، وە ئەبو بەکرو عومەریشیان لە نێودا دەبوون، ئنجا هیچ کام لەوان چاوی بەرەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەڵنەدەهێنا، جگە لە ئەبوبەکرو عومەر، ئەمان تەمەشایان دەکردو، ئەویش تەماشای دەکردن، وە لەگەڵی پێدەکەنین (بەزەردەخەنەوە)و ئەویش زەردەخەنەی لەگەڵ دەکردن.

دووەم: {عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم كَأَنَّمَا عَلَى رُؤُوسِنَا الطَّيْرُ مَا مِنَّا مُتَكَلِّمٌ، إِذْ جَاءَ أُنَاسٌ فَقَالُوا: مَنْ أَحَبُّ عِبَادِ اللهِ تَعَالَى؟ قَالَ: أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا} أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٨٢١٤).

واتە: ئێمە کاتێك کە لەخزمەت پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دانیشتبووین، بەبێ دەنگیی، وەك باڵندەمان بەسەر سەرەوە نیشتبێ، هیچ کەسێکمان قسەی نەدەکرد، کۆمەڵێك هاتنە لای و گوتیان: کام لە بەندەکانی خوا لەلای خوای بەرز، خۆشەویستترن؟! فەرمووی: ڕەوشت چاکترینیانن.

**سێیەم:** {عَنْ عَبْد الرَّحْمَن بن الحارث عَنْ أَبِي قراد السّلمي قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِي صلى الله عليه وسلم فَدَعا بَطَهورٍ، فَغَمَسَ يَدَهُ فتوضَّأَ، فَتَتَبَّعناهُ فَحَسَوْناهُ، فَقَالَ النَّبِي صلى الله عليه وسلم: {مَا حَمَلكُم على ما فَعَلْتُمْ؟!} قُلنا: حُبُّ الله وَرَسولِهِ: قال: {فَإِنْ أَحْبَبتُم أَن يُحِبَّكم الله ورسولُهُ، فأدّوا إذا آئْتُمِنْتُمْ، وآصْدُقُوا إذا حَدَّثْتُمْ، وأحسِنوا جِوارَ مَنْ جاوَرَكُمْ}. أخرجه الطبراني برقم: (٤١٣٣)[١].

واتە: لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا بووین، داوای ئاوی دەستنوێژی کرد، ئنجا دەستی خستە نێوی و دەستنوێژی گرت، ئێمەش دوای ئەو بەلوێچ[٢] ئاوەکەمان خواردەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بۆچی واتان کرد؟! گوتمان: خۆشەویستیی خواو پێغەمبەرەکەی هانی داین وابکەین! ئەویش فەرمووی: ئنجا ئەگەر ویستتان خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان بوێن: هەرکات سپاردەتان پێ سپێردرا، بەجێی خۆی بگەیەنن، وە ئەگەر قسەتان کرد ڕاستگۆ بن، وە هەرکەسێك دراوسێتان بوو، لەگەڵی باش بن.

**چوارەم:** دوا نموونەشمان لەئەدەب و ڕێزو خۆشەویستیی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەم بەسەرهاتەیە کە (بخاري) لە (جامع الصحيح)ەکەی خۆیداو لەکاتی گێڕانەوەی ڕووداوی (حُدَيبِيَة)دا هێناویەتی، بەڵام لەبەر درێژیی، یەکسەر تەرجەمە کوردیی یەکەی دەنووسین، جگە لەقسەی کۆتایی:

{.. ئەوجار (عروه بن مسعود) هەستاو بۆ هاوبەش بۆ خوادانەرەکانی پێشنیار کرد، کە بچێتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و قسەی لەگەڵ بکات. گوتیان بچۆ: ئنجا ڕۆیشت و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەك چۆن (بديل بن وَرْقاء)ی دواند بوو، قسەی لەگەڵ کرد، ئنجا (عروة) پێی گوت: باشە ئەوە (گریمان ئێوە زاڵبوون و) گەلەکەتت بنبڕ کرد، ئایا پێش خۆت بیستووتە: هیچ کەسێك لە عەڕەبان خەڵکی خۆی قڕەبڕ کردبێ؟ وەئەگەر لای

---

(١) بڕوانە: (حياة الصَّحابَة) ج٢ ص ٤٠٩، ٤١٠ .

(٢) لوێچ: ئەو ئەندازەیە، کە پڕی لەپی دەستێك و پەنجەکانی بێت .

دیكەشیان بێ[1]، بەخوا من كەسی ئەوتۆ نابینم و، تەنیا خەڵكێكی تێكەڵ و پێكەڵ دەبینم، كە شیاوی ئەوەن ڕابكەن و بەجێت بهێڵن!

ئەبو بەكر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: میتكەی[2] (لات) بمژە، ئایا ئێمە ڕادەكەین و پشتی بەردەدەین؟!

ئەویش ئاوڕی دایەوەو گوتی: ئەمە كێ یە؟!

گوتیان: ئەبو بەكرە.

گوتی: بزانە! ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە چاكەیەكت بەسەرمەوە هەیە، كەهەتا ئێستا پاداشتم نەداویەوە، وەڵامم دەدایەوە[3].

ئنجا (عروة) دەستی كرد بە قسەكردن لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و هەموو جارێكیش لەكاتی دواندنی دا، دەستی بەڕدێنیدا دەهێنا، (مغيرة بن شُعبة)ش بەسەر سەری پێغەمبەرەوە ڕاوەستا بووو شمشێری پێبووو، خوودەی لەسەر نابوو، ئنجا هەر كە (عروة) دەستی بۆ ڕیشی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبرد، (مغيرة) بەبنكی كالانەكەی لەدەستی دەداو دەیگوت: دەستت لەڕیشی دوور بخەوە! (عروة)ش سەری بەرز كردەوەو گوتی: ئەوە كێ یە؟!

گوتی: موغەیرەی كوڕی شوعبە!

گوتی: هەی بێوەفا! هەردوێنێ نەبوو پاشەڵم شۆردی[4]؟!

پاشان (عروة) بە هەردووك چاوی سەرنجی هاوەڵانی پێغەمبەری (صلى

---

(١) واتە: ئەگەر ئێوەش زاڵ و سەركەوتوو نەبن.

(٢) جنێوێكەو وادیارە لەعورف و باوی ئەو كاتەدا ئاسایی بووە، (لات)یش ناوی یەكێكە لەبتە مێیینەكانیان، بۆیە ئەو جۆرە تەعبیرەی بۆ بەكارهاتوە.

(٣) ئەو چاكەیەی (أبوبكر) بەسەر (عروة)وە ئەوەبوو كە لە خوێن(دية)ێك دا هاوكارییەكی چاكی كردوە، بڕوانە: (فتح الباري) ج٥ ص ٦٩٠ .

(٤) مەبەستی ئەوە بووە، كە (مُغيرة بن شُعبَة) پێش مسوڵمان بوونی، سێزدە (١٣) كەسی كوشتوون و (عروة) خوێنەكەیانی داوە، بڕوانە: (فتح البارى) ج٥ ص٦٩١ .

الله علیه وسلم) دەدا، گوتی: دەجا سوێند بەخوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرجارێك تفی فڕێ دابایە، دەکەوتە دەستی یەکێك لەوان و لەدەم و چاوو بەدەنی خۆی هەڵدەسوو!

وە کاتێك فەرمانێکی پێدەکردن، پێشبڕکەیان دەکرد بۆ جێ بەجێ کردنی!

وە کاتێك دەستنوێژی دەگرت، نیزیك بوو لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی پێکەوە بەشەڕبێن!

وە کاتێك قسەیان دەکرد، دەنگی خۆیانیان لەلا نزم دەکردەوە!، وە لەبەر زێدە ڕێز لێگرتنی، چاویان تێ نەدەبڕی!

ئنجا عورِوە گەڕایەوە لای برادەرەکانی و گوتی:

{أَيْ قَوْمِ وَاللَّهِ لَقَدْ وَفَدْتُ عَلَى الْمُلُوكِ وَوَفَدْتُ عَلَى قَيْصَرَ وَكِسْرَى وَالنَّجَاشِيِّ، وَاللَّهِ إِنْ رَأَيْتُ مَلِكًا قَطُّ يُعَظِّمُهُ أَصْحَابُهُ مَا يُعَظِّمُ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ مُحَمَّدًا {صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ}!.}[1]

واتە: هۆ گەلەکەم! بەخوا بەنوێنەریی چوومەتە لای زۆر پادشایان و، بۆ لای قەیسەرو کیسراو نەجاشیی نوێنەر بووم، بەخوا هیچ پادشایەکم نەدیوە، کە هاوەڵەکانی ڕێزو حورمەتی بگرن، هێندەی هاوەڵانی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ڕێزو قەدرو حورمەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دەگرن..

**ئنجا خوێنەری بەڕێز!**

وەك گوتراوە: (الفَضْلُ ماشَهِدَتْ به الأَعْداءُ) چاکیی ئەوەیە کە ناحەزانیش دانی پێدا بێنن، لەو بەسەر هاتەشدا کە گێڕامانەوە، ئەم هەڵوێست و هەڵس و کەوتە پڕ ڕێزو ئەدەبانەی هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، سەرنجی ئینسان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن:

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج٥ ص ٦٧٥-٦٧٩، وەبڕوانە: (فقه السّيرة)ی د. محمد سعيد رمضان البوطي ص ٣١٦، ٣١٧، وە: (حياة الصَّحابة) ج٢ ص ٤٠٩، ٤١٠ .

- ئەو قسە تفت و تاڵەی ئەبو بەکری صیددیق (أُمْصَصْ بَظْرَ اللاَّتِ) کە پێم وایە ئەبو بەکری بەڕێز خوا لێی ڕازی بێ، وشە و تەعبیرێکی دیکەی هێندە زەق و سەختی لێ نەگێڕراوەتەوە! بەڵام وا دیارە ڕێزو خۆشەویستیی بۆ پێغەمبەری خوا، ناچاری کردوە، ئەو قسە سەختە لەوەڵامی ئەو تۆمەتەی (عروة)دا بڵێ.

- هەڵوێست و قسەکەی (مغيرة بن شُعبة) کە بێگومان، ئەگەر لەبەر زێدە ڕێزو ئەدەب نواندن بەرانبەر بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و زۆر خۆشویستنی نەبێ، ڕەفتارو قسەیەکی نەگونجاون! بەڵام دیارە حاڵ و مەقام وای پێویست کردوە، هەربۆیەش پێغەمبەر خوا صلى الله عليه وێلە وسلم هیچی بە (مغيرة) نەفەرمووە!

- تفی موبارەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەدەم و چاوو جەستەی خۆیان لەهەڵسوونیش لەلایەن هاوەڵانەوە، ئەندازەی ڕێزو خۆشەویستیی قووڵ و ڕیشەداری ئەو بەڕێزانە بۆ پێغەمبەرەکەیان پێشان دەدات و، بەڵگەشە لەسەر بەپیت و پێزو پیرۆز بوونی ئەو زاتە شەریف و زەریف و بەڕێزە، صەڵات و سەلامی خوای لێ بێ.

- پێشبڕکە کردنیش لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیدا، بە هەمان شێوە: ئاوێنەیەکی ساف و بێگەردەو ئەدەب و ڕێزی ڕاستەقینەی ئەو هاوەڵە بەرزو بەڕێزانەی تێدا دەدرەوشێتەوە.

- هەروەها سووربوون لەسەر هاوکاریی کردن بۆ دەست نوێژگرتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، یان بەهرەمەندبوون لە لوێچە (غُرْفة) ئاوێکی پاشماوەی دەستنوێژی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، بەهەمان شێوە.

- دیسان دەنگی خۆ کپ و نزم کردنەوەشیان لەکاتی قسەکردن لەخزمەتیدا، وەك پێشتر گوتوومانە: بەڵگەو نیشانەی پارێزکاریی و تەزکیەبوون و، هۆکاری لێبوردن و پاداشتی مەزنی خوایە، بۆ ئەو بەڕێزانە.

- وە لە كۆتاییدا سەرنج لێ نەدان و چاوتێ نەبڕینی هاوەڵان بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بەڵگەو نیشانەی ئەدەب و ڕێزیان و شێوەو چۆنیەتی لەگەڵ دا بەئەدەب بوونیشیانە!

ئنجا نابێ لە بیریشمان بچێ، كە هەمیشە ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو گەورە، زادەو بەرهەمی عیبادەت و طاعەتی گەورەو چاكەو، ئەمیش بەبێ ئیمان و عەقیدەیەكی پتەوو گەورەو ڕاست و ڕەوان، مەحاڵە بێتە دی.

كەواتە: كە باسی ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو جوانی هاوەڵە بەڕێزەكان (الصَّحابة الكرام) دەكەین، دەبێ بزانین لە چ سەرچاوەیەكەوە دەستیان كەوتوە؟

## بڕگەی دووەم: ئەدەب و ڕێزو خۆشەویستیی یازدە (١١) کەس لە هاوەڵان، بەرانبەر بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):

### ١- ئەبو بەکری صیددیق (رضی الله عنه):

لە ئەبوبەکرەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەم دوو هەڵوێستە وەك دوو نموونەی ئەدەب و ڕێزی بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تۆمار دەکەین، ئەگەرنا ژیان و بەسەرهاتی خەلیفەی یەکەمی پێغەمبەر (خوا لێی ڕازی بێ)، سەرلەبەر ئەدەب و ڕێزو خۆشەویستیی و وەفایە، لەئاست پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وآله وسلم :

أ- لە (صحیح البخاری)دا هاتوە کەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پاش ئەوەی لەنەخۆشی مەرگیدا لەپێ کەوت و نەیتوانی پێش نوێژیی بۆ هاوەڵانی بکات، فەرمووی:

{مُروا أَبا بكر فَلْيُصَلِّ بِالناسِ}

واتە: بە ئەبو بەکر بڵێن: با پێش نوێژیی بۆ خەڵکی بکات.

ئنجا ڕۆژێکیان کە ئەبو بەکر نوێژی بە مسوڵمانان دەکرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەستی بە لەش سووکیی (خِفّة)یەك کردو، هاتە مزگەوت و ئەبو بەکریش بەپێوە بوو، پێش نوێژیی بۆ خەڵکی دەکرد، ئنجا ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) کە هەستی کرد، هاتە دوایەو پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئاماژەی بۆ کرد، کە لەجێی خۆی بمێنێتەوە، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لە تەنیشت ئەبو بەکر دانیشت، ئیدی ئەبوبەکر لەپشت پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) کەدانیشتوو بوو، نوێژی دەکردو، خەڵکیش لەپشت ئەبوبەکرەوە نوێژیان دەکرد.

ئنجا لەو حاڵەتەدا بوو کە ئەبووبەکر کشایەوە دواوەو، گوتی:

{مَا كَانَ لابنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يَتَقَدَّمَ أَمَامَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ}

واتە: کوڕی ئەبوو قوحافە ڕێی ناکەوێ، کە لە پێش پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بێت[1]!

ب- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێش کۆچی دوایی کردنی، سوپایەکی بەرەو ڕووی ڕۆمەکان سازکردو (أسامة بن زيد)یشی کردە فەرماندەی، بەڵام لەبەر نەخۆشیی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، سوپایەکە هەر لە نیزیك شاری مەدینە مایەوەو وەڕێ نەکەوت، ئنجا دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، زۆربەی هاوەڵان کە یەکیان عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) بوو، ڕایان وابوو ئەو سوپایە بەرەو ئامانجەکەی نەچێ و بگەڕێتەوە مەدینە، ئنجا لەو حاڵەتەدا ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، کە تازە بەخەلیفەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانرابوو، گوتی:

{والذي لا إله إلا هو، لو جَرَّتِ الكلابُ بأَرْجُل أزواج النَّبـي صلى الله عليه وسلم ما رَدَدْتُ جَيْشَاً وَجَّهَهُ رسُولُ الله صلى الله عليه وسلم ولا حَلَلْتُ لِوَاءَ عَقده}[2].

واتە: سوێند بەو زاتەی بێجگە لەوی هیچ پەرستراو - ی بەهەق - نین! ئەگەر بێت و سەگ لەلاقی هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆبێن، سوپایەك، کە پێغەمبەری خوا ناردوویەتی، نایگێڕمەوەو، بەیداغێك، کە ئەو گرێی داوە، هەڵی ناوەشێنمەوە[3].

---

(١) صحيح البخاري: ٧١٢، وەبڕوانە: (فقه السِّيرة)ی البوطي ص ٤٥٧، هەروەها بڕوانە: (مدارج السالكين) ج٢ ص ٣٩١، ٣٩٢ .

(٢) بڕوانە: (حياة الصَّحابة) ج٢ ص ٤٦٢ .

(٣) عادەت وابووە، هەر سوپایەك ئاڵا و بەیداغی تایبەتی خۆی هەڵداوە .

٢- عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه):

لە خەلیفەی دووەمی پێغەمبەریشەوە (عُمَر بن الخَطاب) خوا لێی ڕازی بێ، تەنیا ئەم دوو نموونەیە دێنینەوە، بۆ دەرخستنی چۆنیەتی ئەدەب و ڕێز نواندن بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا صەڵات و سەلام و بەرەکەتی خوای بڕژێتە سەر:

أ- (بخاري) لە (محمد بن سعد بن أبي وقاص) کە لە باببیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە، هێناویەتی، کە ڕۆژێکیان (عُمَر بن الخَطاب) مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا خواست و چووە ژوورێ، لە حاڵێکدا کە چەند ئافرەتێکی قوڕەیشی لەلابوون[1]، قسەیان لەگەڵ دەکردو دەنگیان ڕەسەر دەنگی وی (صلى الله عليه وآله وسلم) کەوتبوو!

ئنجا کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب ئیزنی خواست، هەستان و خۆیان خستە پشت پەردە! پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی داو عومەر وەژوور کەوت، لەحاڵێکدا، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێدەکەنی، (عومەر) گوتی: خوا ددانت پێ بکەنێنێ ئەی پێغەمبەری خوا[2]! پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەوە ئەمانەی لەلام بوون پێم سەیربوون (و پێکەنینم هات)، چونکە کاتێك گوێیان لە دەنگی تۆ بوو، خێرا خۆیان پەردەپۆش کرد!

عومەریش گوتی: ئنجا خۆ تۆ شایستەتری، کە شەرم و سامت لێ بکەن، ئەی پێغەمبەری خوا! پاشان عومەر گوتی: هەی دوژمنانی نەفسی خۆتان! شەرم و سام لەمن دەکەن و لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەیبەت ناکەن؟! ئەوانیش گوتیان: بەڵێ، چونکە تۆ قسە ڕەق و دڵڕەق تری لەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەوجار پێغەمبەری خواش فەرمووی:

{إِيهًا يَا ابْنَ الْخَطَّابِ! وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ سَالِكًا فَجًّا قَطُّ إِلَّا سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ}

---

(١) دیارە خێزانە بەڕێزەکانی بوو ون، بڕوانە (فتح الباري) ج٧ ص ٤٠٧.

(٢) واتە هەمیشە شاد و دڵخۆش و بێ غەم بی، بڕوانە: (فتح الباري) ج٧ ص ٤٠٢ .

واتە: ڕاوەستە[1] ئەی کوڕی خەتتاب! سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە، هەرگیز شەیطان لە ڕێیەك دا پێت ناگات، مەگەر ڕێیەکی دیکە بگرێتە بەر، جگە لەڕێ ی تۆ.

ب- جارێکیان عومەر ڕەزای (خوای لێ بێ) لە ڕۆژگاری خەلیفایەتییدا، بە شوێنێکدا ڕۆیشت بۆ نوێژی جومعەو لەسەر ڕێگاکەی پلووسکە (مِیزاب) یەکی ماڵی (عبّاس)ی مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەبوو، لەو ڕۆژەشدا دوو بەچکە باڵندەیان بۆ عەبباس سەربڕیبوون، کە عومەر گەیشتە بن پلووسکەکە، خوێنی دوو بەچکە باڵندەکانی پێدا هەڵڕژاو، عومەر پۆشاکەکی بەخوێن بوو، ئنجا عومەر فەرمانی کرد، کە ئەو پلووسکە هەڵقەندرێ، ئەوجار گەڕایەوە ماڵ، خۆی گۆڕی و پۆشاکێکی دیکەی لەبەرکرد، پاشان نوێژی بۆ خەڵکی کردو، عەبباسیش هاتە لای و پێی گوت: بە خوا ئەو شوێنەی پلووسکەکەی لێ هەڵقەندراوەو لابراوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆی ئەو پلووسکەی لەوێ گرتوە!

ئنجا عومەر، کە ئەوەی بیست بە عەبباسی گوت (خوا لێیان ڕازی بێ): بەتەئکیدکردنەوە داوات لێ دەکەم، کە دەبێ بچیە سەر پشتم هەتا لەوشوێنەی کەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وآله وسلم) تێیدا دانابوو، دایبنێیەوە! عەبباسیش بەقسەی کرد[2].

---

(١) وشەی (إیهاً) بەپێ ی سەروبۆر (حَرَکات)ی مانای جیاجیای هەن، بڕوانە: (فتح الباري) ج٧ ص٤٠٣ .

(٢) بڕوانە: (حیاة الصّحابة) ج٢ ص٤١٤ .

٣- عوسمانی كوڕی عەففان (رضي الله عنه):

له خەلیفەی سێیەمیشەوە، ئەم نموونەیە دێنینەوە[1]:

جارێكیان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەماڵەوە ڕاكشابووو ڕانەكانی، یان لاقەكانی بەدەرەوە بوون، ئەبو بەكر داوای هاتنە ژوورەوەی كرد، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هەر لەسەر حاڵەتی خۆی بوو، پاشان عومەریش مۆڵەتی هاتنە ژووری خواست، ڕێگای ویشی داو حاڵەتی خۆی نەگۆڕی، ئنجا عوسمان هات و مۆڵەتی خواست و ڕێگای دا بێتە ژوورو، كە وەژوور كەوت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پۆشاكەكەی چاك كردو دانیشت!

ئنجا كاتێك (عائشە) لەو بارەوە پرسیاری لێكرد؟ فەرمووی:

{أَلا أَسْتَحْي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحْي منه الملائكة؟!}

ئایا شەرم لە كەسێك نەكەم، كە فریشتەكانیش شەرمی لێدەكەن؟!

وە لەڕیوایەتێكی (مُسْلِم)دا هاتوە، كە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) لەوەڵامی عائیشەدا فەرموویەتی:

{إِنَّ عثمان رَجُلٌ حَيٌّ، وَإِنِّي خَشِيتُ إِنْ أَذِنْتُ لَهُ على تِلْكَ الحالة لا يَبْلُغْ إِلَيَّ في حاجَتِهِ}[2].

واتە: عوسمان پیاوێكی شەرم بەخۆیەو مەترسیی ئەوەم هەبوو، كە ئەگەر بەو حاڵەتەوە مۆڵەتی بدەم بێتە ژووریٚ، نەتوانیٚ ئیشەكەیم پیٚ بڵیٚ (لەبەر زێدە شەرم و ئەدەب و ڕێزی).

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري، شرح صحيح البخاري) لابن حجر العسقلاني ج٧ ص٤١٣.

(٢) صحيح مسلم: ٢٤٠٢.

## ٤- عەلی كوڕی ئەبوو طالیب (رضي الله عنه):

لە خەلیفەی چوارەمی پێغەمبەریشەوە (صلى الله عليه وسلم) (على بن أبى طالب) خوا لێی ڕازی بێ، تەنیا نموونەیەك لە ئەدەب و ڕەوشتی بەرزی، بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دێنینەوە:

{عَنْ عَلِي قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً فَكُنْتُ أَسْتَحْيِى أَنْ أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لِمَكَانِ ابْنَتِهِ، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: "يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ"} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٦٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٢١)).

واتە: من پیاوێكی زۆر بە ئاشقاو بووم، شەرمیشم دەكرد، كە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە بپرسم، چونكە كچەكەی (فاطمة) لەلام بوو، ئنجا بە میقدادی كوڕی ئەسوەدم گوت: كەبۆم بپرسێ و ئەویش پرسیاری لێكردبوو، ئەویش (واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) فەرمـوو بووی: با چووكی بشوات و دەستنوێژ بگرێ.

## ٥- ئەبوو عوبەیدەی كوڕی جەڕڕاح (خوا لێی ڕازی بێ):

لە بارەی (أبو عبيدة بن الجراح)یشەوە، ئەم هەڵوێستە سەرسوڕهێنەرە، دەگێڕینەوە، كە پڕە لە ئەدەب و ڕێزو خۆشەویستیی:

(أبوبكر الصديق) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوەو گوتوویەتی:

{(لە جەنگی ئوحود)دا من یەكەمین كەس بووم، كە گەڕامەوە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پیاوێكم بینی كە لەپێناوی خوادا شەڕی لەسەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەكرد، منیش وەك خۆشەویستیی خزمایەتیی گوتم: یاخوا (طلحة) بێ، مادام كە بۆ خۆم فریا نەكەوتووم، حەزدەكەم پیاوێكی خزمم بێت، وە لە نێوان من و كافرەكاندا پیاوێك هەبوو نەمدەناسی، بەڵام من بەلای پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) لەو نیزیكتر بووم، ئەوەندە هەیە بە شێوەیەك بەخێرایی دەڕۆیی، كە من نەمدەتوانی، كە

سەرنجم دایە (أبو عبیدة بن الجراح) بوو، گەیشتینە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و دیتمان ددانی شكاوە، دەم و چاوی قڵیشاوە، دوو ئاڵقەی خوودەكە چوونەتە ڕوومەتییەوە، ئنجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بچن بۆلای هاوەڵەكەتان، مەبەستی (طلحة) بوو، كە خوێنی لەبەر دەڕۆیشت، بەڵام ئێمە گوێمان نەدایە فەرمایشتەكەی[1]و، چووم كەئەوەی چۆتە كوڵمیەوە دەری بهێنم، كەچی (أبوعبیدة) سوێندی لێ خواردم كەبۆ ئەوی بەجێ بهێڵم! منیش وازم لێ هێنا، ئەویش حەزی نەكرد، كە بەدەستی ئاڵقەكان دەربهێنێتەوە، نەبادا ئەزیەتی پێغەمبەری خوا بدات، بۆیە بەددەمی قەپی پێ داكردو یەكێك لەدوو ئاڵقەكەی دەرهێنا، وە ددانێكی پێشەوەی لەگەڵ ئاڵقەكە هاتە دەرێ، ئنجا منیش چووم كە وەك وی بكەم و، ئاڵقەكەی دیكە دەربهێنم، كەچی دیسان گوتی: سوێندت لێ دەخۆم كەوازم لێ بهێنی، ئنجا وەك جاری پێشووی كردو، ددانەكەی دیكەشی هەڵقەندرا، لەگەڵ ئاڵقەكە، بۆیە ئەبو عوبەیدە، كەوتنی دوو ددانی پێشەوەی، لە هەموو كەس لێ جوانتر بوو}.[2]

## ٦- سەعدی كوڕی موعاذ (رضي الله عنه):[3]

سەعدی كوڕی موعاذ خوا لێی ڕازی بێ كەسەرۆك تیرەی (أَوْس) بووو، تیرەی ئەوسیش بەر لەئیسلام، هاوپەیمانی تیرەی (بني قریظة) بوون لە جوولەكەكان، ئنجا (بني قریظة) پاش بێ هیوا بوونیان لەبەر هەڵستیی كردنی سوپای ئیسلام، پاش جەنگی (أحزاب) كەبەڵێن و پەیمانیان هەڵوەشاندبۆوەو پشتگیریی موشریكەكانیان كردبوو، ڕازی بوون كەتەسلیم ببن و، بەداوەریی (حَكَمِيَّة)ی (سَعْد بن مُعاذ)یش قایل بوو بوون.

---

(١) واتە: لەبەر پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) نەمان پەرژایە سەر (طلحة) و فەرمانەكەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) كە (إیثار) ێكی عەجایب بووە، بۆیان جێ بەجێ نەكراوە.

(٢) بڕوانە: (البدایة والنهایة) ج٥ ص٣١ .

(٣) بڕوانە: (سیرة ابن هشام) ج٢ ص٢٤٠ .

ئنجا کاتێك سەعد گەیشتە بارەگای قیادەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر پێی فەرموو: {أُحْكُمْ فيهم يا سَعْدُ!} ئەی سەعد! حوکمیان دەربارە بدە! ئەویش گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شایستەترە کەحوکم بکات، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: {قَدْ أَمَرَك الله، أَنْ تَحْكُمَ فيهم} خوا فەرمانی پێکردووی، کە حوکمیان دەربارە بدەی!

ئنجا سەعدیش بۆ ئەوەی بە دڵنیاییەوە حوکمیان بۆ دەربکات و، ڕێی هەڵوەشاندنەوەی نەبێ، ڕووی کردە سوپای ئیسلام بەگشتی و، بەتایبەت تیرەکەی خۆی (أَوْس)و پێی گوتن: بەڵێن و پەیمانی خواتان لەسەربێ، کەهەر حوکم و بڕیارێکمدا، جێ بەجێ بکرێ (وهەموو لایەك پێیەوە پابەندبن)؟! گوتیان بەڵێ، پاشان ڕووی کردە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەو طەڕەفەی کەتەشریفی لێی ڕاوەستا بوو، لە حاڵێکدا کە لەبەر زێدە ڕێزو حورمەت، ڕووی بەرەو ئەولا وەرچەرخاندبوو، ئاماژەی بۆ خێوەت (چادر)ەکەی کردو گوتی: وە ئەو کەسەش کەلە ئێرەیە، هەر پێی ڕازی یە؟!

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بەڵێ.

پاشان ڕووی کردە (بني قريظة)، کە لە تەنیشت سوپای ئیسلامەوە ڕاگیرابوون و گوتی: ئایا ئێوەش ڕازین بە حوکم و بڕیاری من؟! گوتیان: بەڵێ.

ئنجا سەعد حوکم و بڕیارەکەی ڕاگەیاندو گوتی: حوکم و بڕیاری من ئەوەیە، کە شەڕکەران بکوژرێن و، ئافرەت و منداڵیان بە دیل بگیرێن و، ماڵ و سامانیشیان دابەش بکرێت!

ئنجا پاش ڕاگەیاندنی حوکم و بڕیارەکە، لەلایەن (سَعْدُ بنُ مُعاذ)ەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: {حَكَمْتَ فيهم بِحُكْمِ اللهِ مِنْ فَوقِ سَبْعِ سَمواتٍ}، واتە: بەگوێرەی حوکمی خوا لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە، حوکمت دان و دادگاییت کردن.

٧- ثابیتی کوڕی قەیس (رضي الله عنه):

(بخاري) لە (أَنَس بن مالك)ەوە خوالێی ڕازی بێ، گێڕاویەتەوە[1] کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێکیان هەواڵی (ثابت بن قیس بن الشمَّاس)ی پرسی، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من دەچم هەواڵیت بۆ دەزانم، کابرا هاتەلای و بینی سەری لەبەرخۆی ناوە، پێی گوت: چیتە؟ گوتی: خراپ، دەنگم بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەرزکردۆتەوەو، کردەوەکانم هەڵوەشاونەوەو لەڕیزی دۆزەخییانم!

ئنجا کابراش هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هەواڵی دایە کە ئاواو ئاوای گوتوە، (مُوسی بن أَنَس) دەڵێ: ئنجا بۆجاری دوایی کابرا چۆوە لای، بەموژدەیەکی گەورەوە گوتی: (پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی):

{إِذْهَبْ اليه فَقُلْ له: إنكَ لستَ منْ أهلِ النار، ولكِنَّكَ مِنْ أَهلِ الْجنَّةِ}

واتە: بچۆوە لای و پێ ی بڵێ: بێگومان تۆ لە خەڵکی دۆزەخ نی، بەڵکو لە خەڵکی بەهەشتی.

دیارە ئەو هەڵوێستەی (ثابِت) پاش هاتنەخوارەوەی ئایەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الحجرات: بووە.

شایانی باسە کە (بخاری) هەڵوێستێکی شێوەی ئەم هەڵوێستەی (ثابِت)ی لە ئەبو بەکرو عومەریشەوە خوالێیان ڕازی بێ، گێڕاوەتەوەو هێناویەتی کە پاش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە (ابن الزبیر) خوا لێیان ڕازی بێ گوتوویەتی: عومەر خوالێی ڕازی بێ هێندەی دەنگی نزم دەکردەوە، هەتا جاری وابوو

---

(١) صحیح البخاي: (٨/ ٤٥٤)، وە (زاد المسیر في علم التفسیر) لإبن الجوزي، ص ١٣٣٠.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێ ی دەفەرموو: چیت گوت[1]؟!

وە (إبن كثير) لە (أبوبكر الصديق)ەوە هێناویەتی كە گوتوویەتی: پاش ئەوەی ئایەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ ﴾

هاتە خوارێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بەخوا لەمەودوا تەنیا وەك كەسێك كە چپە لەگەڵ برایەكی بكات، قسەت لەگەڵدا دەكەم.

٨- ئەبو ئەییوبی ئەنصاریی (رضي الله عنه):

باگوێ لە (أبو أيوب) بگرین بۆخۆی ئەم بەسەرهاتەمان بۆ بگێڕێتەوە، كە پڕپڕە لە ئەدەب و ڕێزو خۆشەویستیی بۆ خوا (صلى الله عليه وسلم):[2]

دەڵێ: كاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (لەشاری مەككەوە كۆچی كردو هاتە شاری مەدینەو) لەماڵی من دابەزی، گوتم: باب و دایكم بەقوربانت بن! من پێم ناخۆشە، كە لەسەرووی تۆوە بم و تۆ لە ژێرەوەم بیت[3]، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بۆ ئێمە وا باشترە، كە لەقاتی ژێرەوە بین، چونكە خەڵكی دێتە لامان.

ئنجا جارێكیان گۆزەیەكمان هەبوو لێمان شكاو، ئاوەكەی ڕژا، من و (أم أيوب) بەپۆشاكێكی تووكدار، كە جگە لەو لێفەو پێخەفی دیكەمان نەبوو، ئاوەكەمان وشك كردەوە، نەبادا شتێك لەئێمەوە بگاتە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كەئازاری بدات.

وە لە ڕیوایەتی (أبو نعيم وابن عساكر)دا جگە لەوەی ڕابرد، ئەمەش هاتوە:[4]

---

(١) صحيح البخاري: (٨/ ٤٥٢) وە (تفسير ابن كثير) ج٧ ص٣٤٦.

(٢) بڕوانە: (حياة الصّحابة) ج٢ ص٤١٣، ٤١٤ .

(٣) واتە لەقات و ژووری خوارەوە، دیارە خانووەكە دووقات بووە.

(٤) بڕوانە: (حياة الصّحابة) ج٢ ص٤١٣، ٤١٤.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ! ناگونجێ من لەسەرووی تۆوە بم، بگوازەوە بۆ ژووری سەرەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد: کەلوپەلەکەی بگوازنەوەو گوێزرایەوە وەکەل و پەلەکەی شتێکی کەم بوو.

## ٩- طەڵحەی کوڕی عوبەیدیللا (رضي الله عنه):

(ابن اسحاق) لە ڕووداوەکانی جەنگی ئوحوددا، ئەم بەسەرهاتە کە ئەوپەڕی ئەدەب و ڕێزگرتنی لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تێدایە، لە(طلحة بن عبيدالله)وە گێڕاوەتەوە:[1] پاش تێشکان و پاشەکشەی مسوڵمانان لەجەنگی ئوحوددا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەڵسا بۆئەوەی بچێتەسەر گابەردێك لەشاخەکە، بەڵام چونکە بێهێز بووبووو دوو (زرێ) شی لەسەر یەك دەبەرکردبوون، نەیتوانی، بۆیە طەڵحەی کوڕی عوبەیدیللا (خوا لێی ڕازی بێ) چووە ژێری، هەتا هەڵسا!

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە، کە لاقێکی طەڵحە (خوا لێی ڕازی بێ) لەکاتی بەرگریی لێکردنی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، شەل بوو بوو، طەڵحە کاتێك پێغەمبەری هەڵگرت، زۆری لەخۆی دەکرد، تاکو ڕێك و ڕاست لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بڕوات، وەك ئەدەب و ڕێزێك لەخزمەتی داو، بۆئەوەی بەهۆی شەلینەوەش ئازاری نەدات، ئنجا لەئاکامی ئەوەدا، کە خۆی ئەزیەت داو زۆری لەخۆی کرد، لەشەلینەکەی چاك بۆوەو شیفای بۆ هات!

---

(١) بڕوانە: (صلاح الأمة في علوّ الهمة) ج٥ ص٦٤٠، ٦٤١.

## ١٠- عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحە: (رضي الله عنه):

له (عبدالله بن رواحة)شەوە ئەم ڕووداوە بەقەبارە گچكەو بەنێوەڕۆك گەورەو گرانە، دەگێڕنەوە كەنیشانەو بەڵگەی زێدە ڕێزو ئەدەب و خۆشەویستییەتی، بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم): (عبدالرحمن بن أبي ليلى) گێڕاویەتەوە كە ڕۆژێكیان (عبدالله بن رواحة) چۆتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەویش لەو كاتەدا وتاری داوە، ئنجا گوێی لێ بووە، كە فەرموویەتی: دابنیشن! (إجلِسوا)، ئیدی (عبدالله) یەكسەر لەشوێنی خۆی، كە دەرەوەی مزگەوتیش بووە دانیشتوە، هەتا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوتارەكەی بۆتەوە! ئنجا كاتێك ئەوە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتۆتەوە، پێی فەرمووە: {زادك الله حرصاً على طواعية الله ورسوله} واتە: خوا سووربوون و ئەمیەت دانت بەفەرمانبەریی كردنی خواو پێغەمبەرەكەیت تێدا زیاد بكات[١].

## ١١- جوثامە ی كینانیی (رضي الله عنه):

(جثامة بن مساحق بن الربيع بن قيس الكناني) خوا لێی ڕازی بێ، كە نوێنەری (عمر بن الخطاب) خەلیفەی دووەم بووە (خوالێی ڕازی بێ)، بۆلای (هِرَقْل) ئەم قۆڵە بەسەرهاتەی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوەو، دەڵێ:[٢]

كە چووم بۆلای، كورسییەكیان بۆ دانام و لەسەری دانیشتم، بەڵام نەمزانی چییە، لەژێرم! ئنجا كەسەرنجم دا كورسییەكی زێڕ بوو، بۆیە كە بینیم لێی هاتمە خوارێ و ئەویش (هِرَقْل) پێكەنی و پێی گوتم: بۆچی لەسەر ئەم كورسییە هاتیە خوارێ، كە ڕێزمان پێی لێ گرتی؟! منیش گوتم: ئاخر گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە، كە ئەم جۆرە شتانەی قەدەغە كردوون! (بێگومان ئەمەش لووتكەی ئەدەب و ڕێزە) لە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێبازەكەیدا.

---

(١) بڕوانە: (حياة الصّحابة) ج٢ ص٤٤٦ .

(٢) بڕوانە: (حياة الصّحابة) ج٢ ص٤٤٨، ٤٤٩ .

**خوێنـەری بەڕێـز!**

هەموو ئەو بابەتانەی، کە لەمەودوا دێن، تێکڕا درێژە پێدەری ئەم ناوو نیشانەن و، دیارە ڕەوشتی جوان و ئاکاری پەسند، پەیوەندیی بە هەموو بوارەکانەوە هەیە، بەڵام بەگشتی ئێمە خستوومانەتە سێ بواری سەرەکییەوە، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی زۆر لە ئایەت و فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، وە بەپێی عەقڵیش دیارە، بەڵام زیاتر لەبەر ڕۆشنایی ئەو فەرموودەیەدا، ڕەوشتی جوان و ئاکاری پەسندمان، بۆ سێ بوار دابەش کردوە:

عَنْ أَبِي ذَر قَالَ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: {اتَّقِ اللَّهِ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ} أخرجه أحمد برقم (٢١٣٩٢)، والترمذي برقم (١٩٨٧) وقال: حسن صحيح، والدارمي برقم (٢٧٩١)، والحاكم برقم (١٧٨) وقال: صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٨٠٢٦)، وأخرجه أيضًا: البزار برقم (٤٠٢٢) وأبو نعيم في الحلية برقم (٣٧٨)، قال الألباني: حديث حسن، قال شعيب الأرنؤوط : حسن لغيره.

واتە: (أبو ذر) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووم: {لە هەر حاڵێکدا بووی پارێز لەخوا بکە، وە بەدوای خراپەدا چاکە بکە دەیسڕێتەوە، وە لەگەڵ خەڵکدا بە ڕەوشتێکی چاك مامەڵە بکە}.

بەڵێ، بەپێی عەقڵ و نەقڵ (وحي) دیارە کە:

**ئینسان سێ بازنەی پەیوەندیی هەن:**

(بازنەی یەکەم) پەیوەندیی لەگەڵ خوا.<br>
(بازنەی دووەم) پەیوەندیی لەگەڵ خود.<br>
(بازنەی سێیەم) پەیوەندیی لەگەڵ خەڵك.

بـازنەی یەکەم

## پەیوەندیی لەگەڵ خوادا

لە پەیوەندیی لەگەڵ خوادا، پێویستە تەقوا بناغە بێ {إتَّقِ الله حَيث ما كُنْت}، لە مامەڵە لەگەڵ خوادا، تەقوا بکە بە بناغە، تەقوا واتە: لەخۆ بێدار بوون، هۆشیاریی و بێدارییەك وات لێبکا قەدەغەکانی خوا نەشکێنی، وە ئەرکەکان نەچوێنی، بەو شێوەیە ئینسان لە گوناهباریی دوور دەبێ.

(راغب الأصفهاني) دەربارەی پێناسەی تەقوا گوتوویەتی: {وَصَارَ التَّقْوى في تَعارف الشَّرْعِ: حِفْظ النَّفْس عَمَّا يُؤْثِم}[1].

واتە: تەقوا لە زاراوەی شەرعدا بریتیە لە خۆپاراستن لە هەر شتێك ببێتە مایەی گوناهبار کردن.

بەشێوەیەکی گشتی ئینسان بە چواندنی واجبێك، وە بەتوخن کەوتنی حەڕام و قەدەغەیەك، گوناهبار دەبێ، کەواتە: پارێزکار کەسێکە هیچ کام لە واجبەکان ناچوێنێ، وە هیچ کام لە قەدەغەکانی خوا ناشکێنێ، ئەوە بناغەی مامەڵە کردنە لەگەڵ خوادا: { إتَّقِ الله حَيث ما كُنْت} یانی: لەهەر کوێیەك بووی و لەهەر حاڵێکدا بووی، پارێز لەخوا بکە.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٨٨١.

■ بازنەی دووەم ■

## پەیوەندیی لەگەڵ خۆتدا

بناغەی پەیوەندیی لەگەڵ خۆتدا ئەوەیە کە لەخۆت وریابی، هەر چاکە بکەی و خراپە نەکەی، وە ئەگەر خراپەیەکت لەدەست قەوما، یەکسەر چاکەیەکی بەدوادا بکەی و بیسڕیەوەو خۆت خاوێن بکەیەوە، وەك لە فەرموودەکەدا هاتوە:

{وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُها}

بەدوای خراپەدا چاکە بکە، دەیسڕێتەوە، ئەوەش بناغەی پەیوەندییە لەگەڵ خۆتدا، هەمیشە لەخۆت وریابی چاکەکار بی، ئەگەر خراپەیەکیشت لەدەست قەوما، چاکەیەکی بەدوادا بکە، داوای لێبوردن لەخوا بکە، تۆبە بکە، یاخود ئەگەر هەقی کەسێکت خوارد، یان ئازاری کەسێکت دا، گەردنی خۆتی پێ ئازاد بکە، یان بچۆ ئەو حەقەی بدەوەو خراپەکەت بسڕەوە، ئەوەش بە نسبەت پەیوەندیی لەگەڵ خۆتدا.

بازنەی سێیەم

# پەیوەندیی لەگەڵ خەڵك

بناغەی پەیوەندیی لەگەڵ خەڵكدا بریتیە لە: ئاكارو ڕەوشتی جوان و بەرزو پەسند، وەك لە فەرموودەكەدا هاتوە:

{وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ}

واتە: لەگەڵ خەڵكدا بە ڕەوشتی جوان مامەڵە بكە.

**كەواتە: بازنەو بوارەكانی ئاكارو ڕەوشتی پەسند سێن:**

**بازنەی یەكەم:** مامەڵە لەگەڵ خوادا، جوانترین ڕەوشت لەگەڵ خوادا پارێزكارییە.

**بازنەی دووەم:** مامەڵە لەگەڵ خۆدا، وە باشترین ئاكار لەگەڵ خۆدا، خۆ پاكڕاگرتنە.

**بازنەی سێیەم:** مامەڵە لەگەڵ خەڵكدا، وە باشترین ڕەوشت لەگەڵ خەڵكدا، خۆش ڕەفتارییە.

ئنجا شایانی باسە، كە من پاش ورد بوونەوەو سەرنج دانی زۆرم لە قورئان و سوننەت، وە لە كتێب و بەرهەمی زانایانی پێشێ و ئێستا، هەڵسام بە سەرژمێر كردنی سەرجەم ئەو ئاكارو ڕەوشتە بەرزو پەسندو جوانانەی، كە ئینسان دەبێ مامەڵەیان پێ لەگەڵ خۆی و، لەگەڵ خواو، لەگەڵ خەڵكدا بكا، وە سەرەنجام گەیشتمە ئەوەی، كە سەرجەم ئەو سیفەتە بەرزو جوانانە: سەدو پەنجاو پێنج

(١٥٥) ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسندن و، لە هەر سێ بوارەکاندا دیارییم کردوون، بەم جۆرەی خوارێ:

**بازنەی یەکەم:** لەگەڵ خۆدا (ڕەوشتە بنەڕەتییەکان): لەو بازنەیەدا پازدە (١٥) سیفەت و ئاکاری بەرزو پەسندم دیاریی کردوون، کە دیارە ئەو پازدە (١٥)یە وێڕای خودی مرۆڤ، پەیوەندییشیان هەیە بەخواو خەڵکیشەوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

**بازنەی دووەم:** لەگەڵ خوادا (ڕەوشتە مەعنەوییەکان): لەو بازنەیەدا شەست و حەوت (٦٧) ئاکارو ڕەوشتی بەرزو پەسندم دیاریی کردوون، کە پەیوەندییان بەبواری مامەڵە کردنەوە لەگەڵ خوادا هەیە.

**بازنەی سێیەم:** لەگەڵ خەڵکدا (ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان): لەو بازنەیەشدا حەفتاو سێ (٧٣) ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسندم دیاریی کردوون، کە بەپێی ئەو ڕەوشتە بەرزو جوانانە، پێویستە پەیوەندییمان لەگەڵ خەڵکدا دابمەزرێنین، وە بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، کە ئەم حەفتاو سێ ڕەوشتە جوانانە دەیخوازن.

ئنجا ئێمە لە بەشەکانی داهاتوودا دەست دەکەین بە سەرژمێرکردنی ئەو ئاکارو ڕەوشتە بەرزو پەسندو جوانانە، وە بەو پازدە (١٥)ەیەش دەست پێدەکەین، کە ناومان ناون ڕەوشتە بنەڕەتییەکان، کە زیاتر پەیوەستن بە خودی مرۆڤەوە، بەڵام پەیوەندییشیان بە هەردوو بوارەکەی دیکەشەوە هەیە، واتە: مامەڵە کردن لەگەڵ خوای بەرزو بێوێنەدا، وە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا.

شایانی باسیشە من بۆیە سەرجەم ئەو ڕەوشتە بەرزو پەسندو جوانانەم کردنە سێ تەوەر لە سێ بواردا، چونکە وەك گوتمان: پێشێ ئینسان دەبێ لەخودی خۆیدا هەوڵ بدا ڕازاوە بێ بە سیفەتی بەرزو جوان، ئنجا لە مامەڵە کردنی لەگەڵ خوادا (سبحانە و تعالی)، ئاکارو ڕەوشتی بەرزو پەسند بێ، پاشان لە مامەڵە کردنی لەگەڵ خەڵکدا، خۆشڕەفتارو پەسند ئاکاربێ، وە

لەڕاستییدا ئەگەر ئینسان بوون (وجود)ی نەبێ، هیچی پێ ناکرێ، ئەگەر ئێستا ئێمە نەبووباین، خوامان نەدەپەرست، دەبێ خۆمان هەبین، ئەوە هەین وەك (بوون)، ئنجا دەبێ خۆمان هەبین، وەك کۆمەڵێك (سیفەت و خەسڵەتی بنەڕەتیی)، ئنجا دەتوانین پەیوەندییەکی باش لەگەڵ خوادا ببەستین، وە دوای ئەوە کە پەیوەندییەکی ڕاست و دروستمان لەگەڵ خوادا هەبوو، ئنجا دەتوانین مامەڵەیەکی باش لەگەڵ خەڵکی خوادا بکەین، ئێستاش دەچینە سەر بازنەو بواری یەکەمی ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند

# دەستپێك

وەك پێشتر گوتمان: پازدە (١٥) ڕەوشت و ئاكاری بەرزو پەسندم لەم بوارەدا دیاریی كردوون، كە ئەمانەن:

١- زانیاریی (العِلم).

٢- دڵ ڕوونیی (البَصیرة).

٣- پاكیی (الطهارة).

٤- ڕاستیی (الصَّدق).

٥- خۆڕاگریی (الصَّبر).

٦- هیممەت بەرزیی (عُلو الهِمّة).

٧- دڵ ساغیی (سلامَة القَلب).

٨- دنیا بەكەم گرتن (الزُّهد).

٩- پەند وەرگرتن (الإعتبار).

١٠- بەئەدەب بوون (التَّأدُّب).

١١- وریایی (الحَذر).

١٢- بەدەمار بوون (العِزّة).

١٣- ئیرادە بەهێز بوون (العَزم).

١٤- بەتەنگ كەرامەتەوە بوون (الغَیرَة).

١٥- دوور بینیی و گورج و گۆڵیی (الحَزْم).

ئێمە هەر كام لەو ئاكارو سیفەتە بنەڕەتییانە كە سەرجەمیان پازدە (١٥)ن، سەرو تیشكیان دەخەینە سەر، بەڵام من جارێكی دیكەش دەڵێم: كە هەر كام لەو ڕەوشت و خەسڵەتە بەرزو پەسندانە، پەیوەندییان بە هەركام لە: (مامەڵە كردن لەگەڵ خوا)دا، وە (مامەڵە كردن لەگەڵ خەڵك)دا هەیە، وێڕای: (مامەڵە كردن لەگەڵ خۆ)، بۆیەش وا دەڵێم و بۆیەش ئێمە لێرەدا ئەو ڕەوشتە بنەڕەتییانەمان هێنا، تاكو پێویست نەكا كاتێ، كە سەرژمێری ئەو ڕەوشت و ئاكارە بەرزو پەسندانە دەكەین، كە مامەڵەیان پێ لەگەڵ خوادا دەكەین، كە ئێمە شەست و حەوت (٦٧)مان لێ دیاریی كردوون، پێویست نەكات ئەو پازدە (١٥)یەشیان ڕەگەڵ بخەینەوە، هەروەها كاتێك باسی چۆنیەتی مامەڵە كردن لەگەڵ خەڵكدا دەكەین، كە حەفتاو سێ (٧٣) ڕەوشتمان سەرژمێر كردوون، پێویست نەكات ئەو (١٥)یەشیان ڕەگەڵ بخەینەوە، چونكە ئەو پازدە (١٥)یە، هەم پەیوەندییان بەخودی مرۆڤەوە هەیە، هەم پەیوەندییان بەخواوە هەیە، هەم پەیوەندییان بەخەڵكەوە هەیە، وەك دوایی - لە كاتێكدا كە باسیان دەكەین - دەیخەینە ڕوو، كە چۆن پەیوەندییان بەخۆو بەخواو بە خەڵكەوە هەیە.

ئێستاش با هەر یەك لەو پازدە (١٥) خەسڵەتە، سەرو تیشكێكیان بخەینە سەر:

■ یەکەم ■

## زانیـاری (العِلـم)

زانیاریی هەم پەیوەندیی بە خودی مرۆڤەوە هەیە، ئینسان بۆخۆی لە زاتی خۆیدا بۆ ئەوەی مرۆڤێکی باش بێ، پێویستی بە زانیاریی هەیە.

وە هەم پەیوەندیی بە نێوانی مرۆڤ و خواوە هەیە، ئینسان دەبێ زانیاریی هەبێ بە خوا، بە بەرنامەی خوا، بە حەڵاڵ و حەرامی خوا، ئنجا دەتوانێ مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ خوادا بکا. وە هەم پەیوەندیی بە مامەڵە کردنەوە لەگەڵ خەڵکیشدا هەیە، دەبێ خەڵك بناسی و شارەزای خەڵك بی: خێرو شەڕی خەڵك، ڕابردووی خەڵك، ژیانی خەڵك، ئنجا دەتوانی مامەڵەیەکی ڕاست و دروستیان لەگەڵدا بکەی.

(الجرجاني) دەربارەی (العِلم) دەڵێ: {العِلم: هوَ الإعتقادُ الجازِم المُطابِق لِلواقِع}[1]، واتە: زانیاریی بریتیە لە بڕوا دامەزرانێکی دامەزراوی پێکەڵ پێك و گونجاو لەگەڵ واقیعدا.

زانیاریی هەبوون بە هەر شتێك، بریتیە لەوە کە تۆ ئەو شتە وەك خۆی بناسی، وەك ئەوەی لە دنیای واقیعدا هەیە، نەك تێیدا بەهەڵەدا بچی.

ئنجا لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) فەرمان کراوە بە وەدەست هێنانی عیلم، بەوە کە ئینسان دەبێ

---

(١) التعريفات، ص ١٩١.

ئەهلی عیلم بێ و زاناو شارەزاو بەرچاو ڕوون بێ، بۆ وێنە:

یەکەم: لە سووڕەتی (محمد) ئایەتی (١٩)دا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ:

﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ ...(١٩) ﴾ محمد.

واتە: بزانە! کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکە نین، داوای لێبوردنیش بۆ گوناهت لە پەروەردگارت بکە.

کەواتە: ئەوە کە پێش هەر شتێك: دەبێ بزانی، بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، خوا فەرمانی پێ کردووی و دەبێ عیلمت بەو بابەتە گەورەو گرنگە هەبێ.

دووەم: لە سووڕەتی (الحج) ئایەتی (٥٤)دا، خوا لە سیاقێکدا دەفەرموێ:

﴿ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ (٥٤) ﴾.

واتە: وە با ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، بزانن کە ئەوە حەقە لە پەروەردگارتەوە، ئنجا ئیمانی پێ بێنن و دڵیان بۆی ملکەچ بێ، وە بێگومان خوا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنمایی دەکا.

کەواتە: بەهۆی عیلمەوە، ئیمان بە حەقانیەتی ئەوە دێنی، کە لە پەروەردگارتەوە هاتوە.

سێیەم: لە سووڕەتی (الزمر) ئایەتی (٩)دا خوای پاك و تاك دەفەرموێ:

﴿ ... قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ (٩) ﴾.

واتە: بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن یەکسانن؟! بێگومان تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن.

چوارەم: لە سووڕەتی (المجادلة) ئایەتی (١١)دا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ:

﴿ .. يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ .. (١١) ﴾.

واتە: خوا ئەوانەتان کە ئیمانیان هێناوە بەرزیان دەکاتەوە، وە ئەوانەی کە خاوەن

زانیارییین و زانیارییان پێدراوە، بەچەندان پلە بەرزیان دەکاتەوە.

پێنجەم: لە سوورەتی (طه) ئایەتی (١١٤)دا خوای زانا دەفەرموێ:

﴿...وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾.

واتە: وە بڵێ: پەروەردگارم! زانیارییم بۆ زیاد بکە.

شەشەم: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنِ الشَّيْءِ أَصْنَعُهُ، فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً}، أخرجه أحمد برقم (٢٥٥٢١)، والبخاري برقم (٥٧٥٠)، ومسلم برقم (٢٣٥٦).

ڕۆژێکیان دیارە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شتێکی کردوە بە مۆڵەت کردوویەتی، هەندێ کەسیش خۆیان لەو شتە پاراستوە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردوویەتی، بۆ وێنە: لە ماڵی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) گۆرانیی گوتراوەو، دەف لێدراوە، وە دوو ئافرەتی گۆرانی بێژ گۆرانیان بۆ دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوە[1]، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتەکەدا دەفەرموێ: بۆچی هەندێ کەس شتێ، کە من دەیکەم، خۆیانی لێ دوور دەگرن، یانی: ئەو شتە لەخۆیان ناوەشێننەوەو پێیان وایە نەدەبوو ئەو شتە بکرێ! سوێند بەخوا من لە هەموویان زاناترم بەخوا، وە لە هەمووشیان باشتر لێی دەترسێم.

واتە: لەگەڵ ئەوەشدا، کە زۆر زاناترم بەخواو، زۆر زیاتریش لەوان لێی دەترسێم، بەڵام هەندێ جار کار بە مۆڵەتیش دەکەم.

ئنجا دیارە وەك پێشتریش باسمان کرد، بەبێ زانیاریی و زانست، ئێمە ناتوانین مامەڵەی ڕاست و دروست نە لەگەڵ خوادا، نە لەگەڵ خەڵکدا بکەین، وە خۆشمان نابین بە مرۆڤێکی تێرو تەواوو دامەزراو، چونکە بەبێ زانیاریی: حەق و ناحەق، ڕاست و چەوت، حەڵاڵ و حەڕام، چاك و خراپ، لێك جیا ناکرێنەوە.

---

(١) لە کتێبی: {سرودو مۆسیقاو چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا} بە درێژیی لەو بارەوە دواوین و، سەرجەم ئەو فەرمووودانەشمان، کە لەو بارەوە هاتوون، هێناون.

■ دووەم ■

## دڵ ڕوونیی (البصيرة)

(الجرجاني) دەربارەی پێناسەی دڵ ڕوونیی (بصيرة) دەڵێ: {البَصيرة: هِيَ قُوَّةُ القَلبِ المُنوَّرِ بِنورِ الله، يَرى بِهِ حَقائِقَ الأَشْياءِ وَبَواطِنِها، وَهيَ بِمثابَةِ البَصَرِ للنَّفسِ، يَرى بِه صُوَرَ الأَشْياءِ وظَواهِرها}[1].

واتە: بەصیرەت بریتیە لەو هێزەی دڵ، کە بە ڕووناکیی خوا ڕۆشن بۆتەوەو ڕاستیی شتەکان و دیوی پەنهانی شتەکانی پێ دەبینێ، وە چاو چۆنە بۆ جەستە، بەصیرەتیش ئاوایە بۆ ڕووح، وەك چۆن بەهۆی چاوەوە جەستە وێنەی شتەکان و ڕواڵەتیان دەبینێ، ڕووحی ئینسانیش بەهۆی بەصیرەتەوە، دیوی پەنهان و حەقیقەتەکانیان دەبینێ.

با تەماشای ئەم دەقانە بکەین دەربارەی دڵ ڕوونیی:

یەکەم: خوای پەروەردگار لە سوورەتی (یوسف) ئایەتی (١٠٨)دا بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾.

---

(١) التعريفات، ص٤٦.

واتە: بڵێ ئەمە ڕێبازی منە، لەبەر ڕۆشناییدا خەڵك بەرەو خوا بانگ دەكەم، خۆم و شوێن كەوتوانم، وە پاكیی بۆ خوا، من لە هاوبەشدانەران نیم.

كەواتە: پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) خاوەنی بەصیرەت بووە، یەكێ لە ڕەوشتە بەرزو پەسندەكانی بریتی بووە لە: بەرچاو ڕوونیی و دڵ ڕوونیی، هەروەها شوێنكەوتوانیشی، دەبێ دڵ ڕوون بن، بەرچاو ڕوون بن، ئەگەر بیانەوێ وەك پێغەمبەری خوا بچن (صلى الله عليه وسلم)، وە بەڕێی ئەودا بچن، دیارە ئەو بەصیرەتەش، كە دەفەرموێ: (عَلَىٰ بَصِيرَةٍ)، هەم شارەزایی بە(خۆ) دەگرێتەوە، هەم شارەزایی بە واقیع و، هەم شارەزایی بە خەڵك، وە هەم شارەزایی بە ئایین، چونكە، كە دەفەرموێ: بەدڵ ڕوونییەوەو بەبەرچاو ڕوونییەوە بانگەواز دەكەم، واتە: لەدینەكەمدا شارەزام، وە ئاگاداری خۆمم، وە بەخەڵك ئاشنام، وە بەواقیع زانام، هەمووی دەگرێتەوە.

**دووەم:** پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەكیدا باسی دڵ ڕوونیی دەكاو دەفەرموێ:

{اتَّقُوا فِرَاسَةَ الْمُؤْمِنِ، فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللَّهِ، ثُمَّ قَرَأَ: (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ)}
أخرجه البخاري في التاريخ الكبير برقم (٣٥٤)، والترمذي برقم (٣١٢٧)، وقال: حديث غريب، وأبو نعيم في الحلية برقم (٢٨١)، وأخرجه أيضًا: الطبري برقم (٤٦)، قال الألباني: ضعيف.

واتە: بترسێن لە دڵ ڕوونیی بڕوادار، چونكە بە ڕووناكیی خوا دەبینێ، {واتە: بەو ئیمانە بەرپێی خۆی دەبینێ كە خوای پەروەردگار خستوویەتە دڵیەوە}، دوایی ئەو ئایەتەی خوێندەوە كە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الحجر.

واتە: بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ كەسانێك، كە بە نیشانەكان، شتەكان دەناسن (دەزانن).

وشەی (الْمُتَوَسِّمِين) هەندێكیان بە (الْمُتَفَرِّسِين)، مانایان كردوە، واتە: ئەوانەی كە ئەهلی فیراسەتن، فیراسەت واتە: وردبینیی و خوێندنەوەی دیوی پەنهانی شتەكان. ئنجا وەك گوتم: ئەو فیراسەت و دڵ ڕوونییە، چ بۆ زاتی خۆ، پێویستە، چ بۆ مامەڵە لەگەڵ خوادا، چ بۆ مامەڵە لەگەڵ خەڵكدا.

■ سێیەم ■

# پـاکیی (الطهـارة)

(راغب الأصفهاني ) لە پێناسەی (الطهارة)دا دەڵێ:

{الطَّهارةُ ضَربانِ: طَهارَةُ الجَسَد، وَطَهارَةُ النَّفس، وَلِكُلٍ مَعْناه الإِصطِلاحي، فَطهارةُ النَّفس: تَرْكُ الذَّنبِ والعَمَل لصَلاح وَتَنقية النَّفسِ مِنَ المَعايب، وَطَهارةُ الجِسمِ: رَفعُ حَدَثٍ أَو إِزالةُ نَجِسٍ أَو في ما مَعناهُما وعَلى صورَتِهما}[1].

واتە: پاکیی دوو جۆرە: پاکیی جەستە، وە پاکی نەفس، وە بۆ هەرکامێکیان مانایەکی زاراوەیی تایبەت هەیە، پاکیی نەفس بریتیە لە واز لەگوناح هێنان، وە کردەوە کردن بۆ ئەوە کە ئینسان نەفسی باش بێ، وە خۆی لە عەیب و عارو کەم و کوڕییەکان بپاڵێوێ و بژار بکا، بەڵام پاکیی جەستە بریتیە لەوە کە ئینسان بێ دەستنوێژیی لەسەر خۆی لابەرێ، یاخود ئەگەر پیسییەك بەبەدەنیەوە بێ، لایبەرێ، یاخود هەر شتێك کە شێوەی ئەو دوانەی هەیە.

دیارە هەم ئایەتی خوای پەروەردگار، هەم فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەربارەی هاندانی مسوڵمانان بۆ پاکیی، هەم پاکیی ڕواڵەتیی، هەم پاکیی پەنهانیی، یاخود هەم پاکیی جەستەیی، هەم پاکیی ڕووحیی، زۆرن، بۆ وێنە:

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن- ص ٣٠٨.

یەکەم: لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٢٢)دا، خوای پاك و تاك دەفەرموێ:

﴿... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾.

واتە: بێگومان خوا زۆر گەڕاوانی خۆش دەوێن و، وە زۆر خۆ پاککەرەوانی خۆش دەوێن.

واتە: ئەوانەی زۆر بۆلای خوا دەگەڕێنەوە، چونکە (تَوّاب) صیغە موبالەغەی (تائِب)ە، (تائِب) واتە: کەسێ کە بۆلای خوا دەگەڕێتەوە، (تَوّاب) واتە: ئەو کەسەی زۆر دەگەڕێتەوە، وە (ٱلْمُتَطَهِّرِينَ) کۆی (مُتَطهِّر)ە، واتە: کەسێك کە خۆی پاك دەکاتەوە، کە بەتەئکید پاکیی پەیوەستە بەجەستەوەو، گەڕانەوە بۆ لای خواش پاکیی مەعنەوییە.

کەواتە: دەگونجێ لێرەدا مەبەست لە (تَطهُّر) پاك بوونەوەی جەستەیی بێ، وە دەشگونجێ (تَطهُّر) هەم خۆ پاککردنەوەی جەستەو، هەم هی نەفس و ڕووحیش بگرێتەوە.

دووەم: هەروەها خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (١٠٨)دا دەفەرموێ:

﴿... وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾.

واتە: بێگومان خوا خۆپاککەرەوانی خۆش دەوێن، دیارە (ٱلْمُطَّهِّرِينَ) ئەصڵی خۆی (مُتَطهِّرِينَ)، واتە: کەسانێك کە خۆ پاك دەکەنەوەو خۆ پاك ڕادەگرتن، دیسان ئەوەش هەم پاکی جەستەیی و ماددیی دەگرێتەوە، وە هەم پاکیی دەروونیی و مەعنەوییش.

سێیەم: وە لە سوورەتی (المدثر) ئایەتەکانی (١-٧)دا خوا (سبحانه و تعالى) ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەکاو دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾﴾.

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت لە نوێنەوە پێچاوە! (یاخود: ئەو کەسەی کە خۆت لە بەرگ و پۆشاکەوە پێچاوە!) هەڵسە خەڵك وریا بکەوەو بترسێنە، پەروەردگارت بە گەورە بگرە، وە بەرگ و پۆشاکی خۆت خاوێن بکەوە، وەواز لە پیسیی بێنە (واتە: گوناح و تاوان کە پیسییە، وازی لێبێنە) . هتد.

**چوارەم:** پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ:

{الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ} أخرجه أحمد برقم (٢٢٩٥٣)، ومسلم برقم (٢٢٣)، والترمذي برقم (٣٥١٧) وقال: صحيح، وأخرجه أيضًا: الدارمي برقم (٦٥٣)، والطبراني برقم (٣٤٢٣)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٢٧٠٩).

واتە: پاك و خاوێنیی نیوەی ئیمانە.

**زانایان گوتوویانە:** بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: پاك و خاوێنیی نیوەی ئیمانە، چونکە ئیمان و ئیسلام بریتیە لە پاکیی و دووریی لە سیفەتی خراپ، وە ڕازانەوە بە سیفەتی چاك، وەك ئەهلی تەصەووف دەڵێن: {التَّخْلية مِنَ الرَّذائِل، والتَّحْليةُ بِالفَضائِل}واتە: بژار کران لە سیفەتە خراپەکان، وە ڕازانەوە بە سیفەتە باشەکان.

کەواتە: ئەگەر ڕازانەوە بە سیفەتە باشەکان، نیوەی ئیسلامەتیی بێ، بژار کران و پاککرانەوەش لە سیفەتە خراپەکان، نیوەکەی دیکەیەتی، کە بەتەئکید، کاتێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باسی (الطهور) دەکا، واتە: پاك و خاوێنیی ماددیی و مەعنەویی، یاخود ڕواڵەتیی و دەروونیی.

**پێنجەم:** وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی سیواك، کە ئەوەش بەشێکی گرنگی پاك و خاوێنییە، دەفەرموێ:

{السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ، مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ} أخرجه الشافعي (١٤/١)، وابن أبي شيبة برقم (١٧٩٢)، وأحمد برقم (٢٤٢٤٩) والنسائي برقم (٥)، وابن خزيمة برقم (١٣٥)، وابن حبان برقم (١٠٦٧)، والبيهقي برقم (١٣٤)، وأخرجه أيضًا: الدارمي برقم (٦٨٤)، وأبو يعلى برقم (٤٥٩٨)، والطبراني في الأوسط برقم (٢٧٦)، والديلمي برقم (٣٥٤٨). قال شعيب الأرنؤوط : صحيح لغيره، وقال الألباني: صحيح.

واتە: سیواك (دەم و ددان پاککردنەوە) پاککەرەوەیە بۆ زار، ڕازیکەرە بۆ پەروەردگار.

کەواتە: خوای پاك و تاك ئەوەی پێخۆشە، کە تۆ دەم و ددانت پاك بێ، بۆن و بەرامەی ناخۆشت لێ نەیەت.

شەشەم: هەروەها دەربارەی بەرگ و پۆشاك، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{اِلْبَسُوا ثِيَابَ الْبَيَاضِ فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ} أخرجه ابن ماجة برقم (٣٥٦٧)، قال الألباني: صحيح.

واتە: لە پۆشاك، بەرگی سپی لەبەر بکەن، چونکە پاکترەو بۆن خۆشترە.

واتە: ئەگەر خاڵێکی ڕەشی پێوە بێ، زووتر دەردەکەوێ، وە بۆنی خۆشتریشە، هەندێ لە قوماشەکان، کە ڕەنگێکی دیکەی هەیە لەوانەیە بۆن دڕنێك، یان بۆنێکی دیکەی لێبێ.

حەوتەم: دەربارەی خواردن و خۆراك، کە ئینسان پێویستە چی بخواو، وە خۆی لە چ خواردنێك بپارێزێ، کە بۆنی ناخۆشەو خەڵك جاڕس دەکەن؟، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ وَالثُّومَ وَالْكُرَّاثَ، فَلَا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدَمَ} أخرجه مسلم برقم (٥٦٤)، والترمذي برقم (١٨٠٦) وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى برقم (٦٦٨٥).

واتە: هەر کەسێ پیوازی خواردو سیری خواردو کوڕادەی خوارد[1]، با نزیکی مزگەوتی ئێمە نەکەوێ، چونکە فریشتەکانیش تووشی ئازار دەبن، بەوەی کە وەچەی ئادەم پێی تووشی ئازار دەبن.

واتە: فریشتەکانیش بۆنی ناخۆشیان پێ ناخۆشە.

---

(١) کوڕادە شتێکە وەك کەوەر وایە، لە هەندێ شوێنان سیرمۆکەی پێ دەڵێن.

بەڕاستیی زۆر گرنگە، مسوڵمان وەك چۆن دینەکەی پاکە، چاکە، بەرزە، ئەویش هەوڵ بدا هەم ڕواڵەتی، هەم دەروونی، هەم جەستەی، هەم ڕووحی، پاك و چاك و بەرز بێ، وە بەڕاستی من زۆرجار، کە مسوڵمانێك دەبینم، بۆنێکی ناخۆش لەدەمی دێ، جا چ بەهۆی جگەرە کێشانەوە، چ بەهۆی توورو کەوەرو سیرو پیاز خواردنەوە، چ بەهۆی غەم نەخواردنی لە دەم و ددانیەوە، کە پاکی ڕاناگرێ و، ڕەنگە تووشی ئیلتیهابی کردبێ، یان ڕەنگە نەخۆشییەك لە دەم و ددانیدا بێ و، غەمی لێ نەخواردەو بۆنێکی ناخۆشی لێدێ، بەزەییم پێیدا دێتەوە، وە بەزەییم بەو ئیسلامەتییەشدا دێتەوە، کە ئەو کەسە نوێنەرایەتی دەکا، هەروەها کەسێکی سەر قرژن و ئاڵۆزو بڵۆز، یان کەسێك کە مشور لەخۆی ناخوا، بەهەمان شێوە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك کابرایەکی بینی ڕیش و قژی قرژن و ئاڵۆز، ئاماژەی بۆ کرد ڕیش و قژی باش بکات، پاشان کابرا ڕیش و قژی خۆی ڕێکخست، کە گەڕایەوە، فەرمووی:

{ئایا ئەوە باشتر نیە لەوە، کە یەکێکتان بێ، سەر قرژن و ئاڵۆز سەری وەك سەری شەیتان بێ؟!}[١]، کابرایەکی دیکە هات، چڵکن و قژ ئاڵۆزو بڵۆز، پێی فەرموو: {ئایا ئەو کابرایە شتێکی دەست ناکەوێ، سەرو ڕیشی خۆی پێ ڕێك و چاك بکات؟}[٢].

پێویستە مسوڵمان وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسی کردوە، زۆر مشوور لە پاك و خاوێنیی خۆی بخوات، ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت کە هێنامانن، دەبێ بەس بن، بۆ ئەوەی مسوڵمانان جەستەیان، بەرگ و پۆشاکیان، دەم و ددانیان پاك بن، وە بۆنیان خۆش بێ، پاشان دەروونیان پاك بێ، وە بەشێوەیەك بن کە هەرکەسێ ئەوانی بینی، پاکیی و چاکیی ئایینەکەیانی بکەوێتە بەرچاو، نەك خەڵك بەهۆی پیس و پۆخڵیی و بێ سەرو بەرییانەوە، ئەو ئایینەی ئەوان نوێنەرایەتیی دەکەن، لەبەرچاویان بکەوێ!

---

(١) رواه مالك في الموطأ: وە بڕوانە: (صحيح وصايا الرسول) سعد يوسف أبو عزيز ج٢ ص ٣٩٤.

(٢) رواه أحمد والنسائي.

■ چوارەم ■

## ڕاستیی (الصِّدق)

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: {الصِّدق: مُطابَقَةُ القَول الضَّمير وَالمُخْبَر عَنه مَعَاً، وَمَتى خُرِمَ شَرطٌ، لم يَكن صِدقاً تامّاً}[1].واتە: ڕاستیی: بریتیە لەوە قسەیەك كە دەكرێ، هەم لەگەڵ نێودڵی ئینسان و، هەم لەگەڵ واقیعی دەرەوەی ئەو شتەدا، یەكبگرێتەوە ڕاست بێتەوە، ئەگەر یەكێك لەو مەرجانە نەیەتەدی، ئەوە ڕاستییەكی تەواو نیە.

بۆ وێنە: كە كەسێك بەكەسێك دەڵێ: تۆم زۆر خۆش دەوێ، دەبێ هەم لەدڵیشیدا ئەو خۆشەویستییە هەبێ، هەم لە هەڵس و كەوتیشیدا بەشێوەیەك هەڵس و كەوتی لەگەڵدا بكا، كە خۆشەویستیی تێدا بەرجەستە بێ، ئەگەرنا، ئەگەر لەدڵیدا نەبێ، ئەوە نیفاقە، وە ئەگەر لە هەڵس و كەوتیشیدا بەرجەستەی نەكا، ئەوە درۆی كردوە، كەواتە: ڕاستیی ئەوەیە، كە ئینسان قسەی ڕاست بێ، دڵی ڕاست بێ، كردەوەشی ڕاست بێ.

(القُشَيرى) دەڵێ: {الصِّدقُ: أَن لا يَكونَ في أَقْوالِك شَيبٌ، وَلا في اعتقادِك رَيبٌ، وَلا في أَعْمالِك عَيبٌ}[2] واتە: ڕاستیی ئەوەیە لە قسەكانتدا خڵتە نەبێ، وە لە بیروبڕواتدا گومان نەبێ، وە لە كردەوەكانتدا كەم و كوڕیی و عەیب نەبێ.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٢٧٧.

(٢) نضرة النعيم، ج٦، ص ٢٤٧٤.

(**الماوَردي**) دەڵێ: {دَواعي الصِّدق: العَقلُ، وَالشَّرعُ، والمُروءَةُ، وَحُبُّ الإِشتهارِ بِالصِّدق}[1]، واتە: هاندەرەکانی ڕاستیی: عەقڵە، شەرعە، جوامێرییە، وە حەز کردنە بەوەی بە ڕاستگۆ بناسرێ.

(**منیش دەڵێم**): {ڕاستیی: بریتیە لەوە کە ئینسان دڵی ڕاست بێ، زمانی ڕاست بێ، کردەوەکانی ڕاست بن، ڕواڵەتی ڕاست بێ، پەنهانی ڕاست بێ، لەگەڵ خۆیدا ڕاست بێ، لەگەڵ خوادا ڕاست بێ، لەگەڵ خەڵکدا ڕاست بێ}. بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر ڕاستگۆیی، با تەماشای ئەو چەند دەقەش بکەین:

**یەکەم:** خوای کاربەجێ لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (١١٩)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لەخوا بکەن، وەلەگەڵ ڕاستاندابن.

پارێز لە خوا کردن و، لەگەڵ ڕاستاندا بوون، کەواتە: ئەوەندە بەس نیە پارێز لەخوا بکەی، دەبێ لەگەڵ ڕاستانیش دابی، وە ئەوەندە بەس نیە لەگەڵ ڕاستاندا بی، دەبێ پارێزیش لەخوا بکەی، وە لە ڕاستیدا لەگەڵ ڕاستاندا بوون، بەرهەمی پارێزکار بوونە، هەرکەسێ ئەهلی تەقوا بێ، چاویش دەگێڕێ کێ وەك خۆی ئەهلی تەقوایە، کێ بۆخوا صوڵحاوە، هەوڵ دەدا لەگەڵ ئەواندا بێ، کە بریتین لە ڕاستان.

**دووەم:** وە خوا (سبحانه و تعالى) لە سورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٥)دا لەسیاقێکدا، کە وەسفی ئیمانداران دەکا بە دە (١٠) سیفەت، دەفەرموێ:

﴿ .. وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ .. ﴿٣٥﴾ ﴾.

(دە) سیفەت دەژمێرێ، یەکێ لەو (دە) سیفەتانە دەفەرموێ: وە پیاوانی ڕاست و ئافرەتانی ڕاست.

---

(١) أدب الدنيا والدين ص ٣٦١- ٣٦٢.

سێیەم: لە سوورەتی (محمد) ئایەتی (٢١)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿.. فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾﴾.

واتە: ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاستیان بکردبایە، بۆ ئەوان باشتر بوو.

**چوارەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ، فَإِنَّ الصِّدْقَ طُمَأْنِينَةٌ، وَإِنَّ الْكَذِبَ رِيبَةٌ } أخرجه الطيالسي برقم (١١٧٨)، والترمذي برقم (٢٥١٨) وقال: حسن صحيح، والدارمي برقم (٢٥٣٢) ، وأبو يعلى برقم (٦٧٦٢)، برقم (٧٢٢)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٧٤٧)، والنسائي برقم (٥٧١١)، وأخرجه أيضًا: إبن خزيمة برقم (٢٣٤٨)، والحاكم برقم (٢١٦٩) وقال: صحيح الإسناد، قال الألباني: صحيح.

واتە: شتێك کە لێی لە گوماندای (دڵت لێی لە قرت و فرت دایە) وازی لێبێنە، بچۆ بۆ شتێك کە لێی لەگوماندانی، چونکە ڕاستیی ئارامیی تێدایە، وە درۆ دڵە ڕاوکەی تێدایە.

**دوو تێبینی پێویست لەسەر بابەتی ڕاستیی (الصدق):**

١- زۆر کەس وشەی (الصِّدق) بە (ڕاستگۆیی) مانا دەکەن، بەڵام لە ڕاستییدا ڕاستگۆیی بەشێکە لە ڕاستیی، بەڵکو ئینسان کاتێ ڕاست دەڵێ، کە ڕاستیی لەدڵیدا هەبێ، وە کاتێك ڕاستیی گوت، دەبێ بە کردەوەش ڕاست بکا، وە کردەوەکانیشی ڕاست بن.

٢- بێگومان، ڕاستگۆیی ئەوەیە کە تۆ لەگەڵ خەڵکدا ڕاستگۆبی، بەڵام پێش ئەوە دەبێ تۆ لەگەڵ خۆتدا ڕاست بی، تەعبیر بکەی لە قەناعەتی خۆت، لە ناخی خۆت، شتێك نەڵێی لە دڵتدا نەبێ، وە پاشان لەگەڵ خوادا ڕاست بی، ئنجا دەتوانی لەگەڵ خەڵکدا ڕاست بی.

■ پێنجەم ■

## خۆڕاگریی (الصَّبر)

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: {الصَّبر: هوَ حَبسُ النَّفسِ عَلى ما يَقتَضيهِ العَقلُ والشَّرع، أَو عَمّا يَقْتضيانِ حَبسَها عنْهُ}[1] واتە: (صبر) بریتیە لە خۆ حەپس کردن لەسەر شتێك کە عەقڵ و شەرع دەیخوازن، یاخود عەقڵ و شەرع دەیخوازن، کە ئەو شتە نەکەی.

مەبەستی ئەوەیە کە (صبر) بریتیە لەوەی نەفسی خۆت لەسەر شتێك حەپس بکەی، کە شەرع و عەقڵ بەچاکی دەزانن، هەروەها نەفسی خۆت بگێڕیەوە لەو شتانەی، کە عەقڵ و شەرع بە خراپیان دەزانن.

**چەند وێنەیەك لە دەقەکانی قورئان و سوننەت دەربارەی ئارامگرتن (صبر):**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (٢٠٠)دا دەربارەی (صبر) دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆڕاگر بن، وە لەبەرامبەر دوژمنانتاندا خۆڕاگر بن، وە لەسەنگەردا بن، وە پارێز لەخوا بکەن، بەڵکو سەرفراز بن.

---

(١) المفردات، ص٢٥٣.

دووەم: لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٥٥)دا خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ:

﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ﴾.

واتە: وە بە دڵنیایی تاقیتان دەکەینەوە بە شتێك لە ترس و برسێتیی و کەم و کوڕیی لە ماڵ و سامان و، لە بەروبوم و میوە، وە لەدەستدانی عەزیزو خۆشەویستانتان، وە موژدە بدە بە خۆڕاگران.

کێن ئەو خۆڕاگرانە؟ دەفەرمویٚ:

﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەوانەی کە ئەگەر بەڵایەکیان توش بوو، دەڵێن: ئێمە هی خواین، وە بۆلای خواش دەچینەوە، (لەخواوە هاتووین وە بۆلای ئەویش دەچینەوە).

کەواتە: هەرشتێکمان بەسەر هاتبیٚ و هەر بەڵایەکمان تووش بووبیٚ، مادام لای خواوە هاتووین و خوا پێیداوین، وە بۆ لای خواش دەچینەوە، پاداشتمان دەداتەوە، گرفت نیەو گویٚ نادەینیٚ.

سێیەم: لە سوورەتی (الزمر) ئایەتی (١٠)دا خوای کاربەجیٚ دەفەرمویٚ:

﴿ .. إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ ﴾.

واتە: بێگومان خۆڕاگران پاداشتیان بەبیٚ ژماردن دەدرێتەوە.

واتە: بۆیان ناژمێردریٚ و ئەوان ژمارەکەی نازانن، ئەگەرنا لە لای خوا هەموو شتێك ژمێردراوە، هیچ شتێك نیە لای خوا سەرژمێر نەکرابیٚ، وەك دەفەرمویٚ:

﴿ .. وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًۢا ﴿٢٨﴾ ﴾.

واتە: وە (خوا) هەموو شتێکی ژماردوە، هەموو شتێك لەلای خوای پەروەردگار سەرژمێر کراوە، بەڵام ئەوان پاداشتەکەیان هێندە، زۆرە بۆیان ناژمێردریٚ.

**چوارەم:** پێشتریش ئەو فەرموودەیەمان هێنا، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفُّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ، يُصَبِّرْهُ اللَّهُ}[1].

واتە: هەرکەسێ خۆی پاك ڕابگرێ، خوا پاکیی پێ دەبەخشێ، وە هەرکەسێ خۆی بێنیاز ڕابگرێ، خوا دڵ دەوڵەمەندیی و قەناعەتی پێ دەبەخشێ، وە هەرکەسێ خۆی لەسەر ئارامیی ڕابێنێ، خوا ئارامیی پێ دەبەخشێ، وە هیچ کەسێ بەخششێکی باشترو فراوانتری لە خۆڕاگریی پێ نەدراوە.

پێشتریش باسمان کرد، کە هەموو ئەو ڕەوشتە بنەڕەتییانە: پەیوەندییان بەخۆوە هەیە، بە خواوە هەیە، بە خەڵکەوە هەیە، کەواتە: دەبێ لەگەڵ خۆتدا خۆڕاگربی، هەموو ئەو شتانەی کە خوا پێی خۆشن و عەقڵی سەلیم بەچاکیان دادەنێ، وە عەقڵ هیچ شتێ کە شەریعەت بەچاکی داناوە، بەخراپی دانانێ، وە عەقڵ هیچ شتێ کە شەریعەت بە خراپی داناوە، بەچاکی دانانێ، هەمیشە عەقڵ تەئیدی نەقڵ دەکاو لە خزمەتی دایە.

**(صبر) ئەوەیە کە:** نەفسی خۆت حەپس بکەی لەسەر هەر شتێك، کە خوا پێی خۆشەو خوا پێی چاکە، وە بیگێڕیەوە لە هەر شتێك، کە خوا پێی ناخۆشە. وە لەگەڵ خوادا خۆڕاگر بی و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەی.

وە لەگەڵ خەڵکیشدا خۆڕاگر بی، مافەکانیان نەفەوتێنی، وە سنوورەکانیان لەگەڵدا نەبەزێنی.

---

(١) پێشتر تەخریج کراوە.

■ شەشەم ■

## هیممەت بەرزیی (علُوُّ الهِمّة)

(إبن مَنْظور) لە پێناسەی هیممەتدا دەڵێ: {الهِمَّةُ في اللُّغَةِ مِثْلُ الهَمِّ وَكِلاهُما إِسمٌ لِما هَمَمْتَ بِهِ، قالَ ابنُ فارِس: وَالهَمُّ ما هَمَمْتَ بهِ، وَكذلِك الهِمَّة، ثُمَّ تُشتَقُّ مِنَ الهِمَّةِ الهُمامُ: المَلِكُ عظيمُ الهِمَّةِ}[1]، واتە: لە زماندا وشەی (هِمَّة) وەك (هَم) وایە، هەردووكیشیان ناون بۆ ئەوە، كە دەتەوێ شتێك بكەی، كارێك ئەنجام بدەی، ئەو بڕیارە كە لەدڵی خۆتدا دەیدەی، پێی دەگوترێ: (هَمْ)، وە پێشی دەگوترێ: (هِمَّة).

(إبنُ فارِس) گوتوویەتی: (هَمّ) هەر شتێكە كە تۆ دەتەوێ بیكەی، ئەنجامی بدەی، هەروەها (هِمَّة)یش بەهەمان شێوە، وە لە وشەی (هِمَّة) (هُمام) وەردەگیرێ، ئەویش واتە: حوكمڕانێك كە هیممەت و ئیرادەیەكی مەزنی هەیە.

(المُناوي) دەڵێ: {عِظَمُ عُلُوِّ الهِمَّةِ: عَدَمُ المُبالاةِ بِسَعادَةِ الدُّنيا وَشَقاوَتِها}[2]، واتە: بەرزیی هیممەت، یان مەزنیی هیممەت ئەوەیە: كە ئینسان گوێ نەداتە خۆشیی و ناخۆشیی دنیا.

گوێ نەداتێ، لەو ڕووەوە، كە نەیكا بە ئاوات و ئامانجی خۆی، هەمیشە بەدوای خۆشیی و لەززەتەكاندا بگەڕێ.

---

(١) لسان العرب، إبن منظور، ج١٢، ص ٦٢٠- ٦٢١.

(٢) نضرة النعيم، ج٢، ص ٢٩٨٤.

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: {الكَبيرُ الهِمّةِ على الإطلاق، هوَ مَن لا يَرضى بِالهِمَمِ الحَيوانية قَدر وِسعه، فَلا يَصيرُ عبْد بَطنه وَفرْجِهِ، بَل يَجتَهدُ أن يتخَصَّص بِمكارِمِ الشَّريعة}[1]، واتە: خاوەن هیممەتی گەورە بە ڕەهایی، ئەو کەسەیە کە ڕازی نەبێ بە ئامانج و ئاواتە ئاژەڵییەکان، بەپێی توانای خۆی، بەجۆرێك کە نەبێتە کۆیلەو وابەستەی ورگی و داوێنی، بەڵکو هەوڵ بدا ئەو ڕەوشت و ئاکارە بەرزانەی کە شەریعەت فەرمانی پێکردوون، تایبەتیان بکا بە خۆیەوە، وە خۆییان پێ برازێنێتەوە.

دیارە وشەی هیممەت لە قورئاندا نەهاتوە، وە لە سوننەتی پێغەمبەری خواشدا (صلى الله عليه وسلم) نەمبینیوە هاتبێ، بەڵام هەم ئایەتی وامان هەن و، هەم فەرموودەی وامان هەن، ئاماژە دەکەن بە هیممەت بەرزیی، بۆ وێنە:

یەکەم: خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (المطففين) ئایەتی (١٨)دا دەفەرموێ:

﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ ﴾.

واتە: نەخێر، {ئەی هاوبەش بۆخوا دانەرەکان! ڕاست ناکەن} بێگومان لیستی تۆماری چاکەکاران لە (عِلِّيِّينَ)ە، واتە: لە بەرزییەکانە.

دووەم: لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٣٩)دا خوای پەروەردگار ڕوو لە ئیمانداران دەکاو دەفەرموێ:

﴿ .. وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ ﴾.

واتە: ئێوە لەسەرەوە دەبن و باڵاو بەرزتر دەبن، ئەگەر بڕوادار بن، واتە: لەکاتی ڕوو بەڕووبوونەوەتاندا لەگەڵ دوژمناندا، ئەگەر بەڕاستی ئیماندار بن، ئێوە لای سەرەوەتان پێ دەبڕێ، وەئێوە لەلای سەرەوە دەبن و ناکەونە ژێر.

سێیەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ:

{إِنَّ اللهَ يُحِبُّ مَعَالِيَ الأُمُورِ وَأَشرافِها، وَيَكْرَهُ سفْسافَها} أخرجه الطبراني برقم (٢٨٩٤)،

---

(١) الذريعة إلى مكارم الشريعة، ص ٢٩١.

قال الهيثمي (١٨٨/٨): فيه خالد بن إلياس ضعفه أحمد وابن معين والبخاري والنسائي وبقية رجاله ثقات، وقال: أحاديثه كأنها غرائب وإفرادات عن من يحدث عنهم ومع ضعفه يكتب حديثه، وقال الألباني صحيح.

واتە: بێگومان خوای بەرز کارو خەسڵەتە بەرزو شەریفەکانی خۆش دەوێن، وە ڕقی لە کارو ئاکارە نزم و پەستەکانە.

**چوارەم:** لە عومەری کوڕی خەتتاب گێڕدراوەتەوە، کە گوتوویەتی:{لا تَصغُرَنَّ هِمَمُكُم، فَإنِّي لَم أَرَ أَقْعَدَ عَن المَكْرُماتِ مِن صِغَر الهِمَم}[1].واتە: با هیممەت و ئیرادەو ئاواتتان بچووك نەبێ، چونکە من نەمبینیوە کاریگەرتر لە هیممەتی گچکە، بۆ ئەوە کە ئینسان دەستی نەگاتە پایە بەرزەکان. واتە: هەرکەسێك هیممەتی نزم و بچووك بێ، ئەوە کاریگەریی زۆری هەیە لەسەری، بۆ ئەوەی هەوڵ نەدا بۆ ئاوات و ئامانجی بەرز.

**پێشینانیش گوتوویانە:** ئاواتی گەورە پیاوی گەورە دروست دەکات.

**پێنجەم:** هەروەها دەربارەی هیممەت بەرزیی گوتراوە:{إذا كانَتِ الآمالُ كِباراً، تَعِبت في مُرادِها الأجسامُ}، واتە: ئەگەر ئاواتەکان بەرز بن، جەستەکان لەپێناو بەدیهێنانیاندا ماندوو دەبن.

وە گوتراوە: بِقَدَرِ الكدِّ تكتَسَبُ المَعالي مَن طَلَب العُلى سَهرَ اللَّيالي

واتە: بە ئەندازەی ڕەنج دان، بەرزییەکان وەدەست دێن، هەر کەس بەرزیی بوێ، شەو نخوونیی دەکێشێ.

**شەشەم:** هەروەها خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (الشعراء) ئایەتەکانی (٨٨-٨٩)دا دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾.

واتە: ئەو ڕۆژەی نەسامان و نە کوڕان دادی ئینسان نادەن، مەگەر کەسێك کە بەدڵێکی ساغ و سەلیمەوە هاتبێتەوە خزمەت خوا.

---

(١) أدب الدنيا والدين - الماوردي- ص ٣٢٧.

حەوتەم

## دڵ ساغیی (سلامَة القَلب)

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە وەك چۆن جەستە نەخۆش دەبێ، دڵ و ڕووح و نەفسی ئینسانیش، نەخۆش دەبێ، هەروەك چۆن جەستە ساغ دەبێ، دەگونجێ دیوی پەنهان و نێوەوەی ئینسانیش ساغ بێت، با چەند وێنەیەك بهێنینەوە:

یەکەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی پێداوە دەفەرموێ:

{أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ} أخرجه أحمد برقم (١٨٣٩٨)، والبخاري برقم (٥٢)، ومسلم برقم (١٥٩٩)، وأبو داود برقم (٣٣٢٩ ورقم ٣٣٣٠)، والترمذي برقم (١٢٠٥) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٤٤٥٣)، وابن ماجه برقم (٣٩٨٤)، وأخرجه أيضًا: الدارمي برقم (٢٥٣١)، والبيهقي برقم (١٠١٨٠).

واتە: ئاگاداربن! لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر چاك بێ، هەموو جەستە چاك دەبێ، وە ئەگەر ئەو تێكبچێ و خراپ بێ، هەموو جەستە تێك دەچێ و خراپ دەبێ، ئەویش دڵە.

دیارە ساغیی و سەلامەتیی دڵ، بە ئیمان و ئیحسان و تەقواو تەزكیە دەبێ، وە بە پێچەوانەوە بە كوفرو نیفاق بە گوناهو تاوان، دڵ و دەروونی ئینسان نەخۆش و دەردەدار دەبێ، وە دڵی ساغیش ئەوەیە كە بەرامبەر بەخوا، ئیمان و خوا بەیەككرتن، وە ئەو خەسڵەتانەی كە ئیمان و خوا بەیەككرتن دەیانحوازن، ئەو خەسڵەتانەی تێدا هەبن.

وە بەرانبەر بەخەڵکیش دڵی ساغ، ئەو دڵەیە کە جگە لە دڵسۆزیی و بەزەیی و خێرخوازیی، تێدا نەبێ، وە پاك بێ لەبوغزو ئێرەیی و خۆ بەگەورە زانین، واتە: دڵی ساغ ئەوەیە کە هەم لەگەڵ خوادا ساف و ساغ بێ، وە ڕازاوەبێ بە ئیمان و تەقواو خوا بەیەکگرتن و تەزکیە، وە هەم لەگەڵ خەڵکیشدا ساغ بێ و، پڕبێ لە سۆزو بەزەیی و خۆشەویستیی و بە خەمەوە بوون و بەتەنگەوە بوون، وە دوور بێ لەو سیفەتانەی کە پێچەوانەی بەرژەوەندیی خەڵکن، وەك بوغزو غەرەزو حەسەدو خۆبەزلگریی و خۆ پەسندیی و خۆ بەسەر خەڵکدا هەڵکێشان و .. هتد.

دووەم: بەڵگەیەکی دیکە لەسەر گرنگیی و پێویستیی ساغ و سەلامەتیی دڵ و دەروون، وەك سیفەتێکی بنەڕەتیی مرۆڤی مسوڵمان لە خودی خۆیداو لە پەیوەندیی لەگەڵ خواو خەڵکدا، ئەو ئایەتەیە کە پێشتریش هێنامان، خوای کاربەجێ لەسەر زمانی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ) دەفەرموێ:

﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: ئەو ڕۆژە کە نە سامان و نە کوڕان سوود ناگەیەنن (بە خاوەنەکەیان)، مەگەر کەسێ بە دڵێکی ساغ هاتبێتەوە لای خوا.

سێیەم: لە سوورەتی (الصافات) ئایەتەکانی: (٨٣-٨٤)دا خوا (سبحانە و تعالی) دەربارەی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ) دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ ﴾.

واتە: وە لە شوێنکەوتوانی (نووح) ئیبراهیم بوو (سەلامی خوای لێبێ) کە بەدڵێکی ساغەوە هاتبوە لای خوا[1].

---

(١) پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) هەموویان خاوەنی دڵی ساغ و سەلامەت بوون، بەڵام بۆچی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ) لە دوو شوێن لە قورئاندا، بە خاوەنی دڵی ساغ و سەلیم و تێرو تەواو وەسف کراوە؟!

دیارە ئەوەش نهێنی خۆی هەیە:

یەك: ڕەنگە یەکێ لە نهێنییەکان ئەوەبێ، کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ)، بەمانای وشە، لەگەڵ هەموو ئەوانەی دژی خوا بوون و دژی بەرنامەی خوابوون، تێکگیراوە:

بێگومان خاوەنی دڵی ساغ و سەلیم بوون، سیفەتێكی بنەڕەتییەو پێویستە لە ئینسانی مسوڵماندا هەبێ، وە دڵ ساغ و سەلیم بوون، وەك هەموو سیفەتە بنەڕەتییەكانی دیكە، هەم ئینسان لە خودی خۆیدا دەبێ بیهێنێتە دی، وە هەم لە مامەڵە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، ئینسان دەبێ خاوەنی دڵێكی ساغ و سەلیم بێ، وە هەم لە مامەڵە لەگەڵ خەڵكیشدا بەو شێوەیە بێ و، دووربێ لە نەخۆشیی و دەردەداریی.

---

لەگەڵ خرۆكە پەرستان، لەگەڵ مانگ پەرستان، لەگەڵ خۆر پەرستان، لەگەڵ بت پەرستان، لەگەڵ تاغووت پەرستان.

دوو: پاشان ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ)، كەسێ بووە وابەستەی شوێنێكی دیاریی كراو نەبووە، لە عێراق بووە هەندێ دەڵێن: لە كوردستان، پاشان چووە بۆ شام، لەوێشەوە بۆ میصر، لە میصرەوە چووە بۆ حیجاز، وە لەو ناوچانەدا هەر هاتووەو چوە، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: ماڵی هەر لەسەر پشتی كەرێ بووە، لە پێناوی خوای پەروەردگاردا، هەر خەریكی كۆچ و كۆچبار بووە.

سێ: وە پاشان ئیبراهیم پێغەمبەرێكی پایە بەرزی خوایە، كە لەسەر خوا فڕێ دراوەتە نێو ئاگری سوور، وە لەپێناو خوادا جگەر گۆشەكەی خۆی هێنایە سەر سەربڕین، دیارە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ)، كۆمەڵێ هەڵوێست و سیفەتی بەرزی وای هەن، شایستەی ئەوەیە كە بەخاوەنی دڵی ساغ و سەلیم پێناسە بكرێ.

■ هەشتەم ■

## دنیا بەکەم گرتن (الزُّهد)

**سەرەتا با پێناسەی زوهد بکەین:**

(غَزالي) دەڵێ: {الزُّهد: هوَ عِبارةٌ عَن انصرافِ الرَّغبَةِ عَنِ الشَّيء إِلى ما هوَ خَيرٌ مِنهُ}[1]، واتە: زوهد بریتیە لە: لاچوونی ئارەزوو لە شتێك بەرەو شتێکی لەو چاکتر.

دەڵێی: ئەو شتەیانم پێ چاکترەو بەسەر ئەویدیکەدا هەڵیدەبژێرم، کەواتە: ئەو شتەی کە بەکەمی دەگری، مانای وایە تۆ زاهیدی بەرانبەر بەو شتە، چونکە شتێکی لەو چاکتر شك دەبەی، دیارە مەبەست لە زوهد، دنیا بەکەم گرتنە، واتە: تۆ کە دواڕۆژت لەلا گەورەترو گرنگ تر بوو، دنیات لەلا بچووك دەبێتەوە لەبەرانبەر دواڕۆژدا.

**قسەیەکی حەکیمانەی زۆر جوان لەو بارەوە گوتراوە:** {لَيسَ الزُّهدُ أَن لا تَملِكَ شَيْئاً، وإِنَّما الزُّهد أَن لا يَملِكَك شَيءٌ}، واتە: زوهد ئەوە نیە تۆ هیچ شتێکت نەبێ، بەڵکو زوهد ئەوەیە: کە هیچ شتێك تۆی نەبێ.

واتە: دنیا بەکەم گرتن (زهد) بەوە نایەتە دی کە تۆ خاوەنی هیچ نەبی، بەڵکو بەوە دێتەدی کە هیچ شتێك خاوەنی تۆ نەبێ، تۆ نەبی بە کۆیلەی شتەکان،

---

(١) إحياء علوم الدين - ج٤ - ص٢١٧.

وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

{تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ وَالْقَطِيفَةِ وَالْخَمِيصَةِ} أخرجه البخاري برقم (٢٧٣٠)، وابن ماجه برقم (٤١٣٥)، وأخرجه أيضًا: إبن حبان برقم (٣٢١٨)، والبيهقي برقم (١٨٢٧٩).

واتە: بەدبەختە ئەو كەسەی دەبێتە كۆیلەی زێڕ، ئەو كەسەی دەبێتە كۆیلەی زیو، ئەو كەسەی دەبێتە كۆیلەی بەرگ و پۆشاك.

دیارە وشەی (زهد) هەم لە قورئان و، هەم لە سوننەتی پێغەمبەری خواشدا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە:

یەكەم: لە سوورەتی (یوسف) ئایەتی (٢٠)دا، خوای زاناو شارەزا دەربارەی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێ)، كە برایەكانی دەیخەنە بیرەوە، دوایی كاروانچی دێن لەو بیرە دەیهێننە دەرێ و، دوایی بە نرخێكی كەم دەیفرۆشن، دەفەرموێ:

﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾.

واتە: (یوسف)یان فرۆشت بە نرخێكی كەم، بە چەند درهەمێك كە دەژمێردرێن، وە بەرانبەر بە یوسف كەم سەیركەر بوون، یاخود بێ ڕەغبەت بوون، واتە: بەكەمیان تەماشا دەكرد، چونكە پشتیان پێوە نەهێشابوو، ئەگەرنا (یوسف) (سەلامی خوای لێبێ) دوایی بۆتە ئەو پەیامبەرە پایە بەرزە، لە ڕووی جوانیی و دیمەنیشەوە، دیارە زۆر سەرنج ڕاكێش بووە.

ڕەنگە زانیبیان كە ئەوە خاوەنێكی هەیەو دوایی بەدوایدا دێ، ویستوویانە زوو لەكۆڵ خۆیانی بكەنەوەو بەچەند درهەمێكی كەم فرۆشتوویانە.

دووەم: لە سوورەتی (طه) ئایەتی (١٣١)دا، كە دیارە وشەی (زهد)ی تێدا نیە، دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ ﴾.

واتە: چاوت مەبڕە ئەوەی هەندێ لە بێبڕوایانمان پێ خۆشگوزەران کردوە، لە جوانیی ژیانی دنیا، کە تێیدا تاقییان بکەینەوە، وە بێگومان ڕۆزیی پەروەردگارت چاکترە، وە زیاتریش دەمێنێتەوە.

لێرەدا خوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆی (صلى الله عليه وسلم) هان دەدا، لەسەر دنیا بەکەم گرتن و دنیا بەکەم تەماشا کردن.

**سێیەم:** هەروەها لە سوورەتی (التوبة) لە ئایەتی (٣٨)دا، خوای بەخشەر هانی ئیمانداران دەدا، کە دنیا لەچاو دوارۆژ بەکەم تەماشا بکەن، کە هەر ئەوەش نێوەرۆکی زوهدە، دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ ﴾.

واتە: ئەی بڕواداران! ئەوە چیتانە کاتێ پێتان بگوترێ لەڕێگای خوادا بۆ جەنگ و جیهاد بچنەدەر، ئێوە خۆتان قورس کردو بەزەوییەوە، نووسان، ئایا ڕازی بوون بە ژیانی دنیاو، دنیاتان هەڵبژارد بەسەر دوارۆژدا؟ ڕابواردنی ژیانی دنیا لەچاو دوارۆژ، تەنها شتێکی کەمە.

واتە: ئەو شتە کەمەتان نەدەبوو ئەوەندە پێ زۆر بێ، کە لەپێناویدا ئەرکی جەنگ و جیهاد بچوێنن، وە کەمتەرخەمیی تێدا بکەن.

**چوارەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی ئەوە کە ژیانی دنیا لەچاو دوارۆژدا چەندە، لە فەرمایشتێکدا کە زۆر سەرنجمان ڕادەکێشێ، دەفەرموێ:

{مَا مَثَلُ الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ إِلَّا مَثَلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ}
أخرجه ابن المبارك برقم (٤٩٦)، وأحمد برقم (١٨٠٤٣)، ومسلم برقم (٢٨٥٨)، وابن ماجه برقم (٤١٠٨)، وأخرجه أيضًا: الحميدي برقم (٨٥٥)، وابن أبي شيبة برقم (٣٤٣٠٦)، وابن حبان برقم (٦١٥٩)، والطبراني برقم (٧١٣)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٠٤٥٩).

واتە: ژیانی دنیا لەچاو دوارِۆژ، تەنها وەك ئەوە وایە، کە یەکێ لە ئێوە پەنجەی بخاتە نێو ئاوی دەریاوە، با تەماشا بکات، بزانێ چەند ئاو بە پەنجەیەوە هاتوە! {یانی: ئەو ئاوەی بە پەنجەیەوە نووساوە، لەچاو ئاوی دەریایەکە چەندە، دنیاش لەچاو دوارِۆژدا ئەوەندەیە}.

پێنجەم: هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{ لَوْ كَانَتْ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ} أخرجه الترمذي برقم (٢٣٢٠)، والطبراني (١٥٧/٦، برقم ٥٨٤٠)، والبيهقي في شعب الإيمان (٣٢٥/٧، برقم ١٠٤٦٥)، قال الألباني: صحيح.

واتە: ئەگەر دنیا لە لای خوا بەقەد باڵە مێشوولەیەك نرخی بوایە، نەیدەهێشت بێ بڕوا قومە ئاوێکی تێدا بخواتەوە.

لەبەر ئەوەی شایستەی نیە، کەسێك خاوەنی خۆی نەناسێ و بەرانبەری سپڵەو بێ نمەك و بێ وەفابێ، شایستەی ئەوە نیە خوا نیعمەتەکانی پێ ببەخشێ، بەڵام دنیا جێی تاقیکردنەوەیەو، لەبەر ئەوەی جێگای تێدا تاقی کردنەوەیە، بۆیە دەبێ مسوڵمان و کافر بەیەکەوە لە نازو نیعمەتەکانی خوا بەهرەمەند بن و تاقی بکرێنەوە.

شەشەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{كُنْتُ نَهيتُكُم عَن زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوها، فَإِنَّهَا تُزَهِّدُ فِي الدُّنْيَا وَتُذَكِّرُ الْآخِرَةَ} أخرجه الحاكم (برقم (١٣٨٧)، والبيهقي برقم (٦٩٨٩)، وأخرجه أيضًا: ابن ماجه برقم (٣٤٠٦)، وابن حبان برقم (٥٤٠٩).

واتە: پێشتر من لێم قەدەغە کردبوون زیارەتی گۆڕستان بکەن، بەڵام ئێستا پێتان دەڵێم سەردانی بکەن، چونکە دەبێتە هۆی ئەوە، کە دنیا بەکەم بگرن، وە دوارِۆژیشتان دەخاتەوە یاد.

حەوتەم: هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەشدا باسی زوهد کراوە:

{عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا أَنَا عَمِلْتُهُ، أَحَبَّنِي اللَّهُ وَأَحَبَّنِي النَّاسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: {إِزْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبُّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا فِي أَيْدِي النَّاسِ يُحِبُّوكَ}

أخرجه ابن ماجه برقم (٤١٠٢)، قال البوصيري (٢١٠/٤): هذا إسناد ضعيف، والطبراني برقم (٥٩٧٢)، والحاكم برقم (٧٨٧٣) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٠٥٢٢) وقال: خالد بن عمرو هذا ضعيف، وأخرجه أيضًا: القضاعي برقم (٦٤٣)، وابن الجوزي في العلل المتناهية برقم (١٣٥٢)، وأورده ابن أبي حاتم في العلل برقم (١٨١٥)، وقال: قال أبي: حديث باطل يعني بهذا الإسناد، قال المنذري (٧٤/٤): رواه ابن ماجه، وقد حسن بعض مشايخنا إسناده، وفيه بُعْدٌ، لأنه من رواية خالد بن عمرو القرشي الأموي السعيدي، وخالد هذا قد ترك، واتهم ولم أَرَ من وثَّقه، لكن على هذا الحديث لامعة من أنوار النبوة، ولا يمنع كون راويه ضعيفًا أن يكون النبـيُّ قالَهُ، وقد تابعه عليه محمد بن كثير الصنعاني، ومحمد هذا قد وثق على ضعفه، وهو أصلح حالاً من خالد، وقال الشيخ الألباني : صحيح.

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! کردەوەیەکم پێشان بدە، هەر کاتێك ئەو کردەوەیەم ئەنجامدا، هەم خوا خۆشی بوێم، هەم خەڵك خۆشی بوێم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: {دنیا بەکەم بگرە، خوا خۆشی دەوێی، ئەوەش کە لەدەستی خەڵك دایە، بەکەم تەماشای بکە، خەڵکیش خۆشیان دەوێی}.

بەڵێ هەمیشە زەبوون بوونی ئینسان، وە سووك بوونی ئینسان، بەوەوەیە کە دنیای لەلا زۆرە، وە ئەوەی لەدەستی خەڵك دایە، چاوی تێدەبڕێ و تەماعی زۆری تێدایە، وە دینی خۆی لە پێناو دنیایدا دەدا، بەڵکو بابای وا هەیە، دینی لەپێناو دنیای غەیری خۆشی دەدا!

**تێبینییەکی گرنگ لەسەر لێکدانەوەو تێگەیشتنی ماناو مەبەستی وشەی (زهد):**

زۆر جار وشەی (زهد) بە {دنیا نەویستیی} لێکدراوەتەوە، کە ئەوە هەڵەیە، وەك لە کتێبی {ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون}یشدا باسم کردوە[1]، چونکە مادام وشەی زوهد لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لەمەقامی مەدحدا هاتوە، مانای وایە (زهد) بریتی نیە لە دنیا نەویستیی، چونکە ئیسلام هیچ کات فەرمانی بە مسوڵمانان نەکردوە، ژیانی دنیایان نەوێ و تەرکە دنیا بن، ئنجا خوا ئێمەی لە دنیادا داناوەو بمانەوێ و نەمانەوێ لەدنیادایین و، دەبێ ژیانی دنیا بگوزەرێنین، وە خوای پەروەردگار پێی خۆشە ژیانی دنیا بەشێوەیەك بگوزەرێنین، کە چاو لەدەستی خەڵك نەبین، وە زەبوون و زەلیل نەبین و بە عیززەتەوە بژین، بەشەرەف و کەرامەتەوە بژین، ئەوەش لەگەڵ دنیا نەویستییدا ناگونجێ، بەڵام لەگەڵ دنیا بەکەم گرتندا دەگونجێ!.

با دنیات بوێ، بەڵام لەلات کەم بێ، هەوڵ بۆ دنیا بدە، بەڵام باوەشی پێدا مەکە، وە کاتێك بەرژەوەندیی دنیات لەگەڵ هی دواڕۆژتدا تێك دەگیرێ، بەرژەوەندییە دنیاییەکەت نادیدە بگرە، وە کاتێ بەرژەوەندییەکی دنیایی ئەوە دەخوازێ، کە تۆ پێشێلی مافی خەڵك بکەی و، کەرامەتی خۆت لەدەست بدەی، ئەو کاتە چاوپۆشیی لەو بەرژەوەندییە دنیاییە بکە، وە کەرامەتی خۆت بپارێزە، وە مافی خەڵك و سنوورەکان مەبەزێنە.

---

(١) هەروەها لە کتێبی: (گیانی ژیان)یشدا ڕوونم کردۆتەوە.

■ نۆیەم ■

## پەند وەرگرتن (الإعتبار)

یەکی دیکە لەو ڕەوشتە بنەڕەتییانە، کە ئینسان دەبێ خۆییان پێ بڕازێنێتەوە، لە مامەڵە لەگەڵ خۆیدا، وە لەمامەڵە لەگەڵ پەروەردگاریدا، وە لە هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکیدا، بریتیە لەوە کە: پەند وەبگرێ، کە شتێکی بەسەردێ، هەروا بەسەریدا نەڕوات، بەڵکو پەندی لێ وەربگرێ.

(الكَفوي) دەڵێ: {الإعتبارُ هوَ النَّظرُ في حَقائقِ الأَشياءِ، وَجهاتِ دِلالَتِها لِيُعرفَ بِالنَّظَر فيها شَيءٌ آخَر مِن جِنسها، وقيل: الإعتبارُ هوَ التَّدبُّر وَقياسُ ما غابَ على ما ظَهر}[1]، واتە: پەند وەرگرتن (الإعتبار) ئەوەیە، کە ئینسان تەماشای ماهیەتی شتەکان بکا، وە لەو ڕووەوە کە چی دەگەیەنن، تاوەکو بەهۆی تەمەشا کردنی ئەوانەوە، شتێکی دیکەی بۆ دەرکەوێ، وە گوتراوە: پەند وەرگرتن ئەوەیە ئینسان لە شتێکەوە ڕابمێنێ، وە شتێك قیاس و پێوانە بکات کە نایبینێ، لەسەر شتێك کە دەیبینێ.

(المُناوي) گوتوویەتی: {العِبرة والإعتبار هوَ الإتِّعاظ}[2]، واتە: عیبرەت واتە: پەند وەرگرتن.

---

(١) الكليات - ص ١٤٧.

(٢) التوقيف على مهمات التعاريف - ص٢٣٥.

خوای پەروەردگار لەچەند شوێنێكدا باسی ئەوەی كردوە كە دەبێ ئێمە پەند وەربگرین، بەهەمان شێوە پێغەمبەری خاتەمیش (صلی الله علیه وسلم)، با تەماشای چەند وێنەیەك بكەین لە قورئان و سوننەت:

یەكەم: لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٣)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿١٣﴾ ﴾.

واتە: بێگومان لە دوو كۆمەڵەكاندا كە بەیەك گەیشتن {بەرەنگاری یەكدی بوونەوە}، نیشانەو بەڵگە هەبوو بۆ ئێوە، كە كۆمەڵێكیان لە پێناوی خوادا دەجەنگین، ئەوانی دیكەش بێبڕوابوون، ئەوانەی بڕوادارابوون بێ بڕوایەكانیان دوو هێندەی خۆیان دەبینی بەچاو، وە خوا هەركەسێ كە بیەوێ پشت ئەستووری دەكا بەهۆی یارمەتی خۆی، بێگومان لەوەدا پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان.

دووەم: هەروەها خوا لەسوورەتی (المؤمنون) ئایەتی (٢١)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ ...﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: بێگومان لە ئاژەڵاندا پەند هەیە بۆ ئێوە.

سێیەم: هەروەها وەك پێشتریش هێنامان: لە سوورەتی (الحشر) ئایەتی (٢)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ .. فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٢﴾ ﴾.

واتە: پەند وەربگرن ئەی خاوەن عەقڵان!

**چوارەم:** پێشتریش ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوامان (صلی الله علیه وسلم) هێنا، كە دەفەرموێ:

{كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، فَزُورُوهَا، فَإِنَّهَا تُزَهِّدُ فِي الدُّنْيَا وَتُذَكِّرُ الْآخِرَةَ}(١)

واتە: لێم قەدەغە کردبوون سەردانی گۆڕستان بکەن، بەڵام ئێستا سەردان بکەن، چونکە دنیاتان لەلا کەم بایەخ دەکات و دواڕۆژتان دەخاتەوە یاد.

**پێنجەم:** (إبن مسعود) خوا لێی ڕازی بێ گوتویەتی:

{السَّعيدُ مَن وعِظَ بِغيْرِه} رواه مسلم برقم (١٦٤٥).

واتە: بەختەوەر کەسێکە پەندی لە غەیری خۆی وەرگرتبێ.

**شەشەم:** کۆتا بەڵگەمان لەو بارەوە، وتەیەکی حەسەنی بەصرابییە، کە دەڵێ: {مَن لَم يَكُن كَلامُهُ حِكْمةً، فَهوَ لَغْوٌ، وَمَن لَم يكُن سُكوتُه تَفَكُّراً، فَهو سَهْوٌ، وَمَن لَم يَكُن نَظَرهُ اعتِباراً، فَهوَ لَهْوٌ}(٢)، واتە: هەرکەسێ قسە کردنەکەی بە ڕێو جێ نەبێ، بەحیکمەت نەبێ، ئەوە قسەی پڕو پووچی کردوە، وە هەرکەسێ بێدەنگییەکەی بیرکردنەوەو ڕامان نەبێ، ئەوە کاتەکەی لەدەست چووە، وە هەرکەسێ تەماشا کردنەکەی پەند وەرگرتن نەبێ، ئەوە هەر خافڵاوەو هیچی دەستگیر نەبووە.



---

(١) پێشتر تەخریج کراوە.

(٢) بڕوانە: (إحياء علوم الدين)، ج٤، ص ٦٤، للغزالي.

دەیەم

## بەئەدەب بوون (التَّأدُّب)

دیارە ئەم وشەیە وەك چۆن وشەیەكی عەرەبییە، فارسیش بەكاری دەهێنن، توركیش بەكاری دەهێنن، لە كوردیشدا بەهەمان شێوە بەكار دێ، ئنجا با بزانین وشەی ئەدەب لە ڕوانگەی ڕەوشت ناسانەوە[1] یانی چی؟

(إبن القیم) دەڵێ: {حَقیقةُ الأَدبِ استعمالُ الخُلقِ الجَمیلِ، ولِهذا كانَ الأَدبُ استخْراجاً لِما في الطَّبیعةِ مِن الكَمال مِن القَوْل إلى الفِعل}[2]، واتە: حەقیقەتی ئەدەب بریتیە لە بەكارهێنانی ڕەوشتی جوان، {هەر كەسێ ئاكارو ڕەوشتی جوان لەخۆیدا بپشكوێنێ، لەخۆیدا بدرەوشێنێتەوە، بە ڕەوشت و ئاكاری جوان مامەڵە بكا، لەزاتی خۆیدا، لەگەڵ دەورو بەریدا، لەگەڵ پەروەردگاریدا، ئەوە مانای وایە بە ئەدەبەو ئەدەبی لە خۆیدا هێناوەتە دی}، بۆیە ئەدەب بریتیە لەپشكواندن و هێنانەدەری ئەو سیفەتە باشانەی، كە بە هێز لە سروشتی ئینساندا هەن، دەرهێنانیان بۆ حاڵەتی كردەوە.

یانی: هەموو ئینسانێك لەبارانیدا هەیە ڕەوشتێكی بەرزو جوانی هەبێ، بەڵام ئەوە بەهێز (بالقوة)یە واتە: وەك حاڵەتی شێردراوەو پەنهان لە سروشتی ئینساندا هەیە، ئینسان دەبێ هەوڵ لەگەڵ خۆیدا بدا، ئەوەی كە بەهێز بەشێوەی شێرراوە

---

(١) ئەگەرنا نووسەران و ئەدیبان بەشێوەیەكی دیكە پێناسەی ئەدەب دەكەن.

(٢) تهذیب مدارج السالكین - ص ٤٤٨.

لە سروشتیدا هەیە، بیكاتە حاڵەتی كردەوەو، بیهێنێتە دنیای واقیع و بەكردەوە لەخۆیدا بەرجەستەی بكا.

كتێبی: (نَضرة النَّعيم)[1] دەربارەی ئەدەب، هەندێ شتی جوانی هێناوە، دەڵێ:

{فَالأَدبُ معَ اللهِ: حُسنُ الصُّحبةِ معهُ بإِيقاعِ الحَركاتِ الظَّاهِرة وَالباطِنةِ على مُقْتضى التَّعظيمِ وَالإِجلالِ والحَياء}.

{وأمَّا الأَدبُ معَ رسولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم: فَيعْني كَمالُ التَّسليمِ لَه والإِنقيادُ لأَمرِه، وَتلقِّي خَبرهِ بِالقبولِ والتَّصديق}.

{وأما الأدب مع الخلق: فَهوَ مُعامَلة النّاس عَلى اختِلافِ مَراتِبهم، كُلٌّ بِما يَليقُ بِهِ}.

واتە: ئەدەب لەگەڵ خوادا، بریتیە لەوە كە ئینسان مامەڵەی باش بێ لە خزمەت خوادا، ئەویش بە شێوەیەك، كە هەڵس و كەوتە دیارەكانی و شێرراوەكانی، بەپێی خوازیاری بەگەورە گرتن و ڕێزگرتنی خواو شەرم كردن بن لە خوا.

وە ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، ئەوەیە، كە بەتەواویی بۆی ملكەچ بین، وە ئەو فەرمانانەی دەیانكات، جێبەجێیان بكەین، وە ئەو هەواڵانەی كە پێمان دەدا، لێی وەربگرین و بەڕاستیان بزانین.

وە ئەدەبیش لەگەڵ خەڵكدا، ئەوەیە كە مامەڵەیان لەگەڵدا بكەی بە جیاوازیی پلەو پایەیانەوە، بەو شێوەیە كە بۆیان شایستەیە، هەركەسە بەو شێوەیە كە لێی دەوەشێتەوە.

وە ئێمە دەتوانین چەند دەقێك بهێنینەوە لەسەر بەئەدەب بوون، لەگەڵ خوادا (سبحانه و تعالى)، وە لەگەڵ قورئاندا، وە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، وە لەگەڵ زانایاندا، وە لەگەڵ خەڵكدا، با تەماشا بكەین:

---

(١) ج٢ ص١٤٣و ١٤٧و ١٤٩.

یەکەم: خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٢٤)دا دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَـٰنِكُمْ أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾ ﴾.

واتە: وە خوا مەکەنە ڕێگر بەهۆی سوێند خواردنتانەوە، کە چاکە بکەن، وە پارێزێ بکەن، وە چاکسازیی لەنێوان خەڵکدا بکەن، وە خوا بیسەری زانایە.

واتە: سوێندێك مەخۆن بە خوای پەروەردگار، کە ئەو سوێندە ببێتە ڕێگر لەکارێکی خێرتان، کە پێویستە بیکەن، سوێند مەخۆ لەکاری خێر کە نەیکەی، وەئەگەر سوێندیشت خوارد، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیە وسلم) هاتوە: کەفارەت بدەو کردەوە باشەکەت ئەنجام بدە، نەك لەسەر سوێندەکەت برۆی و بڵێی: تازە سوێندم خواردوە! مادام کردەوە باشەکەت چاکتر بێ، کەفارەتی سوێندەکەت بدەو کردەوە باشەکە ئەنجام بدە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بۆخۆی وای کردوە، کەواتە: لەئەدەب لەگەڵ خوادا، ئەوەیە کە ئینسان سوێند نەخوا بەخوا، بەتایبەت سوێندێك، کە ببێتە ڕێگر، کە کردەوەیەکی چاك بکات.

وە لەڕاستییدا ئەدەب لەگەڵ خوادا، ئەوەیە کە ئینسان بەردەوام ناوی خوای لەسەر زار نەبێ بۆ سوێند خواردن، وەك لە پێشەوایان و زانایانمان هەبووە گوتوویەتی: من بەڕاست و بەدرۆ سوێندم نەخواردوە، هەڵبەتە ئەوەش جۆرێکە لە زێدەڕۆیی، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) چەندان جار سوێندی بە خوای پەروەردگار خواردوە، ئەگەر پێویستی کردبێ، بەڵام تۆ پێویست بکات و پێویست نەکات، هەمیشە ناوی خوات لەسەر زار بێ، بۆ سوێند خواردن، ئەوە شتێکی باش نیە.

دووەم: سەبارەت بە ئەدەب لەگەڵ قورئاندا، خوای کاربەجێ لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٨٢)دا ئاوا فێرمان دەکا، دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾.

واتە: ئایا لە قورئان ڕانامێنن؟! وە ئەگەر لەلای جگە لەخواوە بوایە، ناکۆکیی و جیاوازیی زۆریان تێدا دەبینی (تێکگیرانیان لەنێواندا دەبینی).

بەڵام ئێستا ئایەتەکان وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك یەکدی دەبەستنەوە، سوورەتەکان هەموویان پشتی یەکدی دەگرن، ئەوەی کە لەمەککە هاتوە، وە ئەوەی کە لەمەدینە هاتوە، هەیە (٢٠) ساڵ زیاتر نێوانیان بووە، بەڵام هەموویان پشتگیریی یەکدی دەکەن، مانای وایە لەلایەن خوایەکەوە هاتوە، کە زانایەو زانیاریی بێسنووری هەیە، کەواتە: ئەدەب لەگەڵ قورئاندا، ئەوەیە کە لێی وردبینەوەو تێوەی ڕامێنین و باش سەرنجی بدەین، نەك هەروا بیخوێنین بە سەرکێڵیی.

سێیەم: وە سەبارەت بە ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی (١)دا دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هیچ شتێك پێش دەستی خواو پێغەمبەری خوا مەخەن، وە پارێز لە خوا بکەن، بێگومان خوا بیسەری زانایە.

هیچ شتێك پێش دەستی خواو پێغەمبەری خوا مەخەن، واتە: هیچ بڕیارێك مەدەن و هیچ هەنگاوێك مەنێن، تاکو نەزانن خوا چی دەفەرموێ؟ یاخود پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چی دەفەرموێ؟ هەڵبەتە خوێنراویشتەوە (لا تَتَقدَّموا) واتە: (لا تَتَقدَّموا) واتە: وەپێش خواو پێغەمبەری خوا مەکەون، لەپێش ئەوانەوە مەڕۆن، لەپێش ئەوانەوە هەنگاو مەنێن، ئەوەش نواندنی ئەدەبە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم).

هەروەها لە ئایەتی دوای ئەو ئایەتەشدا دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾﴾ الحجرات.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دەنگی خۆتان ڕەسەر دەنگی پێغەمبەر مەخەن، {کاتێ کە قسە دەکەن، دەنگی خۆتان بەسەر دەنگی ویدا زاڵ مەکەن}،

نەوەك كردەوەكانتان هەڵبوەشێنەوە، بێ ئەوەی هەست پێ بكەن.

واتە: بێ ئەدەبیی لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەبێتە هەڵوەشانەوەی كردەوە چاكەكان، دیارە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تاكو لەژیاندا بووە، ئەم ئایەتە ڕواڵەتەكەی مەبەست بووە، كە نابێ دەنگ بەسەر دەنگی ئەودا بەرز بكەی، بەڵام كە لەژیاندا نەماوە، واتە: هیچ ڕاو بۆچوونێك نابێ بەسەر سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، - كە وەك دین بەئێمەی ڕاگەیاندوە -، نابێ هیچ قسەو بۆچوون و ڕایەك زاڵ بكەین بەسەریدا.

**چوارەم:** دەربارەی ئەدەب لەگەڵ زانایانێكی باش، وە لەگەڵ بەرپرسانی دادگەردا، كە هەق دەدەن بەو پێگەو پۆستەی خۆیان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللَّهِ، إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ}، أخرجه ابن المبارك برقم (٣٨٨)، وابن أبي شيبة برقم (٣٢٥٦١)، وأبو داود برقم (٤٨٤٣)، والبيهقي برقم (١٦٤٣٥)، وأخرجه أيضًا: البخاري في الأدب المفرد برقم (٣٥٧)، قال الألباني: حسن.

واتە: لە ڕێزگرتنی خواو بەگەورە گرتنی خوایە، كە ڕێز بگری لە: مسوڵمانی خاوەن مووی سپی[١]، وە هەڵگری قورئان كە نەزۆر تێیدا ڕۆچووە، نە خۆشی لێ بەدوور گرتوە[٢]، وە ڕێز لێگرتنی خاوەن دەسەڵاتێكی دادگەر، {حوكمڕانی دادگەر پێویستە ڕێزی لێبنرێ، مادام بەشێوەیەكی دادگەرانە حوكمڕانیی دەكا}.

**پێنجەم:** دەربارەی ئەدەب لەگەڵ خەڵكدا، خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (٨٦)دا دەفەرموێ:

---

(١) مسوڵمانێ كە موی سپی بووە، جا چ پیاو بێ چ ئافرەت.

(٢) واتە: تێیدا ڕۆ نەچووە، كە تووشی زێدەڕۆیی بووبێ، هەروەها لەبەرانبەر قورئانیشدا كەمتەرخەم نیە، كەكاری پێ نەكا، بەڵكو بە شێوەیەكی هاوسەنگ لە قورئان تێگەیشتوە، بە قورئانیشەوە پابەندە.

﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾.

واتە: هەرکاتێ سڵاوتان لێکرا بە سڵاو لێکرانێك، بەباشتر لەخۆی، یاخود لای کەم، وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە[1].

شەشەم: دەربارەی ئەدەب لەگەڵ خۆدا، خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (لقمان) لە ئایەتەکانی: (١٧و١٨و١٩)دا باسی ئامۆژگاریی (لقمان)مان بۆ کوڕەکەی بۆ دەکاو، دەفەرموێ:

﴿ يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾.

**لوقمان ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکا، بەم چەند ئامۆژگارییە:**

- نوێژ بەرپا بکە.

---

(١) لە هەردووك کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) و (ئیسلام و دەوڵەتداریی) دا بە درێژیی باسم کردوە کە دەفەرموێ: (وَإِذَا حُيِّيتُم) واتە: کاتێ سڵاوتان لێکرا، زانایان دەڵێن: مسوڵمان بێ، یان کافر بێ، مادام سڵاوی لێکردی، پێویستە بەباشتر لە خۆی، یان لای کەم، وەك خۆی وەڵامی سڵاوەکەی بدەیەوە، کەواتە: هەندێ فەرمایشتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە ئەوە دەگەیەنن: مسوڵمان وەڵامی سڵاوی جوولەکەو نەصرانییەکان نەداتەوە، ئەوە بەتەئکید مەبەستی پێ کەسانێ بووە دژایەتیی ئیسلامیان کردوە، یان دەبێ تەماشای سەنەدی فەرموودەکان بکرێ و ڕاست نەبن، یان ئەگەر ڕاست بن، ئەوە مەبەست پێی حاڵەتێکی تایبەتە، کاتێ کە چوون بۆ لای تیرەیەکی جوولەکە دیارە کێشەیان هەبووە، بۆ ئەوەی بگەنە ئەنجامێك، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئێوە پێشێ سڵاویان لێمەکەن، بۆ ئەوەی وا نەزانن ئێوە لە بێهێزییەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن، کەواتە: ئەو فەرمایشتە کە دەڵێ: دەست پێشخەری سڵاو کردن مەبن، (لا تبدؤهم بالسلام) شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەرنا ئایەتەکە بەگشتی فەرموویەتی: هەرکاتێ سڵاوتان لێکرا، بەباشتر لەخۆی، یان لایەنی کەم، وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە.

- فەرمان بە چاکە بکەو ڕێ لە خراپە بگرە.

- لەسەر ئەوەی تووشت دێ، خۆڕاگر بە، بێگومان ئەوە لەو کارانەیە کە پێویستی بە عەزیمەت و ئیرادەیەکی بەهێز دەکا.

- ڕوو لە خەڵك وەرمەچەرخێنە.

- بەفیزو کەشخە مەڕۆ، چونکە خوا هیچ کەسێکی شانازیکەری، خاوەن کەشخەی خۆش ناوێ.

- لە ڕۆیشتنتدا میانجیی بە.

- زۆر دەنگت هەڵمەهێنە، چونکە خراپترین دەنگ، دەنگی کەرانە، کەواتە: زۆر دەنگ هەڵمەهێنە زیاد لەو ئەندازەیەی کە پێویستە.

**حەوتەم:** هەر دەربارەی ئەدەب لەگەڵ خۆ، لە بواری خواردن و خواردنەوەدا.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{مَا مَلَأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، حَسْبُ الْآدَمِيِّ لُقَيْمَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ فَإِنْ غَلَبَتِ الْآدَمِيَّ نَفْسُهُ، فَثُلُثٌ لِلطَّعَامِ، وَثُلُثٌ لِلشَّرَابِ، وَثُلُثٌ لِلنَّفَسِ} أخرجه ابن المبارك برقم (٦٠٣)، وأحمد برقم (١٧٢٢٥)، والترمذي برقم (٢٣٨٠)، وقال: حسن صحيح، وابن ماجة برقم (٣٣٤٩)، وابن سعد (٤٠٩/١)، والطبراني برقم (٦٤٤)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٦٥٠)، والحاكم برقم (٧٩٤٥) وقال: صحيح الإسناد، وأخرجه أيضًا: النسائي برقم (٦٧٦٨)، وابن حبان برقم (٥٢٣٦)، والقضاعي برقم (١٣٤٠)، والديلمي برقم (٦٢١٠) .

واتە: ئادەمیزاد هیچ تووڕەکەیەکی پڕ نەکردوە لە ورگی خراپتر، کە پڕی بکا لە خواردن، ڕۆڵەی ئادەم چەند پاروویەکی بەسن کە پشتی ڕابگرن، ئەگەر هەر تاقەتی بەخۆی نەشکا (پێی خۆش بوو بخوا)، با گەدەی بکاتە سێ بەش: بەشێکی بۆ خواردن، بەشێکی بۆ خواردنەوە، بەشێکی بۆ هەناسەو هەوا.

■ یـازدەیەم ■

## وریـایی (الحذر)

(إبن فارس) لە پێناسەی وریایی (الحَذر)دا دەڵێ: {الحَاءُ والذاءُ والرّاءُ (ح ذ ر) أَصلٌ واحِدٌ، وهوَ التَّحرِّي والتَّيقُّظ}[1]، واتە: پیتەكانی (ح، ذ، ر) (حذر) یەك بنچینەیە دەلالەت لە خۆپاراستن و وریایی دەكا.

(راغب الأصفهانی) دەڵێ: {الحَذَرُ هوَ إحترازٌ عن مُخيف}[2]، واتە: (حذر) بریتیە لە خۆپاراستن لە شتێكی جێگای مەترسیی.

لە چەند شوێنێكی قورئان و چەند فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) فەرمان كراوە بە مسوڵمانان كە وریاو هۆشیارو بێدار بن، با لەو بارەیەوە چەند وێنەیەك بهێنینەوە:

یەكەم: لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٣٥)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ .. وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُۚ ..(٢٣٥) ﴾.

واتە وە بزانن كە خوا دەزانێ چی لە سینەتاندا هەیە، لەبەر ئەوە لێی وریا بن ئاگادار بن، (شتێك مەخەنە سینەتان كە خوا پێی ناخۆش بێ).

---

(١) مقاييس اللغة، ج٢، ص ٣٧.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ١٤٩.

**دووەم:** لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٤٩)دا، خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ:

﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ... ﴿٤٩﴾ ﴾.

واتە: وە بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، دادوەرییان لەنێواندا بکەو، شوێن ئارەزووەکانیان مەکەوە، وە لێیان وریابە لە بەشێك لەوەی خوا بۆتۆی ناردۆتە خوار، لات نەدەن.

**سێیەم:** خوا لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (١٢٢)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

واتە: وە بڕواداران بۆیان نیە تێکڕا دەربچن بۆ جەنگ و جیهاد، (یاخود تێکڕا دەربچن بۆ ئەوەی کە بەدوای زانستدا بڕۆن)، بەڵکو با لەهەر کۆمەڵێکی زۆریان کۆمەڵێکی کەمیان دەربچن، بۆ ئەوەی لە ئاییندا شارەزا بن، وە دوایی خەڵکەکەیان هۆشیار بکەنەوە (وە بترسێنن لە سزای خوا) کە گەڕانەوە لایان، بۆ ئەوەی وریا بن و تووشی هەڵەو پەڵە نەبن.

**چوارەم:** هەروەها خوا عز وجل لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٩٢)دا دەفەرموێ:

﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُوا۟ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٩٢﴾ ﴾.

واتە: وە فەرمانبەریی خوا بکەن و فەرمانبەری پێغەمبەر بکەن، وە وریا بن، ئەگەر پشتتان هەڵکرد ئەوە بزانن، کە پێغەمبەری ئێمە تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشکرای لەسەرە.

کەواتە: دوایی خۆتان بەرپرسیارن، هەر کات پێغەمبەری خوا پەیامی خوای بەڕوونیی تێگەیاندن، ئەوە خۆتان بەرپرسیارن.

**پێنجەم:** وە لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٧١)دا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعٗا ﴿٧١﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وریای خۆتان بن، (یان وریایی خۆتان وەربگرن، وەك وریایی چەكێك بێ، لەخۆتی ببێچی)، كۆمەڵ كۆمەڵ دەربچن (بۆ جەنگ) وە تێكڕاش دەرچن.

**شەشەم:** پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەكی دا، باسی لەخۆ وریایی دەكاو دەفەرموێ:

{إِنَّ الشَّيطان حَسَّاسٌ لحَّاس، فَاحذَرُوهُ عَلى أَنفُسِكُم، مَنْ بَاتَ وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ فَأَصَابَهُ شَيْءٌ فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ} أخرجه الترمذي برقم (١٨٥٩)، وقال: غريب، والحاكم برقم (٧١٢٧)، وقال: صحيح على شرط الشيخين، وتعقبه الذهبي في التلخيص قائلا: بل موضوع، فإن يعقوب بن الوليد كذبه أحمد والناس، وأخرجه أيضًا: البغوي في الجعديات برقم (٢٨٣٧)، قال الألباني: موضوع.

بەڵام سەبارەت بەبەشی دووەمی فەرموودەكە:

{مَنْ بَاتَ وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ فَأَصَابَهُ شَيْءٌ فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ}

ئەلبانیی دەڵێ: (صحیح)ە، هەروەك لە (صحيح سنن الترمذي)دا ئاماژەی پێكردوە.

واتە: شەیتان زۆر هەستیارە، وە زۆر دەمیش دەخاتە شتەوە، یان شت دەلێسێتەوە، لێی وریابن، هەركەسێ خەوت و چەوریی گۆشتی بەدەستەوە بوو، ئەگەر شتێكی تووش بوو، با جگە لەخۆی لۆمەی كەس نەكا.

ڕەنگە زیندەوەرێك بەبۆنی ئەو گۆشتەوە بێت و پێیەوە بدات، یاخود لەوانەیە زیانێكی ڕووحیی هەبێ لەلایەن شەیتانەكانەوە.

**حەوتەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{لَا يَبْلُغُ الْعَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُتَّقِينَ، حَتَّى يَدَعَ مَا لَا بَأْسَ بِهِ، حَذَرًا لِمَا بِهِ الْبَأْسُ}

أخرجه الترمذي برقم (٢٤٥١) وقال: حسن غريب، وابن ماجه برقم (٤٢١٥)، والطبراني برقم (٤٤٦)، والحاكم برقم (٧٨٩٩) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي برقم (١٠٦٠٢)، قال الألباني : ضعيف.

واتە: بەندە ناگاتە ئەو پلەیەی لە ڕیزی پارێزکاراندا دابنرێ، هەتا هەندێ شت کە هیچ گرفت و ئیشکالێکی تێدا نیە، واز لێنەهێنی وەك وریا بوون، لە ترسی ئەو شتانەی دیکە کە گرفت و ئیشکالیان تێدا هەیە.

واتە: بەشێکیش لەو شتانەی کە ڕەوان، چاوپۆشییان لێدەکا، بۆ ئەوەی تووشی قەدەغەکان نەبێ، نەك بەشێك لە حەرامیش بداتە بەرێ، بەبیانووی ئەوەی کە ڕەوایەو حەڵاڵە.

دوازدەیەم

## بەدەمار بوون (العِزّة)

(إبن فارس) دەڵێ:{العِزّة مَصدر قَولِهِم: عَزَّ يَعِزُّ عِزّاً وعِزةً مِن مادّة (ع، ز، ز) الَّتي تَدُلُّ عَلى شِدّةٍ وَقوّة وَما شابَهَهُما من غَلَبَةٍ وَقَهر، وَأَرض عَزازٌ: أَي صَلْبة، والعِزُّ خِلافُ الذُّلّ، وَقالَ الراغِب: (العِزَّة حَالَةٌ مانِعَة لِلإِنسانِ مِن أَن يُغْلَب}[1].

دەڵێ: (العزة) چاوگە لەوەوە هاتوە، کە دەگوترێ: (عزَّ، يَعِزُّ، عِزّاً، عِزّة)، (عزَّ) واتە: عەزیز بوو، لەو سێ پیتەوە هاتوە (ع، ز، ز) کە ئەم ماددەیە دەلالەت لەسەر هێزو توندیی دەکا، واتە: وێنەی ئەو دوو مانایە لە زاڵ بوون و خستنە ژێر ڕکێفی خۆ، بنچینەی ئەو مانایەش لەوەوە هاتوە کە دەگوترێ: {(أرض عَزاز) أي: صَلبَة} زەوییەکی پتەو ئەگەر هەڵنەکەنرێ، پێی دەگوترێ: (أرض عَزاز)، ئینسانیش ئەگەر پتەو بوو، مانای وایە خاوەنی عیززەتە، بۆیە دەڵێ: (العِز خِلافُ الذل) عیززەت پێچەوانەی زەبوونییە، (عِزّ) واتە: بەدەمار بوون، (ذلّ) واتە بێ دەماریی.

وە (راغب الأصفهاني) دەڵێ: عیززەت حاڵەتێکە ڕێ لە ئینسان دەگرێ، کە کەسێ بەسەریدا زاڵ بێ و بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

**چەند دەقێك وەك نموونە دەهێنینەوە سەبارەت بە عیززەت:**

**یەکەم:** لە سوورەتی (المنافقون) ئایەتی (٨)دا خوای باڵادەست دەفەرموێ:

---

(١) المقاييس ج٤ ص٣٨، وراغب الأصفهاني- مفردات ألفاظ القرآن ص ٣٣٢.

﴿...وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ ..﴿٨﴾﴾.

واتە: عیززەت هی خوایە، هی پێغەمبەرەكەیەتی، هی بڕوادارانە.

یانی: وەك چۆن خوا، وە پێغەمبەرەكەی خاوەن عیززەتن، ئیمانداریێكیش كە شوێنكەوتووی ئەو پێغەمبەرە بێ و بەندەی ئەو خوایە بێ، دەبێ چاو لەوان بكات و، ئەویش لەقەدەر خۆی عیززەت و بەدەماریی و پتەویی لەخۆیدا بهێنێتە دی.

دووەم: هەروەها خوا لە سووڕەتی (فاطر) ئایەتی (١٠)دا دەفەرمویێ:

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ ...﴿١٠﴾﴾.

واتە: هەركەسێ عیززەتی دەوێ، عیززەت هەمووی هی خوایە، وشەی پاك بەرەو خوا بەرز دەبێتەوە، وە كردەوەی چاك دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی.

كەواتە: بەهۆی ئیمان و خوا بەیەكگرتنەوە، ئینسان عیززەتی لەلای خوای پەروەردگار دەست دەكەوێ، وە ئیمان و تەوحیدیش، دەبێ كردەوەی باشی لەگەڵدا بێ، ئنجا بەرز دەبێتەوە بۆ لای خوای كارزان.

■ سێزدەیەم ■

# ئیرادە بەهێز بوون، بە بڕشت بوون (العَزم)

لە زمانی عەرەبییدا وشەی (عَزم، عَزيمة) عەزیمەت، پێم وایە لە کوردیدا دەبێتەوە بە بڕشت بوون، خاوەنی ئیرادەی بەهێز بوون.

(إبن فارس) دەڵێ: {العَزْمُ: مصدر قولهم (عَزَمَ، يَعْزِمُ) من مادّة (ع، ز، م)، الَّتي تَدُلُّ عَلى الصَّرِيمَةِ والقَطع، يُقالُ: عَزَمْت عليْكَ إلاَّ فَعلْتَ كَذا}[1].

واتە: وشەی (العَزْمُ) چاوگی ئەو قسەیانە، کە دەڵێ: (عَزَمَ، يَعْزِمُ) ئەویش لەو سێ پیتەوە هاتوە: (ع، ز، م)، کە بڕین و، بڕشت و، بەردەوام بوون لەسەر شتێك دەگەیەنێ، دەگوترێ: (عَزَمْت عليكَ إلاّ فَعلْتَ كَذا)، واتە: جەختت لێ دەکەمەوە، کە ئەو کارە هەر ئەنجام بدەی.

(راغب الأصفهاني) دەربارەی پێناسەی عەزم دەڵێ: {العَزمُ: عقْدُ القَلبِ عَلى إمضاءِ الأَمرِ}، واتە: عەزم: بریتیە لە دڵ دامەزران لەسەر جێبەجێ کردنی کارێك.

**خوای پەروەردگار لەچەند شوێنێك باسی عەزیمەتی کردوە، بۆ وێنە:**

**یەکەم:** لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٥٨)دا دەفەرموێ:

---

(١) مقاييس اللغة، ج٤- ص ٣٠٨.

﴿ .. فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾.

واتە: هەركاتێ عەزمت كرد (واتە: دڵی خۆت ساغ كردەوە) بڕیاری تەواوت دا، ئەوە پشت بەخوا ببەستە، بێگومان خوا ئەوانەی خۆشدەوێ، كە پشتی پێ دەبەستن.

**دووەم:** لە سووڕەتی (الأحقاف) ئایەتی (٣٥)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ .. ﴿٣٥﴾ ﴾.

واتە: خۆڕاگر بە، وەك چۆن خاوەن عەزمەكان لە پێغەمبەران خۆڕاگر بوون[1].

---

(١) هەندێ لە زانایان گوتویانە پێغەمبەرانی خاوەن عەزم پێنجن: (نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا، موحەممەد) (علیهم الصلاة والسلام)، بەڵام وەك لە كتێبی (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) لە باسی پێغەمبەراندا باسم كردوە، ئەو ڕایە ڕاست نیە، بەڵكو هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) خاوەنی عەزم بوون، بەڵام دەگونجێ بڵێین: ئەو پێنجەیان لە عەزیمەت و بە بڕشتییدا لەسەرەوەی هەموویانەوە بوون، بێگومان مادام بە بڕشت بوون، سیفەتێكی بەرزو پەسندەو، پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لێبێ)، ڕازاوە بوون بە هەموو سیفەتێكی بەرزو پەسند، كەواتە: ناگونجێ هیچ پێغەمبەرێك خاوەن عەزم نەبووبێ، ئەو ئایەتەش كە خوای پەروەردگار لەبارەی ئادەمەوە دەفەرموێ: ﴿ .. فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ ﴾ طه، واتە: (ئادەم) لەبیری چوو، وە عەزممان پێوە نەبینی.

ئەو ئایەتە مەبەستی ئەوەیە، كە ئادەم (سەلامی خوای لێبێ)، لەو هەڵوێستەدا بەم شێوەیە بووە، دەنا بەتەئكید ئادەمیش پێغەمبەرێكی پایە بەرزی خوایەو، وەك هەموو پێغەمبەرانی دیكە، خاوەنی عەزیمەت بووە، بەڵام خوای كاربەجێ مەبەستی پێ هەڵوێست و ڕەفتارێكی دیاریی كراوە، بۆیە دەبێ ئاوا ورد بینەوە، ئەگەرنا هەر لەخۆوە بڵێین: پێغەمبەرانی (أول العزم) پێنجن، ئەدی ئەوانی دیكە عەزمیان نیە؟! نەخێر، بەڵكو كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: لەبیری چوو وە عەزممان پێوە نەبینی، واتە: لەو هەڵوێستەدا كە لەبیری چوو، خاوەنی عەزم نەبوو، نەك لە هەموو هەڵوێستەكانی دیكەی دا، چونكە خوای زاناو شارەزا، پێغەمبەرانی خۆی لەنێو هەموو مرۆڤایەتیدا هەڵبژاردوون، ئنجا ئەگەر بەعەزم بوون سیفەتێكی بەرزو گەورە بێ، ئەوە بەتەئكید هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، پشك و بەشیان لەو سیفەتەدا هەبووە، بەڵام هەیانە پشكی زیاتری بووەو، هەیانە كەمتر.

سێیەم: لە سوورەتی (الشورى) ئایەتی (٤٣)دا خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴿٤٣﴾﴾.

واتە: وە هەركەسێ كە خۆڕاگر بێ و چاوپۆشیی بكا {لە كەسێ كە نەفامیی بەرانبەر دەكا} ئەوە بێگومان ئەو {خۆڕاگریی و چاوپۆشی كردن لە نەفامان}ە، لەو كارانەیە كە پێویستیی بە بڕشت و بەئیرادەیەكی بەهێز دەكا.

هەڵبەتە: لێرەدا خوای بەبەزەیی لەگەڵ ئیمانداراندا دەدوێ، كەواتە: نەك هەر پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، خاوەنی عەزم بوون، بەڵكو دەگونجێ ئیماندارانیش خاوەنی عەزم بن.

■ چـواردەیەم ■

# بەتەنگ کەرامەتەوە بوون (الغَيرة)

(الغَيرة)، لە کوردەواریی خۆماندا وشەی غیرەت بەکار دەهێنن بۆ ئازایەتیی، دەگوترێ: (پیاوێکی بە غیرەتە) واتە: ئازایە، بەڵام (الغَيرة) واتایەکی دیکەی هەیە لە زمانی عەرەبیدا.

(إبنُ فارس) دەڵێ: {الغَيرة: مَصدَر قَوْلِهِم غِرْتُ عَلى أَهلي غَيْرَةً، مِن مادّة (غ، ي، ر) الَّتي تَدلُّ عَلى صَلاحٍ وَإِصلاحٍ ومنْفَعةٍ}[1]، واتە: (غَيرة) چاوگی ئەو قسەیەیە، کە دەڵێ: (غِرْتُ عَلَى أَهلي غَيرَة) واتە: بەتەنگ ماڵ و خێزانی خۆمەوە بووم، بەتەنگ ناموسی خۆمەوە بووم، کە ئەویش لە (غ، ی، ر)ەوە هاتوە کە ئەصڵی ماددەکە چاکیی و چاکسازیی و سوود گەیاندن دەگەیەنێ.

(الكَفَوي) دەڵێ:{(الغَيرة): كراهَةُ شَراكةِ الغَيرِ في حقِّهِ}[2]، واتە: ( غەیرە) ئەوەیە کە ئینسان پێی ناخۆش بێ، کە کەسێکی دیکە لە شتێکدا کە تایبەتە بە خۆیەوە بەشدار بێ، بەتایبەت بە نسبەت هاوسەرەوە، ئافرەتانیش (غَيرة)یان هەیە بەرانبەر پیاوەکانیان، پێیان ناخۆشە چاویان لە ئافرەتی دیکەوە بێ، وە بەپێچەوانەشەوە: پیاویش بەهەمان شێوە پێی ناخۆشە، کە کەسێکی دیکە چاوی لە خێزانی بێ، یان خێزانی چاو ببڕێتە کەسێکی دیکە، ئەوە پێی دەگوترێ

---

(١) مقاييس اللغة - إبن فارس - ج٤ ص ٤٠٢.

(٢) الكليات - ص ٦٧١.

(الغَيرة)، بەڵام چەمكی (الغَيرة) فراوانتریشە، چونكە هەر شتێك تایبەت بێ بەتۆوەو، پێت ناخۆش بێ كەسێكی دیكە چاوی تێبڕێ و تەماعی تێبكا، ئەوە پێی دەگوترێ: (غَيرة)، وە ئەو سیفەتەش وەك سیفەتەكانی دیكە سیفەتێكی بەرزو پەسندەو سیفەتێكی بنەڕەتییە.

دیارە لە قورئاندا وشەی (غَيرة) نەهاتوە، بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویستدا (صلى الله عليه وسلم) باسی (غَيرة) كراوە، بۆ وێنە:

**یەكەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ، وَإِنَّ الْمُؤْمِنَ يَغَارُ، وَغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ عَلَيْهِ}، أخرجه أحمد برقم (١٠٩٦٣)، والبخاري برقم (٤٩٢٥)، ومسلم برقم (٢٧٦١)، والترمذي برقم (١١٦٨)، وقال: حسن غريب، وأخرجه أيضًا: ابن حبان برقم (٢٩٣)، وأبو يعلى، برقم (٥٩٩٨).

واتە: بێگومان خوای بەرز غەیرەی هەیە، وە بڕواداریش غەیرەی هەیە، غەیرەی خواش ئەوەیە، كە ئیماندار شتێك بكا، كە خوا لێی قەدەغە كردوە، {واتە: خوا پێی ناخۆشە}.

**دووەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{الْمُؤْمِنُ يَغَارُ وَاللَّهُ أَشَدُّ غَيْرًا} أخرجه مسلم برقم (٢٧٦١)، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (٧٢٠٩)، وابن حبان برقم (٢٩٢)، والديلمي برقم (٦٥٥٨).

واتە: ئیماندار غەیرەی هەیە، وە خوا زیاتر غەیرەی هەیە.

خوا (سبحانە و تعالی) ئەو شتانەی پێویستی كردوون، پێی ناخۆشە بچوێنرێن، وە ئەو شتانەی قەدەغەی كردوون، پێی ناخۆشە بشكێنرێن، خوا غەیرەی هەیە بەرامبەر بە واجبەكان و قەدەغەكان، چونكە دەزانێ بەندەكانی بەرژەوەندییان لەوەدایە گوێڕایەڵیی ئەو بكەن، ئەو شتانەی پێویستی كردوون، جێبەجێیان بكەن، وە ئەو شتانەی قەدەغەی كردوون، خۆیان لێ دوور بگرن، هەروەك ئیماندار دەبێ بە غەیرە بێ و، بەتەنگ كەرامەتیەوە بێ، خوای پەروەردگاریش بەندەكانی خۆی خۆشدەوێت و بەتەنگیانەوەیە.

■ پـــازدەیەم ■

# دوور بینیی و
# گورج و گۆڵیی (الحَزم)[1]

زانایان بەم شێوەیە پێناسەی (الحَزم)یان کردوە: {الحَزْمُ: مَصدرٌ مِن قَولِهِم: (حَزَمَ فُلان أَمْرهُ حَزْماً)، حَزَم، يَحْزُمُ، حَزْماً، وَحزامَةً، وَرَجُلٌ حازِمٌ وحَزيمٌ}[2].

واتە: (الحَزم) چاوگێکە لەو قسەیەوە هاتوە، کە دەگوترێ: (حَزَمَ فُلان أَمْرهُ حَزْماً)، واتە: کاری خۆی توندو تۆڵ کرد، ورد بینی تێدا کرد، (حَزَم، يَحْزُمُ، حَزْماً، وَحَزامَةً) لەوە هاتوە، کەسێکی توندو تۆڵ و دوور بین و گورج و گۆڵ، کە ئیشی خۆی چاك کۆنترۆڵ کردوە.

پێناسەیەکی دیکە بۆ (الحَزم) دەڵێ: {الحَزم: ظبطُ الإنسانِ أَمرَهُ والأَخْذُ بِهِ بِالثِقة}[3] واتە: حەزم بریتیە لەوە، کە ئینسان کاری خۆی توند بگرێ و کۆنترۆڵی بکا، وە دووربینیی تێدا بکا، وە بەتەمای خەون و خەیاڵ و خۆزگە خواستن، لێی نەگەڕێ، بەشێوەیەك کاری خۆی بکا، کە جێگای متمانە بێ.

(إبن منظور) دەڵێ: {الحَزم: ضبْطُ الرَّجُلِ أَمرَهُ والحَذَر مِن فَواتِهِ، وَفي حَديث

---

(١) دیارە من وشەی (الحَزم)م بە توندو تۆڵیی و دوور بینیی مانا کردوە.

(٢) المنجد ص١٣١.

(٣) مختار الصحاح، ص١٣٤.

الوَتْرِ أَنَّهُ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم قالَ: لأَبو بَكرٍ رضي الله عنه: (أَخَذْتَ بِالحَزم)}[1]، واتە: حەزم بریتیە لەوە کە ئینسان کاری خۆی ڕێکبخات و توندو تۆڵ بیگرێ، وە لێی وریا بێ کارەکەی لەدەست نەچێ، وە لە فەرمووودەیەکدا کە باسی نوێژی وەتر دەکا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە ئەبو بەکری[2] (خوا لێی ڕازی بێ) فەرمووە: {ئیشی خۆت بە توندو تۆڵیی و دووربینیی گرتوە}.

هەر (إبن منظور) دەڵێ: لە فەرمووودەدا هاتوە کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کراوە: {ما الحَزم؟} فَقالَ: أَن تَستَشيرَ أَهْلَ الرَّأيِ وَتُطيعَهُم} واتە: پرسیاری لێکراوە: حەزم چییە؟ فەرموویەتی: ئەوەیە کە ئەوانەی خاوەن عەقڵن، ڕاوێژیان پێ بکەی، دوایی بەقسەیان بکەی، {لەشتێکدا کە دەیپێکن}.

دیارە وشەی (حِزام)یش یانی: پشتێن هەر لەوەوە هاتوە، وە ئەو کەژووو قەیاسەش کە وڵاخی پێ تەنگە دەکەن و توندی دەکەن، ئەوەش هەر پێی دەگوترێ: (حِزام)، بە کوردیی کەژوو، قەیاسە.

- ئایا وشەی (عَزْم) وە (حَزْم) جیاوازییان چییە؟

(حَزم) ئەوەیە تۆ پێش ئەوەی کارەکە بکەی، خۆتی بۆ ئامادە بکەی، دوور بینیی بکەی، خۆت توندو تۆڵ بکەی، بەڵام (عَزم) ئەوەیە لەکاتی ئەنجامدانی کارەکەدا، خاوەن عەزیمەت و بە بڕشت بی، کارەکەت بگەیەنیە سەرو پاشە کشە نەکەی، بۆیە گوتراوە: {قَد أَحْزِمُ لَو أَعْزِمُ} واتە: حەزمم دەبێ، ئەگەر عەزمم هەبێ، واتە: جاری واهەیە دەزانم دوور بینیی لەکارەکەدا بکەم و، خۆم گورج و گۆڵ دەکەمەوە، بەڵام دوایی عەزیمەتم نابێ لەسەری بڕۆم.

---

(١) لسان العرب - ج٣ - ص ١٥٦.

(٢) دیارە ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: من پێش ئەوەی بخەوم، نوێژی وەتر دەکەم.

با چەند وێنەیەك دەربارەی (حَزْم) بهێنینەوە:

یەکەم: لە پەنددا[1] هاتوە، دەڵێ: {مِنَ الحَزْمِ سُوءُ الظَّنِّ} واتە: لە توندو تۆڵیی و دووربینییە کە ئینسان جار جارە گومانی خراپ بێ، لە شوێنێکدا کە خەڵکێك شایستەی گومانی خراپ پێ بردن بن، دەبێ گومانت بەرانبەریان خراپ بێ، چونکە ئەگەر گومانت بەرانبەریان چاك بێ، کڵاوت لەسەر دەنێن، قوڵت دەبڕن، هەڵت دەخەڵەتێنن، ئەوەش پێچەوانەی دووربینیی و گورج و گۆڵییە.

دووەم: گوتراوە: {فُلانٌ أَحْزَمُ مِن الحَرباء}[2] واتە: فلان کەس {لەسەر کارەکەی خۆی هێندە زاڵەو وای توندو تۆڵ کردوەو دووربینە} وەك (حَرْباء) وایە {کە فێڵی لێ ناکرێ و بەتەڵەو داوەوە نابێ}.

لێرەش کۆتایی بە توێژینەوەی ئەو پازدە (١٥) ڕەوشتە بنەڕەتییە دێنین، کە مرۆڤ لە خودی خۆیدا دەیانهێنێتە دی، بەڵام وەك چەند جارێکی دیکەش گوتمان: ئەو پازدە ڕەوشتە، هەم پەیوەندییان هەیە بە مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا (سبحانە و تعالی)، وە هەم پەیوەستن بە مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ خەڵکیشدا، واتە: ئەو پازدە ڕەوشتە، خاڵی هاوبەشن لەنێوان مامەڵە لەگەڵ خودو خواو خەڵکدا.

---

(١) هەندێکیان بە فەرموودەیان داناوە، بەڵام پێناچێ فەرمووده بێ، فەرموودەناسانیش بەمجۆرە قسەیان لەبارەوە کردوە: {أخرجه القضاعي برقم (٢٤)، قال: المناوي (٤١٢/٣): قال العامري في شرحه: صحيح، وأقول : فيه علي بن الحسن بن بندار، قال الذهبي في ذيل الضعفاء: اتهمه ابن طاهر، أي بالوضع، وبقيه، وقد مر ضعفه، والوليد بن كامل قال في الميزان: ضعفه أبو حاتم والأزدي، وقال البخاري: عنده عجائب، قال العجلوني (٤٢٥/١): ضعيف}.

(٢) جۆرە باڵندەیەکە ڕەنگی خۆی دەگۆڕێ بەپێی ئەو شوێنەی لێیەتی، بۆ وێنە: ئەگەر لەسەر درەختێکی سەوز بێ، ڕەنگی خۆی سەوز دەکا، وە ئەگەر لەشوێنێکی خۆڵەمێشیی بێ، ڕەنگی خۆی خۆڵەمێشیی دەکات و بەردەوام بەپێی کات و شوێن خۆی دەگۆڕێ.

# ڕێ خۆشکردن

مەبەستمان لە ئاکارە مەعنەوییەکان، ئەو ڕەوشت و ئاکارو خەسڵەتە بەرزانەن، کە مرۆڤ مامەڵەیان پێ لەگەڵ خوای تاك و پاکدا دەکات، ئنجا وەك پێشتر گوتمان: سەرجەم ئەو خەسڵەت و ئاکارە بەرزو پەسندانەی کە پێویستە ئینسانی مسوڵمان خۆییان پێ بڕازێنێتەوە، لە بواری مامەڵە کردن لەگەڵ خوای مەزن و بەرزدا، بەپێی لێکۆڵینەوەی من، سەرجەمیان شەست و حەوت (٦٧)ن، هەڵبەتە دەگونجێ زیاتر بن، بەڵام من ئەوەندەم کەوتنە بەرچاو، ئنجا سەرەتا هەموویان سەرژمێر دەکەین، پاشان سەرو تیشکیان دەخەینە سەر.

ئەو شەست و حەوت (٦٧) ڕەوشت و ئاکارە بەرزو جوانەی کە ئینسانی مسوڵمان پێویستە خۆییان پێ بڕازێنێتەوە، لە مامەڵە کردن لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، ئەمانەن:

١- ناسینی خوا (مَعرِفَةُ الله).

٢- بڕواهێنان بەخوا (الإيمانُ بِالله).

٣- تەسلیم بوون بۆ بەرنامەی خوا (الإستسلام).

٤- خوا بەیەکگرتن (توحيدِ الله).

٥- خوا پەرستیی (العِبادة).

٦- ساغ کردنەوەی پەرستن بۆ خوا (الإخلاص).

٧- پاڕانەوە (الدُّعاء).

٨- پارێزکاریی (التَّقوى).

٩- دڵنیایی (اليَقين).

١٠- خۆ یەكلا كردنەوە لە پەرستندا (التَّبَتُّل).

١١- هۆكار گرتنە بەرەو خوا (التوَسُّل).

١٢- خۆ وەنزیك خستن لە خوا (التقرُّب).

١٣- خۆشویستنی خوا (المَحَبّة).

١٤- خۆ پەناگرتن بەخواو دەست پێوە گرتنی (الإعتصامُ بِالله).

١٥- لەخوا ترسان (الخَوفُ مِن الله).

١٦- سام كردن لە خوا (الخَشية مِنَ الله).

١٧- بیم هەبوون لە سزای خوا (الرَّهبَة مِن الله).

١٨- مل كەچیی لە دەروونەوە بۆ خوا (الخُشُوع لِلّه).

١٩- ملكەچیی ڕواڵەتیی و جەستەیی بۆ خوا (القُنُوت لله).

٢٠- گەردن كەچیی پەنهانیی و ئاشكرا بۆ خوا (الإخباتُ لله).

٢١- ئومێدەوار بوون (الرّجاء).

٢٢- لاڵانەوەو كڕووزانەوە لە خوا (التضرُّع لِلّه).

٢٣- چاودێریی كردنی خواو، هەستكردن بە چاودێریی خوا (مُراقَبة الله).

٢٤- خۆپارێزیی لە حەڕام (الوَرع).

٢٥- تامەزرۆیی بەرەو خوا (الرّغبة إلى الله).

٢٦- شادمان بوون بەبەخشش و بەزەیی خوا (الفَرَح بِرَحمة الله وبِفَضله).

٢٧- گێڕانەوەی هەموو كارەكان بۆ ویستی ڕەهای خوا (إرْجاعُ الأُمور كُلِّها إلى مَشيئة الله).

٢٨- زۆر یادی خوا كردن (الذكرُ الكَثير).

٢٩- چاك بوون (الصَّلاح).

٣٠- ڕاكردن بەرەو خوا (الفِرارُ إلى الله).

٣١- خێرایی کردن لە چاکاندا (المُسارعة في الخَيرات).

٣٢- بەدوورگرتنی خوا لە هەر کەم و کورتییەك (التَّسبيح).

٣٣- بەپاك گرتنی خوا لەهەر هەڵەو پەڵەیەك (التَّقديس).

٣٤- ستایش کردنی خوا (التَّحْميد).

٣٥- بەگەورە گرتنی خوا (التَّكبير).

٣٦- بەمەزن گرتنی دروشمەکانی خوا (تَعْظيم حُرُماتِ الله).

٣٧- پاراستنی سوێند (حِفظُ اليَمين).

٣٨- گوێ بۆ خوا گرتن (السَّمع).

٣٩- فەرمانبەریی کردنی خوا (الطاعة).

٤٠- پەنا بەخوا گرتن (الإستعانة بِالله).

٤٢- داوای چاکەو ڕێنمایی لە خوا کردن (الإستخارة).

٤٣- پشت بەخوا بەستن (التَّوكُّل عَلى الله).

٤٤- سوپاس کردنی خوا (الشُّكرُ لِله).

٤٥- بە وردیی لە فەرمایشتی خوا تێگەیشتن (الفِقهُ عَنِ الله).

٤٦- وەرگرتنی ڕێنمایی خوا (الإهتداءُ بِهُدى الله).

٤٧- دەست گرتن بە کتێبی خواوە (الإستِمساكُ بِكتابِ الله).

٤٨- شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (الإتِّباع لِرسولِ الله (صلى الله عليه وسلم)).

٤٩- پابەندیی بەبەرنامەی خواوە (الإلْتزامُ بِشَريعة الله).

٥٠- دۆستایەتیگرتن لەگەڵ خواو دۆستەکانی و، دووریگرتن لە دوژمنەکانی (الوَلايةُ مَع اللهِ وَأوليائِهِ، والبَراءة مِن أَعدائِه).

٥١- خوێندنەوەی کتێبی خوا (تِلاوة كِتابِ الله).

٥٢- گوێ گرتن لە کتێبی خوا (الإستماعُ لِكتابِ الله).

٥٣- حوکم کردن بە کتێبی خوا (الحُکم بِکتابِ الله).

٥٤- شەریعەتی خوا کردنە دادوەر (التَّحاکمُ إلى شَریعة الله).

٥٥- گەیاندن و ڕوون کردنەوەی بەرنامەی خوا (تَبلیغ وتبیین)

٥٦- بانگەواز کردن بۆ لای خوا (الدَّعوة إلى الله).

٥٧- بیرکردنەوە لە دروستکراوی خوا (التَّفَکُّر في خَلْقِ الله).

٥٨- تێوەڕامانی کتێبی خوا (التَّدَبُّر في کِتابِ الله).

٥٩- پەند لێوەرگرتنی کتێبی خوا (التَعبُّر بِکتابِ الله).

٦٠- لەگەڵ خۆدا تێکۆشان (مُجاهدة النَّفس).

٦١- داوای لێبوردن لەخوا کردن (الإستغْفار).

٦٢- لەناخەوە بەرەو خوا بادانەوە (الإِنابة).

٦٣- گەڕانەوە بۆ لای خوا (التَّوبة).

٦٤- دڵ ئارام بوون بەخوا (الطمأنینَة بِالله).

٦٥- کاری خۆ سپاردن بەخوا (تَفویضُ الأُمورِ إلى الله).

٦٦- لەخوا ڕازی بوون (الرِّضا عَنِ الله).

٦٧- خواستنی ڕەزامەندیی خوا (إبتغاءُ رِضوانِ الله).

بەڵێ، ڕەوشتە مەعنەوییەکان:

ئەم شەست و حەوت (٦٧) ڕەوشتە، ئەو ئاکارە بەرزو پەسندانەن، کە ئینسانی مسوڵمان دەبێ مامەڵەیان پێ لەگەڵ خوای بەرزو بڵندا بکات.
ئێستاش سەرو تیشکیان دەخەینە سەرو پێناسەیان دەکەین:



## ناسینی خوا (مَعرِفَةُ الله)

بێگومان بناغەی هەڵس و کەوت و مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ هەرکەسێك و هەر شتێکدا، بریتیە لە ناسینی ئەو شتە، یان ئەو کەسە، بەچاکیی، وەك گوتراوە: {الحُكمُ عَلى شَيءٍ، فَرْعٌ عَن تَصَوّرِهِ}، واتە: تاکو شتێك وێنا نەکەی و نەیناسی، ناتوانی حوکمی بەسەردا بدەی.

(**الجرجاني**) دەربارەی وشەی (مَعرِفة) دەڵێ: {إدراكُ الشَّيءِ عَلى ما هوَ عَلَيْه، وهي مَسبوقَةٌ بِنِسيانٍ حاصِلٍ بَعدَ العِلمِ، ولِذلِكَ يُسَمّى الحَقُّ تَعالى بِالعالِمِ دونَ العارِفِ}[1]، واتە: مەعریفەت بریتیە لە ناسینی شتێك وەك خۆی کە لە واقیعدا هەیە، وە وشەی مەعریفەت لەبیرچوونی پێش دەکەوێ، لەدوای ئەوەی شتێکت زانیوە دوایی لەبیرت چۆتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە خوای مەزن بە (عالم) ناودەبرێ، بەڵام بە (عارف) ناو نابرێ، چونکە زانیاریی خوا بێ سنوورەو لەبیرچوونی پێش ناکەوێ.

(**الفيروز آبادي**) دەربارەی وشەی مەعریفەت دەڵێ: {المَعرفة: إدراكُ الشَّيءِ بِتَفكُّرٍ وتَدَبُّرٍ لِأَثَرِهِ يُقال: فُلان يَعرِف الله، لأنَّ مَعْرِفَةَ البَشَرِ لِله، إنَّما هيَ بِتَدَبُّرِ آثارِهِ دونَ إدراكِ ذاتِهِ، وَهيَ أَخَصُّ مِنَ العِلم}[2]، واتە: مەعریفەت ئەوەیە کە تۆ

---

(١) التعريفات - ص٣٣٦.

(٢) بصائر ذوي التمييز - ج٤، ص ٤٧.

شتێك بزانی بەهۆی تێوەڕامان و سەرنج دانی شوێنەوارەكانی، دەگوترێ: فڵان كەس خواناسە، چونكە ناسینی بەشەر بۆ خوا، بەهۆی تێوەڕامان و سەرنج دانی شوێنەوارەكانیەوەیە، نەك بەهۆی دەرك كردنی حەقیقەتی زاتی خوا، وە وشەی مەعریفەت لە عیلم تایبەت ترە.

(**الكَفوي**) دەڵێ: {مَعرفةُ اللهِ عَزّ وجَل بِالدّليلِ الإجمالي، فرضُ عَينٍ لا مَخْرجَ عنْهُ لِأَحدٍ مِنَ المُكلَّفين وَهي: بِتفْصيل فَرضُ كِفايةٍ لا بُدَّ أَن يَقومَ بهِ البَعْضُ}[1]، واتە: ناسینی خوای پایە بەرز بەبەڵگە بەشێوەی كورت، فەڕزی عەینەو دەبێ هەموو كەس خوای خۆی بەبەڵگە بناسێ، وە هیچ كەسێك لە مرۆڤەكان لەو تەكلیفە ناچنە دەرێ، بەڵام بەشێوەی تەفصیلْ و بەشێوەی ورد {كە بەرپەرچی نەیاران بداتەوە} ئەوە فەڕزی كیفایەیەو دەبێ هەندێكیان پێی هەڵسن.

**ئنجا با دەربارەی ناسینی خوا، هەندێ دەق بەوێنە بهێنینەوە:**

**یەكەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاریی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسی كردوەو فەرموویەتی:

{احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ أَمَامَك، تَعَرَّف إِلى اللهِ في الرَّخَاءِ يَعْرِفُكَ في الشَّدّة} أخرجه الطبراني برقم (١١٢٤٣)، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (٢٨٠٤). قال شعيب الأرنؤوط: صحيح.

واتە: خوا بپارێزە خوا دەتپارێزێ، خوا بپارێزە لەپێش خۆتەوە دەیبینی، لە فەرحانییدا خوا بناسە، خوا لەتەنگانەدا دەتناسێ.

**دووەم:** هەر لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش دەهێنینەوە:

{عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذًا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَلَى الْيَمَنِ قَالَ: إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ عِبَادَةُ اللَّهِ، فَإِذَا عَرَفُوا اللَّهَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ

---

(١) الكليات - ص ٨٢٥.

خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذَا صَلَّوْا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ غَنِيِّهِمْ، فَتُرَدُّ عَلَى فَقِيرِهِمْ، فَإِذَا أَقَرُّوا بِذَلِكَ، فَخُذْ مِنْهُمْ وَتَوَقَّ كَرَائِمَ أَمْوَالِ النَّاسِ} أخرجه البخاري برقم (١٣٩٨) ومسلم برقم (١٩).

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاریی موعازی کردوە لە کاتێکدا کردیە بەرپرسی یەمەن، فەرموویەتی: دەچی بۆ لای کۆمەڵێك، کە ئەوانە خاوەن کتێبن، با یەکەم شتێك کە تۆ لێیان داوا دەکەی بریتی بێ لەبەندایەتیی بۆ خوای بەرزو بالاّ، ئنجا هەرکاتێ خوایان ناسی، هەواڵیان پێ بدە کە خوا لە هەر شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، دوایی باسی زەکات دانیش دەکا، کەواتە: هەنگاوی یەکەم بۆ مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ خوادا، بریتیە لە ناسینی خوا.

سێیەم: هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا فەرموویەتی:

{إِنَّ أَتْقَاكُمْ وَأَعْلَمَكُمْ بِاللَّهِ أَنَا} أخرجه البخاري برقم (٢٠).

واتە: بە دڵنیایی پارێزکارترینتان و زاناترینتان بەخوا منم.

ئنجا شایەنی باسە کە بناغەی ئیمان بەخوا، ناسینی خوایە، لەو بارەشەوە هەڵەو پەڵەی زۆر لە کتێبەکانی عەقیدەدا هەن، هەربۆیەش من لە کتێبی: (الإسلامُ كَما يَتَجَلّى فِي كِتابِ الله) بەرگی یەکەمم تەرخان کردوە بۆ ناسینی خوا، بەم ناوونیشانە: (الإسلام مَعْرِفَةٌ صَحيحَةٌ بِالخالِقِ والخَلْق) واتە: ئیسلام پێش هەموو شتێك ناسینێکی ڕاست و دروستی خواو دروستکراوەکانی خوایە، وە لە بەرگەکانی دیکەدا باسی ئیمانم کردوە، وە باسی بەرهەمی ئیمانم کردوە، کە پابەندییە بە شەریعەتەوە، لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵگاو دەوڵەت.

وەباسم کردوە کە پانتاییەکی زۆر لە قورئاندا بۆ ناسینی خوا تەرخان کراوە، بۆ وێنە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ

﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٥٤﴾ الأعراف.

واتە: بێگومان پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بەشەش ڕۆژ {واتە: بەشەش قۆناغ} هێناونە دی، پاشان چۆتە سەر عەرش، بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بەخێرایی بەدوایدا دەڕوا، وە خۆرو مانگ و ئەستێرەکان، هەموویان بە فەرمانی خوا ڕام و دەستەمۆ کراون، ئاگادار بن! دروستکراو بەس هی خوایە، {بەس خوا دروست دەکا}، فەرمانیش هەر هی خوایە، بەرزیی و پایەداریی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

بەڵێ ناسینی خوا، بەو شێوەیە کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوە، هەنگاوی یەکەمی مامەڵەی ڕاست و دروستە لەگەڵ خوادا، بۆیەش ئێمە کردمان بەیەکەمین ڕەوشت لەو شەست و حەوت (٦٧) خەسڵەت و ڕەوشتە بەرزو پەسندەی، کە دەبێ ئینسانی مسوڵمان مامەڵەیان پێ لەگەڵ خوادا بکا.

■ ٢ ■

## بڕواهێنان بەخوا (الإِيمانُ بِالله)

دوای ئەوەی كە ئینسان خوای ناسی، كە لە خاڵی یەكەمدا باسمان كردو گوتمان: مامەڵە كردن لەگەڵ هەر شتێكدا، ئەگەر لەسەر بناغەی ناسین و زانیاریی و ئاشنا بوونی نەبێ بەو شتە، مامەڵەیەكی ناڕێك و نادروست دەردەچێ، بۆیە یەكەمین هەنگاوی پێویست بۆ مامەڵە كردنی بەندە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بریتیە لە ناسینی خوا (سبحانه و تعالى)، ئنجا پاش ناسینی خوا، هەنگاوی دووەم و ئاكاری هەرە پێویست بۆ مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ خوادا، بریتیە لە بڕواهێنان بەخوا (الإِيمان بِالله)، ئنجا دیارە ئەگەر ئێمە بمانەوێ بە تێرو تەسەلیی پێناسەی ئیمان بكەین، ئەوە كاتێكی زۆرمان دەوێ[1].

**زانایان گوتوویانە:** {الإِيمان: الإِيقانُ بِالجَنان، وَالإِقرارُ بِاللِّسان، وَالعَمل بِالأَركان}، واتە: ئیمان بریتیە لە قسەی دڵ و قسەی زمان، وە كردەوەی دڵ و كردەوەی ئەندامەكان، مەبەستیان لە (قسەی دڵ) واتە: زانین و دان پێداهێنانی دڵ، وە مەبەستیان

---

(١) بۆ ئاشنا بوونی زیاتر بە مەسەلەی ئیمان و پایەكانی، سەیری كتێبی: {(الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) بەرگەكانی: ٢ و٣ و٤ و٥، لە چاپی یەكەمدا، وە كتێبی: {ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی} هەر شەش بەرگەكەی، هەروەها: شەرحی: {عەقیدەی (طەحاویی)} بكە.

لە (قسەی زمان)یش دیارە دەربڕینی زمانە، وە مەبەستیان لە (کردەوەی دڵ) خۆشویستنی دڵ و پەسەند کردنی ئەو شتانەیە، کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، وە مەبەستیان لە (کردەوەی ئەندامەکان) جێبەجێ کرنی ئەو شتانەیە کە ئیمان دەیانخوازێ، کە زانایان زۆربەی هەرە زۆریان دەڵێن: کردەوە بەشێکی پێکهێنەری ئیمانە.

هەندێ لە زانایانی دیکە گوتوویانە:{الإيمان: الإيقانُ بِالجَنان، وَالإقرارُ بِاللِّسان، وَالعَمل بِالأَركان}، واتە: ئیمان بریتیە لە قەناعەت هێنانی بە دڵ، وە دان پێداهێنانی بە زمان، وە کردەوە بە ئەندامەکان.

**دەتوانین بە کورتی بڵێین: ئینسان چوار هێزی هەن، ئیمان پەیوەندیی بە هەرکام لەو چوار هێزەی ئینسانەوە هەیە:**

- هێزێکی هەیە شتی پێ دەزانێ، کە بریتیە لە: (عەقڵ).

- هێزێکی دیکەی هەیە کە شتی پێ دەوێت، یان ڕەفزی دەکات، کە بریتیە لە: (دڵ).

- وە هێزێکی دیکەی هەیە، هێزی دەربڕین کە بریتیە لە: (زمان)، یاخود نووسین.

- وە هێزێکی دیکەی هەیە، هێزی جێبەجێکردن، کە ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە: (کردەوەی ئەندامەکان)دا.

**ئنجا ئیمان پەیوەندیی بە هەر کام لەو چوار هێزەی ئینسانەوە هەیە:**

١- دەبێ سەرەتا بە عەقڵ، دەرکی ئەو شتانە بکەی کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، وەك خوای پەروەردگار، فریشتەکان، پێغەمبەران، کتێبەکان، ڕۆژی دوایی، قەزاو قەدەر، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست، وەك ئەوەی شەریعەت گوتوویەتی، دەرکیان بکەی و بیانزانی.

٢- پاشان بە دڵ، ئەو شتانەت خۆش بوێ و پەسندیان بکەی و بۆیان ملکەچ بی.

٣- پاشان بە زمان، دان بەو شتانەدا بێنی کە بەعەقڵ دەرکت پێ کردوون و پەسندت کردون.

٤- بە ئەندامەكانیش، بەو شێوەیە مامەڵە بكەی كە ئەو حەقیقەتانەی، كە لە عەقڵ و دڵدا جێگیر بوون و بە زمان دانیان پێدا هێنراوە، دەیخوازن.

بۆیە من دەڵێم: {الإيمانُ يَنبوعُ الفَضائِلِ كُلِّها، كَما أَنَّ الكُفرَ مَصدرُ الرَّذائِل كُلِّها}.

واتە: ئیمان سەرچاوەی هەموو سیفەتە بەرزو پەسەندەكانە، هەروەك چۆن كوفریش چاوگی هەرچی سیفەتی پەست و خراپە.

**با سەرنجی چەند دەقێك بكەین، دەربارەی ئیمان:**

**یەكەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بەوە كە ئیمان تەنیا شتێك و دوو شت نیە، فەرموویەتی:

{الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَستُّونَ شُعْبة، (وَفِي رِوايةٍ: بِضْعٌ وَسَبْعونَ) أَفْضَلُهَا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ} أخرجه البخاري برقم (٩)، وابن حبان برقم (١٦٧). وأخرجه أيضًا: البيهقي في شعب الإيمان برقم (١).

واتە: ئیمان شەست و ئەوەندە (لە ڕیوایەتی دیكەدا حەفتاو ئەوەندە) بەشەیە، بەرزترینی، یان چاكترین بەشی، بریتیە لە گوتنی: (لا إله إلا الله)، {دیارە دەبێ بە قەناعەت و بە دڵەوە ئەوە بڵێ، ئنجا گەورەترین بەشی ئیمانە، ئەگەرنا ئەگەر قەناعەتی نێو دڵ نەبێ، نەك هەر بەشێك نیە لە ئیمان، بەڵكو نیشانەی نیفاقە}، وە بچووكترین بەشی ئیمان، بریتیە لە لادانی ئازارێك لەسەر ڕێگا، وە شەرم و شكۆش بەشێكە لە ئیمان[1].

**دووەم:** بەڵگە لەسەر ئەوە كە ئیمان سەرچاوەی هەموو ڕەوشتە بەرزو پەسندەكانە، زۆرن، لە بابەتەكانی پێشوودا ئاماژەمان بە زۆرێكیان دا، یەكێك لەوانە لە سەرەتای سوورەتی (المؤمنون)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

---

(١) هەندێ لە زانایان هەوڵیان داوە، كە هەموو ئەو شەست و ئەوەندە، یاخود حەفتاو ئەوەندە بەشەی ئیمان دیاریی بكەن، بۆ وێنە: (البیهقی) كتێبێكی هەیە بەناوی (شِعب الإیمان)، كە (١٥) بەرگەو بە تەفصیل باسی ئەو بەشانەی ئیمانی كردوە، بە ئیجتیهادی خۆی، هەمووشی لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەكانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم).

﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾.... ﴾.

پێشێ باسی ئیمان دەکا، دەفەرموێ: بەڕاستی بڕواداران سەرفرازن، ئەوانەی کە لەنوێژەکانیاندا بۆ خوا ملکەچن، ئەوانەی کە پشت لە قسەی پووچ دەکەن، ئەوانەی کە خۆیان تەزکیە دەکەن، {یاخود زەکات دەدەن}، ئەوانەی کە داوێنی خۆیان دەپارێزن، هتد...

سێیەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە کە ئینسان تاکو ئیمانی باشتر بێ، خوورەوشتی بەرزو پەسندو باشتر دەبێ، فەرموویەتی:

{أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ} أخرجه الترمذي برقم (١١٦٢) وقال: حسن صحيح، وابن حبان برقم (٤١٧٦) والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٢٧). قال الألباني: حسن صحيح، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح وهذا إسناد حسن.

واتە: ئیمان تەواوترینی بڕواداران، ڕەوشت جوانترینیانن، {واتە: کێ ڕەوشتی جوانتر بێ، ئیمانی تەواوترە}، وە باشترینتان ئەوانەتانن، کە باشترن بۆ هاوسەرەکانیان {لەگەڵیاندا لێبوردەو بە حەوصەڵەن}.

ئنجا پێشتریش باسمان کرد، کە ئیمانی قووڵ و دامەزراوو تێرو تەواو، تاعەت و عیبادەتێکی باشی لێوە پەیدا دەبێ، تاعەت و عیبادەتی چاکیش و بۆخوا صوڵحانیش، لەگەڵ خەڵکدا گونجانی لێ پەیدا دەبێ، هەمیشە لەگەڵ خەڵکدا گونجان و تەبابوون، بەرهەمی بۆ خوا صوڵحانە، بۆیە گوتراوە: {لەو کەسە بترسە، کە لە خوا ناترسێ}، ئەگەر ئینسان ترسی خوای لەدڵدا هەبوو، شەرم و شکۆی هەبوو بەرانبەر بەخوا، خۆشەویستیی هەبوو، لەخوا نزیك بوو، بەتەئکید ناتوانێ سنوورەکانی دەورو بەری ببەزێنێ و لەبەر خوا خۆی لە زیان گەیاندن بە بەرانبەرەکانی دەپارێزێ.

دیارە دەشگونجێ مرۆڤی بێ بڕواو نامسوڵمانیش، هەندێك ڕەوشت و ئاكاری جوانی هەبن، بەڵام هەر چۆن بێ، ڕەوشت و ئاكاری بەرزو جوان، پشتیوانەیەكی مەعنەویی هەر هەیە، لە فیترەتی ساغ و عەقڵی سەلیم، ئەگەر مرۆڤەكە بێ بڕوابێ، یاخود وێڕای عەقڵ و فیترەت - كە خوا بەهەموو مرۆڤەكانی داون - جۆرێك لە عەقیدەی خوایی و ئاسمانییش، ئەگەر مرۆڤەكە ئاییندار بێ.

بەڵام بێگومان بەبێ ئیمان و عەقیدەی ڕاست و ساغ - كە تەنیا لە ئیسلامدا هەیە - گشتگیریی و بەردەوامیی (شمولیة ودَیمومة) لە ڕەوشت و ئاكاری پەسندا نایەنە دی.

■ ٣ ■

## تەسلیم بوون بۆ بەرنامەی خوا (الإسلام)[١]

دەگونجێ ئیسلام بەزۆر شێوە پێناسە بكرێ، هەندێ لە زانایان گوتوویانە: {الإِسلامُ: إِظْهارُ القُبولِ والخُضُوعِ لِما أَتى بِهِ مُحَمَّدٌ صلى الله عليه وسلم، وقيلَ: إِظهارُ الشَّريعةِ والإِلتزامِ بِما أَتى بِه النَّبـيُّ صلى الله عليه وسلم}، واتە: ئیسلام بریتیە لە دەرخستنی قبووڵ كردن و ملكەچیی، بۆ ئەوەی كە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لەلایەن خواوە هێناویەتی (وەك ئایین)، وە گوتراوە: ئیسلام بریتیە لە دەرخستنی شەریعەت و پابەند بوون بەوەی، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەلایەن خواوە هێناویەتی.

با سەرنجی ئەم دەقانەی خوارەوە بدەین:

یەكەم: خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٩)دا، دەربارەی ئیسلام دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ .. ﴿١٩﴾ ﴾.

واتە: بەرنامە لەلای خوا، تەنیا ئیسلامە.

---

(١) لە كتێبی (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) ج٢، هەروەها لە كتێبی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی بەرگی یەكەمدا، بە تەفصیل باسی ئیسلامم كردوە.

ئیسلام یانی: ملکەچ بوون بۆ خوا، وە لەڕاستیدا ئیسلامەتیی، ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستە کراوە، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە هەر کەسێ بەڕاستی پابەند بێ بە قورئان و سوننەتەوە، ملکەچ دەبێ بۆ خوا، چونکە هەندێ کەس وا دەزانن وشەی ئیسلام، بەس بەو مانای ئیسلامەتییەیە کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، بەڵام نەخێر، ئەصڵی مانای ئیسلام واتە: ملکەچ بوون بۆ خوا، وە ئیسلامیش کە دوا پەیامی خوایە، بۆیە ناوی لێنراوە ئیسلام، چونکە وا لە ئینسان دەکا، کە بۆخوا ملکەچ بێ و بۆخوا تەسلیم بێ.

**دووەم:** لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٢)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەك بۆخوا شایستەیە پارێزی لێ بکەن، وە بە مسوڵمانەتیی نەبێ مەمرن، {یاخود بە ملکەچیی نەبێ مەمرن}. ئنجا ئایا مرۆڤ چۆن شێوەی مردنی خۆی دیاریی دەکا؟ شێوەی مردنت بەرهەمی شێوەی ژیانتە، هەرکەسێ بە مسوڵمانەتیی بژی، بە مسوڵمانەتییش دەمرێ، هەرکەسێ لە ژیانیدا بۆخوا ملکەچ بێ و پابەند بێ بە ئایین و شەریعەتی خواوە، دیارە ئینسان لەسەر ئەوە دەمرێ کە لەسەری ژیاوە، وەك گوتراوە: {يَمُوتُ الإنسانُ عَلى ما عاشَ عَلَيهِ} ئینسان لەسەر چی بژی، لەسەر ئەوەش دەمرێ، وە لەسەر چ شتێکیش بمری، لەسەر ئەوەش زیندوو دەکرێیەوە.

لەڕاستییدا ئەم ژیانی دنیایە لەگەڵ مردن و زیندوبوونەوەی دوارۆژدا، وەك سێ ئاڵقەی زنجیرێکن و هەموویان پێکەوە پەیوەستن، مردنەکەت و ژیانەکەی دواییت، دەرئەنجامی ژیانەکەی ئێرەتە، لێرە چۆن بی، هەم مردنەکەشت ئاوا دەبێ و، هەم لەسەر ئەوەش زیندوو دەکرێیەوە.

**سێیەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە پێناسەی ئیسلامدا، بەمانا عورفی و باوەکەی، دەفەرموێ:

{الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ} أخرجه أحمد برقم (٩٤٩٧)، والبخاري برقم (٥٠)، ومسلم برقم (٩)، وابن ماجه برقم (٦٤).

واتە: ئیسلام ئەوەیە، کە خوا بپەرستی و هیچ شتێك نەکەیە هاوبەشی، وە نوێژ بەرپا بکەی، وە ئەو زەکاتەی کە پێویست کراوە، بیدەی، وە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگری.

لێرەدا باسی حەجی نەکردوە، بەڵام دیارە لە فەرموودەکانی دیکەدا باسی حەجیش هاتوە، لەفەرموودەی دیکەدا هاتوە، کە دوایی باسی دەکەین، فەرموویەتی: ئیسلامەتیی لەسەر پێنج پایان بنیات نراوە، وەك دەفەرموێ:

{بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ} أخرجه أحمد برقم (٦٠١٥)، والبخاري برقم (٨)، ومسلم برقم (١٦)، والترمذي برقم (٢٦٠٩) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٥٠٠١)، وابن حبان برقم (١٥٨)، وأخرجه أيضًا: أبو يعلى برقم (٥٧٨٨)، وابن خزيمة برقم (٣٠٩)، والطبراني برقم (١٣٢٠٣)، والبيهقي برقم (٧٠١٣).

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایان بنیات نراوە:

**پایەی یەکەم:** شایەتمان بەوە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، وە بەوە کە موحەممەد نێرراوی خوایە.

**پایەی دووەم:** وە بەرپا کردنی پێنج نوێژەکان.

**پایەی سێیەم:** وە زەکات دان.

**پایەی چوارەم:** حەجی ماڵی خوا، (بۆ هەرکەسێ کە لەتوانایدا بێ).

**پایەی پێنجەم:** وە گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

■ ٤ ■

# خوا بەیەکگرتن (تَوحيدُ الله)

ڕەوشتی چوارەم لەو ڕەوشتە جوان و بەرزو پەسندانەی، کە پێویستە ئینسان خۆییان پێ برازێنێتەوە، لە بواری مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا، بریتیە لە خوا بەیەکگرتن (توحيد الله).

بەڵام وەك چۆن باسکردنی ئیمان و ئیسلام، پێویستی بە شوێنی تایبەتی خۆی دەکا، ئەگەر بمانەوێ بەتەواویی هەقی خۆی بدەینێ، بەهەمان شێوە: خوا بەیەکگرتنیش وردەکاریی زۆری هەیە، کە من لە کتێبی: {ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی} بەرگی دووەم و سێیەمم تەرخان کردوون بۆ باسی خوا بەیەکگرتن، لە هەرسێ بوارەکانی: بەدیهێنەرایەتیی، پەرستن، ناووسیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوادا، بۆ زیاتر بەهرەمەند بوون و شارەزا بوون لەو بابەتە گرنگ و پڕ بایەخ و هەستیارە، دەتوانی بگەڕێیتەوە سەریان، بەهەمان شێوە لە بەرگی دووی کتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا، دیسان باسی خوا بەیەکگرتنمان کردوە، خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتە بەناوبانگەکەیدا، کە (آية الكُرسي)ە، دەفەرموێ:

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا

يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة.

ئەو ئایەتە موبارەکە کە بە (آية الكرسي) بەناوبانگە، وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئەو ئایەتە لەڕووی نێوەڕۆکەوە گەورەترین ئایەتە لە قورئاندا[1]، لە دە (١٠) ڕستە پێك دێ، من لەبەرگی یەکەمی تەفسیرە کوردییەکەمدا: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) بەتەفصیلْ باسم کردوە، خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ: خوا، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، هەمیشە خاوەنی ژیان و زیندوویە، وە سەرپەرشتیارە، ... تاکو کۆتایی ئایەتە موبارەکەکە.

کەواتە: ئێمە دەبێ خوا بەیەکگرین، واتە: تەنیا خوا (سبحانه و تعالى) بەبەدیهێنەر، بەخاوەن، بەپەرستراو، وە بەخاوەنی ئەو ناوو سیفەتە هەرە بەرزو پەسندو چاکانە، بزانین، کە هەر شایستەی خوان، وە هیچ کام لە دروستکراوەکانی خوا، بە ژیاندارو بێ ژیانەوە، بە بینراوو نەبینراوەوە، بەبەرهەست و نابەرهەستەوە، نەهێنینە ڕیزی خوا، نە لەبەدیهێنەرایەتییدا، نە لە خاوەندارێتییدا، نە لەپەرستراوێتییدا، وە نە لە ناوو سیفەتەکانیشیدا، ئەو کات مانای وایە، ئێمە خوامان بەیەك گرتوە.



---

(١) رواه أحمد و مسلم .

■ ٥ ■

## خوا پەرستیی (العِبادة)

زانایان زۆر پێناسەیان بۆ خواپەرستیی (العِبادة) کردوون، بەڵام ڕەنگە کورت و پوختترینیان ئەو پێناسەیە بێ، کە دەڵێ: {العِبادَة إِسمٌ جامِعٌ لِكُلِّ ما يُحِبُّهُ اللهُ وَيَرضاهُ، مِنَ الأَقوالِ، وَالأَعْمالِ الظَّاهِرَة والباطِنة}[1]. واتە: خواپەرستیی ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی، کە خوا خۆشی دەوێن، وە لێیان ڕازییەو پەسندیان دەکا، لە قسان و، لە کردەوە پەنهان و ئاشکرایەکان.

**منیش ئاوا پێناسەی عیبادەتم کردوە**[2]: {العِبادةُ: إِفرادُ اللهِ تَعالى بِأَقْصى الحُبِّ، والتَّعْظيمِ، والخَشيةِ، والتَّسليمِ، والطَّاعة والتَّوكُّل}، واتە: عیبادەت بریتیە لە تاك کردنەوەی خوا، وە تایبەت کردنی خوای بەرز بە ئەوپەڕی خۆشویستن و، ئەو پەڕی بەگەورە گرتن و، لێترسان و بۆ ملکەچ بوون و گوێڕایەڵیی و، پشت پێ بەستن.

---

(١) ئەو پێناسەیە کۆمەڵێ لە زانایان هێناویانە، بۆ وێنە (إبن تيمية) لە کتێبی (العبودية) ص٥، ئەو پێناسەیەی هێناوە.

(٢) لە کتێبی: {خواپەرستی ئیسلامیی} بەرگی یەکەمدا بەتەفصیل پێناسەی عیبادەتم کردوە، هەروەها لە کتێبی: {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله} بەرگی دووو بەرگی شەشدا، بەتەفصیل باسی خواپەرستییم کردوە.

هەموو ئەو شتانە، ئەوپەڕەكەیانت تەنها بۆخوا بێ، چونكە دەگونجێ ئینسان جگە لەخوا شتێكی دیكەشی خۆش بوێ، شتێكی دیكەش بەگەورە بگرێ، وە بترسێ لە شتێكی دیكەش، وە فەرمانبەریی جگە لە خوای پەروەردگاریش بكا، بەڵام دەبێ فەرمانبەریی ڕەها، خۆشویستنی ڕەها، لێترسانی ڕەها، بەگەورەگرتنی ڕەها، بۆ ملكەچ بوونی ڕەهاو بێ سنوور، تەنها بۆخوا تبارك و تعالى بێ.

خوا (سبحانه و تعالى) لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٢١)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: ئەی خەڵكینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن كە ئێوەشی دروست كردووەو ئەوانی پێش ئێوەشی دروست كردووە، بەڵكو پارێز بكەن.

واتە: بەڵكو پارێز بكەن لە سزای خوا، لە تووڕە بوونی خوا، لە لێپرسینەوەی خوا، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ، كە بەهۆی بەندایەتییمانەوە بۆخوا، سیفەتی تەقوامان بۆ پەیدا دەبێ، وە یاخود دەپارێزرێین لەوەی، كە خوای پەروەردگار لێمان تووڕە بێت و سزامان بدا.

■ ٦ ■

## ساغ كردنەوەی
## پەرستن بۆ خوا (الإخلاص)

(**الكَفَوي**) دەڵێ: {الإخلاص: هِي القَصد بَالعِبادةِ إلى أَن يَعْبدَ المَعبودَ بِها وَحْدهُ، وقيلَ: تَصْفيةُ السر وَالقَولِ والعَمَل}[١]، واتە: ئیخلاص بریتیە لەوەی ئەو پەرستنەی ئەنجامی دەدەی، تەنیا پەرستراوی ڕاستەقینەی پێ بپەرستی، كە خوایە، وە گوتراوە: ئیخلاص بریتیە لە پاككردنەوەو بژار كردنی دڵ و قسەو كردەوە، لەبەشی جگە لە خوا.

وشەی (إخْلاص) لەسەر كێشی (إفْعالَ) (أَخْلَصَ يُخْلِصُ): واتە: ساغی كردەوە، ساغی دەكاتەوە، (مُخْلِص) واتە: ساغ كەرەوە، كەسێك كە كاری خۆی بۆ خوا ساغ كردۆتەوە، وە بەشی جگە لە خوای پەروەردگاری پێوە نەبێ.

**با لەو بارەوە سەیری ئەو دوو ئایەتە موبارەكە بكەین:**

**یەكەم:** خوا (سبحانه و تعالى) لە سورەتی (البَينة) ئایەتی (٥)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ .. ﴿٥﴾ ﴾.

---

(١) الكليات - ص٦٤.

واتە: وە فەرمانیان پێ نەكراوە، مەگەر بەوە كە خوا بپەرستن، وە ملكەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ بكەنەوە.

ساغ كردنەوەش ئەوەیە: پێوە نەمێنێ، بەشی جگە لە خوا، لە پەرستن و بەندایەتییاندا نەمێنێ.

دووەم: هەروەها خوای تاك و پاك لە سوورەتی (الزمر) ئایەتی (٢)دا دەفەرموێ:

﴿..فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢﴾.

واتە: بەندایەتیی بۆخوا بكەو ملكەچیی خۆتی بۆ ساغ بكەوە.

یانی: خۆتی بۆ یەكلا بكەوە، بەشێوەیەك كە خلّتەی شیرك و ڕیات پێوە نەبێ.



■ ٧ ■

## پـاڕانەوە (الدُّعاء)

دەربارەی تەنیا پاڕانەوە لەخوای بەخشەر، (الطيبي) وەك پێناسە کردنی دەڵێ: {هوَ إظهارُ غايةِ التّذلُّلِ وَالإفتقارِ إلى اللهِ وَالإسْتكانةِ لهَ}[1] واتە: پاڕانەوە بریتیە لەئەوپەڕی ملکەچیی و ئاتاجیی دەربڕین و کڕووزانەوە بۆ خوا.

هەڵبەتە پاڕانەوە لە جگە لە خوای پەروەردگار، دروست نیە، ئێمە لە سوورەتی (الفاتحة)دا دەخوێنین:

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾.

واتە: هەر تۆ دەپەرستین، وە تەنیا یارمەتیش لەتۆ دەخوازین، واتە: تەنیا لەتۆش دەپاڕێینەوە، زانایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: کاتێك بەرکار (مفعول به) پێش کارو بکەر (فعل و فاعل) دەکەوێ، کورت هەڵهێنان (الحصر) دەگەیەنێ، ئەگەر فەرمووبای {نَعْبُدكَ وَنَسْتَعينُك} واتە: تۆ دەپەرستین و داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین. کە ئەو کاتە دەگونجاو جگە لە خواش بپەرسترێ و پشتی پێ ببەسترێ، بەڵام کە دەفەرموێ: {إِيَّاكَ نَعْبُدُ} واتە: بەس تۆ دەپەرستین، {وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ} واتە: وە پشتیش بەس بەتۆ دەبەستین، مانای وایە جگە لەخوا، نابێ هیچکەس بپەرسترێ، وە جگە لەخوا نابێ هیچکەس داوای

---

(١) إبن حجر - فتح الباري - ج١١، ص ٩٥.

یارمەتی لێبکرێ، یانی: ئەو داوای یارمەتی کردنەی تایبەتە بەخواوە، ئەگەرنا کەسێك داوای یارمەتی دەکا: شتێکم بۆ بکە! یان یارمەتییم بدە! ئەوە جیاییە.

(إبن تيمية) دەڵێ: {الدُّعاءُ نَوعان: أَولاً: دُعاءُ العِبادةِ: وَهوَ الثَّناءُ عَلى اللهِ، وَثانياً: دُعاءُ المَسْألةِ: وَهوَ طَلَبُ ما يَنفَعُ الدَّاعي}[1]، واتە: پاڕانەوە لەخوا دووبەشە: پاڕانەوەی پەرستن، کە بریتیە لە مەدح و سەنای خواو ڕازو نیاز لەگەڵ خوا، (بێ ئەوەی شتێکی تایبەتی لێ داوا بکەی)، دووەمیان: بریتیە لە پاڕانەوەی داواکردن، بریتیە لەوەی شتێك لەخوا داوا بکەی، کە سوودت پێ دەگەیەنێ.

**دیارە خوا (سبحانە و تعالی) لە قورئاندا لەزۆر شوێندا باسی دوعای کردوە، بەتایبەت باسی دوعای پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، بۆ وێنە:**

**یەکەم:** لە سوورەتی (غافر) ئایەتی (٦٠)دا دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ .. ﴿٦٠﴾ ﴾.

واتە: وە پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە.

کە لێرەدا بە شێوەی مسۆگەریی (جزم) فەرموویەتی، واتە: بێگومان و بەجەخت لەسەر کردنەوە فەرموویەتی: وەڵامتان دەدەمەوە.

**دووەم:** هەر لە سوورەتی (غافر) ئایەتی (١٤)دا دەفەرموێ:

﴿ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ .. ﴿١٤﴾ ﴾.

واتە: لەخوا بپاڕێنەوەو ملکەچیی خۆتان بۆ خوا ساغ بکەنەوە.

شایانی باسیشە من لە تەفسیرەکەی خۆم، بەرگی شەشەم، لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف) لە کاتی تەفسیر کردنی ئایەتی (٥٥)دا، کە خوا (سبحانە و تعالی) باسی چۆنیەتی لەخوا پاڕانەوە دەکات، بەتەفصیل لەوێ دەربارەی لەخوا پاڕانەوەو ئەدەبەکانی، وە شێوازەکەی، قسەم کردوە، کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

---

(١) مجموع الفتاوى - ج١٧، ص١٠.

﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ۝٥٥ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٥٦ ﴾ الأعراف.

بۆیە خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەکەم و، لێرە بە هێنانەوەی چەند دەقێك وازدێنم.

لەو ئایەتەدا - واتە: ئایەتی ژمارە (١٤)ی (غافر)دا - خوا دەفەرمویٚ: لە خوا بپاڕێنەوەو ملکەچیی خۆتانی بۆ ساغ بکەنەوە، واتە: لەکاتێکدا لەخوا دەپاڕێیەوە، بەتەمای هیچ کەسی دیکەو هیچ شتی دیکە مەبە، ئەوجار مانای وایە تۆ بەڕاستی لەخوا پاڕاویەوە، وەك پێشتر ئەو قسەیەی (عەبدولقادری گەیلانیی)مان هێنا، کە دەڵێ: {كُن مَعَ الحَقِّ بِلا خَلق، وَمَعَ الخَلقِ بِلا نَفْس} واتە: لەگەڵ خوادا مامەڵە بکە، خەڵك مەهێنە نێوان، وە لەگەڵ خەڵکیشدا مامەڵە بکە، نەفسی خۆت مەهێنە نێوان.

**سێیەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی پاڕانەوە دەفەرمویٚ:

{الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ وَقَرَأَ: {وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ}} أخرجه أحمد برقم (١٨٤١٥)، وابن أبي شيبة برقم (٢٩١٦٧)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٧١٤)، وأبو داود برقم (١٤٧٩)، والترمذي برقم (٢٩٦٩) وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى برقم (١١٤٦٤)، وابن ماجه برقم (٣٨٢٨)، وابن حبان برقم (٨٩٠)، والحاكم برقم (١٨٠٢) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١١٠٥)، وأخرجه أيضًا: الطبراني في الصغير برقم (١٠٤١).

**زۆرێك زانایان گوتوویانە:** هەموو ئەو شتانەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووني، لەژێر ڕۆشنایی قورئاندا فەرمووني، لێرەدا با تەماشای فەرموودەکە بکەین، دەفەرمویٚ: پاڕانەوە یانی: خوا پەرستیی، ئنجا وەك بەڵگە هێنانەوە، ئەو ئایەتەی خوێندۆتەوە:

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ۝٦٠ ﴾ غافر.

واتە: وە پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە، بێگومان ئەوانەی لەبەرانبەر بەندایەتیی و پەرستنی مندا خۆیان بەزل دەگرن، بە زەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە.

تەماشای ئایەتەکە دەکەین، لەبەشی یەکەمی ئایەتەکەدا فەرموویەتی: (ٱدۡعُونِيٓ) لەبەشی دووەمیشدا فەرموویەتی: (عِبَادَتِي) کەواتە: کەسێك لەخوا نەپاڕێتەوە، مانای وایە پەرستنی بۆ خوا ئەنجام نەداوەو، لەبەرانبەر پەرستنی خوادا، خۆی بەزل گرتوە، کەواتە: دوعا بەمانای عیبادەتە.

**چوارەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر لەبارەی دوعاوە، فەرموویەتی:

{ادْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ} أخرجه الترمذي برقم (٣٤٧٩) وقال: حديث غريب، والحاكم برقم (١٨١٧)، وقال: مستقيم الإسناد، وتعقبه الذَّهَبِـيُّ في التلخيص بأن فيه صالح المري متروك، وأخرجه أيضًا: ابن أبي حاتم، كما في تفسير ابن كثير (٧٥/٤)، والطبراني في الأوسط برقم (٥١٠٩)، قال الألباني: حسن.

واتە: لەخوا بپاڕێنەوەو دڵنیابن لە وەڵام درانەوە.

بەڵێ، خوای پەروەردگار دوعای کەسێ وەردەگرێ، کە یەقینی هەبێ خوای بەخشەر وەڵامی دەداتەوە، ئنجا ئەوەش تەفصیلی هەیە، ئایا وەڵامدانەوەی خوا بۆ بەندە، مانای وایە هەرچی بەندە گوتی، یەکسەر بۆی جێبەجێ بکا؟ بەتەئکید نەخێر، بەڵکو خوای زاناو شارەزا بەو شێوەیەی کە خۆی پێی چاکە، وە لەو کاتەدا کە بۆخۆی پێی چاکە، وەڵام دەداتەوە، وەك لە خاڵی پێنجەمدا ڕوونی دەکەینەوە.

**پێنجەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا دەفەرموێ:

{مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ وَلَا قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إِلَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ بِهَا إِحْدَى ثَلَاثٍ: إِمَّا أَنْ تُعَجَّلَ لَهُ دَعْوَتُهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَصْرِفَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهَا} قَالُوا: إِذًا نُكْثِرُ، {قَالَ: اللَّهُ أَكْثَرُ} أخرجه ابن أبي شيبة برقم

(٢٩١٧٠)، وأحمد برقم (١١١٤٩)، وأبو يعلى برقم (١٠١٩)، والحاكم برقم (١٨١٦) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١١٢٨)، وأخرجه أيضًا: الطبراني في الأوسط برقم (٤٣٦٨)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده جيد.

واتە: هەركەسێ لەخوا بپاڕێتەوە بەدڵ، وە داواكارییەكەی تاوان نەبێ، وە پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی تێدا نەبێ، مسۆگەر خوا یەكێ لە سێ شتانی بۆ دەكا:

- یان ئەو شتەی دەیەوێ بۆی جێبەجێ دەكا، {بەڵام لەو كاتەدا كە خوا بەچاكی دەزانێ بۆی}.

- یان بە ئەندازەی ئەوە، خوا پاداشتی دەداتەوە لە دواڕۆژدا.

- یاخود هێندەی ئەوە، شتێكی نەخوازراوو خراپی لەسەر لادەبا.

**خوێنەرانی خۆشەویست!** گرنگ ئەوەیە ئێمە دڵنیابین لەوەی كە هەركاتێ دەستمان بۆ لای خوا بەرز كردەوەو داوامان كرد، خوای بەبەزەیی ئەو دەستانەمان بەخاڵیی ڕەت ناكاتەوە.

شەشەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێكی دیكەدا دەفەرمووێ:

{إِنَّ اللَّهَ حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحْيِي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ، أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا خَائِبَتَيْنِ}، أخرجه أبو داود برقم (١٤٨٨)، وابن ماجه برقم (٣٨٦٥)، وابن عساكر (٤٦٥/٥٨)، قال الألباني : صحيح.

واتە: خوا (سبحانه و تعالى) شەرمكارو بەڕێزە، شەرم دەكات پیاوێك دەستەكانی بۆ لای بەرز بكاتەوە، دەستەكانی بێ ئاكام و خاڵیی بهێڵێتەوە.

تۆ ئەگەر مرۆڤێك بەخشندە بێ، داوای لێبكەی، نائومێدت ناكا، چ جای خوا كە خاوەنی ئەوپەڕی كەڕەم و بەخشندەییە، بەڵكو كەڕەم و بەخشندەیی خوا، هەر بەراورد ناكرێ لەگەڵ هی دروستكراوەكانیدا، بگرە هەرچی كەڕەم و بەخشندەیی هەیە، زەڕڕەیەكە لەكەڕەم و بەخشندەیی خوا.

ئنجا ئەگەر مرۆڤ بەو یەقینەوە لەخوای بەخشەر بپاڕێتەوە، بەتەئكید خوای پەروەردگار یەكێ لەو سێ شتانەی پێ دەبەخشێ، بەڵام وەك گوتم: مەرج نیە ئەو شتەی بەندە دەیەوێ، خوای بەرزو مەزن هەمان شتی بۆ بكاو لەهەمان كاتدا بۆی بكا، چونكە جاری وا هەیە ئینسان داوایەك لە خوا دەكا، ئەگەر خوای كارزان بۆی جێبەجێ بكا، زەرەری لێ دەكا: دایك یان باب ڕقی لە منداڵەكەی هەڵساوە، یان كەسێ ڕقی لە كەسێكی دیكە هەڵساوە تووكی[1] لێ دەكا، بەڵام ئەگەر دوعایەكەی جێبەجێ بێ، دوایی پەشێمان دەبێتەوە، كەواتە: هیچ پاڕانەوەیەكی بەندە بە زایە ناچێ، بەڵام لەو كاتەداو بەو شێوەیەی، كە حیكمەتی خوا دەیخوازێ، بۆی جێبەجێ دەكا.



---

(١) نزای خراپ.



## پارێزكاریی (التقوی)[١]

(راغب الأصفهانـي): دەڵێ: {التَّقوى في تعارُفِ الشَّرعِ: حِفْظُ النَّفسِ عَمّا يُؤْثِم}[٢]، واتە: تەقوا لە زاراوەی شەرعدا بریتیە لە: خۆپاراستن لە هەرشتێكی گوناهباركەر.

دیارە هەم فەرمایشتی خوای بەرزو مەزن، هەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی تەقوا زۆر زۆرن، ئێمە لێرەدا ناتوانین هەقی خۆی بدەینێ، وە من لەبەرگی شەشەمی كتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا بەتەفصیل باسی تەقوام كردوە.

**بەڵام چەند دانەیەك دەهێنینەوە لەو ئایەت و فەرموودانە، بۆ وێنە:**

---

(١) من زیاتر لە بەرانبەر (تقوی)دا، وشەی پارێزكاریی بەكار دەهێنم، هەندێ گوتوویانە: پارێزگاریی، بەڵام وا نیە، چونكە پارێزگاریی لەبەرامبەر (حفظ)دا بەكاردێ، بەڵام پارێزكاریی واتە: كاری بەپارێز، واتە: تۆ بەشێوەیەك كار بكەی، كردەوەكانت پارێزیان تێدا بكەی، تێیاندا وریاو هۆشیار بی، لەوەدا كە بەپێی شەرع بن، وە لەوەدا كە ئیخلاص و تەنیا خوا پێ مەبەست بوونیان تێدابێ، وە لەوەدا كە پێی موعجەب و سەرسام نەبی، تووشی عوجب نەبی، ئەوە هەر كارێك ئاوابوو، مانا وایە پارێزی تێدا كراوەو هۆشیاریی و وریایی تێدا كراوە.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٨٨١.

**یەکەم:** خوای کاربەجێ لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٩٤)دا دەفەرموێ:

﴿...وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩٤﴾.

واتە: وە بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکارانە.

**دووەم:** لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٤)دا دەفەرموێ:

﴿...إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٤﴾.

واتە: بێگومان خوا پارێزکارانی خۆش دەوێن.

**سێیەم:** لە سوورەتی (الجاثیة) ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ:

﴿...وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩﴾.

وە خوا دۆست و پشتیوانی پارێزکارانە.

**چوارەم:** لە سوورەتی (القصص) ئایەتی (٨٣)دا دەفەرموێ:

﴿...وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ٨٣﴾.

واتە: وە بێگومان سەرەنجام بۆ پارێزکارانە.

بەکورتیی دەتوانین بڵێین: خوای کاربەجێ لە چەندان ئایەتی قورئاندا خێرو بەرەکەتی دونیاو دوارۆژی بەستۆتەوە بەتەقواوە.

**پێنجەم:** لە فەرمایشتێکدا هاتوە: {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَن أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ؟ {فَقَالَ تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ}،

أخرجه أحمد برقم (٩٦٩٤)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٢٩٤)، والترمذي برقم (٢٠٠٤) وقال: صحيح غريب، والحاكم برقم (٧٩١٩) وقال: صحيح الإسناد، وابن حبان برقم (٤٧٦)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٧٥٦)، وأخرجه أيضا: ابن ماجه برقم (٤٢٤٦).

واتە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کرا دەربارەی شتێك، کە زۆرترینیی خەڵك دەخاتە بەهەشت، یان چ شتێك لە هەموو شتێك زیاتر خەڵك

بەرەو بەهەشت دەبات؟، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: پارێز لە خوا، وە ڕەوشتی جوان، یانی: بۆ خوا صوڵحان، وە لەگەڵ خەڵکدا گونجان، یان: خوا پەرستیی و خەڵك دۆستیی.

ئەو دووە لە هەموو کردەوەو سیفەتەکانی دیکە زیاتر خەڵك دەبەنە بەهەشتەوە، دیارە هەر لەو فەرمایشتەشدا، بە پێچەوانەوە پرسیار کراوە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم): چ شتێك لە هەموو شتێك زیاتر خەڵك دەخەنە دۆزەخ؟ فەرموویەتی: زارو، داوێن، ئەو گوناهانەی بەزار دەکرێن، وە ئەو گوناهانەی بەداوێن دەکرێن، لەو دوو ڕێگەوە خەڵك زیاتر بەرەو دۆزەخ دەبرێن.

■ ٩ ■

## دڵنیـایی (الیقین)

(راغب الأصفهانـي) دەڵێ: {اليَقين: هوَ سُكونُ الفَهمِ مَع ثَباتِ الحُكم}[١]، واتە: یەقین بریتیە لەوە كە تێگەیشتنت ئارام بووبێ، وە بڕیاردانت چەسپاو بووبێ.

هەر كات لە بارەی مەسەلەیەكەوە ڕاوەستای و دوا بڕیاری خۆت لەو بارەوەدا، ئەوە پێی دەگوترێ یەقین.

(الكَفوي) دەڵێ: {اليَقين هوَ أَن تَعلَمَ الشَّيْءَ، ولا تتخيَّل خِلافَه}[٢]، واتە: یەقین بریتیە لەوەی تۆ شتێك بزانی، وە پێچەوانەی ئەو شتەی كە تۆ زانیوتە، ئەگەری بۆ دانەنێی. بۆ وێنە: ئێمە دەزانین ئێستا لە لای ئێمە ڕۆژە، ئەگەری بۆ دانانێین كە ئێستا شەو بێ، دیارە لێرە، ئەگەرنا كە لە شوێنێكی دیكەی دنیا شەوە، ئەوە جیایە، یان من یەقینم هەیە كە ئەوە كتێبێكە بەدەستمەوەو، دڵم بەلای ئەوەدا ناچێ، كە ئەوە دەفتەرێك بێ.

(الجرجانـي) دەڵێ: {اليَقين: إِعتِقادُ الشَّيْءِ بِأَنهُ كَذا مَع اعتقادِ أَنّهُ لا يُمْكِنُ إلاّ كَذا، مُطابِقاً لِلواقع غَيْرَ مُمْكنِ الزّوالِ}[٣]، واتە: یەقین بریتیە لەوە، كە بڕوات

---

(١) المفردات، ص ٥٥٢.

(٢) الكليات، ص ٦٧.

(٣) التعريفات، ص٢٥٩.

بەشتێك بێ، قەناعەتت بە هەبوونی شتێك بێ کە ئاوایە، وە قەناعەتیشت وابێ کە ناگونجێ ئاوا نەبێ، وە ئەوەش گونجاوبێ لەگەڵ واقیعدا، بەشێوەیەك کە نەتوانرێ نەگونجێ و لابچێ.

قەناعەتت ئەوەندە ڕۆچوو بێ، نەگونجێ لابچێ.

**لە قورئاندا باسی سێ جۆرە یەقین کراوە:**

أ- **علم اليقين:** ئەوەیە کە تۆ شتێك بەبەڵگە تێیدا دڵنیا بووبی.

ب- **عين اليقين:** ئەوەیە کە تۆ پێویستیت بەبەڵگە نەمابێ، بەچاوی دڵ و بەچاوی سەر بینیبت.

ج- **حق اليقين:** ئەوەیە کە چووبیە نێو ئەو شتەوە، یاخود لە حاڵی چێژتن، یان دەست لێدانی دابی.

بۆ وێنە: پێت دەڵێن لە فلان شوێن میوەیەك هەیە هێندەت بۆ باس دەکەن، دەگاتە ڕادەی تەواتور، وە دڵنیا دەبی ئەو میوەیە هەیە، با بۆخۆشت نەتبینیبێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (علم اليقين)، دوایی کە چووی میوەکەت بینی، ئەوە (عين اليقين)ە، ئنجا کە میوەکەت خوارد، ئەوە (حق اليقين)ە.

**چەند دەقێك لە بارەی (یقین)ەوە:**

یەکەم: خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الأنعام) ئایەتی (٧٥)دا، باسی ئەوەمان بۆ دەکا کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبی) ئەهلی یەقین بووە، دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾.

واتە: ئاوا بەو شێوەیە موڵکی فراوانی ئاسمانەکان و زەویمان پیشانی ئیبراهیم دەدا، بۆ ئەوەی لە دڵنیایان بێ، لە بڕوا پتەوان بێ، لەو کەسانە بێ کە یەقینیان هەیە بە پەروەردگارێتیی خوا.

**دووەم:** لە سوورەتی (المدثر) ئایەتەکانی: (٤٦و ٤٧)دا، خوای بەرزو مەزن لەسەر زمانی بێ بڕوایان لە دۆزەخدا دەفەرمویٚ:

﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾.

واتە: وە ئێمە پێشتر بێ بڕوا بووین بە ڕۆژی پاداشت و سزا، تاکو یەقینمان بۆ هات، واتە: تاکو مردنمان بۆ هات، ئنجا ئایا بۆچی بە مردن گوتراوە: یەقین، چونکە کەس گومانی نیە لەوە کە دەمرێ و، کاتێك دێ ئەو دنیایە بەجێ دەهێڵێ.

**سێیەم:** لە ئایەتی کۆتایی سوورەتی (الحجر)دا، خوا (سبحانه و تعالی) دەفەرمویٚ:

﴿ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾.

واتە: وە پەروەردگاری خۆت بپەرستە، تاکو یەقینت دەگاتە سەر.

لێرەشدا یەقین بەمانای مردنە[١].

---

(١) کاتی خۆی کۆمەڵێکی گومڕا هەبوو بەناوی (هەقە) گوتوویانە: پێویست ناکا ئەرکە شەرعییەکان جێبەجێ بکرێن، وە پێویست ناکا خۆمان لە قەدەغە کراوەکان بپارێزین، چونکە ئێمە گەیشتووینەتە یەقین، کە لەڕاستیدا ئەوانە کڵاویان لەسەر نراوە، ویستوویانە کڵاویش لەسەر خەڵك بنێن، ئەگەرنا هیچ کەس هێندەی پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم)، وە هیچ کام لە پێغەمبەرانی دیکەش (علیهم الصلاة والسلام) یەقینی نەبووە، بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست لە کۆتا نوێژدا کە دەیکا، دوو پیاو دەچنە بن باڵی کە عەبباس و عەلیین (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەو شێوەیەش نوێژە جەماعەتەکەی دەکا، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە لووتکەی یەقیندا بووە، ئەگەر یەقینی باشت هەبێ، ئەوجار خواپەرستیی باشتر دەکەی، نەك بە پێچەوانەوە.

■ ١٠ ■

## خۆ یەكلا كردنەوە لە پەرستندا (التَّبَتُّل)

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: {التَّبتُّل: الإنقطاعُ إلى اللهِ في العِبادة، وَإِخلاص النيّة انقِطاعَاً يَختَصُّ بِهِ}[1]. واتە: خۆدابڕین بۆ خوا لە پەرستندا، وە خۆساغ كردنەوە بەشێوەیەك كە هیچ شتێكی دیكەت لەدڵدا نەبێ.

(إبنُ مَنظور) دەڵێ: {البَتل: القَطع، وتَبَتَّل إلى الله، إنقَطَع وَأَخْلص}[2] واتە: (البَتل) بەمانای خۆدابڕین (القطع) دێ، خۆی بەلای خوادا دابڕی، خۆی لە هەموو شتێك دابڕی، خۆی بۆ خوا ساغ و یەكلا كردەوە،

**با چەند دەقێك بە نموونە بهێنینەوە لە قورئان و سوننەت، لەبارەی (تبتُّل)ەوە:**

یەكەم: لەسوورەتی (المزمل) ئایەتی (٨)دا، خوای تاك و پاك بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ناوی خوای پەروەردگارت باس بكە، وە خۆت بەلای ئەودا دابڕە (لە خوا پەرستییدا).

---

(١) المفردات، ص ٣٦.

(٢) لسان العرب، ج١، ص٦.

دووەم: لەو بارەوە ئەو فەرموودەیەش هەیە:

{عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ : رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لَاخْتَصَيْنَا}، أخرجه مسلم برقم (١٤٠٢)، وأحمد برقم (١٥٨٨)، والترمذي برقم (١٠٨٣)، قال الألباني: صحيح، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

واتە: سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا بەرپەرچی عوسمانی كوڕی مەظعوونی دایەوە، كە ڕێگای بدا بۆ (تَبَتُّل). {(تَبَتُّل): واتە: هەمیشە ژیانی بریتی بێ لە سەرگەرم بوون بەخوا پەرستییەوە، واز لە دنیاو ژیان و خەڵك و ماڵ و منداڵ بێنێ}، سەعد دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی ئەوی دابوایە، ئێمەش خۆمان دەخەساند. {بۆ ئەوەی پێویستییمان بە هاوسەرو پەیوەندیی جینسی حەڵاڵیش نەبێ}.

لێرەدا دەبێ لێمان تێكنەچێ، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگای نەداوە، عوسمان (تَبَتُّل) بكات واتە: لە هەموو ژیانیدا، بەڵام لەو شوێنەدا كە خوای زاناو دانا دەفەرموێ: (وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا) فەرمان بە پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) دەكا، كە (تَبَتّل) بكات، واتە: جار جار، لەكاتی خوا پەرستندا خۆت لەهەموو شتێكی دیكە داببڕە، بەڵام تۆ لە هەموو ژیانتدا خۆت لەهەموو شتێك داببڕی، ئەوە پێچەوانەی شەریعەتە، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی كردوە.

■ ١١ ■

## هۆكار گرتنەبەر
## بەرەو خوا (التوَسُّل)

(الجَوهَري) دەڵێ: {التَّوسُّل: التَّقرُّب وَالوسيلةُ ما تَقَرَّب بِهِ إلى الخَير، والجَمع الوُسْل والوَسائِل}[1] واتە: تەوەسسول یانی: خۆ وە نزیك خستن، وەسیلەش هەر شتێكە كە ئینسان پێی بەرەو خێرو چاكە دەچێ، وە كۆی (الوسيلة) (وُسل) و (وَسائِل)ە.

(راغب الأصفهاني) دەربارەی وەسیلە دەڵێ: {الوَسيلة: التوسُّل إلى الشَّيءِ بِرَغبَةٍ وَهي أَخَصُّ مِنَ الصِّلَة لِتَضَمُّنها مَعنى الرَّغْبة، وَحَقيقَةُ الوَسيلةِ إلى الله تعالى، مُراعاةُ السَّبيل بِالعِلم والعِبادة وَتَحريِّ مكارِمِ الشَّريعة}[2]. واتە: وەسیلە بریتیە لە بەئارەزووەوە بەرەو شتێك چوون، وە ئەوە تایبەت ترە لە (وصيلة)، چونكە وەصیلە ئەوەیە پێی بگەی بە ئامانجێك با بەئارەزووەوەش نەبێ، بەڵام وەسیلە مانای ئارەزوو مەندیی تێدایە، وە حەقیقەتی وەسیلە بۆلای خوای بەرز ئەوەیە، كە تۆ ڕێبازی خوا بە زانیاریی و بە پەرستن ڕەچاو بكەی، وە بزانی شەریعەت فەرمانی بەچی كردوە؟، ئەوە لەخۆتدا بهێنیە دی، ئەوە بریتیە لە گرتنەبەری هۆكار بەرەو خوا.

---

(١) الصِّحاح، ج٥، ١٨٤١.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٥٢٣، ٥٢٤.

با سەرنجی قورئانی بەرزو بەپێز بدەین، لەو بارەوە:

یەکەم: خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٣٥)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣٥ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لەخوا بکەن، وەهۆکاری بۆ لا بگرنە بەر، وە لەپێناویدا تێ بکۆشن، بەڵکو سەرفرازبن، کەواتە: وەسیلە دەبێ بگیرێتە بەر بەرەو خوا[1].

دووەم: لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٥٧)دا دەفەرموێ:

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ .. ٥٧ ﴾.

واتە: ئەوانەی کە ئێوە لێیان دەپاڕێنەوە (ئەی هاوبەش دانەرەکان!) ئەوانە کامەیان زیاتر لە پەروەردگار نزیکە، هۆکار بەرەو خوا دەگرێتە بەر، بۆ ئەوەی زیاتر لێی نزیك ببێتەوە.



---

(١) لە بەرگی چوارەمی: {تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز} لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا باسێکی تایبەتم لە بارەی (وسیلة)ەوە کردوە.

■ ١٢ ■

## خۆ وەنزیك خستن لە خوا (التقرُّب)

دیارە وشەی (قُرب) بەمانای نزیکیی دێ، (تقرُّب)یش کە لەسەر کێشی (تَفَعُّلَ)ە، یانی: خۆ وەنزیك خستن، ئینسانی مسوڵمان دەبێ هەمیشە هەوڵ بدا خۆی لەخواوە نزیکبخاتەوە، خۆ وە نزیکخستن لە خوا واتە: زیاتر پابەند بوون بە شەریعەتی خواوە، ئەگەرنا بێگومان ئێمە ناتوانین بەرەو خوا بچین، خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی، لەدەرەوەی دروست کراوەکانی خۆیەتی، لێرەدا مەبەست: خۆ وەنزیکخستنی مەعنەوییە، لە ڕەزامەندیی خوا نزیك بین، لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی شەریعەتەوە نزیکبین، وە دووربین لە هەرشتێ کە خوای پەروەردگار پێی ناخۆشە.

**با لەو بارەوەش دەقێکی قورئان بێنین:**

لە سوورەتی (العلق) ئایەتی (١٩)دا خوا (تبارك و تعالى) لە سیاقی چەند ئایەتێکدا، کە باسی یەکێ لە کافرە ملهوڕەکان دەکا، دەربارەی دژایەتییکردنی بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەکا دەفەرموێ:

﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ﴿١٩﴾ ﴾.

واتە: نەخێر بەقسەی مەکە (یاخود نەخێر ئەوەی ئەوان دەیڵێن، وانیە)، کڕنووش بۆ خوا ببەو لەخوا نزیك ببەوە.

کەواتە: ئێمە لەڕێی بەندایەتیی بۆ خواوە، وە لەڕێی خۆدوورگرتن لە فەرمانبەریی کردنی نەیارانی خواوە، وە کڕنووش بردن و ملکەچیی بۆ خواوە، لەخوا نزیك دەبینەوە.

■ ١٣ ■

## خۆشویستنی خوا (المَحبّة)

(إبن فارس) دەڵێ: {المَحبّة هِي الإسم مِنَ الحُبّ، وَكِلاهُما مَأْخوذٌ مِن مادَّة (ح، ب، ب)، الّتي تَدُلُّ عَلى اللُّزومِ وَالثَّبات}[1]، واتە: (مَحبّة) ناوە لە (حُبّ)وە هاتوە، وە هەردووکیشیان لە ماددەیەك وەرگیراون، کە لە سێ پیت پێك دێ: (ح، ب، ب) کە پەیوەست بوون و چەسپان دەگەیەنێ، کەواتە: تۆ کە خوای پەروەردگارت خۆش دەوێ، پەیوەست دەبی بەخواوەو چەسپاو دەبی، لەسەر خۆشەویستیی و بەندایەتیی کردنت بۆ خوا.

با تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین:

یەکەم: خوا (سبحانە و تعالى) لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (٣١)دا دەفەرموێ:

﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ .. ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن.

کەواتە: وەك پێشتریش باسمان کردوە: شوێن کەوتنی ئێمە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله علیە وسلم) بەڵگەیەکە، ئیسپاتی خۆشویستنی خۆمانی بۆ خوای پەروەردگار پێ دەکەین، وە هۆکارێکیشە خۆشویستنی خوای بۆخۆمان، پێ دەستەبەر بکەین.

دووەم: لەسوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٦٥)دا دەفەرموێ:

﴿ ... وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبّٗا لِّلَّهِۗ ... ﴿١٦٥﴾ ﴾.

---

(١) مقاييس اللغة، ولسان العرب، ج١، ص ٢٨٩- ٢٩٠.

واتە: ئەوانەی بڕوادارن، خۆشەویستییان بۆخوا زیاترە.

واتە: خۆشەویستییان بۆ خوا زیاترە لە خۆشەویستییان بۆ هەركەسێك و هەرشتێك، یاخود خۆشەویستیی ئەوان بۆخوای خۆیان، كە تاكە پەرستراوی بە حەقە، زیاترە لە خۆشەویستیی هاوبەشدانەرەكان بۆ ئەو شتانەو ئەو كەسانەی كە جگە لەخوا دەیانپەرستن، بەتەئكیدیش وایە ئەو خۆشەویستیی و مەحەببەتەی ئینسانی مسوڵمان بەرانبەر بەخوا دەچێتە دڵی، بەرانبەر بەهیچ شتێك ناچێتە دڵی، چونكە خوای پەروەردگار خاوەنی ئەو بوونەیە كە بەئێمەی داوە، خاوەنی هەرچی نیعمەتە، كە لەخۆمان و دەورو بەری خۆماندا دەیبینین، وە خوای بێ وێنە لە زاتی خۆیدا خاوەنی هەموو سیفەتی بەرزو بەڕێزو پەسندە، وە هیچ شتێك هاوتای خوا نیە، بۆیە خۆشەویستییەكیش، كە لەدڵی بەندەدا جێگیر دەبێ بەرانبەر بە خوا، ئەو خۆشەویستییە بەرانبەر بەهیچ شتێكی دیكە لە دروستكراوەكانی، ناچێتە دڵی بەندەوە.

سێیەم: لە سوورەتی (طه) ئایەتی (٣٩)دا خوای كاربەجێ لە سیاقی چەند ئایەتێكدا كە باسی مووسا (سەلامی خوای لێبێ) دەكا، دەفەرموێ:

﴿...وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي .. ﴿٣٩﴾﴾.

واتە: وە لەلایەن خۆمەوە خۆشەویستم كردبووی، لەلایەن خۆمەوە خۆشەویستیی خۆم خستبووە سەرتۆ.

دیارە لێرە باسی منداڵێتیی مووسا دەكا، كە لەماڵی فیرعەوندا بەخێو كراوە.

دەڵێن: مووسا هێندە منداڵێكی شیرین و دڵگیرو جوان بوو، هەركەسێ بینیویەتی خۆشیویستوە، بۆیە دەستیان نەچۆتێ بیكوژن، هەرچەندە گومانی خراپیان پێ بردوە، كە هی بەنی ئیسرائیل بێت و بەئاوێ دادرابێ، بەڵام خوای پەروەردگار وای شیرین و جوان كردبوو، دەستیان نەچۆیە بیكوژن، سەرەنجام ئەو مووسایەی لێدەرچوو، كە كۆتایی سەڵتەنەتی دیكتاتۆریەتی فیرعەون لەسەر دەستی ئەو هات[1].

---

(١) لە تەفسیرەكەی خۆم: {تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز} بەرگی (٤) لەكاتی

■ ١٤ ■

## پەناگرتن بەخوا و دەست پێوە گرتنی (الإعتصامُ بِالله)

(إبن فارس) لە پێناسەی وشەی (الإعتصام)دا دەڵێ: {(ع، ص، م) أَصْلٌ واحِدٌ صَحيح يَدلُّ عَلى إمساكٍ وَمنعٍ وَمُلازمةٍ، وَاعْتصمَ العَبدُ بِاللهِ تَعالى: إذا امْتَنع وَاستَعْصم، وَاستَعصم: إلْتَجأ، وَاعْتَصَم فُلان بِالله، إذا امْتَنَع بِه}[1]. واتە: پیتەکانی: (ع، ص، م) یەك بنچینەن، دەست گرتن بە شتێکەوە دەگەیەنن، وە ڕێگرتن لە شتێك دەگەیەنن، وە پەیوەست بوون بە شتێکەوە دەگەیەنن، بۆیە کە دەگوترێ: بەندە (إعتصام)ی بەخوای بەرزەوە کرد، واتە بەهۆی ئەوەوە خۆی لە مەترسییەکان پاراست، وە (استَعصم) واتە: پەنای پێگرت، (وَاعْتَصَم فُلان بِالله، إذا امْتَنَع بِه) بەهۆی خواوە خۆی پاراست لە شتەکانی دیکەو ڕێی گرت لە شتەکانی دیکە کە زیانی پێ بگەیەنن.

---

تەفسیرکردنی ئایەتی ژمارە (٥٤)ی سوورەتی (المائدة)دا، بەتەفصیل باسی ئەوەم کردوە، کە چۆن ئینسان خوای خۆش دەوێ، وە بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی کە خوا خۆشبویستریێ، کە هەندێ لە گرووپەکان (الفِرَق) بۆ وێنە: موعتەزیلە گوتوویانە: ناگونجێ ئینسان خوای خۆش بوێ، بەڵام لەڕاستیدا بەهەڵە داچوون، بەڵکو ئەو خۆشەویستییەی بەرانبەر بەخوا هەیە، بەرانبەر بە هیچ شتێکی دیکەو کەسێکی دیکە نابێ.

(١) مقاییس اللغة، ج١- ص٣٦١.

لەو بارەوەش ئەو دوو ئایەتە دەهێنین:

یەکەم: لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠١)دا، خوا (تبارك وتعالى) دەفەرموێ:

﴿...وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾﴾.

واتە: هەرکەسێ خۆی بەخوا بپارێزێ و پەنا بەرێتە بەر خوا، ئەوە ڕێنمایی کراوە بۆ ڕێیەکی ڕاست (یان خراوەتە سەر ڕێیەکی ڕاست).

دووەم: لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (١٧٥)دا، دەفەرموێ:

﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾﴾.

واتە: ئنجا ئەوانەی کە ئیمانیان بەخوا هێناوە، وە خۆشیان بەخوا پاراستوە، {دەستیان بەخوا گرتوەو، خۆیان پێ پاراستوەو چوونەتە ژێر پەنای خوا} ئائەوانە لەمەودوا خوا دەیانخاتە نێو بەزەیی و بەخششی خۆیەوە، وە لە دنیاشدا بەرەو ڕاستە شەقامی خۆی ڕێنماییان دەکات، (یان دەیانخاتە سەر ڕاستە شەقامی خۆی).

ئەوەش ڕەوشتێکی دیکەیەو، ئینسان دەبێ پشتی هەر بەخواوە بێ، هەڵبەتە ئەوە جیایە لە پشت بەخوا بەستن، ئەمە یانی: دەست بەخواوە بگرێ و خۆی بەخوا بپارێزێ، وە کاتێ بەندایەتیی بۆ خوا دەکا، پێی وابێ لە پەنایەکدایە، هیچ پەنایەك ئاوا نیەو، لە سێبەرێك دایە، هیچ سێبەرێك وەك ئەو سێبەرە نیە.

■ ١٥ ■

## لەخوا ترسان (الخَوفُ مِن الله)

(الجرجاني) دەربارەی پێناسەی (خَوف) دەڵێ: {الخوف: تَوَقُّعُ حُلُولِ مَكْروهٍ، أَو فَواتِ مَحْبوبٍ، وقيل: إِضطِرابُ القَلْبِ وحَركتهُ مِن تَذَكُّرِ المَخوف}[1]، واتە: (خَوف) بریتیە لەوە كە بۆ داهاتوو هەست بە مەترسییەك، بەزیانێك بكەی بێتە ڕێت، یاخود ترسی ئەوەت هەبێ شتێ كە خۆشت دەوێ، لەدەستت دەربچێ.

هەروەها لە پێناسەی دیكەدا گوتراوە: (خوف) بریتیە لە نائارامیی و جووڵە جووڵی دڵ بەهۆی ئەوەوە كە تۆ یادی شتێك دەكەی، كە جێگای مەترسییە.

ئنجا كە لێرەدا مەبەستمان خوای پەروەردگارە، دیارە خوای بێ هاوتا جێگای مەترسیی نیە لە خودی خۆیدا، بەڵام بەهۆی مامەڵەی لارمان لەگەڵ خوادا، سزاو تۆڵەی خوا بۆ ئێمە دەبێتە جێگای مەترسیی.

ئنجا با لەو بارەوە ئاماژە بەچەند ئایەتێك بدەین:

یەكەم: لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٨٥)دا خوا (سبحانه و تعالی) دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾.

---

(١) التعريفات - ص ١٠١.

واتە: وەپاش ئەوەی خوا زەوی باش دروست کردوەو (پڕی کردوە لە نازو نیعمەت)، خراپەی تێدا مەکەن وە لێی بپاڕێنەوە بەترس و بە ئومێدەوە (هەم ترستان هەبێ، هەم هیواتان هەبێ، هەم ترستان هەبێ لە گوناح و تاوانەکانی خۆتان، هەم هیواشتان هەبێ بەو تاعەتانەی کە ئەنجامیان دەدەن، بەهۆی ئەوەوە خوای پەروەردگار لێتان ببووریٰ). بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نیزیکە.

**دووەم:** لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٧٥)دا لە سیاقێکدا کە باسی هەڕەشەی دوژمنان دەکا لە ئەهلی ئیمان، خوای پەروەردگار دەفەرمویٰ:

﴿ ..فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾.

واتە: ئێوە لێیان مەترسێن، وە لەمن بترسێن ئەگەر بڕوادارن.

بڕوادار دەبێ ئەو ترسەی بەرانبەر بەخوا هەیەتی، بەرانبەر بەجگە لە خوا نەیبێ، ئەگەرنا ئینسان وەك شتێکی سروشتیی لە مارێك دەترسێ، لە ئاگرێك دەترسێ، لە دوژمنێك دەترسێ، ئەوە شتێکی سروشتییە، بەڵام دەبێ ئەو ترسەی بەرانبەر بەخوا هەتە، هیچ ترسێکی دیکەی لەگەڵ نەیەتە تەرازووەوە.

**سێیەم:** لە سوورەتی (النمل) ئایەتی (١٠)دا خوای پەروەردگار دەفەرمویٰ:

﴿ ... فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَـٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ ﴾.

واتە: کاتێ مووسا گۆچانەکەی فڕێدا، هەڵبەزیەوە وەك تیرە مار، مووسا پشتی تێکردو ئاوڕی نەدایەوە (لێی ترسا)، (خوا بانگی کرد) ئەی مووسا! مەترسێ، ڕەوانەکراوان لە لای من نابێ بترسێن.

واتە: من گفتوگۆت لەگەڵدا دەکەم و لەگەڵ من هاتوویتە جێژوان، نابێ بترسێی، نابێ لە جگە لە من بترسێی، ئنجا گۆچانە، مارە، حەزیایە، بەڵام

دیارە بۆ مووسا (سەلامی خوای لێبێ)، حاڵەتێکی کت و پڕ بووە و پێشتر نەیزانیوە، ئەوە ترسێکی سروشتیی و ئاساییە.

لێرەوەش دەمەوێ ئەوە بڵێم: کە هەندێ لە زانایان زێدەڕۆیی دەکەن لەباس کردنی ترسان لەخوادا، یاخود بەنەزانیی باسی دەکەن، من لێرەوە دڵسۆزانە دەڵێم: خوا (سبحانه و تعالى) لە هەموو قورئاندا خۆی وا پێناسە نەکردوە کە لەخودی ئەو بترسێین، وەك شتێکی مەترسییدار لێی بترسێین، بەڵکو ئێمە دەبێ لەسزای خوا بۆ کردەوەکانی خۆمان، بترسێین، لە دەرەنجامی کردەوە شووم و خراپەکانی خۆمان بترسێین، بەڵێ، دەبێ سام و هەیبەتی خوامان لەدڵدا بێ، بەڵام دەبێ وریابین زێدەڕۆیی لەوەدا نەکەین، ئنجا وەك چۆن دەبێ سام و هەیبەت لەدڵماندا بێ، پێشتریش دەبێ خۆشەویستییمان هەبێ بۆ خوا (سبحانه و تعالى)، وە بەڕاستی دەبێ زۆر باسی ئەوە بکەین کە خوا خۆشبویستریێ، نەك ترسمان بەرانبەری هەبێ، بەبەڵگەی ئەوە کە پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ)، وەك لەبەرگی پێنجەمی تەفسیرەکەشمدا هێناومە، لە تەفسیری ئەو ئایەتانەدا کە خوای پەروەردگار لە سەرەتایەکەیانەوە دەفەرمویێ:

﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾ الأنعام.

لەتەفسیرکردنی ئەو ئایەتانەدا باسم کردوە کە: ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ)، کاتێ ئەستێرە ئاوابوو، مانگ ئاوابوو، خۆر ئاوابوو، هەموو جارێ ئەو قسەیە دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: (لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ) واتە: من ئاوابوانم خۆش ناوێن، کەواتە: گرنگترین شت، وە بناغەی پەیوەندیی لەگەڵ پەرستراو (معبود)دا بریتیە لە خۆشویستنی.

■١٦ ■

## سام كردن لە خوا (الخَشيَة مِنَ الله)

دیارە من وشەكانی (خوف، خشیة، هَیبة)م لێك جیا كردوونەتەوە، چونكە من پێم وایە لە قورئاندا هاو واتایی (ترادف) نیە، واتە: دوو وشە یان سێ وشە یەك واتایان هەبێ، ڕەنگە واتاكانیان لێك نزیك بن، بەڵام هاوواتا نین، وە نەك وشەیەكی زیاد لە قورئاندا نیە، كە دوو وشە بەكاربێنێ و یەك واتایان هەبێ، بەڵكو پیتێكی زیادیش لەقورئاندا نیە، وە هەركەسێ لە وشەكانی قورئان ورد بێتەوە، ئەو حەقیقەتانەی بەڕوونیی دەكەوێتە بەرچاو.

(راغب الأصفهاني) لە پێناسەی (الخشیة)دا دەڵێ: {الخشیة: خَوفٌ یَشوبُهُ تَعظیمٌ، وَقیل: هيَ خَوفٌ مقرونٌ بإجلالٍ}[1]، واتە: (الخشیة): بریتیە لە ترسێك كە بەمەزنگرتنی لەگەڵ تێكەڵ بووە، یاخود ترسێكە جووت بووە لەگەڵ بەشكۆمەنداناندا.

ئێستاش با چەند ئایەتێك بە نموونە بێنینەوە:

یەكەم: لە سوورەتی (فاطر) ئایەتی (٢٨)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرمویێ:

﴿...إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ..﴿٢٨﴾﴾.

---

(١) مفردات.

واتە: تەنیا بەندە زانایەكان سامیان هەیە بەرانبەر بەخوا، بۆ زانایان نەیفەرمووە: (يَخافُ الله) فەرموویەتی: (يَخشى الله)، كەواتە: سام كردن بەرانبەر بەخوای پەروەردگار، ترسێكە كە بەگەورەگرتنی تێدایە، بۆیە خوای كارزان تایبەتی كردوە بەزانایانەوە.

دووەم: هەروەها لە سوورەتی (الرعد) ئایەتەكانی (١٩، ٢١،٢٠)دا دیسان مەدحی زانایان دەكاو دەفەرموێ:

﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢١﴾﴾.

واتە: ئایا ئەو كەسەی دەزانێ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە هەقە، وەك ئەو كەسە وایە كە كوێرە؟! دوایی لە وەسفیاندا دەفەرموێ: ئەوانەی كە هەرچی خوا فەرمانی پێكردوە دەیگەیەنن، وە سام لەپەروەردگاریان دەكەن، وە ترسی لێپرسینەوەی خراپی ڕۆژی لێپرسینەوەیان هەیە.

**زانایان لەبارەی جیاوازیی نێوان (خَوف) و (خَشية)ەوە چەند شتێكیان گوتوە:**

١- (خَشية): ترسێكە بەگەورەگرتنی تێدایە.

٢- یان ترسێكی توندە، (شِدَّة الخَوف).

٣- یان مەزنیی و مەترسیی لێكراو دەگەیەنێ (عَظمَة المَخوف).

٤- یاخود ئەو ترسە لەوەوەیە كە لە زانیاریی و یەقینەوە سەرچاوە دەگرێ، بەڵام (خوف) ڕەنگە لە نەزانینەوە سەرچاوە بگرێ.

■ ١٧ ■

# بیم هەبوون لە سزای خوا
# (الرَّهبة مِنَ الله)

لەبەرانبەر (الرَّهبة)دا (بیم هەبوون)م داناوە، دەگوترێ: ترس و بیمی هەیە، لەبەر ئەوەش وام گوتوە چونکە (رَهبة) ئاوا پێناسە کراوە:

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: {الرَّهبة والرَّهبُ: مَخافَةٌ مَع تَحَرُّز وَاضطراب}[1]. واتە: (الرَّهبة) و (الرُهب) بریتیە لە ترسێك کە خۆپاراستن و دڵەڕاوکێی تێدابێ.

**با لەو بارەوەش ئاماژە بە دوو ئایەتان بکەین:**

**یەکەم:** خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ٥١ ﴾ النحل.

واتە: وە خوا فەرمووی: دوو پەرستراوان مەگرن، تەنها یەك پەرستراو هەیە، {کە خوایەو پەرستراوی بەحەقە}، هەر بیمتان بەرانبەر بە {سزای} من هەبێ.

**دووەم:** لە سوورەتی (الأنبیاء) ئایەتی (٩٠)دا، لێرەدا وشەی (رَهبة)م بەوە لێکداوەتەوە کە بریتیە لە بیم هەبوون ترس هەبوون و بەرانبەر بە سزای خوا، خوای بێهاوتا دەربارەی پێغەمبەران دەفەرموێ:

---

(١) مفردات - ص٢٤٩.

﴿..إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾﴾.

واتە: ئەوانە خێراییان دەکرد لە چاکەکاندا، وە بەئارەزوو مەندانەو بەبیم هەبوونەوە، لێمان دەپاڕانەوەو، بۆ ئێمە ملکەچ بوون.

کەواتە: (رَغَبًا) بریتیە لە ئارەزوو هەبون بە پاداشتی خوا، وە (وَرَهَبًا) بریتیە لە بیم هەبوون لە سزای خوا، لێرەوەیە کە گوتوومە: (رَهبة) بیم و ترسە بەرانبەر بە سزای خوای دادگەر.

■ ١٨ ■

# مل كەچیی لە دەروونەوە بۆ خوا (الخُشوع لله)

(إبن القيم) دەڵێ: {الخُشوع: قيامُ القَلبِ بَينَ يَدَي الرَّبِّ بِالخضُوع والذلِّ، وقيل: هوَ الإِنقيادُ لِلحَقِّ}[1]، واتە: (خشوع) بریتیە لەوە كە دڵ بەملكەچیی و زەبوونیی بەرامبەر بەپەروەردگار ڕابوەستێ، وە گوتراوە: (خُشوع) واتە: ملكەچ بوون و تەسلیم بوون بۆ حەق.

وە (خشوع) لە قورئاندا بەچەند مانایەك هاتوە:

- بەمانای زەبوونیی هاتوە.
- بەمانای ئەوە كە ئەندامەكانت جووڵە نەكەن، هاتوە.
- بەمانای ترس هاتوە.
- بەمانای خۆبەكەمگرییش هاتوە.

خوای پەروەردگاریش لە قورئاندا لەچەند شوێنێك باسی (خشوع)[2] دەكا، بۆ وێنە:

---

(١) مدارج السالكين- ج١، ص٥٥٨.

(٢) ئێمە (خضوع)مان هەیەو، (خشوع)مان هەیە، (خضوع) ئەوەیە كە تۆ ڕواڵەتت ملكەچ بێ، بەڵام (خشوع) ئەوەیە دڵت تەسلیم و ملكەچ بێ.

یەكەم: لە سەرەتای سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ:

﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢﴾

واتە: بێگومان ئەو بڕوادارانە سەرفرازن، كە لەنوێژەكانیاندا ملكەچن، واتە: لە دەروونەوە ملكەچن بۆ خوا.

دووەم: لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٥)دا خوای پەروەردگار لە ڕیزی (دە) (١٠) سیفەتتدا كە پیاوان و ئافرەتانی ئیمانداریان پێ مەدح دەكا، یەكێ لەو سیفەتانە (خشوع)ە، وەك دەفەرموێ:

﴿.. وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ ... ٣٥﴾.

واتە: پیاوانی لەدەروونەوە ملكەچ بۆخوا، وە ئافرەتانی لەدەروونەوە ملكەچ بۆخوا.

سێیەم: لە سوورەتی (الحديد)دا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ:

﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ .. ١٦﴾.

واتە: ئایا كاتی ئەوە نەهاتوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، كە دڵیان بۆ یادی خواو بۆ ئەو حەقەی دابەزێنراوە، ملكەچ بێ؟! كەواتە: (خشوع) پەیوەندیی بەدڵەوە هەیە.

■ ١٩ ■

## ملکەچیی ڕواڵەتیی و
## جەستەیی بۆ خوا (القنوت لله)

هەڵبەتە هەرکاتێ ئینسان لەدڵەوە ملکەچ بوو بۆخوا، ئەو حاڵەتە دەروونییە لەسەر ڕواڵەت و جەستەیشی ڕەنگ دەداتەوە.

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: {القُنوتُ لُزومُ الطّاعةِ مَعَ الخُضُوع}[1]، واتە: (القنوت) بریتیە لە پەیوەست بوون بە فەرمانبەرییەوە لەگەڵ ملکەچییدا.

**ئەمەش چەند دەقێکی قورئان و سوننەت لەو بارەوە، وەك نموونە:**

**یەکەم:** لە سوورەتی (الروم) ئایەتی (٢٦)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ٢٦ ﴾.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەموویان بۆخوا گەردنکەچن.

وەك واقیعیش دەبینین: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هیچی لە یاسا گەردوونییەکانی خوا، دەرناچێ.

**دووەم:** لەسوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٣٨)دا دەفەرموێ:

---

(١) المفردات - ص ٤١٣.

﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ ﴾.

واتە: پارێزگاریی بکەن لەنوێژەکانتان، بەتایبەتی نوێژی نێوەڕاست، وە بۆخوا بەملکەچیی بوەستن.

لەهۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا ئەم گێڕراوەیە هاتوە:

{عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلَاةِ يُكَلِّمُ الرَّجُلُ صَاحِبَهُ وَهُوَ إِلَى جَنْبِهِ فِي الصَّلَاةِ حَتَّى نَزَلَتْ: {وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ} فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ وَنُهِينَا عَنْ الْكَلَامِ} أخرجه البخاري برقم (٤٥٣٤)، ومسلم برقم (٥٣٩).

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم دەڵێ: ئێمە بەر لەوەی {وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ} دابەزێ، لەنێو نوێژدا قسەمان پێکەوە دەکرد، پیاوێك قسەی لەگەڵ هاوەڵەکەی تەنیشتیدا دەکرد، بەڵام کە دابەزی، فەرمانمان پێکرا بە بێدەنگیی و قسە کردنمان لێ قەدەغە کرا.

سێیەم: لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٥)دا، یەکێ لەو دە (١٠) سیفەتە کە خوای پەروەردگار ئیماندارانی پیاوو ژنیان پێ وەسف دەکا، (قنوت)ە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ..وَٱلۡقَـٰنِتِينَ وَٱلۡقَـٰنِتَـٰتِ .. ﴿٣٥﴾ ﴾.

واتە: وە پیاوان و ئافرەتانی گەردنکەچ (بۆ خوا).

**چوارەم:** لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، دەفەرموێ:

{أَفْضَلُ الصَّلَاةِ طُولُ الْقُنُوتِ} أخرجه أحمد برقم (١٤٤٠٨)، ومسلم برقم (٧٥٦)، والترمذي برقم (٣٨٧) وقال: حسن صحيح ، وابن ماجه برقم (١٤٢١)، وابن خزيمة برقم (١١٥٥)، والطحاوي (٢٩٩/١) وابن حبان برقم (١٧٥٨)، وأخرجه أيضاً: ابن أبي شيبة برقم (٨٣٤٦)، والبيهقي برقم (٤٤٦١).

واتە: باشترین نوێژ ئەوەیە کە ملکەچ بوونی دوورو درێژی تێدا بێ، واتە: بەپێوە وەستانی زۆری تێدا بێ بەرانبەر بە خوای بەخشندە دەست بخەیە سەر دەست و، بەملکەچیی ئایەتەکانی قورئانی بەپێز بخوێنی، بۆیە زانایان: (طولُ الْقُنُوتِ)یان بە (طول القيام)، ڕاوەستان بە ملکەچیی بۆخوا، تەفسیر کردوە.

■ ٢٠ ■

## گەردن کەچیی پەنهان و ئاشکرا (الإخباتُ لله)

(الإخبات) واتە: چ بەپەنهانیی چ بە ئاشکرا، چ بەدەروونەوە چ بە جەستە، بۆ خوا ملکەچ بی.

(إبن القيم) دەڵێ: {الإخباتُ: الخُضُوعُ وَالتّذلُّل للهِ، مَعَ المَحبَّة والتَّعظيم لَهُ}[1].
واتە: (الإخبات): بریتیە لە زەبوونیی و ملکەچیی بۆ خوای زاڵی خاوەن شکۆ، لەگەڵ خۆشویستن و بەگەورە گرتنیدا.

**ئەمەش دوو نموونە لە ئایەتەکانی قورئان لەبارەی (إخبات)ەوە:**

**یەکەم:** لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٢٣)دا خوای زاڵی کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخْبَتُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾.

ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، وە بە پەنهان و ڕواڵەتەوە، بەدەرو دەروونەوە بۆ پەروەردگاریان ملکەچن، ئەوانە هاوەڵی بەهەشتن، وە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

---

(١) مدارج السالكين ج٢ ص٦.

دووەم: لە سوورەتی (الحج) ئایەتەكانی (٣٤و ٣٥)یشدا خوای پەروەردگار باسی (إخبات) دەكا دەفەرمویٚ:

﴿..فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾﴾.

شایانی باسیشە: من لێرەوە وەرم گرتوە كە (إخبات) بەمانای: {ملكەچیی دەرو دەروون} دیٚ، خوا دەفەرمویٚ: پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، هەر بۆ وی ملكەچ بن، وە موژدە بدە بە (مُخبتین)، {دوایی پێناسەی (مُخبتین) ئاوا دەكا} ئەوانەی كاتێك باسی خوا دەكریٚ، دڵیان ڕادەچڵەكیٚ {ئەوە (دەروون)}، وە خۆڕاگران لەسەر ئەوەی كە تووشیان دیٚ، {ئەوەش هەر پەیوەندیی بەدەروونەوە هەیە}، وە بەرپاكەرانی نوێژ، وە ئەوانەی لەوەی، كە پێمان داون دەبەخشن. {دیارە نوێژ بەرپا كردن و، بەخشین لەوەی، كە خوا پێیداوی و دوو كردەوەی ڕواڵەتیین، كەواتە: (إخبات) هەم ملكەچیی دەروون دەگرێتەوە، وە هەم ملكەچیی ڕواڵەتیش دەگرێتەوە}.

■ ٢١ ■

## ئومێدەوار بوون (الرجاء)[١]

**شارەزایانی زمان و زاراوەکان ئاوا پێناسەی (رجاء)یان کردوە:**

{الرَّجاءُ: تَأَمُّلُ الخَيْرِ وَقُرْبُ وقوعِهِ، وَقال الرّاغِب: الرَّجاء ظَنٌّ يَقتَضي حُصُولَ ما فيهِ مَسَرَّةٌ، وقيل: هوَ الثِّقَةُ بِجودِ الربِّ تَعالى}[٢]

واتە: (رجاءُ) بریتیە لە چاوەڕێ کردنی خێرو چاکەیەك، وە نزیکیی هاتنی ئەو خێرو چاکەیە، (راغب) گوتوویەتی: (رجاءُ) بریتیە لە گومانێك کە پەیدابوونی شتێك کە جێگای خۆشحاڵییە، دەخوازێ، هەروەها گوتراوە: (رجاءُ) بریتیە لەمتمانەدار بوون بەبەخشندەیی پەروەردگاری بەرز.

**ئەمەش نموونەیەك لە ئایەتەکانی قورئان لەبارەی (رجاء )ەوە:**

خوا (سبحانە و تعالی) لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢١٨)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ

---

(١) لە زمانی کوردیشدا ئێمە ئەو وشەیە باوەو بەکاری دەهێنین، بۆ وێنە: بە کەسێ دەڵێی: ڕجات لێ دەکەم.

(٢) مدارج السالكين ج١، ص ٣٧ - والتوقيف على مهمات التعاريف ص١٧٤ - ومفردات ألفاظ القرآن ص ١٩.

رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢١٨) ﴾.

واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە، وە ئەوانەی كۆچیان كردوە، وە ئەوانەی تێكۆشاون لەپێناوی خوادا، ئا ئەوانە بەئومێدی بەزەیی خوان، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە.

كەواتە: ئەو ئایەتە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، كە ئومێد هەبوون بە ڕەحمەتی خوا دەبێ كردەوەی لەگەڵ دابێ، ئەوەتا ئیمان هەیە، كۆچ كردن هەیە، تێكۆشان هەیە، ئنجا ئومێدەوارن بە ڕەحمەتی خوا، وەك لە ئایەتەكەدا هاتوە:

(أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ )

ئا ئەوانە ئومێدەوارن بەبەزەیی خوا، كەواتە بەبێ كردەوە، ئینسان ئومێدەواربێ بەبەزەیی خوا، ئەوە لەڕاستییدا خەیاڵ پڵاوە، وەك پێشینانیش دەڵێن: {كەس بەخەیاڵ نەبووە بەماڵ}، هەروەها گوتراوە: {بەحەڵوا حەڵوا، دەم شیرین نابێ}، دەبێ كردەوەت هەبن، ئەو كردەوانەی كە بەهۆی وانەوە، ئومێدت وابێ خوای بەخشەر پێت دەبەخشێ و، لێت نزیكەو لێت خۆشدەبێ.

■ ٢٢ ■

## لالانەوەو كڕووزانەوە
## لە خوا (التضرُّع لِلّه)

یەكی دیكە لەو خەسڵەت و سیفەتانەی، كە مرۆڤ دەبێ خۆییان پێ بڕازێنێتەوە، لە مامەڵە كردن لەگەڵ خوادا، بریتیە لە لالانەوە لەبەر خوا، داواكردن لەخوا بەشێوەی كڕووزانەوەو لالانەوە.

(**المُناوي**) دەڵێ: {الضّراعةُ: الخُضوعُ والتّذُّل، والتَّضَرُّع أَن تَدعوَ اللهَ بِضَراعَة}[1] واتە: (تَضرُّع) بریتیە لە ملكەچیی و زەبوونیی، وە كڕووزانەوە (تَضرُّع) ئەوەیە كە تۆ لەخوا بپاڕێیەوە، بەملكەچیی و زەبوونیی.

خوای پەروەردگار لەزۆر جێگای قورئاندا باسی كردوە، كە (تَضرُّع) سیفەتێكی زۆر باشەو مسوڵمان دەبێ (تَضرُّع)ی هەبێ بۆ خوا، یانی: لێی بپاڕێتەوەو لەبەری بكوڕووزێتەوە، بۆی ملكەچ بێ و لێی بلاڵێتەوە، وە خوای كارزان لۆمەی ئەو كافرانەی كردوە كە ئەو سیفەتانەیان نیە، بۆ وێنە:

یەكەم: خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٥٥)دا دەفەرموێ:

﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

---

(١) التوقيف على مهمات التعاريف - ص ٢٢٢.

واتە: لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە بەکڕووزانەوەو لالانەوە، وە بەپەنهانیی، (نەك بەهات و هاوار) بێگومان خوا سنوور شکێنانی خۆش ناوێن.

زۆر کەس لە پاڕانەوەدا سنوور دەبەزێنێ، وەك ئەو مامۆستایانەی نیو سەعات، سێ چارەگ لەدوعای قنووتدا یان لە هەندێ موناسەباتتدا، خەڵك هەمووی دەستی سڕ دەبێ، پێی دەتەزێ، ئەو هەر خەریکی پاڕانەوەیە، کە پێم وایە ئەو بیدعەتە زیاتر هەندێ لەزانایانی وڵاتانی خەلیج دایان هێناوە، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەندێ هەڵوێستی دیکە کە پێویستە لەبەرانبەر حوکمڕانانی لاڕێ و خراپدا بینوێنن، ناینوێنن، ئنجا دەیانەوێ بەدوعاو پاڕانەوەی درێژ، قەرەبووی ئەو بێ هەڵوێستییەیان بکەنەوە!! کە بەتەئکید بێ هەڵوێستیی بەرانبەر بە ستەمکاران، وە بێ هەڵوێستیی بەرانبەر بە هەقی هەژاران و بەشخوراوان، بەدوعا قەرەبوو نابێتەوە، ئنجا عەجایب ئەوەیە هەندێ لە مامۆستایانی کەنداوو لێرەش هەندێ خەڵکی دیکە، کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەوانەوە، زۆر باسی خراپیی بیدعەت و، باشیی پابەندیی بەشەریعەتەوە دەکەن، کەچی خۆیان ئەو بیدعەتە زلەیان داهێناوە لەبواری دووعاکردندا، کە هەر زیاد کردنێك تێیدا، بیدعەتە، چونکە تۆ هەموو قورئان تەماشا بکە! هەموو فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەماشا بکە! هیچ یەکێ لە دوعایەکان لە نیو خولەك، لە دەققەیەك تێناپەڕێ، بەڵام تۆ نیو سەعات، سێ چارەگ دەپاڕێیەوە، هەرچی دوعای عەرش و قورشە دەیهێنی، ئەوە لەکوێت هێنا؟! ئەمە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ .. إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٥٥ ﴾

خوا، تێپەڕان و سنوورشکێنانی خۆشناوێن، وە لە فەرموودەدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{يَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ وَالطُّهُورِ} أخرجه ابن أبي شيبة (٥٣/٦، رقم ٢٩٤١٠)، وأحمد (١٧٢/١، رقم ١٤٨٣)، وأبو داود (٧٧/٢، رقم ١٤٨٠)، قال الألباني :حسن صحيح، قال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره وهذا إسناد منقطع.

واتە: كەسانێك پەیدا دەبن لە پاڕانەوەو پاكیی (دەستنوێژو خۆشۆردن)دا تێدەپەڕێنن.

كە من پێم وایە ئەو حاڵەتەی باسم كرد، مەبەست ئەوەیە.

هەروەها ئەوە كە بڵێی: خوایە! هەرچی كافرە لەبەینی بەرە، ژنەكانیان بێوەژن بكە، منداڵیان هەتیو بكە، ماڵیان كاول بكە!!، ئەوە بەڕاستی هەمووی تێپەڕاندنە لە دوعا كردندا، وە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) لەو جۆرە دوعایەیان نەكردوە، مەگەر نووح (سەلامی خوای لێبێ) كە تووك لە قەومەكەی خۆی دەكا، ئەویش دوای ئەوەی خوای پەنهانزان هەواڵی پێدەدا، كە تازە بڕوا ناهێنن، وەك خوای زاڵی كاربەجێ پێی دەفەرموێ:

﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ .. ﴿٣٦﴾﴾ هود.

واتە: وە سروش بۆ نووح كراو هەواڵی پێدرا: ئەی نووح! هیچ كەسی دیكە لە گەلەكەی تۆ ئیمان ناهێنێ، پاش ئەوە ئنجا نووح (سەلامی خوای لێبێ) دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾﴾.

واتە: وە نووح گوتی: پەروەردگارم! هیچ كام لە كافران مەهێڵەو سەرزەمینیان لێ پاك بكەوە.

چونكە پێشتر خوای زاناو شارەزا هەواڵی پێدابوو: كە كەسی دیكە ئیمان ناهێنێ، بەڵام پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) كە پێشەواو سەرمەشقی ئێمەیە، دوعای وای نەكردوە بفەرموێ: خوایە! هەرچی كافرە لەبەینی بەرە!

**دووەم:** هەر لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٢٠٥)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَـٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾﴾.

واتە: وە یادی پەروەردگارت بكە لەبەر خۆتەوە، لەنەفسی خۆتدا، وە بەملكەچیی و كڕووزانەوەو لالانەوەو بەترسەوە، وە بەبێ دەنگ هەڵهێنان.

سێیەم: دەربارەی ئەوە کە کافران کڕووزانەوەو لاڵانەوەیان لەخوا نەبووە، خوا گلەییان لێ دەکاو دەفەرموێ:

﴿ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: دەبوایە کاتێك هەڕەشەو سزای ئێمەیان بۆ دەهات، لەخوا کڕووزابانەوەو لاڵابانەوەو بۆ لای خوا گەڕابانەوە، بەڵام دڵیان ڕەق بوو، وە شەیتان ئەو کردەوانەی دەیانکردن، بۆی جوان کردن.

ئەو بەڵایانەی خوا بۆی دەناردن، بەکارەساتی سروشتییان دادەنان، بۆیە نەدەبووە هۆی ئەوەی بۆلای خوا بگەڕێنەوە، ئەو بەڵایەیان لەسەر لاببات.

■ ٢٣ ■

# چاودێریی کردنی خوا و
# هەستکردن بە چاودێریی خوا (مُراقَبة الله)

(إبن القيم) دەڵێ: {المُراقَبة: دَوامُ عِلم العَبدِ وَتَيَقُّنِهِ بِإطِّلاع الحَقِّ سُبحانهُ و تَعالى عَلى ظاهِرِهِ وباطِنِهِ}[1]، واتە: مەبەست لە (مراقبة) ئەوەیە کە بەندە زانیاریی هەبێ، وە دڵنیابێ لەوە کە خوای پاك و بەرز هەمیشە چاودێریی دەرو دەروونی دەکا، چاودێری پەنهان و ئاشکرای دەکا.

**ئەمەش دوو نموونەی ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی لەبارەوە:**

یەکەم: لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٩٣)دا، خوا (سبحانه وتعالى) لەسەر زمانی یەکێ لە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، کە لەگەڵ گەلەکەیدا دەدوێ، پێیان دەفەرموێ:

﴿..وَٱرْتَقِبُوٓاْ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾﴾.

واتە: ئێوە چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵ ئێوە لە چاوەڕوانانم.

(إبن فارس) دەڵێ: {الرَّقيب: هوَ الحافِظ الّذي لا يَغيبُ عَنْه شَيءٌ، فَعيلٌ بِمعنا

---

(١) مدارج السالكين - ج٢، ص ٦٨.

الفاعِل}(١). واتە: (رَقیب): بریتیە لەو پارێزەرەی، کە هیچ شتێك لە زانیاریی وی ون نابێ، وە (رقیب) لەسەر کێشی (فعیل)ە، بەڵام بەمانای (فاعل)ە.

**دووەم:** لە دەقەکانی سوننەتیش دەقێك، کە مانای (مراقبة) دەگەیەنێ، فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوایە (صلى الله علیه وسلم)، لە درێژەی فەرموودەیەکدا هاتوە کە بەفەرموودەی جوبریل بەناوبانگەو، جوبریل لە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەپرسێ: {قَالَ: (فَأَخْبِرْنِي عَنْ الْإِحْسَانِ)؟ پێغەمبەریش ئاوا وەڵام دەداتەوەو: (أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ)}(٢) لێی دەپرسێ: ئیحسان (چاك خوا پەرستن) چییەو لە چییدا بەرجەستە دەبێ؟ پێغەمبەری خواش (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {ئەوەیە کە بەشێوەیەك خوا بپەرستی، کە دەیبینی، ئنجا ئەگەر تۆش ئەو نەبینی، ئەو تۆ دەبینێ}، ئەمە واتایەکی دیکەی ئەوەیە: {بەشێوەیەك خوا بپەرستی، کە دەیبینی، یاخود بەشێوەیەك بیپەرستی کە ئەو تۆ دەبینێ}، هەردوو واتایەکەی هەن.

بەڵێ، مەبەست لە چاودێریی کردن (مراقبة) ئەوەیە، کە ئینسان هەمیشە هەست بەچاودێریی خوا بکا، وە ئاگای لەخوا بێ، هەم خۆی چاودێریی خوای پەروەردگار بکا، وە هەم چاودێریی خوای بینەریش بەسەر خۆیەوە ببینێ.



---

(١) مقاييس اللغة - ج٢ ص ٤٢٧.

(٢) پێشتر تەخریج کراوە.

■ ٢٤ ■

## خۆپارێزیی لە حەڕام (الوَرَع):

(المُناوي) دەڵێ: {الورَع: تَرْكُ ما يَرِيبُك وَنفي ما يَعيبُكَ، وَالأَخذ بِالأَوثَق، وَحَمْل النَّفسِ عَلى الأَشَق، وَقيلَ: النَّظَر في المَطْعَمِ واللِّباس، وتَرك ما بهِ بَأس، وقيلَ: تَجَنُّب الشُّبُهات، وَمُراقَبة الخَطَرات}[1]، واتە: (وَرَع): بریتیە لە تەرك كردنی هەرشتێك كە لێی لەگومان دای، وە لابردنی هەر شتێك كە عەیبدارت دەكا، وە گرتنی هەر شتێك كە جێگای متمانەیە، وە بارهێنانی خۆت لەسەر شتێك كە قورسترە (لە تاعەت و چاكەو، خۆدوور گرتن لە حەڕامەكان).

وە گوتراوە: سەرنج دانی خواردن و خواردنەوەو پۆشاكە، وە وازهێنانی هەر شتێكە كە گرفت و ئیشكالێكی تێدا بێ.

وە گوتراوە: ئەو شتانەی كە گومانیان لێ دەكرێ، خۆیان لێ دوور بگری، وە ئاگاشت لە غایەلەو خەتەرەی دڵ و دەروونت بێ.

**ئنجا با دوو نموونە لە ئایەتەكانی قورئان و دەقەكانی سوننەت لەو بارەوە بێنینەوە:**

**یەكەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المؤمنون) ئایەتی (٥١)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾.

---

(١) التوقيف على مهمات التعاريف، ص٣٣٧.

لەو ئایەتەدا خوای تاك و پاك ڕوو لەهەموو پێغەمبەران دەكاو هەموویان دەدوێنێ، دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەران! خواردنی خۆش و بەتام و حەڵاڵ و چاك بخۆن، وە كردەوە چاكەكان ئەنجام بدەن، بێگومان من بەوەی ئێوە دەیكەن، زانام.

وەكو دەبینین بەر لەوەی پێیان بفەرموێ: كردەوەی چاك بكەن، فەرموویەتی خواردنی پاك و چاك و حەڵاڵ و زەڵاڵ بخۆن.

**دووەم: پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:**

{فَضْلُ العِلمُ أَفْضَلُ مِن فَضْلِ العِبادَةِ وَخَيْرُ دِينِكُم الوَرِع}، أخرجه البزار برقم (٢٩٦٩)، والطبراني في الأوسط برقم (٣٩٦٠)، قال الهيثمي (١٢٠/١): رواه الطبراني في الأوسط والبزار، وفيه عبد الله بن عبد القدوس وثقه البخاري وابن حبان وضعّفه ابن معين، والحاكم برقم (٣١٧)، قال الألباني: صحيح لغيره.

واتە: زیادە لەزانستدا باشترە لەزیادە لە عیبادەتدا، {واتە: ئایا ئەگەر كاتێكت بەدەستەوە بێ، وا باشترە دوو ڕكعات نوێژی زیادە بكەی، یا عیبادەتێكی دیكەی زیادە بكەی، یان زانستی زیاتر بەدەست بهێنی؟ دەفەرموێ: بەدەستهێنانی زانیاریی زیاتر باشترە، لە ئەنجامدانی عیبادەتی زیاتر، دیارە ئەوەش بۆ كەسێك كە پێویستی زیاتر بە عیلم بێ، دەبێ لەمەبەستی فەرموودەكە تێبگەین، ئەگەرنا كەسێك توانای عیلمیی نەبێ، بابایەكی عەوامە، دیارە بۆ وی، ئەو شتە خێرترە كە زیاتر لەتوانایدایە}، پاشان دەفەرموێ: وە باشترین دینداریيتان بریتیە لە (ورع) یانی: خۆپاراستن لەو شتانەی كە قەدەغەن.

■ ٢٥ ■

## تـامەزرۆیی
## بەرەو خوا (الرّغبة إلى الله)

ئینسانی ئیماندار هەمیشە دەبێ بەرەو خوا ئارەزووی هەبێ، شەوق و ئیشتیاقی هەبێ.

(**الكَفَوي**) دەڵێ: {الرَّغبةُ: إِرادةُ الشَّيءِ بِالحِرصِ عَليه}[1]، ڕەغبەت: بریتیە لە ویستنی شتێك بە سووربوون لەسەری.

خوای پەروەردگار لەچەند شوێنێکی لە قورئاندا، باسی ئەوە دەکا، کە بەندەکانی ئارەزوو مەندن بەرەو خواو تامەزرۆیی زیاتری نیزیکی لە خوایان هەیە، بۆ وێنە:

یەکەم: لە سوورەتی (الأنبیاء) ئایەتی (٩٠)دا دەفەرموێ:

﴿...وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ۝٩٠﴾.

باسی هەندێ لە پێغەمبەران دەکا (سەلامی خوایان لێبێ) دەفەرموێ: لێمان دەپاڕانەوە بە ئارەزوو مەندییەوەو بەترس و سام و بیمەوە، وە لەدەروون و ناخەوە بۆ ئێمە ملکەچ بوون.

---

(١) الكليات - ص ٤٨٢.

دووەم: لە سووڕەتی (التوبة) ئایەتی (٥٩)دا دەفەرمویٚ:

﴿ .. إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

سێیەم: لە سووڕەتی (الشرح)دا لە ئایەتەكانی: (٧و٨)دا، خوا (سبحانه و تعالى) بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ:

﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر لێبوویەوە {یانی: لە كاروباری ڕۆژانەت} خۆت ماندوو بكەو پێت بچەقێنە بۆ عیبادەت بۆ پەروەردگارت، یان: ئەگەر لەكارو چالاكیی نێو خەڵك بوویەوە، پێت بچەقێنە بۆ خوا پەرستیی، وە تامەزرۆیی و ویستت بۆ لای پەروەردگارت بیٚ.

ئنجا ئەمە ئەوەشی لیٚ وەردەگیریٚ، كە ئینسانی ئیماندار كاتیٚ عیبادەتەكان ئەنجام دەدا، دەبیٚ بەئارەزووەوەو بە ئیشتیاق و تامەزرۆییەوە خوا پەرستییەكان ئەنجام بدا، وەك پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) كاتیٚ وەختی نوێژ دەهات، دەیفەرموو:

{يَا بِلَالُ! أَرِحْنَا بِالصَّلَاةِ} أخرجه أحمد برقم (٢٣١٣٧)، وأبو داود برقم (٤٩٨٥)، قال شعيب الأرنؤوط: رجاله ثقات، لكن اختلف على سالم بن أبي الجعد في إسناده، قال الألباني: صحيح.

واتە: ئەی بیلال! بەهۆی نوێژەوە ئاسوودەمان بكە، با دڵمان مورتاح بیٚ.

ئنجا یەكیٚ لەزانایان دەڵیٚ: ئەگەر بڵێی: (أَرِحنا بِها) لەكویٚ، وە ئەوە لەكویٚ كە بڵێی: (أَرِحْنَا منها) واتە: ئاسوودەمان بكە لەدەستی! وەك ئەوەی بێگارێك بیٚ! یاخود ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، كەسی واهەیە كە مانگی ڕەمەزان دیٚ، وا دەزانیٚ شتێكی پڕ مەترسیی بەرەو ڕووی هاتوە! ئنجا ئەوە لەكویٚ و، ئەوەش لەكویٚ بە تامەزرۆییەوە بڵێی: سوپاس بۆ خوا ئەوە ئەمساڵیش مانگی نزیك بوونەوە لە خواو، مانگی تەزكیەی نەفس هات!.

## ٢٦

# شادمان بوون بەبەخشش و بەزەیی خوا (الفَرَح بِرَحْمَةِ الله وبِفَضله)

ئینسانی مسوڵمان دەبێ ئەوپەڕی دڵخۆشیی و شادمانیی تەنها بە ڕەحمەت و بەخششی خوابێ.

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: {الفَرَحُ: إنشِراحُ الصَّدر بِلَذَّةٍ عاجِلة وأَكْثر ما يَكونُ في اللّذّات البَدَنية}[1]، واتە: (الفَرَح) بریتیە لە سینە گوشاد بوون بەهۆی تام و چێژێکی زوو تێپەڕەوە، وە بەزۆریی وشەی (فَرَحُ) بۆ تام و چێژە جەستەییەکان بەکاردێ، بۆیەش خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ يونس.

واتە: بڵێ: بە فەزڵ و بەخششی خوا، با هەر بەوە دڵخۆش بن، واتە: دڵخۆشیی گەورەیان، با هەر بەوەبێ.

(المُناوي)یش دەڵێ: {الفَرَح: إنفتاحُ القَلبِ بما يَلْتَذُّ بِهِ}[2]، واتە: (فَرَح) بریتیە لە کرانەوەی دڵ بە شتێك، کە چێژی لێوەردەگرێ.

---

(١) المفردات - ص ٣٧٨.

(٢) التوقيف على مهمات التعاريف - ص ٢٨٥.

بۆ بەڵگە هێنانەوەش بە ئایەتەکانی قورئانی بەڕێز، لەو بارەوە کە دەبێ مرۆڤی مسوڵمان دڵخۆشیی و شادمانیی گەورەی، تەنیا بە ڕەحمەتی خواو پاداشت و بەخششەکەی بێ، بە نموونەیەك واز دێنین:

خوا (سبحانه و تعالى) لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ يونس.

واتە: بڵێ: با بەبەزەیی خوا بەبەخششی خوا، هەر بەوە زۆر دڵخۆش بن، ئەوە باشترە لەوەی پەزمەندەی دەکەن و وەسەریەکی دەنێن {لە ماڵ و سامان}.

■ ٢٧ ■

## گێڕانەوەی هەموو کارەکان بۆ ویستی ڕەهای خوا (إرجاعُ الأُمور كُلِّها إلى مَشيئة الله)

ئەوەش یەکی دیکەیە لەو ئەدەب و سیفەتە جوان و پەسندانەی کە پێویستە بەندە خۆییان پێ برازێنێتەوە لەبواری مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا، ئەو ڕاستییەش لەزۆر شوێنی قورئاندا دەبینرێ، بۆ نموونە:

یەکەم: خوا (سبحانە و تعالى) لە سوورەتی (الكهف) ئایەتەکانی (٢٣و ٢٤)دا بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: وە بۆ هیچ شتێك مەڵێ: من بەیانی ئەوە دەکەم، مەگەر بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ، {ئەگەرنا بە ڕەهایی مەڵێ: فلان شتە دەکەم}[1] وە هەرکات لەبیرت

---

(١) ئەو دوو ئایەتەش هۆی هاتنە خوارەوەکەیان ئەوەبوو کە: شاندێك لە هاوبەش بۆخوا دانەرەکان، هاتنە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سێ پرسیاریان لێکرد: دەربارەی (أصحاب الكهف، و ذي القرنين، و الروح)، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە بیری چوو بفەرموێ: بەیانی ئەگەر خوا بیەوێ (إنشاءالله) وەڵامتان دەدەمەوە، فەرمووی: بەیانی وەرنەوە وەڵامتان دەدەمەوە، کەچی خوای پەروەردگار چەند ڕۆژێك

چوو یادی پەروەردگارت بكەوەو بڵێ: بەڵكو پەروەردگارم بەرەو سەر ڕاستیی نیزیكتر لەوە ڕێنماییم بكات.

**دووەم:** لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٥٥)دا مووسا (سەلامی خوای لێبێ) بەخوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ .. إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ .. ﴿١٥٥﴾ ﴾.

واتە: (پەروەردگارم!) ئەمە هەر تاقیكردنەوەی تۆیە! هەركەسێكت بوێ گومڕای دەكەی، وەهەركەسێكیشت بوێ ڕێنمایی دەكەی، یان دەیخەیتە سەر ڕێگای ڕاست.

واتە: ویستی خوای پەروەردگار هیچ قەیدو كۆت و بەندی لەسەر نیەو ڕەهایە، بەڵام ئایا كە ڕەهایە: پێچەوانەی عیلم و حیكمەت، خوای زاناو شارەزا بڕیارێك دەدا؟

بەتەئكید نەخێر، چونكە سیفەتەكانی خوای كاربەجێ هەموویان بەیەكەوە پەیوەستن و ویستی خوای زاناو توانا شوێن حیكمەت و زانیارییەكەی دەكەوێ، واتە: ویستی خوا بەپێی زانیاریی و حیكمەت و دادگەریی خوا، ڕوو لەشتەكان دەكا.

**سێیەم:** خوای بەرزو بێ وێنە هەر لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٨٩)دا لەسەر زمانی شوعەیب (سەلامی خوای لێبێ)، فەرموویەتی:

﴿ .. وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ... ﴿٨٩﴾ ﴾

(شوعەیب بەگەلەكەی دەفەرموێ): وە بۆمان نیە بگەڕێینەوە بۆ كوفر

---

وەحییەكەی دواخست، دوایی خوای بێوێنە ئەو ئەدەبەی فێری پێغەمبەرەكەی و (صلى الله عليه وسلم) ئۆممەتەكەی كردو پێی فەرموو: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ .. ﴿٢٤﴾ ﴾. بڕوانە: المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص ٧٩١، ٧٩٢، وە بڕوانە: جامع البيان، للطبري، ج١٧ ص ٥٩٢.

مەگەر پەروەردگارمان بیەوێ. دیارە پەروەردگاریش حەز بە كوفر ناكا، وەك دەفەرموێ:

﴿.. وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ .. ﴿٧﴾﴾ الزمر.

بەڵام بۆچی شوعەیب (سەلامی خوای لێبێ) ئەوە دەبەستێتەوە بە ویستی ڕەهای خواوە؟ ئەوە ئەدەبە لەگەڵ خوادا، یانی: ئەگەر خوا بیەوێ كەسێ كافر بێ، با ئیمانیشسی هێنابێ، كافر دەبێتەوە، بەڵام ئایا خوا لەخۆیەوە لەخەڵك بەهانەیە گومرایان بكا؟ بە دڵنیاییەوە: نەخێر.

خوای زاڵی مەزن حەز دەكا هەموو بەندەكانی ڕێی ڕاست بگرن، بەڵام وەك ئەدەب و ڕێزو حورمەت لەگەڵ خوادا نواندن، دەبێ هەموو شتەكان بگێڕیەوە بۆ ویستی خوای كاربەجێ.

■ ٢٨ ■

## زۆر یادی خوا كردن (الذكرُ الكَثير)

(الزُبَيدي) دەڵێ: {الذِّكرُ وَالذِّكرى: خِلافُ النِّسيانِ، والذِّكرُ: الحِفظُ لِلشّيءِ، وَالذِّكرُ: هو الشَّيءِ عَلى الّلسانِ، والذِّكر: الصِّيتُ في الخَيْر والشَّر}[1]، واتە: (ذكر) بەچەند واتایەك هاتوە: (الذِّكر، وَالذِّكرى) پێچەوانەی لەبیر چوونەوەیە، وە (ذكر) بەمانای پاراستنی شتێك دێ، واتە: شتێك لە زەینی خۆتدا بپارێزی، وە (ذكر) بریتیە لە شتێك كە باس دەكرێ و بەسەر زمانت دادێ، وە بەمانای ناوبانگیش دێ، ناوبانگی چاك بێ، یان خراپ.

(إبن القيم) دەڵێ: {الذِّكر: التَّخَلُّص مِن الغَفْلةِ والنِّسيان}[2] واتە: (ذكر) بریتیە لە دەرباز بوون لە بێ ئاگایی و لەبیرچوونەوە.

خوای بێ هاوەڵ لەزۆر ئایەتاندا باسی ئەوە دەكا، كە ئیماندار دەبێ زۆر یادی خوا بكاو خوای لەبیر بێ، بۆ وێنە:

یەكەم: خوا لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (٤١)دا دەفەرموێ:

﴿...وَٱذۡكُر رَّبَّكَ كَثِيرٗا وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ٤١﴾.

---

(١) تاج العروس، ج٦، ص ٣٧٦ - ٣٧٨.

(٢) مدارج السالكين - ج٢ ص ٤٥١.

واتە: زۆر یادی پەروەردگارت بکە، بەیانیان و ئێواران، بە پاکیی بگرە.

چونکە دوو کاتی زۆر سەرنج ڕاکێشن، بەیانیان ژیان بەرەو هاتن دێ، ئێواران ژیان بەرەو خامۆشیی دەچێ، لەو کاتانەدا خوای پەروەردگار بە پاك بگرە.

**دووەم:** وە خوا عز وجل لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٤١)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ﴿٤١﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بەیاد کردنێکی زۆر یادی خوا بکەن.

**سێیەم:** هەروەها هەر لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٥)دا، لە ڕیزی ئەو دە (١٠) سیفەتەدا، کە خوای پەروەردگار پیاوان و ئافرەتانیان پێ مەدح دەکا، دەفەرموێ:

﴿ .. وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ .. ﴿٣٥﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: وە ئەوپیاوانەی زۆر یادی خوا دەکەن، وە ئەو ئافرەتانەی زۆر یادی خوا دەکەن.

**چوارەم:** دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەو فەرموودەیەی لێ گێڕراوەتەوە دەربارەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

{عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ}
أخرجه مسلم: (٣٧٣)، أبي داود برقم (١٨)، و أحمد برقم (٢٦٤١٩).

دیارە هیچ کەس بەقەدەر هاوسەر، هاوسەری خۆی ناناسێ، دایکمان عائیشە ئافرەتێکی زۆر بلیمەت و شارەزاو وریا بووە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە هەموو کاتەکانیدا یادی خوای دەکرد، یانی هەمیشە زیکری خوا لەسەر دەمی موبارەکی بووە.

**پێنجەم:** پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی یادکردن و یاد نەکردنی خوا، فەرموویەتی:

{مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ، وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ، مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ} أخرجه البخاري برقم (٦٠٤٤)، ومسلم برقم (٧٧٩)، وابن حبان برقم (٨٥٤)، وأخرجه أيضًا: أبو يعلى برقم (٧٣٠٦)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٣٦)، والديلمي برقم (٦٤٤٢) .

واتە: وێنەی ئەو كەسەی یادی پەروەردگاری دەكا، وە ئەو كەسەش كە یادی پەرەوەردگاری ناكات، وەك زیندووو مردوو وان.

وەك چۆن دەگونجێ جەستە بێ ڕووح بێ، وە دەشگونجێ ڕووحی تێدا بێ، بەهەمان شێوە، دڵی ئینسانیش ژیانی ڕووحەكەی بریتیە لە یادی خوا، وەك دەفەرمویێ:

﴿.. أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾ الرعد.

واتە: ئاگاداربن! دڵان بەهۆی یادی خواوە، ئارام دەگرن و ئۆخژنیان بۆدێ.

■ ٢٩ ■

## چاك بوون (الصَّلاح)

ئینسان دەبێ هەوڵ بدا چاك بێ، ڕێك بێ، پاك بێ، ئنجا شایستەی ئەوە دەبێ بڵێ: من بەندەی خوام. ئنجا با بزانین چاك بوون (صَلاح) زانایان چۆنیان پێناسە كردوە:

(**الكَفوي**) دەڵێ: {الصّلاحُ: هوَ سلوكُ طَريقِ الهُدى، وَقيلَ: هوَ استِقامةُ الحالِ عَلى ما يَدعو إِليهِ الشَّرع والعَقْل، والصّالح: المستَقيمُ الحال في نَفسهِ. وَقيلَ: هو القائِمُ بِما عَليه مِن حقوقِ اللهِ وَحُقوقِ العِباد، وَالكمالُ في الصّلاحِ مُنتَهى دَرَجات المُؤمنين ومُتمنّى الأنبياءِ وَالمُرسَلين}[1]. واتە: (صلاح): بریتیە لە گرتنی ڕێی ڕاست، وە گوتراوە: بریتیە لە ڕاست ڕاوەستان لەسەر بەرنامەیەك كە شەرع و عەقڵ، {واتە: شەرعی ڕاست، وە عەقڵی سەلیم} داوای دەكەن، وە (صالح) بەكەسێ دەگوترێ: كە ئینسانێكی ڕێك و ڕاستە لەزاتی خۆیدا، وە گوتراوە: (صالح) كەسێكە مافەكانی خواو، مافەكانی بەندەكان جێبەجێ دەكا، وە تەواویی لە چاكییدا كۆتا پلەی بڕوادارانە، وە خۆزگەی پێغەمبەران و ڕەوانەكراوانی خوایە (سەلامی خوایان لەسەربێ).

**ئەمەش دوو نموونە لە ئایەتەكانی قورئان، لەو بارەوە:**

---

(١) الكليات - ص ٥٦١. وفتح الباري ج١٠، ص ٥٢٦.

یەکەم: لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٩٦)دا خوای پەروەردگار لەسەر زمانی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ١٩٦﴾.

واتە: بێگومان سەرپەرشتیاری من خوایە، وە هەر ئەویش سەرپەرشتیی چاکان دەکا.

دووەم: لە سوورەتی (الأنبياء) ئایەتی (١٠٥)دا خوا تبارك و تعالى دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ١٠٥﴾.

واتە: وە بێگومان ئێمە لە زەبووردا لەدوای ذکر (مەبەست پێی تەوڕاتە) نووسیومانە {وەك یاسایەك (أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ)} کە سەرزەمین بەندە چاکەکانم بە میراتی دەگرن.

دەگونجێ مەبەست لە (الأرض) سەرزەمینی دنیا بێ، ئەو کاتەش بەندە چاکەکانم یانی: ئەوانەی کە شایستەن و ئەو سیفەت و مەرجانە لەخۆیاندا دێننە دی، کە شایستەبن، وە دەشگونجێ مەبەست پێی سەرزەمینی بەهەشت بێ، کە ئەم ڕایە پێدەچێ زیاتر نزیك بێ لە ڕاستییەوە، واتە: سەرزەمینی بەهەشت لەگرەوی چاکاندایە، میراتی چاکانە، خوای پەروەردگار لە چاکانمان بگێڕێ، بە لوتف و کەرەمی خۆی. ئنجا ئینسانیش بە چی چاك دەبێ؟ وەك زانایان گوتوویانە: بەوە کە ئەو ڕێبازە چاکەی خوای پەروەردگار بگری، ئەگەرنا بەخۆزگە خواستن و بە قسەی شیرین هیچ نابێ، بەڵکو دەبێ ئینسان بەکردەوە ببێتە بەڵگەو شاهێدی چاکییەکەی.

■ ٣٠ ■

## ڕاكردن بەرەو خوا (الفِرار إلى الله)[١]

(إبن القيم) دەڵێ: {حَقيقةُ الفِرارِ: الهَرَبُ مِن شَيءٍ إلى شَيء} واتە: حەقیقەتی ڕاكردن بریتیە لەوەی لە شتێكەوە بۆ شتێك ڕابكەی.

ئەم سیفەتەم لە قورئاندا لە سوورەتی (الذاریات)دا هێناوە، كە خوا دەفەرموێ:

﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ٥٠ ﴾.

واتە: بۆلای خوا ڕابكەن، من لەوەوە بۆ ئێوە، ترسێنەرێكی ئاشكرام، یاخود وریاكەرەوەیەكی ئاشكرام.

(الطبري) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: {أُهْرُبوا أَيُّها النّاس! مِن عِقابِ اللهِ إلى رَحمتهِ، بِالإيمان بِه وَاتِّباعِ أَمرهِ بِطاعتهِ}[٢]، واتە: ئەی خەڵكینە! لە سزاو تۆڵەی خوا بۆ لای بەزەیی خوا ڕابكەن، بەهۆی ئیمان پێهێنان و شوێن كەوتنی فەرمانی خواو ئەنجامدانی فەرمانبەریی بۆ خواوە.

كەواتە: كە خوا دەفەرموێ:

﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾.

---

(١) ئەو ناوو نیشانە ڕەنگە بۆ هەندێ كەس سەیر بێ، ئینسان چۆن بەرەو خوا ڕابكا؟!.

(٢) تفسير الطبري، ج١١، ص ٤٧٣.

نەك ئەوە بێتە بەرچاو کە خوا لەشوێنێکەو تۆش بەرەو وێ ڕادەکەی! بەڵکو یانی: بەرەو تاعەتی خوا، بەرەو ئیمان بەخوا، بەرەو ڕەزامەندیی خوا ڕابکە، وە لەچەنگ ئەو شەیتان و نەفس و ئەو هۆکارانە ڕابکە، کە لەخوات دوور دەکەنەوەو بەرەو خوا بچۆ، وەك لەشوێنی دیکەدا خوا دەفەرموێ:

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ .. ﴿١٣٣﴾﴾ آل عمران.

واتە: وە خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك لەخواوە.

(مسارعة) واتە: خێرایی کردن، (فرار)یش واتە: ڕاکردن. یانی: بە مردەڵۆخەیی و بەکاوە خۆ، بەرە خوا مەچن، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و گوێڕایەڵیی کردن و، خۆپاراستن لە قەدەغەکراوەکان، بەڵکو بەدەست و بردیی و بە گورج و گۆڵیی، بچن.

■ ٣١ ■

## خێرایی كردن لە چاكاندا (المُسارعة في الخَيرات)

**جارێ با بزانین وشەی (السُّرعة) لە چییەوە هاتوە؟:**

(**فیروز آبادي**) دەڵێ: {السُّرعة: ضِدُّ البُطءِ، وَتُستعملُ في الأجسامِ يقال: سَرُعَ فهو سَريع، أَسْرَعَ: فهوَ مُسْرِعٌ، سَرَعانُ النّاس: أَوائِلُهُم الّذين يُسارِعون إِلى الشّيء}[1]، واتە: سورعەت (كە لە كوردیشدا هەر بەكاری دەهێنین) پێچەوانەی سستییە، هەم لەشتە مادديیەكاندا بەكاردێ، هەم لە كردەوانیشدا بەكاردێ، دەگوترێ: (سَرعَ يَسْرَعَ: فهو سريعٌ)، (وأَسْرَعَ يُسْرِعُ فَهوَ مُسْرِعٌ) لەڕووی زمانەوانییەوە، هەم بە فعلێكی سێیانیی (ثلاثي)و هەم بە چواریی (رباعي)ش هاتوە، خێرایی كرد، خێرایی دەكات، ئەو خێرایە، (سَرعانُ النّاس) ئەوانەن كە كاتێ ئیمام سڵاو دەداتەوە، زوو لە مزگەوت دەچنە دەرێ، كە ئەوە زەم كراوە، یاخود بە پێچەوانەوە: ئەوانەی كە بۆ كاری خێرو چاكە پێش خەڵكی دەكەون، پێیان دەگوترێ: (سَرَعانُ النّاس) كە كۆی (سَريع) یان (مُسرعَ)ە، واتە: خەڵكی پەلەكار.

دەربارەی (المُسارعة في الخَيرات) گوتراوە: {المُسارعة في الخيرات: هيَ مُبادرة الطّاعات والسَّبقِ إِليها والإستعْجالُ في أَدائِها وَعدَم الإبطاءِ فيها أو تَأْخيرها}[2]،

---

(١) بصائر ذوي التمييز، ج٣ ص ٢١٤.

(٢) نضرة النعيم، ج٨، ص ١٣٨٨.

واتە: (الُمسارعة في الخَيرات): یانی: پەلە كردن لەكاری چاكەدا، بریتیە لە دەستپێشخەریی لە فەرمانبەرییداو، پێشكەوتنەوە لە خەڵك بەرەو چاكەكان، وە پەلە كردن لە جێبەجێ كردنیاندا، وە سستیی نەنواندن و دوا نەخستنیان.

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (المؤمنون) ئایەتەكانی: (٥٧-٦١)دا پێناسەی ئەوانەمان بۆ دەكات كە خێرایی دەكەن لە چاكەكانداو دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئەوانەی كە لەسام و هەیبەتی پەروەردگاریان مات بوون و بەترس و لەرزن، وە ئەوانەی كە بڕوا بە ئایەتەكانی پەروەردگاریان دێنن، وە ئەوانەی كە هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دانانێن، وە ئەوانەی هەرچی كردەوەی باشە ئەنجامی دەدەن، بەڵام دڵیان هەر لە مستێ دایەو بیمیان هەیە، چونكە دەزانن دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان (نازانن كردەوە باشەكانیان لێ وەردەگیرێ، یان نا؟) ئا ئەوانەن كە خێرایی دەكەن لە چاكانداو پێش خەڵكیش دەكەونەوە.

ئێمە سێ وشەمان هەن: (المُسارَعة والمُسابَقة والمُبادَرة)، یانی: خێرایكردن، پێشبڕكێكردن، دەست پێشخەریكردن، مانایەكانیان لێك نزیكن، بەڵام یەك نین.

■ ٣٢ ■

## بەدوورگرتنی خوا لە هەر کەم و کورتییەك (التَّسبيح)

(إبن حجر) دەڵێ: {التّسبيحُ: يَعني قولُ (سُبحان الله) ومَعناه تَنزيهُ اللهِ عَمّا لا يَليقُ بهِ مِن كُلِّ نَقصٍ، فَيَلزمُ نَفيُ الشَّريك، والصاحِبة، وَالوَلد، وجميعُ الرَّذائِل}[1]، واتە: وشەی (تسبيح) ئەوەیە، کە تۆ بڵێی: (سُبحان الله)، وە مانای (سُبحان الله) ئەوەیە، کە تۆ خوا بەپاك بگری لە هەر شتێك، کە لێی ناوەشێتەوە، وە لەهەر شتێك کە کەم و کورِیی دەگەیەنێ، کەواتە: بەدوورگرتنی خوا لەکەم و کورِیی، واتە: هاوبەشی لێ دووربخەیەوە، هەروەها هاوسەرو ڕۆڵە، وە هەرچی سیفەتی ناتەواویی و ناپەسندە.

**ئەمەش نموونەیەك لە ئایەتەکانی قورئان لەو بارەوە:**

خوا لە سوورەتی (النمل) ئایەتی (٨)دا، دەفەرموێ:

﴿.. وَسُبۡحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَـٰلَمِينَ ٨﴾.

وە پاکیی و بێ عەیبیی بۆ پەروەردگاری جیهانییان.

---

٩١) فتح الباري - ج١١، ص ٢١٠.

■ ٣٣ ■

## بەپاك گرتنی خوا، لەهەر هەڵەو پەڵەیەك (التَّقديس)

(الرازي) لەبارەی پێناسەو مانا کردنی وشەی (تقديس)ەوە گوتوویەتی: {التّقديس: التّطهيرُ، قَدّسهُ: طَهّرهُ، وطيَّبهُ، وَهوَ قَريبٌ مِنَ التَّسبيحِ، لكِن التَّسبيحُ يُعطي مَعنى الإبعادِ أَي: إبعادُ اللهِ عَمّا لا يَليقُ بِه}[1]، واتە: (التّقديس) یانی: (التّطهيرُ) پاككردنەوە، (قَدّسهُ) یانی: بەپاکی گرت و بە چاکی دانا، (تقديس) لە (تسبيح)ەوە نزیکە، بەڵام (تسبيح) مانای دوورخستنەوە دەگەیەنێ، واتە بەدوورگرتنی خوا لەهەر کەم و کوڕییەك، بەڵام (تَطهير) یانی: بەپاك گرتن.

**نموونەیەك لە قورئان لەو بارەوە:**

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحشر) ئایەتی (٢٣)دا دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾.

وەك دەبینین: یەکێ لە سیفەتەکانی خوا، بریتیە لە (ٱلْقُدُّوسُ ) واتە: بێ پەڵە، بێ عەیب، پاك بێ کەم و کوڕیی.

---

(١) مختار الصحاح، ص ٤٥٥.

■ ٣٤ ■

## ستایش کردنی خوا (التَّحْميد)

(**الجرجانـي**) دەڵێ: {الحَمد: هوَ الثّناءُ عَلى الجَميلِ مِن جِهةِ التَّعظيمِ مِن نِعمةٍ وغَيرِها}[١]، واتە: (حَمد) بریتیە لە ستایش کردنی کەسێك لەسەر شتێکی جوانی، لەو ڕووەوە کە بەگەورەی دەگری، یاخود لەبەر ئەوەی ئەو کەسە لەگەڵ تۆدا یان لەگەڵ جگە لە تۆدا چاکەیەکی کردوە.

(**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: {الحَمدُ لله تَعالى: هُوَ الثَّناءُ عَليهِ بِالفَضيلة}[٢]، واتە: ستایش کردنی خوای مەزن ئەوەیە: کە تۆ مەدحی بکەی پێی هەڵابڵێی، بەو چاکانەی کە هەیەتی.

(**إبن القيم**) دەڵێ: {الحَمدُ: إخبارٌ عَن مَحاسِن المَحمودِ مَع حُبِّه، وَإجلالِهِ، وتَعظيمِهِ}[٣]، واتە: ستایش کردنی خوا: ئەوەیە کە تۆ هەواڵ بدەی، لە چاکەکان و سیفەتە بەرزو پەسندەکانی ئەو کەسەی کە ستایشی دەکەی، لەگەڵ خۆشویستن و بەشکۆمەند دانان و بەمەزن گرتنیدا[٤].

---

(١) التعريفات، ص٩٣.

(٢) المفردات، ص ٢٥٦.

(٣) بدائع الفوائد، ج٢ ص ٩٣.

(٤) ئەو پێناسەیانم لەهەموویان پێ جوانترە.

ئەوەش نموونەیەکی ئایەتەکانی قورئان لەبارەی ستایش کردن (تحمید)ی خواوە:

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الفاتحة)دا لەسەر زمانی بەندەکانی، دەفەرموێ:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾.

واتە: ستایش، (مەدح و سەنا) بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.

■ ٣٥ ■

## بەگەورە گرتنی خوا (التَّكبير)

(إبن فارس) دەڵێ:{التَّكبيرُ: مَصدر كَبَّر وَهو مَأخوذٌ من مادّة (ك، ب، ر) الّتي تَدلُّ عَلى خِلافِ الصِّغَرِ، إذا كان الصِّغَر يَدلُّ عَلى القِلّةِ وَالحَقارة، فَإنَّ الكِبَرَ يَدُلُّ عَلى الكَثْرةِ والعَظمة}[1]، واتە: (تكبير) چاوگی (كَبّر)یە، (كَبّر) واتە: بەگەورەی گرت، ئەویش لە ماددەیەك هاتوە كە لەسێ پیت پێك دێ، (ك، ب، ر) كە دەلالەت لەسەر پێچەوانەی بچووكیی دەكا، {یانی دەلالەت لەسەر گەورەیی و مەزنیی دەكا}، ئەگەر بچووكیی: كەمیی و زەبوونیی، بگەیەنێ، گەورەیی: زۆریی و مەزنیی، دەگەیەنێ.

**ئەمەش دوو نموونەی ئایەتەكانی قورئان لەبارەی بە گەورە گرتن (تكبير)ی خواوە:**

**یەكەم:** لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ:

﴿... وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا ﴿١١١﴾﴾.

واتە: بەبەگەورە گرتن، خوا بەگەورە بگرە.

**دووەم:** هەروەها لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٨٥)دا دەفەرموێ:

---

(١) المقاييس، ج٥ ص ١٥٣.

﴿.. وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾﴾.

خوا لە باسی مانگی ڕەمەزاندا، کە زۆر لە زانایان گوتوویانە: ئەوە ئامەژەیە بۆ (الله أكبر) گوتنەکانی ڕۆژی جەژن، دەفەرمویٚ: وە (خوا ئەو بڕیارانەی داون) بۆ ئەوەی خوا بەگەورە بگرن، لەسەر ئەوەی کە ئێوەی ڕێنمایی کردوە، وە بۆ ئەوەش کە سوپاسگوزارو شوکرانە بژێر بن.

ئنجا کە دەڵێین: (اللهُ أَكبر) کە دیارە بانگیش هەر بە (اللهُ أَكبر) دەست پیٚ دەکا، لە سەرەتایەکەیەوە چوار جار دووبارە دەبێتەوە، وە لەکۆتاییەکەیدا دوو جار، واتە: خوا گەورەترە، ئەو (خوا گەورەترە) بەو واتایە نیە کە خوا لە فڵان شتەو فڵان شتە، گەورەترە، بەڵکو خوا گەورەترە بە ڕەهایی، نەك بەبەراورد لەگەڵ دروستکراوەکانیدا، واتە: ئەو پەڕی گەورەیی و مەزنیی هەر هی خوایە، لەڕووی زاتیەوە، لەڕووی ناوو سیفەتەکانیەوە، لەڕووی بەرنامەکەیەوە، لەڕووی کردەوەکانیەوە، لەڕووی قەدەرەکانیەوە، لەهەموو ڕووەکانەوە، خوای گەورەو مەزن ئەو پەڕی مەزنیی و گەورەیی هەیە، مادام هیچ شتێك وەك خوا نەبیٚ.

کەواتە: لە هەموو ڕوویەکەوە، هیچ شتیٚ وەك خوا نیە، وە هەموو شتێکیش هەر هی ئەوەو، لەژێر ڕکێفی ئەودایە، چونکە ئەو، بەرزیی و گەورەیی و مەزنیی ڕەهاو بیٚ سنووری هەیە.

■ ٣٦ ■

# بەمەزن گرتنی دروشمەكانی خوا (تَعْظيم حُرُماتِ الله)

(إبن فارس) دەڵێ: {التّعظيم: مصدر عَظَّم، بِمعنى فخَّم، وبجَّل، ومادّة (ع، ظ، م) تَدورُ حَول مَعنى الكِبَرِ والقُوّة}[1]. واتە: وشەی (التّعظيم) چاوگی (عَظم)یە، ئەویش بەمانای (فخَّم) وە (بَجَّل) دێ، ڕەنگە ئێمە بۆ كوردییەكەی هەموو ئەو وشانە، مانایەكانیانمان چنگ نەكەوێ، (فخَّم) واتە: فەخامەت و گەورەیی پێشان دان، (بَجَّل) واتە: زۆر بە حورمەت و بەڕێزو بە پایەبەرز وەسف كردن، ئەو ماددەیەی كە لەو سێ پیتە پێك دێ (ع، ظ، م) هەموو مانایەكانی لەدەورەی گەورەیی و هێز دەسووڕێن.

(إبن منظور) دەربارەی وشەی (الحُرمات) دەڵێ:{(الحرُمات) جَمع (حُرْمَة) وَهي ما لا يَحِلُّ انتهاكُه، وَهيَ: مَأخوذةٌ مِن مادّة (ح، ر، م) الّتي تَدورُ حوَل مَعنى الحَرامِ والتَّشديد}[2]، واتە: (الحُرُمات) كۆی (حُرْمة)یە، (حُرْمة)یش هەر شتێكە دروست نەبێ دەست درێژیی بكرێتە سەر، لە ماددەی (ح، ر، م) وەرگیراوە، كە مانایەكەی لەدەوری نەهێشتن و توند گرتندا دەخولێتەوە.

---

(١) مقاييس اللغة، ج٤، ص٣٥٥.

(٢) التحرير والتنوير، ج١٧، ص٢٥٢.

(محمد الطاهر بن عاشور) دەڵێ: {(الحُرُمات) جَمع (حُرُمَة) وذُكِر أنَّ مَعناها ما يَجِبُ احْترامهُ، والإحترام: هوَ اعْتبارُ شَيءٍ ذو حَرَمٍ، وذلِك كِنايَةٌ عَن عَدَمِ الدُّخول، أي: عَدَم انتهاك مُخالفة أَمرِ اللهِ في شأنه}[1]، واته: (حُرمات) كۆی (حُرُمَة)یه، مانایەكەی ئەوەیە ئەو شتەی پێویستە ئیحتیرامی بگیرێ، ئیحتیرامیش ئەوەیە: ئەو شتە بە خاوەن (حَرَم) دابنرێ، یانی: شوورەیەكی هەیەو نابێ ئەو شوورەیە بشكێنرێ، واتە: نابێ بچیە نێو ئەو بازنەیەوە، بەو واتایە كە نابێ بەكەم تەماشا بكرێ، بەوە كە سەرپێچیی لە فەرمانی خوای پەروەردگار بكرێ لەبارەیەوە.

**ئەمەش دوو نموونە لە ئایەتەكانی قورئان لەو بارەوە:**

یەكەم: لە سوورەتی (الحج)دا لە ئایەتی (٣٠)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ .. ﴿٣٠﴾ ﴾.

واتە: ئەوە بەو جۆرەیە، وە هەركەسێ حورمەتەكانی خوا بەمەزن بگرێ، ئەوە چاكترە بۆی، لەلای پەروەردگاری.

یانی: ئەو شتانەی كە خوا ڕێزی لێناون، تۆش دەبێ ڕێزیان لێ بنێی، وەك چۆن خوا (سبحانه و تعالى) ڕێزی لە حەڕەمی مەككە و حەڕەمی مەدینە ناوە، هەر بەو جۆرە ڕێزیشی لە خوێن و كەڕامەتی ئینسانەكان ناوە، وە ڕێزی لە مافەكانیان ناوە، ئنجا تۆش دەبێ هەرچی خوا ڕێزی لێناوە، ڕێزی لێ بنێی، هەندێ كەس وا دەزانێ خوا تەنها ڕێزی لە كەعبەو مزگەوت و قورئان ناوە، نەخێر، خوا تبارك و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ...﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: بەدڵنیایی ئێمە ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە.

هەڵبەتە وەچەی ئادەمیش كە خوای پەروەردگار ڕێزی لێناوە، پێویستە حورمەتی بپارێزرێ، هەر كەس و هەر ئادەمزادێك بێ: كافربێ، مسوڵمان بێ، چونكە خوا بە ڕەهایی (مطلق)ی باسی كردوە.

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٧، ص٢٥٢.

دووەم: خوا لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٣٢)دا، دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾.

واتە: ئەوەی باسکرا بەو شێوەیە بوو، وە هەرکەسێ دروشمەکانی خوا بەمەزن بگرێ، ئەوە لە پارێزکاریی دڵەوەیە، واتە: پارێزکاریی لە دڵ و دەروونیدا هەیە، بۆیە دروشمەکانی خوا بەمەزن دەگرێ.

کەواتە: حورمەتەکان و دروشمەکانی خوا، دەبێ بە مەزن بگیرێن، ئەوەش یەکێکی دیکەیە لەو سیفەتە مەزنانەی کە ئینسان دەبێ مامەڵەیان پێ لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بکات: کە هەرشتێ خوا ڕێزی لێناوە، تۆش دەبێ ڕێزی لێ بنێی.

بۆیە ئەوانەی کە بەبێ ئەدەبیی باسی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکەن، باسی ئیسلام و مزگەوت و قورئان دەکەن، باسی هەر شتێ دەکەن کە خوا ڕێزی لێناوە، ناتوانن لافی مسوڵمانەتیی لێ بدەن، مسوڵمان کەسێکە، هەر شتێ خوا ڕێزی لێناوە، ئەویش ڕێزی لێ دەنێ، تۆ ئەگەر مسوڵمانی، دەبێ بە پێوەری خوا شتەکان بکێشی و بپێوی، نەك بە هەنجەتی ئازادیی ڕادەربڕینەوە، ڕێزی هیچ شتێکت لەلا نەبێ، ئازادیی ڕادەربڕینیش دەبێ حورمەتی هەبێ و، هەموو ئینسانێك بۆی هەبێ تەعبیر لەناخی خۆی بکا، دەبێ بۆی هەبێ بیرو ڕای خۆی دەربخات، ئەوە شتێکە، بەڵام بەسووك تەماشا کردنی پیرۆزییەکانی خەڵکی دیکەو ئیهانە پێکردنیان، ئەوە شتێکی زیادەیە لە بیروڕا دەربڕین، ئەوە پێشێل کردنی مافی خەڵکی دیکەیە، گوتراوە: مافی تۆ لەو شوێنە کۆتایی دێ، کە مافی خەڵکی دیکە دەست پێ دەکا.

## ٣٧

# پاراستنی سوێند (حِفظُ اليَمين)

(**إبن حجر**) لەو بارەوە گوتوویەتی: {حِفظُ اليَمين: ضَبْطُ المَحلوفِ عَلَيهِ في النَّفس، فَلا يَحْنَثُ وإذا حَنَّثَ كَفَّر}[١]، واتە: پارێزگاریی کردن لەسوێند، ئەوەیە ئەو شتەی سوێندت لەسەری خواردوە {دەیکەم یان نایکەم} بیپارێزی و سوێندەکەت نەشکێنی، وە ئەگەر سوێندەکەت شکاند، {ئەو شتەی گوتووتە: نایکەم پێویست بوو بیکەی، یان بەپێچەوانەوە}[٢]، ئەو کاتە کەفارەت بدەی.

### جۆرەکانی سوێند خواردن

**سوێند خواردن بەگشتی سێ جۆری هەیە**[٣]:

**جۆری یەکەم: اليمين الغموس:** {هوَ الحَلِفُ على فِعلٍ، أَو تَركٍ ماضٍ، كاذِباً}، سوێندی غەمووس {ئەو سوێندەی کە خاوەنەکەی غەرق دەکا لە گوناهدا}، ئەوەیە: کە کەسێك بەدرۆ بڵێ: ئەو شتەم کردوە، یاخود نەکردوە.

---

(١) فتح الباري، ج١١ ص ٥٠٤.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.

(٣) لە تەفسیرە کوردییەکەی خۆم: {تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز} بەرگی چوارەمدا، کە تایبەتە بەتەفسیری سوورەتی (المائدة)وە، لە تەفسیری ئایەتی (٨٩)دا بە تەفصیل باسی سوێندم کردوە.

**جۆری دووەم: اليمين اللّغو:** {ما يحَلفُ ظانّاً أَنَّهُ كَذا، وهو خِلافه، أَو: ما لا يَعْقِدُ الرّجل قَلْبَهُ عَليهِ، كَقوله: لا وَاللهِ، بَلا واللهِ} سوێندی لەغوو زانایان بەدوو شێوە پێناسەیان کردوە:

یەك: شتێك پێی وابێ وایەو، سوێندیشی لەسەر بخوا، بەڵام بەهەڵەدا چووبێ، یاخود بڵێ: وانیە، بەڵام واشبێ، واتە: لە شتێکدا بەهەڵەدا چووبێ، بەڵام سوێندیشی لەسەر بخوا.

**دوو:** یاخود ئەو سوێندەیە کە ئینسان دڵی لەسەر دانامەزرێنێ، وەك ئەوەی بڵێ: بەخوا وادەبێ، یان بەخوا وانابێ، بێ ئەوەی دڵی لەسەر بچەسپێنێ، ئەو جۆرە سوێندە سزای لەسەر نیە، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ قُلُوبُكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿٢٢٥﴾ ﴾ البقرة.

واتە: خوا سزاتان نادا بەهۆی سوێندە پووچەکانتانەوە، واتە: ئەو سوێندانەی کە دڵتان لەسەر نەچەسپاندوون، یاخود ئەو سوێندەی کە تێیدا بەهەڵە داچوون. بەڵام ئەوەی کە زۆر گوناهە (اليمين الغموس)ە.

**جۆری سێیەم: اليمين المنعقدة:** سوێندی دامەزراو {الحَلفُ عَلى فِعل أَو تَركِ آتٍ} واتە: ئەوەیە سوێند بخۆی کە لە داهاتوودا کارێك بکەی، یان نەیکەی[1].

خوای پەروەردگار فەرمانی کردوە بە پاراستنی سوێند، فەرموویەتی:

﴿ ...وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ .. ﴿٨٩﴾ ﴾ المائدة.

واتە: سوێندەکانتان بپارێزن.

---

(١) جۆرەکانی سوێندو پێناسەکانیان (فتح الباري) ج١١،ص ٥٠٤ هێناویەتی.

سوێندیش بەم جۆرەی خوارێ دەپارێزرێ:

أ- کە ئەگەر ناچار نەبی، سوێند نەخۆی.

ب- سوێند لەسەر شتێکی چاك نەخۆی کە نایکەم، وە سوێند لەسەر شتێکی خراپ نەخۆی، کە بیکەی، وە هەرکاتێ بۆت دەرکەوت، ئەو شتەی سوێندت خواردوە بیکەی، خراپە، یان بەپێچەوانەوە، ئەوە کەفارەت بدەی و، سوێند خواردنەکەت نەبێتە هۆکاری چاکە نەکردنت، یان خراپە کردنت!

ج- هەرکاتێ سوێندت خوارد کارێك بکەی و کارەکەش چاك بوو، یان بە پێچەوانەوە: سوێندت خوارد کارێك نەکەی و کارەکەش خراپ بوو، ئەوە سوێندەکەت بهێنیە جێ و لەسەری بڕۆی و کەفارەت نەدەی.

سوێند بەچی دەخورێ؟

سوێند دەبێ تەنیاو تەنیا بە خوای بەرزو مەزن، یان بە سیفەتەکانی بخورێ، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ} أخرجه البخاري برقم (٦٢٧٠).

واتە: هەرکەسێ سوێند دەخوا، با سوێند بەخوا بخوا، یان بێدەنگ بێ.
ئنجا کە سوێند بەخوا بخورێ، دەبێ مرۆڤ ئەدەب و حورمەتی هەبێ بەرامبەر سوێندەکەی.

## ٣٨ ■ گوێ بۆ خوا گرتن (السَّمع)

## ٣٩ ■ فەرمانبەریی کردنی خوا (الطاعة)

گوێ بۆ خوا گرتن (السّمع): واتە: بیستن و پەسند کردن. وە فەرمانبەریی کردن (الطاعة) واتە: بەقسە کردن و جێبەجێ کردن.

(الجرجاني) دەڵێ: {الطّاعةُ: فِعلُ المَأموراتِ ولَو نَدباً، وَتركُ المَنهيّات ولَو كَراهةً}[١] واتە: (طاعة) ئەنجامدانی فەرمان پێکراوەکانە، ئەگەر مەندووبیش[٢] بن، وە واز لێهێنانی قەدەغەکراوەکانە، ئەگەر ئەو قەدەغەکراوە ناپەسندیش[٣] بێ.

(إبن عَلاّن) دەڵێ: { الطّاعةُ: هيَ الإمتِثالُ ظاهراً، وَالرِّضى باطِناً لِحُكْمِ اللهِ ورَسوله، وَما يقولُهُ مَن دَعى إلى ذلِك}[٤]، واتە: (طاعة) بریتیە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی بە ڕواڵەت، وە ڕازی بوون بەو حوکمانە لە دەروونداو، وە هەروەها هەر کەسێك کە خەڵك بۆ ئەوە بانگ دەکا، بە ڕواڵەت بەقسەی بکەی، وە لەدەروونیشەوە پەسەندی بکەی.

**لە قورئاندا خوای پەروەردگار وەسفی ئیماندارانمان بۆ دەکا، بەو دوو سیفەتە، بۆ وێنە:**

---

(١) التعريفات - ص ١٤٥.

(٢) ندب: واتە: شتێك ئەگەر بیکەی، خێرت دەگا، ئەگەر نەیکەی گوناهت ناگا.

(٣) مكروە: ئەوەیە ئەگەر وازی لێبێنی، خێرت دەگا، ئەگەر بیکەی، گوناهت ناگا.

(٤) دليل الفالحين - ج١ ص٤٣٠.

یەكەم: خوای كارزان لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٨٥)دا، ئاوا باسی پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) و بڕواداران دەكات، دەفەرموێ:

﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥﴾.

واتە: پێغەمبەرو بڕواداران بڕوایان بەوە هێنا، كە لە پەروەردگارییەوە بۆی دابەزێنراوە، هەركامیان بڕوای هێنا بە خواو فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانی، گوتیان: جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ كام لە پێغەمبەرەكانی (خوا)وە، وە گوتیان: بیستمان و فەرمانبەرییمان كرد، پەروەردگارمان! لێبوردنت داوا دەكەین، وە سەرەنجام هەر بۆ لای تۆیە.

بەڵێ، بەڕێزان!

قسەی ئیمانداران ئەوەیە كە بڵێن: (سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا) واتە: بیستمان و فەرمانبەرییمان كرد، (سَمِعۡنَا) واتە: بیستمان، فەرمانەكەمان قەبووڵ كرد، (وَأَطَعۡنَا) واتە: جێبەجێشی دەكەین.

دووەم: هەروەها لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٥١)دا، دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥١﴾.

واتە: بێگومان قسەی ئیمانداران هەر ئەوەیە، كاتێك بانگ بكرێن بۆ دادوەریی لە نێوانیانداكردنیان لەلایەن خواو پێغەمبەرەكەیەوە، كە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین، بەڕاستی هەر ئەوانە سەرفراز و سەركەوتون.

## ٤٠

# پەنا بەخوا گرتن (الإستعاذة بِالله)

(**عبدالرحمن بن حسن**) دەڵێ: {الإستعاذةُ: هيَ اللُّجوءُ إلى اللهِ عَزَّ وَجل، والإعتِصامُ بهِ مِن شَرِّ كُلِّ ذي شَرٍ}[1]، واتە: (الإستعاذة) واتە: پەنا بەخوای زاڵ و خاوەن شکۆ گرتن، وە خۆ پێ پاراستنی لە خراپەی هەر خاوەن خراپەیەك.

وەك خوا تبارك و تعالى لە سوورەتی (فصلت) ئایەتی (٣٦)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٣٦ ﴾.

واتە: وە هەرکاتێ لە شەیتانەوە دنە[2] درای، (دنە دانێکت بۆ هات)، پەنا بەخوا بگرە، بێگومان هەر خوا بیسەری زانایە.

یانی: قسەکەت دەبیستێ کە پەنای پێ دەبەیە بەر خوا، وە دەشزانێ چی لەدڵ و دەروونتدا هەیە، وە بە پیلان و فێڵی شەیتانیش زانایەو دەتپارێزێ.

---

(١) قرة عیون الموحدین، ص ٥٥.

(٢) (نزغ) وەك (نخس) بریتیە لەوە کە نینۆکێك، یان پەنجەیەك لە کەسێك بژەنی، یان ئەگەر گوێدرێژێك یان وڵاخێك بتەوێ لێی بخوڕی، ئەوەی کە نەقیزەی تێوە دەژەنی، پێی دەگوترێ: (نَزغ) یان (نخس)، سەیری (مختار الصحاح) بکە ص ٦٥١و ٦٥٤.

■ ٤١ ■

## یارمەتیی لەخوا خواستن (الإستعانة بِالله)

(إبن تيمية) بەمجۆرە چەمك و واتای (إستعانة) ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ: {الإستِعانة: طَلَبُ العَونِ مِنَ اللهِ، وَيُطْلب مِن المَخلوقِ ما يَقدِر عَليه مِن الأُمور}[1]، واتە: (الإستِعانة): ئەوەیە داوای یارمەتیی لەخوا بکەی، وە دروستکراوەکانیش هەر ئەوەیان داوا لێدەکرێ، کە لەتوانایاندا هەیە.

خوای بەدیهێنەر لەسەر زمانی بەندەکانی و بۆ فێرکردنیان، دەفەرموێ:

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة.

واتە: هەر تۆ دەپەرستین و داوای یارمەتیی هەر لەتۆ دەکەین، {بۆ ئەو شتانەی کە تەنها بەخوا دەکرێن}، بەڵام تۆ بڵێی: فلان کەس! ئەو شتەم بدە دەست، یان: بۆ فلانە کار هاوکاریم بکە، ئەوە ئاساییە، مادام لەتوانای ئینساندایە، بەڵام شتێك تەنها بەخوا بکرێ، دەبێ تەنیا لەخوا داوابکرێ، بۆ وێنە: شیفا، سەرخستن، ژێر خستن، بەرزکردنەوەو، نزم کردنەوە، دەوڵەمەندکردن، هەژارکردن، بەڵام هۆکارەکانیش دەوری خۆیان دەبینن و، ئەویش هەر خوای بەدیهێنەر وای کردوە ئەو هۆکارە ئەو ڕۆڵە ببینێ.

---

(١) مجموع الفتاوى، ج١ ص ١٠٣.

■ ٤٢ ■

## داوای چاكەو ڕێنمایی لە خوا كردن (الإستخارة)

(إبن حجر العسقلانی) ئاوا مانای وشەی (إستخارة) دەكات:{الإستخارة: طَلَبُ خَيْر الأَمرَين، لَمّا احتاجَ إلی أَحدِهِما}[1] واتە: (الإستخارە) ئەوەیە كەسێك كە دوو ئیشی لەپێشن، داوا بكا كامیان چاكترە، خوای بەخشەر بیخاتە دڵی و بۆی ئاسان بكات، پێویستیی بەیەكێ لەو دوانەیە، نازانێ كامیان بكا؟!.

هەڵبەتە لێرەدا پێویستە هەموو لایەك بزانین: داوای چاكە لەخوا كردن، لەحاڵێكدا دەكرێ، كە چاكیی ئەو كارەی بەتەمای بیكەی، بۆتۆ دیار نەبێ، بەشەرع یان بەعەقڵ، بەڵام بۆ وێنە: تۆ تینووتە، ئایا ئاو بخۆیەوە، یان نەخۆیەوە؟ ئەوە پێویست ناكا ئیستیخارەی بۆ بكەی، یاخود سەفەری حەجت دێتە پێش، چاكییەكەی دیارە.

یان بە پێچەوانەوە كارێك خراپییەكەی دیاربێ، پێویست ناكات ئیستیخارەی بۆ بكەی، ئیستیخارە لە حاڵێكدا دەكرێ، كە تۆ لە دووڕیانێكدای، نازانی ئەو شتە بكرێ، یان نا؟

---

٩١) فتح الباري - ج١١ ص ١٨٧.

**لەو بارەشەوە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە ئایەتێکی قورئان و دەقێکی سوننەت بکەم:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٥٤)دا، دەفەرموێ:
﴿ ...وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ ﴾.

واتە: بێگومان خوا ڕێنماییکاری ئەوانەیە کە ئیمانیان هێناوە بۆ ڕاستە شەقام،

واتە: دەیانخاتە سەر ڕاستە شەقام.

مانای وایە: ئەگەر ئێمە داوای هاوکاریی و یارمەتیی لەخوا بکەین: کە ئەو دوو، یان چەند کارە، کامیان ڕاستە؟! ئەوە شتێکی باشمان کردوە، چونکە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ئەوانەی کە ئەهلی ئیمانن، خوای پەروەردگار ڕێنماییان دەکات بەرەو ڕێی ڕاست و، ڕێی ڕاستیان پیشان دەدا لە هەموو ڕوویێکەوە.

**دووەم:** لەبارەی ئیستیخارەوە، ئەو فەرموودەیە هاتوە، کە ئەوەی من ئاگادار بم، تاکە فەرموودەیە، لەو بارەوە:

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا الِاسْتِخَارَةَ فِي الْأُمُورِ كُلِّهَا، كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: (إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ! إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ! إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ، خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاقْدُرْهُ لِي، وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ، شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاصْرِفْهُ عَنِّي، وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أَرْضِنِي، قَالَ وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ)} أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٢٩٤٠٣)، وأحمد برقم (١٤٧٤٨)، والبخاري برقم (٦٩٥٥) ، وأبو داود برقم (١٥٣٨)، والترمذي برقم (٤٨٠) وقال: حسن صحيح غريب، والنسائي برقم (٣٢٥٣)، وابن ماجه برقم (١٣٨٣)، وابن حبان (برقم ٨٨٧).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئیستیخارەی فێر دەکردین لەهەموو کارێکدا (کە پێویستی بە ئیستیخارە بێ) وەك چۆن سوورەتێکی قورئانی فێر دەکردین، دەیفەرموو: هەرکامێك لە ئێوە ویستی کارێك ئەنجام بدا، با دوو ڕکعات نوێژ بکا جیا لە هی فەرز، دوایی بڵێ: (دوای سلاو دانەوە لە نوێژەکەی): ئەی خوایە! من داوای خێرو چاکە لەتۆ دەکەم بە زانیارییت، وە داوای دەسەڵاتت لێ دەکەم، بە دەسەڵاتی خۆت، وە لە بەخششی مەزنی تۆ داوا دەکەم، بێگومان تۆ دەتوانی و من ناتوانم، وە تۆ دەزانی و من نازانم، تۆ زۆر زانای بە هەموو نهێنییەکان، ئەگەر دەزانی ئەو کارەم (ناوی کارەکەشی دەهێنێ) بۆ دنیاو دینداریيم چاکە {یاخود فەرمووی: بۆ ئێستام و بۆ دوایەم}، ئەوە بۆمی ئاسان بکەو بەنسیبم بکە، بەڵام ئەگەر دەزانی ئەو کارە بۆمن خراپە بۆ دینم، وە بۆ ژیان و گوزەرانم، وە بۆ سەرەنجامم، {یاخود فەرمووی: بۆ ئێستام و بۆ دوایەم}، ئەوە کارەکە لەمن لادەو، منیشی لێ لادە، وە هەر چاکەیەك هەیە لەهەر شوێنێك بۆمی بڕیار بدە، وە منیشی لێ ڕازی بکە، دوایی ناوی کارەکەی خۆی دێنێ.

تێبینییەکی گرنگ:

هەندێ کەس وا دەزانن نوێژی ئیستیخارە کە کرا، دەبێ بابای ئیستیخارەکار بخەوێ و چاوەڕێ بێ بەخەون ئەنجامەکەی وەربگرێتەوە! کە بێگومان ئەوە هیچ پەیوەندیی بە ئیستیخارەوە نیە، بەڵام جاری واش هەیە خوای پەروەردگار دڵ ڕوونیی و بەرچاو ڕوونیی لە خەونداو، بەبێ خەونیش و بەبێ نوێژی ئیستیخارەش، دەخاتە دڵی ئینسانی ئیماندارەوە، ئەوە جیایە، بەڵام ئەوەی کە سوننەتەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فێری ئێمەی کردوە، ئەوەیە کە دوو ڕکعات نوێژ بکەی، وە دڵی خۆت لە هەر بڕیارێك خاڵی بکەیەوە، نەك شتەکەت هەر لەدڵدابێ، ئنجا ئیستیخارە بکەی، ئەوە ئیستیخارە نیە، دەبێ دڵی خۆت خاڵی بکەیەوە، ئنجا دوو ڕکعات نوێژ ئەنجام بدەی و بڵێی: خوایە! ئەوەم بخەیە دڵ کە تۆ پێت خۆشەو پێت چاکە، وە بەدڵیش لەخوا بپاڕێیەوە، ئەو کاتە بە مۆڵەتی خوا ئەوەی دەکەوێتە دڵ، کە خێرو بەرژەوەندییە بۆ دنیاو قیامەتی.

■ ٤٣ ■

# پشت بەخوا بەستن
# (التَّوكُّل عَلى الله)

(إبن فارس) لە بارەی مانای زمانەوانیی (توكل) دەڵێ:{التَّوكُّل: مصدَر تَوكَّل يَتوكَّل، وَهو مَأخوذ مِن مادّة (و، ك، ل)، الَّتي تَدُلُّ عَلى اعتمادٍ على الغَير، لِأَمرٍ ما}[1].

واتە: وشەی (توكُّل) چاوگە، لە كرداری: (تَوكَّل يَتوكَّل)، ئەویش لە ماددەی (و، ك، ل) وەرگیراوە، كە ئەوە دەگەیەنێ كە لەكارێكدا پشت بە جگە لە خۆت ببەستی.

(إبن رجب الحنبلی) دەڵێ: {التّوكُّل: صِدقُ الإعتمادِ عَلى اللهِ في إستِجلابِ المَصالح وَدفعِ المَضارِ، مِن أُمورِ الدُّنيا والآخرة، وكيلَة الأُمورِ كُلِّها إِليْه، وتَحقيقُ الإيمان بِأنَّه لا يُعطي ولا يَمْنَع ولا يَنفع ولا يَضُر سِواه}[2].

واتە: (توكل) بریتیە لەوەی بەڕاستیی دڵت بەخواوە پەیوەست بكەی، لەبەدەست هێنانی بەرژەوەندییان، یاخود دوورخستنەوەی زەرەرو زیانان، لەكاروباری دنیادا، وە لەكاروباری دواڕۆژدا، وە سپاردنی هەموو كارەكان بەخوا، وە ئیمانی تەواوت بەوە هەبێ، كە هیچ كەسێ نابەخشێ و ناگرێتەوە، وە سوود ناگەیەنێ و زیان ناگەیەنێ، بێجگە لەخوا.

---

(١) مقاييس اللغة - ج٦، ص٣٣٦.

(٢) جامع العلوم والحكم، ص٤٩.

(إبن القيم) بەراوردێك دەكا لەنێوان پشت بەخوا بەستن (التوكل)، وە كار بەخوا سپاردن (التفويض)داو دەڵێ:{بَين التّوكُّل عَلى اللهِ وتَفويضِ الأَمرِ إليْه، عِلاقَة العُمومِ والخُصوصِ، التَّفويض أوسَع، والتّوكُّل بَعد وُقوعِ السَّبَب، لكِن التَّفويضَ قَبله وبَعده، والتَّفويض هوَ عَيْنُ الإستِسلامِ، لكنَّ التوكُّلَ شعبةٌ منه}[1].

واتە: لەنێوان پشت بەخوا بەستن و، كار بەخوا سپاردندا، پەیوەندیی گشتیی و تایبەتیی هەیە، كار بەخوا سپاردن چەمكەكەی فراوانترە، پشت بەخوا بەستن، دوای ئەوەیە كە شتەكە ڕوودەدا، ئنجا پشت بەخوا دەبەستی، بەڵام كار بەخوا سپاردن (تَفويضِ الأَمرِ إلى الله) پێش ڕوودانی شتەكەو دوای ڕوودانیشی، كاری خۆت حەواڵەی خوا دەكەی و پێی دەسپێری، وە (تَفويض) بریتیە لە خودی ملكەچ بوون بۆخوا، بەڵام پشت بەخوا بەستن، بەشێكە لە كاری خۆت بەخوا سپاردن.

كەواتە: (توكُّل) ماناكەی تایبەتترو بچووكترو تەسكترە لە كاری خۆ بەخوا سپاردن (تفويض)، پاشان باسی متمانە (الثقة)ش دەكاو دەڵێ: {والثقة سَوادُ عَينِ التّوكُّل ونقطة دائِرة التّفويضِ}[2]، واتە: متمانە (الثقة) بریتیە لە ڕەشكێنەی چاوی پشت بەخوا بەستن، وە چەقی كار بەخوا سپاردن.

**ئنجا با تەماشای چەند دەقێك بكەین، دەربارەی (التَوَكُّل):**

**یەكەم:** خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (٨١)دا، دەفەرموێ:

﴿ .. وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾ ﴾ النساء.

واتە: وە پشت بەخوا ببەستەو كاری خۆتی پێ بسپێرە، خوات بەسە بیكەی بەوەكیلی خۆت.

**دووەم:** لە سووڕەتی (المائدة) ئایەتی (١١)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

---

(١) مدارج السالكين، ج٢، ص١٤٣.

(٢) هەمان سەرچاوە، ج١، ص ١٤٩.

﴿.. وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١١﴾ المائدة.

واتە: وە ئیمانداران با تەنیا پشت بەخوا ببەستن.

**بۆ زانیاریی هەمووو لایەك:** پشت بەخوا بەستن، واتە خوا كردن بە وەكیل، (توكُّل) واتە: وەكیل گرتن، (وَكيل): ئەو كەسەیە كە كاری خۆتی پێ دەسپێری و، پشتی خۆتی پێ دەبەستی، بۆیە خوا (سبحانه و تعالی) لە زۆر شوێناندا دەفەرمویَ: ئیمانداران با تەنها پشت بەخوا ببەستن.

**پەیوەندیی نێوان پشت بەخوا بەستن و، گرتنەبەری هۆكارەكان:**

هەڵبەتە پشت بەخوا بەستن و، دەستگرتن بە هۆكارەكان، تێك ناگیرێن، ڕۆژێك كابرایەكی خێڵەكیی هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وشترێكی پێبوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا وشترەكەم ببەستمەوەو پشت بەخوا ببەستم، یان لێی گەڕێم و پشت بەخوا ببەستم؟! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:

{أعقِلْها وَتَوَكَّل} أخرجه الترمذي برقم (٢٥١٧)، وقال: غريب، وابن خزيمة في التوكل كما في إتحاف المهرة برقم (١٥٩١٠)، وأبو نعيم في الحلية برقم (٣٩٠)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٢١٢)، قال الألباني: حسن.

واتە: بیبەستەوەو پشت بەخوا ببەستە.

كەواتە: بەستنەوە، پێچەوانەی پشت بەخوا بەستن نیە، چونكە بەستنەوە ئیشی دەستانە، پشت بەخوا بەستنیش ئیشی دڵ و دەروونە، دەبێ دڵت بەخواوە پەیوەست بێ، دەستیشت بە هۆكارەكانەوە گرتبێ، نەك تەمبەڵ تەمبەڵ هەڵخزێی، ئنجا بڵێی: پشتم بەخوا بەستوە! وەك كاتی خۆی هەندێ كەس سەفەری حەجێیان كردوە بەبێ نان و توێشوو، گوتوویانە: ئێمە پشتمان بەخوا بەستوە، بەڵام لەڕێدا كاتێ پەكیان كەوتوە دەستیان كردوە بە سواڵ كردن، یاخود لەبرسان مردوون!! كە ئەوە نەفامییە لە تێگەیشتن لەدیندا، چونكە گرتنە بەری هۆكارەكان، هیچ پێچەوانەی پشت بەخوا بەستن نیە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

لە جەنگی (ئوحود)دا، دوو زرێی پۆشیبوون، خودەی لەسەر بووە، مانای وایە هۆكاری گرتۆتە بەر.

هەروەها كاتێ لە مەككەوە كۆچ دەكات بۆ مەدینە، چەند نەخشەیەكی زۆر سەرسوڕهێنەر دادەنێ:

١- دەلیلێك دەگرێ بۆ ڕێگا، كە زۆر شارەزا بووە، هەرچەندە هاوبەش بۆخوا دانەریش بووە.

٢- پاشان پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو بەكر ڕادەسپێرێ، كە ڕانە مەڕێك بەدوایاندا بێنێ بۆ سڕینەوەی شوێن پێیەكان.

٣- ئەسمائی كچی ئەبو بەكر دادەنێ، كە ئاوو خواردنیان بۆ بێنێ.

٤- پاشان لەجیاتی ئەوەی ڕاست بەرەو مەدینە بچێ، بەرەو خوارەوەی مەككەو ئەشكەوتی (ثور) دەچێ و، سێ ڕۆژان لەوێ دەبێ، بە كورتیی: كۆمەڵێك هۆكار دەگرێتە بەر، لەگەڵ ئەوەشدا، كە هیچكەس هێندەی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) پشتی بەخوا نەبەستوە.

■ ٤٤ ■

## سوپاس کردنی خوا (الشُّكرُ لِله)

(إبن القيم) لەبارەی چەمك و واتای (شكر)ەوە، دەڵێ: {الشكر: ظهورُ نِعمةِ اللهِ عَلى لِسانِ عَبْده، ثَناءً وَاعتِرافاً، وَعلى قَلبه شُهوداً وَمَحَبَّةً، وَعلى جَوارحهِ انقياداً وطاعةً}[1] واتە: شوکر بریتیە لە دەرکەوتنی نیعمەتی خوا لەسەر زمانی بەندەکەی، وەك ستایش کردن و دان پێداهێنان، وە لەسەر دڵی، وەك بینین و خۆشەویستی، {واتە: بەو نیعمەتە خوا ببینێ و خوای خۆش بوێ}، وەلەسەر ئەندامەکانی، وەك ملکەچیی و فەرمانبەریی.

(الكَفَوي) دەڵێ: {الشُّكرُ كَالحَمدِ في أَنَّها وَصَف بِاللِّسانِ بإِزاءِ النِّعمة، إلاّ أَنَّ الحَمد يَكونُ بِاللِّسانِ وبِالقَلبِ، بِخِلاف الشُّكرِ، إِنَّهُ يَقَعُ بِالجَوارح}[2]، واتە: شوکر وەك (حَمد) وایە، (حَمد) واتە: ستایش، (شکر) واتە: سوپاس، شوکرو حەمد هەردووکیان بەزمان دەکرێن، لەبەرامبەر چاکەو نیعمەتدا، بەڵام ستایش کردن (حَمد) بەزمان و بەدڵ دەکرێ، بەڵام شوکر وێڕای دڵ و زمان، بە ئەندامەکانیش دەبێ.

**با لەو بارەوە ئاماژە بەچەند ئایەتێکی قورئانی بەرزو بەپێز بکەین:**

**یەکەم:** خوا (سبحانە و تعالى) لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٥٢)دا دەفەرموێ:

---

(١) مدارج السالكين - ج٢ ص ٢٤٤.

(٢) الكليات - ص ٥٣٥.

﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ١٥٢ ﴾.

واتە: یادم بكەن، یادتتان دەكەم، وە سوپاسم بكەن و سپڵە مەبن، سپڵەییم بەرانبەر مەنوێنن.

نەیفەرمووە: (وَلا تَكفرُوا بِي) بەڵكو فەرموویەتی: (وَلَا تَكۡفُرُونِ) واتە: سپڵە مەبن، وشەی (كَفَر) ئەگەر بۆخۆی تەعەددای كرد یانی: بەبێ پیت (حرف)، مانای سپڵەیی و بێوەفایی دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بە پیتی با و (ب) بوو: (كَفرَ بهِ) ئەو كاتە مانای بێ بڕوایی دەگەیەنێ.

**دووەم:** خوا لە سووڕەتی (سبأ) ئایەتی (١٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ ...ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ١٣ ﴾.

واتە: ئەی ئالی داوود! سوپاسی خوا جێبەجێ بكەن، {یانی بە كردەوە ئەنجامی بدەن} وە كەمێك لە بەندەكانم سوپاسگوزارن.

**سێیەم:** وە لەسووڕەتی (لقمان) ئایەتی (١٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ .. أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ١٤ ﴾.

واتە: سوپاسی من بكەو سوپاسی باب و دایكت بكە، {واتە: بەدڵ و بەزمان و بەئەندامەكان، بەندایەتیی بۆ من بكە، وە لەگەڵ دایك و بابیشتدا ئەهلی وەفاو چاكە بە} سەرەنجام هەر بۆ لای منە.

**بەڵێ، لەڕاستییدا شوكر هەم پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە، هەم بە زمانەوە، هەم بە ئەندامەكانەوە:**

أ- سەبارەت بە پەیوەندیی شوكر بە دڵەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ .. ٥٣ ﴾ النحل.

واتە: هەر، چاكەیەك لەئێوەدا هەیە لەخواوەیە.

کەواتە: ئەگەر چاکەکان بگێڕیەوە بۆ خوا بەدڵ، ئەوە فەزڵت بۆ خاوەن فەزڵ گێڕاوەتەوەو، ئەرکی دڵت لە شوکردا جێبەجێ کروە.

ب: وە سەبارەت بە شوکرانە بژێریی کردنی خوای بەخشەر بە زمان، خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ:

﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾ الضحى.

واتە: وە چاکەی پەروەردگارت باس بکە.

ج: وە سەبارەت بە شوکرانە بژێریی کردنی خوای بەرزو مەزن بە کردەوە، خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ:

﴿ .. ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ سبأ.

واتە: ئەی ئالی داوود! شوکر ئەنجام بدەن، نەیفەرمووە: (قولوا شكراً) بەڵکو دەفەرموێ: (إعملوا شكراً) واتە: شوکر دەبێ بە کردەوە ئەنجام بدرێ، ئەویش بەوە کە نیعمەتەکانی خوا لەچاکەدا بەکار بهێنێ و، ڕەزامەندیی خوایان پێ وەدەست بێنێ.

■ ٤٥ ■

## بە وردیی لە فەرمایشتی خوا تێگەیشتن (الفِقهُ عَنِ الله)

یەکێکی دیکە لەو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزو جوانانەی، کە دەبێ بەندە مامەڵەیان پێ لەگەڵ خوادا بکات، ئەوەیە کە باش لە فەرمایشتی خوا تێبگا، ئەو فەرمایشتەی کە ڕاستەوخۆ پێی فەرمووە، کە قورئانە، یاخود ئەو وەحییەی لەڕێگای پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) ئاڕاستەی دەکرێ، بەوردیی و ژیرانە تێیان بگا.

(راغب الأصفهاني) دەڵێ:{الفقه: هوَ التَّوَصُّل إلى عِلم غائِبٍ بعلمٍ شاهِد، وَمن ثَمَّ فَهوَ أَخَصُّ مِنَ العِلمِ، فَقُهَ فَقاهةً، أي: صار فقيهاً، وَفَقُهَ فِقْهاً وَفَقَهَاً، أي: فَهِمَهُ}[1]، واتە: (فیقه) بریتیە لە گەیشتن بە زانیارییەکی نادیار، بەهۆی زانیارییەکی دیارەوە، کەواتە: (فیقه) لە زانیاریی تایبەت ترە، ئنجا دەگوترێ: {فَقُهَ فقاهه}، واتە: بوو بە فەقیەو شارەزا بوو لەدیندا، بەڵام {فَقِهَ فِقْهاً وَفَقَهاً} واتە: تێیگەیشت.

(الجرجـــاني) دەڵێ:{الفِقهُ هوَ العِلمُ بِالأَحكامِ الشَّرعيةِ العَمَلية مِن أَدِلَّتِها التَفصيلية}[2]، واتە: (فقه) زانیاریی هەبوونە بە حوکمە شەرعییە کردەییەکان

---

(١) المفردات، ص ٣٨٤.

(٢) التعريفات - ص ١٧٥.

بەهۆی بەڵگە ڕوونەکانیانەوە.

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: {الفِقهُ: فَهْمُ مُرادِ المُتكلِّم مِن كَلامِه}.

واتە: (فِقه) بریتیە لە تێگەیشتنی مەبەستی قسەبێژ لە قسەکەی.

**ئنجا با لەوبارەوە چەند دەقێکی شەریعەت بێنین:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (٦٥)دا، دەفەرموێ:

﴿.. ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾﴾.

واتە: تەماشا بکە! چۆن ئایەتەکانی خۆمانیان جۆراو جۆر بۆ دەخەینە ڕوو، بەڵکو تێبگەن.

لێرەدا (يَفْقَهُونَ) واتە: (يَفهَمون) یانی: بەوردیی و بەقووڵیی تێبگەن.

**دووەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە دەفەرموێ:

{مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ} أخرجه أحمد برقم (٧١٩٣) الطبراني في الكبير برقم (٩٢٩)، وأخرجه أيضًا: في الشاميين برقم (٧٥٨)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

واتە: هەرکەسێ خوا چاکەی بۆی بوێ، لەدیندا شارەزای دەکا.

**سێیەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوعا بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ) دەکاو دەفەرموێ:

{اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ} أخرجه أحمد برقم (٢٤٢٢)، والطبراني برقم (١١٥٣١)، وأبو نعيم في الحلية (٣١٦/١)، وابن سعد (٣٦٥/٢)، والحاكم برقم (٦٢٨٠)، وقال: صحيح الإسناد، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

واتە: ئەی خوایە! لەدیندا شارەزایی وردی پێ بدەو، فێری لێکدانەوەشی بکە.

**چوارەم:** لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{إِنَّ طُولَ صَلَاةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ، مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطِيلُوا الصَّلَاةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ، وَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا} أخرجه أحمد برقم (١٨٣٤٣)، ومسلم برقم (٨٦٩)، وابن حبان برقم (٢٧٩١)، وأخرجه أيضًا: الدارمي برقم (١٥٥٦)، والبيهقي برقم (٥٥٥٣)، والبزار برقم (١٣٩٨)، وأخرجه أيضًا: الحاكم برقم (٥٦٨٣) وقال: صحيح على شرط الشيخين.

واتە: درێژیی نوێژی پیاو، وەكورتیی وتارەكەی، نیشانەی شارەزاییەتی، بۆیە نوێژ درێژ بكەن، بەڵام وتارتان كورت بكەن، وە بێگومان ڕوونكردنەوەی مەبەستەكان بەجوانیی، جۆرێك لە جادووی تێدایە.

واتە: كاریگەرییەكی پەنهانی تێدایە، هەڵبەتە بەداخەوە زۆربەی مامۆستا وتار بێژەكان پێچەوانەی ئەو فەرمایشتە دەجووڵێنەوە: وتاریان زۆر درێژە، خەڵك هەمووی بێزار دەبێ، وە نوێژەكانیشیان بەزۆریی هەڵدەپڕووزێنن و، تەنیا سووڕەتە كورتەكانی كۆتایی قورئان دەخوێنن، كە ئەوەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم).

پێنجەم: هەروەها ئەم دەقەش هاتوە، كە لە فەرموودەی پێغەمبەر بوونیدا مشت و مڕی زۆر هەیە:

{فَقيهٌ واحِدٌ أَشَدُّ عَلى الشَّيْطانِ مِن أَلفِ عابِدٍ}، أخرجه البخاري في التأريخ (٣٠٨/٣ ترجمة ١٠٤٦ روح بن جناح أبو سعد الشامي، والترمذي برقم (٢٦٨١) وقال: غريب ولا نعرفه إلا من هذا الوجه، وابن ماجه برقم (٢٢٢)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٧١٥)، وأخرجه أيضًا: الطبراني برقم (١١٠٩٩)، والطبراني في الشاميين برقم (١١٠٩) والديلمي برقم (٤٣٩٨)، وابن حبان في الضعفاء (٣٠٠/١)، ترجمة ٣٤٦ روح بن جناح، وقال: منكر الحديث جداً يروي عن الثقات ما إذا سمعها الإنسانُ الذي ليس بالمتبحِّر في صناعة الحديث، شهد لها بالوضع، قال الألباني: موضوع.

واتە: یەك شارەزا لەدیندا لەسەر شەیتان، توندترو سەختترە، لە هەزار خوا پەرست {كە بەبێ شارەزایی خوا دەپەرستن}.

هەڵبەتە ئەم دەقە ماناو چەمكەكەی ڕاست و بەجێیە، هەرچەندە سەنەدەكەی بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەلمێنراویش نەبێ و بێهێز (ضعيف) بێ.

شەشەم: کۆتا فەرمایشت کە لەوبارەوە بیهێنین، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

{لَا يَفْقَهُ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ}، أخرجه أبو داود برقم (١٣٩٤) والترمذي برقم (٢٩٤٩) وقال: حسن صحيح، وابن ماجه برقم (١٣٤٧)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٢١٦٨)، والدارمي برقم (١٤٩٣)، وابن حبان برقم (٧٥٨)، قال الألباني: صحيح.

واتە: هەرکەسێ لە کەمتر لە سێ شەواندا قورئان بخوێنێ، ئەوە لێی تێناگا.

واتە: ئەگەر زۆرت خوێند، دەبێ شەوو ڕۆژی (١٠) جزو بخوێنی، ٣/١ی قورئان بخوێنی و، بە سێ شەوو ڕۆژان تەواوی بکەی، بەڵام بە کەمتر لەوە بیخوێنی، ناتوانی چاك لێی وردبیەوە، وە ناتوانی لێی ڕابمێنی و تێیبگەی، قورئانیش دەبێ تێڕامان و لێوردبوونەوەمان بەرانبەری هەبێ، ئەگەرنا کەمتر لێی بەهرەمەند دەبین.

■ ٤٦ ■

## وەرگرتنی ڕێنمایی خوا
## (الإهتداءُ بِهُدى الله)

(إهتداء)، (إفْتِعال)ە، لە (هُدى)وە هاتوە، ئنجا بزانین (هُدى)و (هِداية) يانی چی؟

(الجرجانـي) دەڵێ: {الهِداية: دِلالَة عَلى ما يُوَصِّل إلى المَطلوب}[١]، واتە: هیدایەت بریتیە لە ڕێنماییکردن بەرەو گەیەنەر بە ئامانج.

(راغب الأصفهانـي) دەڵێ: {الهِداية: دَلالةٌ بلُطفٍ}[٢]، واتە: هیدایەت بریتیە لە ڕێنماییکردنێکی نەرم و نیان و پەنهان.

خوای پەروەردگار دەربارەی (هِداية) و (إهتداء)ەوە دەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾ محمد.

واتە: وە ئەوانەی کە ڕێنمایی خوایان وەرگرتوە، خوا ڕێنماییان بۆ زیاد دەکات، وە پارێزکارییان پێ دەبەخشێ.

ئەم ئایەتە موبارەکە ئەوە دەگەیەنێ کە ئینسان سەرەتا دەبێ هیدایەتی خوا وەربگرێ و قبووڵی بکا، ئنجا لەئەنجامی ئەوەدا، خوای بەخشەر زیاتر ڕێنمایی دەکا،

---

(١) التعريفات، ص ٢٧٧.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٥٤٠.

وە دەیخاتە سەر ڕێ، وە بەرچاو ڕۆشنیی و دڵ ڕۆشنیی پێ دەبەخشێ.

**زانایان دەڵێن:** هیدایەتی خوا بەگشتی سێ جۆرە:

هیدایەتێکی گشتی (هِداية عامّة)، وە هیدایەتێکی تایبەت (هداية خاصّة)، وە هیدایەتێکی تایبەتتر (هِداية أَخَص).

**١- هیدایەتی گشتی:**

ڕێنمایی خوایەو سیستم (نظام)ی چەسپاویەتی، بۆ هەموو دروستکراوەکان، وەك ئەوە کە فیرعەن لە مووسا (سەلامی خوای لێبێ) دەپرسێ:

﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾ طه.

واتە: پەروەردگاری تۆو برایەکەت کێیە ئەی مووسا؟ مووسا (سەلامی خوای لێبێ) لە وەڵامدا پێی دەفەرموێ:

﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه.

واتە: گوتی: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوە، پاشان ڕێنمایی کردوە، یانی: ڕێ و شوێن و یاسای بۆ داناوە، پێی بەڕێوە بچێ، ئەو یاسا گشتییانەی کە خوای بەرزو مەزن بۆ هەموو بوونەوەر دایناون، ئەوە هیدایەتی گشتی خوایە.

**٢- هیدایەتی تایبەت:**

ئەو ڕێنمایی و ڕێنیشاندانەیە کە خوا (سبحانە و تعالی) بۆ مرۆڤ و جند (جن) ناردوویەتی بەگشتی، وەك خوای پاك و تاك دەفەرموێ:

﴿ .. إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ یوسف.

واتە: ئەم قورئانە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان. ئەویش ئەو وەحی و پەیامەی خوایە کە خوای پەروەردگار بە تایبەت ناردوویەتی بۆ مرۆڤ و جند(جن)،

کە دیارە دروستکراوەکانی دیکە بەپێی ئەو سیستم و ڕێنماییە گشتییەی خوا بەڕێوە دەچن، کە خوا بۆی داناون پێوەی پابەند کردون.

٣- هیدایەتی تایبەتتر:

ئەو جۆرە ڕێنمایی و خستنە سەر ڕاستە شەقامەیە، کە خوا (سبحانە و تعالی) بە ئەهلی تەقوای دەبەخشیٚ و بە کەسانێکی دەبەخشیٚ، کە بەرەو خوا هەنگاو دەنێن، وەك خوای بەخشەر دەفەرمویٚ:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ﴿١٧﴾ ﴾ محمد.

واتە: وە ئەوانەی ڕێی ڕاستیان گرتوە (خوا) ڕێنمایی بۆ زیاد کردوون و پارێزکاریی پێبەخشیون.

ئاشکراشە: ئەو هیدایەتەی کە زیاد دەکریٚ بۆ کەسانیٚ، کە هیدایەتی خوا وەردەگرن، بریتیە لەو هیدایەت و تەوفیقەی کە پێیان دەچەسپێنیٚ لەسەر ڕاستە شەقام، وە بەرچاویان ڕۆشن دەکاتەوە، وەك خوا لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرمویٚ:

﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة.

هەڵبەتە کتێبی خوا ڕێنماییە بۆ هەموو کەس، بەڵام بۆچی لێرەدا دەفەرمویٚ: ڕێنماییە بۆ پارێزکاران (مُتَّقين)؟! چونکە ئەو هیدایەتەی لێرەدا هاتوە، ڕێنماییەکی تایبەتە.

هەروەها لەچەند شوێنێکی دیکەشدا کە خوای کاربەجیٚ قورئان دەکاتە ڕێنمایی تایبەت بۆ ئیمانداران، ئەوە مەبەست پێی ئەو مانایەی سێیەمی هیدایەتە، کە دیارە لە ئەنجامی ئەوەدا، کە ئینسان ڕێنمایی خوای پەروەردگار وەردەگریٚ، خوای بەخشەر زیاتر پێی دەچەسپێنیٚ و، لە کەرەم و بەخششی خۆی بۆی زیاد دەکات.

■ ٤٧ ■

## دەست گرتن بە كتێبی خواوە
## (الإستِمساكُ بِكتابِ الله)

لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: {أمسَكَ بِشيءٍ، وتمَسَّك بِهِ واستَمْسكَ كلُّه بمَعنى اعتَصَم بهِ، وَكَذالِك مَسَّك بِهِ}[1]، واتە: وشەی (أَمْسَكَ) لەگەڵ (تَمَسَّك) لەگەڵ (إِسْتَمْسَك) لەگەڵ (مَسَّكَ) هەموویان بەمانای: توند دەستی پێوە گرت، دێن.

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الزخرف) ئایەتی (٤٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ ﴾.

واتە: توند دەست بگرە بەوەوە كە بۆت سروش كراوە، بێگومان تۆ لەسەر ڕێیەكی ڕاستی.

دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، وشەی: (إستِمساك) وەك بنچینەیە لە زمانی عەرەبیدا، دەڵێ: {زيادةُ المَبنى تَدُلُّ عَلى زيادة المَعنى}، (مسَّك بِهِ) و (أَمْسَك بِه)، یانی: گرتی، بەڵام (تمَسَّك بِه، وَإستمْسك بهِ) یانی: توند گرتی، زۆر بە جیددیی گرتی، وەك خوا (سبحانه و تعالى) بە یەحیای فەرمووە:

---

(١) مختار الصحاح - ص ٥٣٨.

﴿ يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ .. ﴿١٢﴾ ﴾ مريم.

واتە: ئەی یەحیا! کتێبەکە توند بگرە.

بەڵێ، سیفەتێکی دیکەی پەسندی مامەڵە کردنە لەگەڵ خوادا، کە مرۆڤ بە جیددیی دەست بە کتێبی خواوە بگرێ، دیراسەی بکا، موتالاَی بکا، تێی بگا، پاشان بەپێی ڕێنمایی و ئاڕاستەکانی بەڕێوە بچێ.

■ ٤٨ ■

## شوێن كەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)
## (الإتِّباع لِرسولِ الله (صلى الله عليه وسلم))

(إبن فارس) دەڵێ: {الإتِّباع مَصدرُ اتَّبَعَ، وَهوَ مِن مادّة (ت، ب، ع)، وتَدُلُّ هذِهِ المادَّةُ عَلى التُّلُوِّ والقُفُوِّ}[1]، واتە: (الإتِّباع) چاوگی (إتَّبَعَ)یە، (إتَّبَع يَتَّبِع إتِّباعاً)، ئەویش لە ماددەی (ت، ب، ع)ەوە هاتوە، ئەم ماددەیەش بەدواداچوون و بەشوێن پێدا ڕۆیشتن، دەگەیەنێ.

(إبن عبدالبَرّ) دەڵێ: {الإتِّباعُ: ما ثَبَتَ عَلَيهِ الحُجة، وهوَ اتِّباع كُلِّ ما أَوْجَب عَلَيْكَ الدَّليلُ إتباعَ قوْلِه}[2]، واتە: (الإتِّباعُ) شوێن كەوتنی هەر شتێكە كە بەڵگەی لەسەر هاتبێ، كە پێویستە تۆ شوێنی بكەوی، هەروەها بریتیە لە شوێن كەوتنی هەر كەسێك، كە بەڵگە لەسەر تۆی پێویست كردوە، دوای قسەكەی بكەوی.

ئنجا ئەوەی بەڵگەی شەرعیی لەسەر ئێمەی پێویست كردوە، ئەوەیە كە بەدوای قسەی خواو پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) بكەوین، وە پاشان هەر كەسێك كە قسەی خواو پێغەمبەری خوامان پێ ڕادەگەیەنێ بەبەڵگە.

---

(١) مقاييس اللغة - ج١ ص ٣٦٢.

(٢) الشنقيطي - أضواء البيان، ج٧ ص ٥٤٨، لێی خواستۆتەوە.

بۆیە زانایان لەو بارەوە قسەیەکی جوانیان هەیە دەڵێن:

{أَقْوالُ العُلماءِ يُستَدلُّ لَها، ولا يُسْتَدل بِها}

واتە: قسەی زانایان بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوە، بەبەڵگە ناهێنرێتەوە، واتە: بۆت نیە بڵێی: فلان شتە واجبە لەبەر ئەوەی فلان زانا وای گوتوە، چونکە تەنها بە قسەی خواو پێغەمبەری خوا شت واجب دەبێ و قەدەغە دەکرێ، بەلام زانایان حەلال و حەرامی خوا بە ئێمە ڕادەگەیەنن، کە گوتیان: فلان شتە حەلالە یان حەرامە، دەبێ بەڵگە بهێننەوە بۆ قسەکەیان، ئەگەر نا جگە لەخواو پێغەمبەری خوا، کەس بۆی نیە شتێك لەسەر بەندەکانی خوا پێویست بکا، یاخود شتێکیان لێ قەدەغە بکا.

ئنجا لەو بارەوە کە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، یەکێکە لەو سیفەت و ئاکارو ڕەوشتانەی، کە پێویستە ئینسانی مسوڵمان خۆییان پێ برازێنێتەوە، لە بواری مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ .. ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن. وەك پێشتریش باسمان کرد: شوێن کەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڵگەی بەندەیە لەسەر ئەوە، کە خوای خۆش دەوێ، وە هۆکاری ئەوەشە کە خوا بەندەی خۆی خۆش بوێ.

وە بە نسبەت پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بۆ ئێمە پێویستە شوێنی بکەوین لە ڕێبازو سوننەتەکەی، ئەوەیە کە وەك (دین) بەئێمەی ڕاگەیاندوە، وەك لەو بارەوە بە درێژیی دواوم لە کتێبی: {شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خوا لەنێوان تێپەڕاندن و بەزایەداندا}[1].

---

(١) لەو کتێبەدا خستوومەتە ڕوو کە ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

■ ٤٩ ■

## پابەندیی بەبەرنامەی خواوە
## (الإلْتزامُ بِشَريعة الله)

(الرازي) لەبارەی مانای زمانەوانیی (إلتزام)ەوە دەڵێ: {الإلْتزام: لزمتُ الشَيءَ لُزوماً ولِزاماً ولَزِمتُ به ولازمتهُ، وَأَلْزَمَهُ الشَّيءَ فَالْتَزَمَهُ، وَالإلتزامُ أَيضاً: الإعتِناق}[1]،

بەلای کەمەوە دەبێتە شەش بەش:

یەك: هەندێکی وەك سەرۆکی دەوڵەت فەرموویەتی و، کردویەتی، کەواتە: هەرکەسێ ڕاست بۆوە، بۆی نیە ئەوەمان پێ بڵێ و، دەبێ لە مەقامی دەسەڵاتی شەرعییدا بگوترێ.

دوو: هەندێکی وەك قازیی و دادوەر فەرموویەتی.

سێ: هەندێکی وەك موفتی و فەتوا دەر فەرموویەتی.

چوار: هەندێکی بەگشتی فەرموویەتی بۆ هەموو کات و شوێنەکان و، بۆ هەموو کەسەکان، ئەوەیان پابەندکەرە بۆ هەموو لایەك، کە بەزۆریی سوننەت ئەوەیانە.

پێنج: هەندێکی وەك سروشتی بەشەریی خۆی فەرموویەتی، یان کردوویەتی.

شەش: هەندێکی وەك کۆشش کردنی لە بوارەکانی ژیان و گوزەراندا، وەك: لەڕووی جەنگ و کشتوکاڵ و پیشەسازیی و پزیشکیی و ...هتد فەرموویەتی، زانایان دەڵێن: ئەوە زیاتر ڕێنمایی کردنی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم بۆ ئێمە، بەڵام پابەندکەر نیە بۆ ئێمە، بۆ وێنە فەرموویەتی: ئەو شتە بکەن باشە، کە ڕەنگە لەو ژینگەیەو لەو کاتەدا شتێکی لەو باشتر نەبوویێ، بۆیە خەڵکی بەو شێوەیە ڕێنمایی کردوە، بەهەر حاڵ ئەوە بابەتێکی وردو قووڵە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەوەی پابەندکەرە بۆ ئێمە لە سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوەیانە کە وەك دین بە ئێمەی ڕاگەیاندوە.

(١) مختار الصحاح - ص ٥١٦.

واتە: (لزمتُ الشَّيْءَ لُزوماً ولِزاماً ولَزِمتُ به ولازَمته) هەمووی یەك مانایە، واتە: ئەو شتەم گرت، پێوەی پابەند بووم، (وَأَلْزَمَهُ الشيءَ، فَالْتزمَهُ) بەو شتەوەم پابەند کرد، ئەویش پێوەی پابەند بوو، (والإلتزام أيضاً الإعتناق) وە مانایەکی دیکەی (إلتزام) بریتیە لە بڕواهێنان بە شتێك، قەناعەت کردن بەشتێك.

**ئەمەش نموونەیەك لە ئایەتەکانی قورئان لەبارەی پایەندیی بە شەریعەتەوە:**

خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (الجاثية) ئایەتی (١٨)دا باسی ئەزموونی خاوەن کتێبەکان دەکا، جوولەکەو نەصرانییەکان، پاشان دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾

شتێکی ئاشکرایە کە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئاندا، کە دوا نوسخەی هیدایەتی خوایەو، بەپێغەمبەری خاتەم (موحەممەد)دا (صلى الله عليه وسلم) نێردراوە، بەشێکە لەو ئایینە گشتییەی، کە خوا ناردوویەتی و ئیسلام نوسخەیەکە لەو ئایینە، کە خوا بۆ هەموو پێغەمبەرانی (سەلامی خوایان لێبێ)، ناردوە، ئنجا خوا بەپێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾

واتە: ئنجا تۆمان لەسەر بەرنامەیەك لە ئایینی خۆمان، دانا، شوێنی بکەوەو شوێن ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن.

شوێنی بکەوە واتە: پێوەی پابەندبەو ئیلتیزامت پێوەی هەبێ.



## دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ خواو دۆستەکانی، دووریی گرتن لە دوژمنەکانی (الوَلايةُ مَع اللهِ وَأولِيائِهِ، والبَراءَة مِن أَعدائِهِ)

یەکی دیکە لە ڕەوشت و ئەدەبە گەورەو گرنگەکان، کە دەبێ ئینسانی مسوڵمان لەخۆیدا بیانهێنێتەدی و بەرجەستەیان بکات، بۆ مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ خوادا (سبحانه و تعالى)، بریتیە لەوە کە: دۆستایەتیی ڕەهای لەگەڵ خوادا هەبێ، وە لەگەڵ دۆستانی خوادا، وە بەرائەت و دوورییشی هەبێ لە دوژمنان و ناحەزانی خوا، هەڵبەتە لەبواری هەڵس و کەوت لەگەڵدا کردنیان نا، چونکە هەڵس و کەوت و مودارا لەگەڵ هەموو کەسدا دەکرێ، بەڵکو لەبواری هەڵوێستی فیکریی و عەقیدەیی و هاوکاریی پشتگرتنیاندا، کە ئەمیش یەکی دیکەیە لەو مەسەلانەی، زۆرجار زێدەڕۆیی و کورت هێنانیان تێدا دەکرێ.

### مانای دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی:

سەرەتا با بزانین (الوَلاء) و (البَراء) یانی چی؟

(إبن فارس) دەڵێ: {الوَلاء: مَصدَر والى يُوالي مِن مادّةِ (و، ل، ي)، الّتي تَدلُّ عَلى

القُرب}[1]، واتە: وشەی (الوَلاء) چاوگی (والى، يوالي، ولاءً و مُوالاةً) كە لە ماددەی (و، ل، ى)ەوە هاتوە، كە نزيكيی دەگەیەنێ.

**ئنجا با سەرنجی مانای وشەی (مُوالاة) بدەین:**

(المُوالاة): {هيَ التّقرُّب وَإظهارُ الوُدِّ بِالأَقوالِ والأَفعالِ وَالنّوايا لِمن اتخَذهُ الإنسان وليّاً}[2]. واتە: (موالاة) یانی: خۆ وەنزیك خستن و پێشاندانی خۆشەویستیی بەقسەو، كردەوە و، نیازەكانی نێو دڵ، بۆ هەر كەسێك كە ئینسان دەیكا بە نزیك و دۆستی خۆی.

**ئنجا با سەرنجی چەمك و واتای (براء) (براءة) بدەین كە دژو پێچەوانەی (ولاء)ە:**

{(بَراءة): مِن مادّة (ب، ر، ء) الّتي تَدلُّ على التَّباعُد مِن شَيءٍ وَمُزايَلتهِ}[3]، واتە: (بَراءة): كە لە ماددەی (ب، ر، ء) دروستكراوە، وازلێهێنانی شتێك و دووریی لێگرتنی دەگەیەنێ، كە دەڵێی: من لەو كەسە یان لەو شتە بەرییم، واتە: لێی دوورم، خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ ﴾ التوبة.

واتە: ئەوە ڕاگەیەنرانی دووریی خواو پێغەمبەرەكەیەتی {(صلى الله عليه وسلم)} بۆ ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی كە پەیمانتان لەگەڵیاندا بەستوون، بەڵام پابەندنین بە پەیمانەكانیانەوە.

ئێستاش با سەرنجی دوو ئایەتی قورئان و دەقێكی سوننەتی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بدەین، لەوبارەوە:

یەكەم: خوای پەروەردگار دەربارەی دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ خوادا (سبحانه و تعالى)، لە سوورەتی (الكهف) ئایەتی (٤٤)دا دەفەرموێ:

---

(١) مقاييس اللغة - ج٦، ص ١٤١.

(٢) الموالاة والمعاداة في الشريعة الإسلامية - ص ٢٨.

(٣) مقاييس اللغة، لابن فارس.

﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ ﴾.

واتە: لەو كاتەدا (لەڕۆژی دواییدا) دۆستایەتیی تەنیا بۆ خوای حەق دەمێنێتەوە، {واتە: تەنیا ئەو كەسەی كە خوای بەدۆست گرتوەو لەخوا نزیك بووە، هەر ئەو دۆستایەتییەكەی دەمێنێتەوە}، دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ خوادا پاداشتی زیاترە، وە سەرەنجامی چاكترە.

**دووەم:** لە سوورەتی (الممتحنة) ئایەتی (٤)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرمویٚ:

﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ ..﴿٤﴾ ﴾.

واتە: بێگومان سەر مەشقییەكی چاك هەیە بۆ ئێوە، لە ئیبراهیمداو لەوانەدا كە لەگەڵیدا بوون، {واتە: شوێن كەوتوانی ئیبراهیم} كاتێ بەگەلەكەی خۆیان گوت: ئێمە لە ئێوە بەریین، وە لەوەش كە جگە لە خوا دەیپەرستن پێتان بێبڕواین و دوژمنایەتی و ڕق لێبوونەوەی یەكجاریی لەنێوانماندا ئاشكرا بووە، هەتاكو تەنیا بڕوا بەخوا دێنن...

هەڵبەتە دووریی گرتن لە خەڵكی كافر، واتە: لە عەقیدەی پووچیان، لە كوفرەكەیان، بەڵام ئەوە ڕێناگرێ لەوەی تۆ مامەڵەیان لەگەڵدا بكەی، لەگەڵیان بگونجێی و بساچێنی[1]، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ جوولەكەو نەصرانیی و مونافیق و هاوبەش بۆ خوا دانەراندا مامەڵەی كردوە، هەم لە مەككەو هەم لە مەدینە، وە پەیمانی لەگەڵدا بەستوون، كەواتە: مامەڵەی كردنیی لەجێی خۆی، بەڵام دووریی لێكردن (بَراءة) پەیوەندیی بە دڵ و دەروونەوە هەیە، وە پەیوەندیی هەیە بەدووریی گرتن لە بەرنامەو ڕێبازیان، وە پەیوەندیی هەیە بەو كوفرو شیرك و عەقیدە خراپەوە، كە هەڵیان گرتوە.

---

(١) بساچێنیٚ: بگونجیٚ، هەڵبكات.

سێیەم: وە لە فەرمودەیەکدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بەوە کە دەبێ دۆستایەتیی تەنیا لەگەڵ خوادا بێت و لەگەڵ ئیمانداراندا بێ، وە دەبێ خۆشەویستنت تەنها لەبەر خوابێ، وە دەبێ مسوڵمان دژایەتیی و دووریی هەبێ لە کەسانێك کە دوژمنی خوان، فەرموویەتی:

{أَوْثَق عُرى الإيمانِ: المُوالاةُ في اللهِ، وَالمُعاداةُ في الله، وَالحُبُّ في الله، والبُغْضُ في الله} أخرجه الطبراني برقم (١١٥٣٧)، وأخرجه أيضا: البيهقي في شعب الإيمان برقم (٩٥١٣). قال الألباني: صحيح.

واتە: قایم ترین قوڵفی ئیمان بریتیە لە: دۆستایەتیی گرتن لە پێناوی خوادا، وە دژایەتیی کردن لە پێناوی خوادا، وە خۆشویستن لەبەر خوا، وە ڕق لێبوونەوە لەبەر خوا.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە ڕق لێبوونەوەو دۆستایەتییان، تەنها لەبەر خوا دەبێ، وە تەنیا بەپێی تەرازووو پێوەری شەریعەتی خوای پەروەردگار دەبێ.

■ ٥١ ■

## خوێندنەوەی کتێبی خوا

## (تِلاوة كِتابِ الله)

(إبن حجر العسقلاني) بۆ ڕوونکردنەوەی چەمك و مەبەستی خوێندنەوەی کتێبی خوا، دەڵێ:{تِلاوَةُ كِتابِ الله: هِيَ قِراءَتُهُ بِتَرتيلٍ تِلاوةً تبَيِّن حُروفُها، وَيَتَأنَّى في أَدائِها لِيكُونَ أَدْنى إِلى فَهْمِ المَعاني}[1]، واتە: مەبەست لە خوێندنەوەی کتێبی خوا ئەوەیە: کە بە ڕێك و پێکیی بخوێنرێتەوە، بە شێوەیەك کە پیتەکانی دەربخات، وە بەشێنەیی بخوێنرێتەوە، تاکو نزیکتر بێ لەوە کە هەم خوێنەر کە دەیخوێنێ، هەم گوێگر لە مانای وشەکان تێبگا.

**زانایان گوتوویانە:** (قِراءة) لەگەڵ (تلاوة) جیاوازییەکەی ئەوەیە: (تلاوة) هەمیشە دەبێ بەتەرتیل بێ، بەڵام (قِراءة) جاری وا هەیە بە تەرتیلەو جاری واش هەیە بێ تەرتیلە.

وە زانایان دەڵێن: خوێندنەوەی قورئان سێ حاڵەتی هەن:

**حاڵەتی یەکەم:** (تَرْتيل): ئەوەیە کە هەقی خۆیان بدەیە وشەکان.

**حاڵەتی دووەم:** (حَدْر): ئەوەیە کە خوێندنەوەیەکی خێراتر بێت، بەڵام هەقی خۆیان بدرێتە وشەکان.

---

(١) فتح الباري - ج٨، ص ٧٢٧.

**حاڵەتی سێیەم:** (تَدوير): ئەوەیە کە لەنێوان (تَرْتيل)[1] و (حَدر) دابێ، واتە: نە بە (تَرْتيل) بێ لەسەر ئایەتەکان بوەستێ و، وە ئەو حاڵەتانەی کە سوننەتە لە قورئان خوێندندا ڕەچاو بکرێن، هەموویان ڕەچاو بکرێن، وە نەهەموویان فەرامۆش بکرێن.

وە هەندێکیان گوتوویانە: حاڵەتی (تحقيق)یش هەیە: ئەویش ئەوەیە کە قورئانخوێندنەکە زۆر بەکاوەخۆو شێنەیی و بیرلێکردنەوەوە بێ.

**ئەمەش دوو نموونە لە ئایەتەکانی قورئان، لەبارەی خوێندنەوەی قورئانەوە:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار بەم شێوەیە باسی قورئان خوێندن دەکا: لە سورەتی (البقرة) ئایەتی (١٢١)دا دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٢١ ﴾.

واتە: ئەوانەی کتێبمان پێداون و وەك بۆی شایستەیە دەیخوێننەوە، ئا ئەوانە بڕوایان پێی هەیە، وە هەر کەسێ پێی بێ بڕوا بێ، ئەوانە لە زیانبارانن.
کەواتە: خوای بەبەزەیی مەدحی ئەو کەسانە دەکات کە قورئان دەخوێنن، بەو شێوەیەی، کە بۆ قورئان شایستەیە.

**دووەم:** هەروەها خوا فەرموویەتی:

﴿ .. وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ٤ ﴾ المزمل.

واتە: وە بەڕێکی قورئان بخوێنە.

---

(١) رَتِلَ يَرْتَلُ رَتْلاً: استوى وانتظم وحَسُن تأْليفه ويقال: رَتِلَ الثَّغْر أو الأَسنان... وَرَتَّل الشَّيْء: نَسَّقَهُ ونَظَّمَهُ، وَرَتَّل القُرآن: جَوَّدَ تِلاوَتهُ، وثَغرٌ مُرَتَّلٌ: مُنَضَّدٌ مُسْتَوي الأَسنان. المُعجَم الوَسيطِ، ص ٣٣٧.

■ ٥٢ ■

## گوێ گرتن لە کتێبی خوا
## (الإستماعُ لِكتابِ الله)

وشەی (سَمِع) واتە: بیستی، ئنجا (إستَمَع) کە پیتەکانی زیاترن و بەپێی بنچینەی: {زیادةُ المَبنى تَدلُّ عَلى زيادةُ المَعنى} هەر وشەیەك پیتەکانی زیاتر بن، ماناکەی بەهێزتر دەبێ، کەواتە: (سَمِعَهُ) یان (سَمِع لهُ) واتە: گوێی بۆ گرت، بەڵام (إستَمع لَهُ) یان (إسْتَمَعَ إليه) واتە: گوێی بۆ هەڵخست و باشی گوێ لێگرت، وەك گوتراوە: {إستَمع لَهُ: أصغى وتَسَمَّعَ إليه وألقى إليه السَّمع}[1]، هەموویان یەك واتایان هەیە واتە: گوێی بۆ هەڵخست.

خوای پەروەردگاریش لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٢٠٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾.

واتە: وە هەرکاتێ قورئان خوێنرایەوە، گوێی بۆ هەڵخەن وە بێدەنگ بن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ.

خوای پەروەردگار هەر بەوەندە ئیکتیفای نەکردوە بفەرموێ: (فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ) واتە: بە گرنگیی پێدانەوە گوێی بۆ بگرن، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا فەرموویەتی: (وَأَنصِتُوا۟) واتە: وە بێدەنگ بن، بێدەنگییەك بۆ گوێگرتن، پاشان فەرموویەتی: بۆ ئەوەی بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ چۆن قورئان خوێندن خێرو پاداشتی گەورەی هەیە، بەهەمان شێوە گوێ گرتن لە خوێندنی قورئانیش، مایەی دابەزینی بەزەیی خوای بەبەزەییەو، خێرو پاداشتی گەورەی هەیە.

---

(١) مختار الصحاح - ص ٥٨٢.

■ ٥٣ ■

## حوکم کردن بە کتێبی خوا
## (الحُكم بِكِتابِ الله)

(**الجرجاني**) لەبارەی پێناسەی (حكم) و (الحكم بما أنزل الله)ەوە دەڵێ: {الحُكم: هوَ سياسَة النَّاس والقَضاء بَينَهُم وتَدبيرِ أُمُورِهِم، وَالحُكمُ بِما أَنزلَ الله هو العَمَلُ بِالحُكم الشَّرعيِّ}[1]، واتە: حوکم بە کتێبی خوا، بریتیە لە سەرپەرشتیی کردن و مشوور لێخواردنی خەڵك، وە دادوەریی کردن لەنێوانیاندا، وە بەڕێوەبردنی کارو باریان، حوکم کردنیش بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، بریتیە لە کار کردن بە حوکمی شەرعیی، (بەو حوکم و یاسایانەی کە لە قورئان و سوننەت وەردەگیرێن).

خوای کاربەجێ دەربارەی حوکم کردن بە قورئان، لە سیاقی چەند ئایەتێکدا، کە باسی تەورات دەکا، کە بۆ جوولەکەکانی دابەزاندوە، وەباسی ئینجیل دەکا، کە بۆ نەصرانییەکانی دابەزاندوە، دوایی دەفەرموێ:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ... ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة.

واتە: وە ئێمە کتێبیشمان بەحەق بۆتۆ دابەزاندوە، هەرچی لەپێش خۆیەوەیەتی لە کتێبەکانی خوا، هەموویان بەڕاست دەزانێ (وەك ئەصڵەکەیان، نەك وەك واقیعی ئێستایان، کە لادان و گۆڕانکاریی زۆریان تێدا کراوە)، وە بەسەریشیانەوە چاودێرە (ئەگەر گۆڕانکاریی و لادانیان تێدا کرابێ، ئەوەی بە پێویستی زانیبێ، دەستنیشانی دەکا) تۆ حوکمیان لەنێواندا بکە بەوەی، کە خوا ناردوویەتە خوار، وەبەدوای ئارەزووەکانیان مەکەوەو لەحەق لامەدە.

---

(١) التعريفات، ص ٩٧، و التوقيف على مهمات التعاريف، للكفوي، ص ١٤٥.

■ ٥٤ ■

# شەریعەتی خوا کردنە دادوەر
# (التَّحاكمُ إلى شَريعة الله)

(الرازي) لەبارەی ڕیشەی (حکم)ەوە لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: {حَكَّمهُ في مالِه تَحكيماً، إذا جَعَل إليهِ الحُكم فيهِ، فاحتَكَم إلَيْه في ذلك، واحتَكَموا إلى الحاكِمِ، والمُحاكَمَةُ: المُخاصَمَة إلى الحاكِم}[1]، واتە: فڵان کەسی کرد بەدادوەر لەماڵەکەیدا، یانی: حوکم کردنی سەبارەت بەماڵ و سامانەکەی، عایدی وی کردوە، وە حوکم کردنەکەیان گێڕایەوە بۆ لای دادوەر، (المحاكمة)ش واتە: بردنی کێشەو ناکۆکیی بۆ لای دادوەر (قاضي).

ئنجا با دوو نمونەش لە قورئاندا، لە بارەی پێویستبوونی دادوەریی بردنە لای شەریعەتەوە بێنینەوە، وەك بەڵگە لەسەر ئەوەی، کە شەریعەتی خوا کردنە دادوەر، فەرزێکە ئینسان بەبێ ئەوە نابێتە مسوڵمان:

یەکەم: خوای زاڵ و زانا لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ ﴾ النساء.

---

(١) مختار الصحاح، ص ١٤٢.

واتە: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی، كە پێیان وایە بڕوایان هێناوە بەوەی كە دابەزێنراوە بۆ لای تۆ، وە بەوەش كە پێش تۆ دابەزێنراوە، {ئیددیعای ئەوە دەكەن كە ئیمانیان بە قورئانیش هەیە، وە بەكتێبەكانی دیكەش هەیە كە پێش قورئان دابەزێنراون}، كەچی دەیانەوێ كێشەو مشت و مڕی خۆیان ببەن بۆ لای طاغووت و دەیكەنە دادوەر، فەرمانیشیان پێكراوە كە كوفر بە طاغووت بكەن، وە شەیتانیش دەیەوێ بە گومڕاییەكی دوور گومڕایان بكاو، دووریان بخاتەوە لە ڕاستە ڕێ.

**ئەمە ئەوە دەگەیەنێ:** كە كەسێ تەنها بیەوێ و ئیرادە بكا طاغووت بكاتە دادوەری خۆی، پێی لەدین دەردەچێ، چ جای ئەوەی بە كردەوە وابكا! هەڵبەتە ئەوە لە حاڵەتێكدایە كە بە دڵ و قەناعەتەوە بێ، ئەمە لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، بەڵام كەسێك لە حاڵێكدا كە مەحكەمەیەكی شەرعیی نیەو بەناچاریی پەنا دەباتە بەر لایەنێكی دیكە، بۆ ئەوەی بەشێك لە حەقەكەی خۆی دەست بكەوێ، زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، كە مەرج نیە ئینسان لە هەموو حاڵاندا بەو هۆیەوە لە بازنەی ئیمان دەربچێ، ئەگەر دڵ و قەناعەتەكەی چەسپاو بێ و، هەر شەریعەتی خوا بەڕاست بزانێ، بەڵام بەناچاریی پەنا بەرێتە بەر لایەنێكی دیكە، بۆ ئەوەی بەشێك لە حەقەكەی دەست بكەوێ، یاخود ستەمی زیاتری لێنەكرێ، ئەوە ئەوپەڕەكەی دەگونجێ بڵێین: گوناهێكە كردوویەتی، بەڵام ئەو ڕەفتارە بە كوفر لەقەڵەم نادرێ، مادام دڵ و دەروونەكەی چەسپاو بێ، وە بشڵێ: من هەر شەریعەتی خوام پێ ڕاست و پێ حەقە، هەڵبەتە هەندێ لە زانایانیش دەڵێن بە ڕەهایی طاغووت كردنە دادوەرو، شەریعەتی خوا نەكردنە دادوەر، ئینسانی پێ لە بازنەی ئیمان و ئیسلام دەردەچێ، ئەو بابەتەش لەو سیاقەدا، لەوەندەی كە گوتمان زیاتر هەڵناگرێ و لەشوێنی دیكەدا بەدرێژیی لە بارەیەوە دواوین[1].

---

(١) بڕوانە: بەرگی سێیەم و چوارەمی: {تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز} كە تەفسیری هەردووك سووڕەتی (النساء) و (المائدة)یان تێدان، هەروەها بەرگی دووەمی كتێبی: {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}.

دووەم: لە سووڕەتی (النور) ئایەتی (٥١)دا خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ:

﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾.

واتە: بێگومان قسەو هەڵوێستی بڕواداران کاتیٚ بانگ دەکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا، تاکو دادوەرییان لەنێواندا بکات، {قسەو هەڵوێستیان} هەر ئەوەیە کە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن.

تەنیا ئەوانە کە کاتێك بانگ بکرێن بۆ لای شەریعەتی خوا، بڵێن: بیستمان و وەردەگرین، وە جێبەجێشی دەکەین، سەرفرازن، واتە: هەرکەسیٚ هەڵوێستی وانەبیٚ، سەرفراز نیە.



## گەیاندن و ڕوون كردنەوەی بەرنامەی خوا (تَبليغ وَتَبيين دِينِ الله)

(**إبن فارس**) دەڵێ: {التَّبليغ مَصدر بَلَّغَ يُبلِّغ تَبليغاً، من مادّة (ب، ل، غ) الَّتي تَدُلُّ على الوصُول إلى الشَّيء}[1]، واتە: (تَبليغ) چاوگی (بَلَّغَ يُبلِّغ تَبليغاً)ە، گەیاندی دەیگەیەنێ گەیاندن، ماددەكەی لە (ب، ل، غ)ەوە هاتوە، كە دەلالەت دەكات لەسەر گەیشتن بە شتێك.

(**الجَوهري**) دەڵێ: {الإبلاغ: الإيصال وكَذلِك التَّبليغ، والإسم مِنهُ: البَلاغ}[2]، واتە: (إبلاغ وتبليغ) بریتیە لە گەیاندن، وە ناوێك كە لەو دوانە دروست دەكرێ، بریتیە لە: (بَلاغ) واتە: گەیاندن.

**ئێستاش با سەرنجی چەند دەقێك بدەین لەبارەی گەیاندنی بەرنامەو شەریعەتی خوای بەرزو مەزنەوە:**

یەكەم: خوای زاناو توانا لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٩٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ .. ﴿٩٩﴾ ﴾.

---

(١) مقاييس اللغة، ج١، ص ١٠٢.

(٢) الصحاح، ج٣، ص ١٣١٦.

واتە: جگە لە گەیاندن (هیچ ئەركێك) لەسەر پێغەمبەر نیە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەنیا گەیاندنی بەرنامەی خوای لەسەرە، بەڵام دوایی ئەركی خەڵكە، كە ئەو پەیامەی پێغەمبەری خوا بەڕوونیی پێی ڕاگەیاندوون، جێبەجێی بكەن.

**دووەم:** هەروەها خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٨٢)دا، دەفەرمویَ:

﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٢﴾ ﴾.

واتە: ئنجا ئەگەر پشتیان تێكردی و ملیان وەرسووڕاند، ئەوە بێگومان تۆ تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشكرات لەسەرە.

**سێیەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەبارەی گەیاندنی شەریعەت و بەرنامەی خواوە فەرموویەتی:

{لِيُبَلِّغ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَإِنَّ الشَّاهِدَ عَسَى أَنْ يُبَلِّغَ مَنْ هُوَ أَوْعَى لَهُ مِنْهُ}، أخرجه أحمد برقم (٢٠٤٠٢)، والبخاري برقم (٥٢٣٠)، ومسلم برقم (١٦٧٩)، وأبو داود برقم (١٩٤٧)، وأخرجه أيضًا: ابن حبان برقم (٥٩٧٤) .

واتە: با ئەوەی لێرە ئامادەیە، بیگەیەنێ بەوەی كە لێرە نیە، (دیارە فەرمایشت و وتارێكی فەرمووە، فەرموویەتی: با ئەوانەی كە گوێیان لێیە لێرە، بیگەیەنن بەوانەی لێرەنین)، چونكە زۆر نزیكە كەسێك شتێك ببیستێ، خۆی زۆر باشی لێ تێنەگا، دوایی بیگەیەنێ بە یەكێكی دیكە، كە ئەو باشتر لێی تێبگات و باشتر بتوانێ ئیستیعابی بكا، باشتر بزانێ مەرام و مەبەستی ئەو قسەیە چی بووە.

**چوارەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

{بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً} أخرجه أحمد برقم (٦٤٨٦)، والبخاري برقم (٣٢٧٤)، والترمذي برقم (٢٦٦٩) وقال: حسن صحيح، وابن حبان برقم (٦٢٥٦)، وأخرجه أيضًا: الدارمي برقم (٥٤٢)، والديلمي برقم (٢٠٨١) .

واتە: لەمنەوە ئەگەر ئایەتێکیش بێ بیگەیەنن.

ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە نابێ بڵێی: من دەبێ لەهەموو بەرنامەی خوا تێبگەم، ئنجا دەست بکەم بە گەیاندنی بەخەڵك، بەڵکو ئایەتێکیش کە لێی دڵنیای ئەوە ئایەتی خوایە، حوکمێکی شەرعیش لە شوێنی خۆیدا ئەگەر پێویست بوو، بیگەیەنە، چونکە گەیاندنی کەم یان زۆر، ئەرکی ئۆممەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، هەرکام لە ئەندامانی ئۆممەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، نوێنەرایەتیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکا بۆ گەیاندنی بەرنامەو شەریعەتەکەی، بۆ پیادە کردنی لە ژیانی خۆیداو گەیاندنی بە جگە لە خۆی.

ئنجا با بێینە سەر ڕوون کردنەوەی چەمك و واتای وشەی: ڕوونکردنەوە (تَبيين)، (**الرازي**) دەڵێ: {التَّبيين: الإيضاح وَهوَ أيضاً الوضُوح}[1]، واتە: (تَبيين) یانی ڕوون کردنەوە، هەروەها بەمانای ڕوونیش دێ.

(**جاحظ**)[2] دەڵێ:{البَيان: إسمٌ جامعٌ لِكُلِّ شيءٍ كَشَف لَكَ قِناعَ المَعنى، وَهَتَكَ الحِجابَ دون الضَّمير، حَتّى يُفضي السّامِع إلى حَقيقَتهِ ويَهجِم عَلى مَحصُولِهِ}[3] واتە: (بَيان) ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەر شتێك کە پەردە لەسەر مانا لادەدا، وەکارێکی وا دەکا کە ماناکەی بچێتە دڵەوە، تا بیسەر ئەو قسەیەی کە دەیبیستێ، باش باش لە مەبەستەکەی حاڵی بێ.{ئەوە پێی دەگوترێ: (بَيان)}.

**ئنجا با دوو نموونە لە ئایەتەکانی قورئانی بەرزو بەپێز لەبارەی ڕوونکردنەوە (تبیین)ەوە بێنینەوە:**

یەکەم: خوای خاوەندار لە سوورەتی (إبراهيم) ئایەتی (٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ ..﴿٤﴾ ﴾.

---

(١) مختار الصحاح، ص ١٧٦.

(٢) ئەدیبێکی ناودارو زبر دەست بووە، کتێبێکی هەیە بەناوی (البَيان والتَّبيين)، ج١ ص ٧٦.

(٣) البيان والتبيين، ج١ ص ٧٦.

واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر بە زمانی گەلەکەی خۆی (واتە: ئەو گەلەی کە لەنێویاندا ژیاوە) تاکو بۆیان ڕوون بکاتەوە.

واتە: پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، گەیاندن و ڕوون کردنەوەیان لەسەر بووە.

دووەم: خوای بەخشەر لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٢٦)دا، دەفەرمویٚ:

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ .. ﴿٢٦﴾ ﴾.

واتە: خوا دەیەوێ بۆتان ڕوون بکاتەوە، کەواتە: ئەرکی پێغەمبەران و جێگرانیان لە زانایان، تەنها گەیاندن نیە، بەڵکو ڕوون کردنەوەشە.

■ ٥٦ ■

## بانگەواز کردن بۆ لای خوا

## (الدَّعوة إِلى الله)

(بانگەواز کردن بۆ لای خوا) مانایەکەی ڕوونەو، بە هێنانەوەی دوو نموونە لە ئایەتەکانی قورئان وازی لێ دێنین:

یەکەم: خوا دەربارەی بانگەواز کردن بۆلای خوای بەرزو مەزن، لەسووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٤) ﴾.

واتە: با کۆمەڵێکتان هەبن، بانگەواز بۆ چاکە بکەن و، فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند بکەن، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن.

دووەم: هەروەها دەفەرموێ:

﴿ ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ (١٢٥) ﴾ النحل.

واتە: بە لێزانیی و ئامۆژگاریی باش بانگەواز بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت

بکەو، بەچاکترین شێواز شەڕە قسەیان لەگەڵ بکە، بێگومان پەروەردگارت زاناترە کێ لەڕێی وی گومڕا بووە، وە هەر ئەویش زاناترە بە ڕێی ڕاست گرتوان.

لەڕاستییدا ئایەت و فەرموودە لەوبارەوە یەکجار زۆرن، کە ئینسانی مسوڵمان لەسەری پێویستە خەڵك بانگ بکا بۆ لای خوا، دوای ئەوەی پێیان دەگەیەنێ و بۆیان ڕوون دەکاتەوە، ئنجا دەبێ بانگیشیان بکات بۆ لای خواو بەرنامەکەی.



■ ٥٧ ■

## بیركردنەوە لە دروستكراوی خوا
## (التَّفَكُّر فـي خَلْقِ الله)

ئەویش یەكێ دیكەیە لەو ئاكارو خەسڵەتە بەرزانەی كە ئینسان پێویستە لە مامەڵە كردن لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا، لەخۆیدا بەرجەستەیان بكاو بیاندرەوشێنێتەوە.

(**إبن فارس**) دەڵێ: {التّفَكُّر مَأخوذ مِن مادّة (ف، ك، ر) الَّتي تَدُل عَلى تَردُّد القَلبِ في الشَيءٍ يُقال: تَفَكَّر، إِذا تَرَدَّدَ قَلبُهُ مُعْتَبِراً}[1]، واتە: (تَفَكُّر) لە ماددەی (ف، ك، ر)ەوە هاتوە، كە دەلالەت لەشتێك دەكا، لەدڵدا دێت و دەچێ، ئەگەر دڵ (یانی: عەقڵ، ئەوان زۆر جار وشەی دڵیان لەشوێنی عەقڵ بەكار هێناوە)، بیر لە شتێ بكاتەوە، بیهێنێ و بیباو تێوەی ڕابمێنێ، بۆ ئەوەی پەندی لێ وەربگرێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (تفكر).

(**الجرجانـي**) دەڵێ: {التَفَكُّر: تَصَرُّف القَلبِ في مَعاني الأَشياءِ لِدَرك المَطلوب}[2]. واتە: (تَفَكُّر) بریتیە لەوە كە دڵ (عەقڵ) لەمانای شتەكان ورد بێتەوەو تێیان ڕابمێنێ، تاكو بگاتە مەبەست. {كە ئایا ئەو شتە مەبەست پێی چیە؟ ئەو

---

(١) مقاييس اللغه، ج٤، ص٤٤٦.

(٢) التعريفات، ص٦٦.

دروستکراوە، بۆچی دروستکراوە؟ چۆن دروست کراوە؟ خوا لە قورئاندا لە زۆر شوێناندا باسی (تفکر)ی کردووە، باسی تێوەڕامان و ورد بوونەوەی کردوە، بۆ وێنە:

**یەکەم:** لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتەکانی (١٩٠-١٩١)دا، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿١٩٠﴾ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿١٩١﴾ ﴾.

لە موناجاتێکی زۆر بە کوڵ و گەرم و گوڕدا، کە خوای پەروەردگار هەندێ لە بەندەکانی خۆی پێ وەسف دەکا دەفەرموێ: بێگومان لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و جێگۆڕکەی شەوو ڕۆژاندا، نیشانە هەن بۆ خاوەن عەقڵان، (خاوەن عەقڵان کێن کە خوای بەرزو مەزن مەدحیان دەکا؟) ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن بە پێوەو، بە دانیشتن و، لەسەر تەنیشتیان (واتە: لە هەموو حاڵاندا، چونکە ئینسان هەر ئەو سێ حاڵەتەی هەن: یان بەپێوەیە، یان دانیشتوە، یان ڕاکشاوە)، بیر دەکەنەوە لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی، (لە ئەنجامی بیر کردنەوەدا، دەگەنە ئەوەی بڵێن): پەروەردگارمان! بە گاڵتەو بەبێ حیکمەت و پووچ و بێ ئامانج ئەم (دروستکراوان)ەت دروست نەکردوە، پاکیی بۆتۆ کە شتێ بخوڵقێنی هیچ ئامانجێکی لە پشتەوە نەبێ، لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

**دووەم:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی ئەو ئایەتانەی سەرەوە، فەرموویەتی:

{لَقَدْ نَزَلَت عَلَيَّ اللَّيْلة آيَةٌ، وَيْلٌ لِمَن قَرَأَها وَلَم يَتَفَكَّر فِيها: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمواتِ وَالأَرض)} أخرجه ابن حبان برقم (٦٢٠)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دوای ئەوەی ئەم ئایەتەی بۆ هاتە خوار، بە هاوەڵانی بەڕێزی فەرموو: ئەمشەو ئایەتێکم بۆ هاتۆتە خوار، سزا بۆ

ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوەو بیری لێ ناکاتەوە، ئنجا ئایەتەکەی، یان ئایەتەکانی خوێندەوە.

سێیەم: هەروەها خوای پەروەردگار دەربارەی بیرکردنەوەی ئینسان لە دروستکراوەکان، هەروەها لەخۆی، دەفەرموێ:

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾ الروم.

واتە: ئایا لە دڵی خۆیاندا بیریان نەکردۆتەوە: کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، تەنیا بە هەق و بە چەسپاندنی هەق، وە بۆ کاتێکیی دیاریکراو، دروست کردوون؟ وە بێگومان زۆرێك لە خەڵکی بە دیداری پەروەردگاریان بێبڕوان.

**بۆ زانیارییتان!** ئاسمانەکان واتە: سەرەوە، زەوی واتە: ژێرەوە، وە ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان واتە: ئەو دروستکراوانەی کە بە نسبەت ئێمەوە نە لەسەرەوەن و نە لە خوارەوەن، چونکە: سەروو و خواروو ڕێژەیی (نسبي)ن، بە نسبەت ئێمەوە، ئەوەی دەکەوێتە خوارەوەمان: زەوییە، وە ئەوەی دەکەوێتە سەروومان، پێی دەگوترێ: ئاسمان.

بەڵێ، خوا ئاسمانەکان و زەوی بەحەق نەبێ دروست نەکردوون، وە بۆکاتێکی دیاریی کراو دروستی کردوون، وە زۆرێك لە خەڵکی بە دیداری پەروەردگاریان بێ بڕوان، واتە: وا دەزانن ئەو کەون و کائیناتە خەون و خەیاڵە، وە وادەزانن ئەو دنیایە شاری بێ خاوەنە، نازانن ئەو چیرۆك و بەسەرهاتە دەبێ ئەنجامێکی هەبێ، خوای کاربەجێ دوورە لەوەی ئیشی بێ حیکمەت بکا، وەك دەفەرموێ:

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: ئایا وا دەزانن بەگاڵتە خوڵقاندومانن، وە بۆ لای ئێمە ناگێڕرێنەوە، بەرزیی بۆ خوای پادشای حەق {کە شتێك بکات هیچ حیکمەتێکی لە پشتەوە نەبێ}، جگە لەوی هیچ پەرستراو نین، خاوەنی بارەگای بەپێزو بەرێزە.

■ ٥٨ ■

## تێوەڕامانی کتێبی خوا
## (التَّدَبُّر فـي كِتابِ الله)

من {تێوەڕامان}م لە بەرامبەر (تَدَبُّر)دا داناوە، پێشتر باسمان کرد کتێبی خوای پەروەردگار دەبێ بخوێنرێتەوەو گوێی لێ بگیرێ، وە پابەندیی پێوە بکرێ، دیارە کاتێ ئینسان دەتوانێ پابەند بێ بە قورئانەوە، کە پێشتر لێی ورد بێتەوەو تێوەی ڕامێنێ، ئایا ئەو فەرمایشتەی خوا چی دەفەرموێ؟ خوا چی ویستوە؟ وە پاشان بەس بە تێوەڕامان ئیکتیفا نەکا، بەڵکو هەوڵبدات پەندی لێوەربگرێ، واتە: ئەوەی کە قورئان داوای لێ کردوە، جێبەجێی بکا، وە لەخۆیدا بیهێنێتە دی.

(الجرجانـي) دەڵێ: {التّدبُّر: النَّظرُ في عَواقِبِ الأُمورِ، وَهو قَريبٌ مِنَ التّفَكُّر، إلاّ أَنَّ التّفَكُّر تَصرُّفِ القَلبِ بِالنَّظَر في الدّليل، والتَّدبُّر تَصرّفُهُ بِالنَّظر في العَواقب}[١]، واتە: (تَدَبُّر) بریتیە لە تەماشاکردن و سەرنجدانی ئەنجامی کارەکان، کە لە بیرکردنەوەوە نزیکە، بەڵام بیرکردنەوە بریتیە لە هەڵس و کەوتی عەقڵ و دڵ لەگەڵ شتەکاندا، بە سەرنج دانی بەڵگەکان، بەڵام ڕامان (تَدَبُّر) بریتیە: لە هەڵس و کەوت کردنی عەقڵ و دڵ، بە تەماشا کردنی سەرەنجامی شتەکان. {نەك تەماشا کردنی بەڵگەکەیان، واتە: لەوەدا لەیەك جیا دەبنەوە، (تَفَكُّر) ئەوەیە

---

(١) التعريفات، ص٥٤.

کە تۆ بیر لە خودی شتەکە بکەیەوە، بەڵام (تَدَبُّر) ئەوەیە بیر لە سەرەنجامی ئەو شتەو کۆتاییەکەی و دەرەنجامەکەی بکەیەوە}.

**ئنجا با بزانین تێوەڕامانی قورئان چی دەگەیەنێ؟**

(**إبن القيم**) دەڵێ: {أمّا تَدَبُّر القُرآن: فَهوَ تَحديق ناظِر القَلبِ إلى مَعانيه، وَجمْعُ الفِكرِ عَلى تَدَبّرِهِ وَتعقُّلِهِ وهوَ المَقصودُ بإنزالِهِ}[1]، واتە: تێوەڕامانی قورئان، بریتیە لەوە چاوی دڵ ببڕیە ماناو مەبەستەکانی، وە فیکری خۆت کۆ بکەیەوە لەسەر تێوەڕامانی و فام کردنی، کە هەر ئەوەش ئامانجی ناردنی قورئانە.

وەك خوای تاك و پاك دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص.

واتە: (ئەمە) کتێبێکی بەپێزە ناردوومانەتە خوار، تاکو لە ئایەتەکانی ڕامێنن، وە تاکو خاوەن عەقڵان پەند وەربگرن.

هەڵبەتە لەزۆر ئایەتی قورئانیشدا باسی بیرلێکردنەوەو تێوەڕامانی قورئان کراوە، بەڵام ئێمە بە دوو نموونە وازی لێدێنین:

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٨٢)دا، دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ﴿٨٢﴾ ﴾.

واتە: ئایا لە قورئانەوە ڕانامێنن؟! {یانی: هەڵوەستەی دوورو درێژی فیکریی لەبەرامبەر ئایەتەکانیدا ناکەن؟} ئەگەر ئەم قورئانە لەلای جگە لەخواوە بوایە، ناکۆکیی و تێکگیرانی زۆریان تێدا دەبینی.

تەماشا دەکەین ئەو قورئانە بەرزو مەزنە، ئەو ئایەتانەی کە لەماوەی بیست و سێ (٢٣) ساڵدا هاتوونەتە خوار، بەشێکیان لە مەککە، بەشێکیان لە مەدینە، لە فاصیلەیەکی بیست و سێ (٢٣) ساڵییدا، هیچی لەگەڵ ئەوەی دیکەدا ناکۆك نیە، بەڵکو هەمووی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك بەیەکەوە پەیوەستن و یەکدی

(١) مدارج السالكين، ج١. ص ٤٧٥.

دەبەستنەوە، ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە، كە كەسێك ئەم قورئانەی ناردوە، كەسێك ئەم فەرمایشتەی فەرمووە، كاتێ كەیەكەم ئایەتی ناردۆتە خوار:

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ العلق.

كۆتا ئایەتیشی لەبەر چاو بووە، كە چی تێدا دەنێرێتە خوار، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان ئەو ئایەتەیە كە دەفەرموێ:

﴿ .. ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ .. ﴿٣﴾ ﴾ المائدة.

**دووەم:** هەروەها لەسوورەتی (محمد) ئایەتی (٢٤)دا خوای زاناو شارەزا بەسەرزەنشتەوە ڕوو لەبێبڕوایەكان، یاخود ڕوو لەدڵ نەخۆشەكان دەكاو دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾ .

واتە: ئایا لە قورئانەوە ڕانامێنن، یاخود دڵیان قوفڵی لێدراوە؟ واتە: ئەگەر لە قورئانەوە ڕابمێنن بەدڵێكی كراوەوە، لە مەبەستەكانی تێدەگەن، بەڵام ئەگەر لە قورئانیش ڕامێنی، بەڵام بەدڵی داخراو، لێی بەهرەمەند نابی، یاخود ئەگەر دڵیشت كراوەبێ، بەڵام تێیرانەمێنی، لێی بەهرەمەند نابی.

كەواتە: دەبێ تێشیرامێنی و دڵی خۆشتی بۆ بكەیەوە، ئەو كاتە لە قورئان بەهرەمەند دەبی، چونكە هەندێ كەسی عەلمانیی، كە لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای قورئان دەكەن، یاخود بە چاویلكەی ڕۆژئاواییەكانەوە تەماشای دینەكەی خۆیان دەكەن، ئەوەی ئەوان دەربارەی دینە تێكدراوو شێوێنراوەكەی خۆیان گوتوویانە، هەندێ زڕە مسوڵمانمان هەیە، هەمان قسە وەك تووتی دووبارە دەكاتەوە، دەڵێ: كوا قورئان چی تێدایە؟ یان فڵان سوورەت چی تێدایە؟ ئاخر تۆ، یان تێوەی ڕانامێنی، یان بەدڵی داخراوەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەكەی، دڵی خۆتی بۆ بكەوەو، بابەتییانە مامەڵەی لەگەڵ بكە، بە قەناعەتی پێش بیر كردنەوەوە تەماشای قورئان مەكە، بە بیرو قەناعەتی پێش وەختە مامەڵە لەگەڵ قورئاندا مەكە، دڵی خۆتی بۆ بكەوەو بابەتییانە تەماشای بكە، ئنجا بزانە چی تێدا دەبینی!!.

■ ٥٩ ■

## پەند لێوەرگرتنی کتێبی خوا
## (التَّذكُّر بِكتابِ الله)

(إبن القيم) لەبارەی چەمك و واتای وشەی (تذكُّر)ەوە دەڵێ: {التَّذكُّر: تَفعُّلٌ مِن الذِّكرِ، وَهوَ ضِدُّ النِّسيان، وهوَ حُضُور صورَة المَذْكور العِلمية في القَلب، واختُيِر لَهُ بناء التَّفَعُّلِ لِحصولِهِ بَعدَ مُهلةٍ وَتدرُّجٍ، فَمَنزِلةُ التَّذكُّر مِن التَّفَكُّر، مَنزِلَةُ حُصُول الشَّيءِ المَطلوبِ بَعدَ التَّفتيش عَلَيه}[1]، واتە: وشەی (تَذكُّر) لەسەر کێشی (تَفَعُّل)ە، {کە مانای (تَكَلُّف)و خۆ ئەزیەتدان و فشار لەخۆ کردن دەگەیەنێ}[2]، (تَذكُّر) (تَفَعُّل)ە لە (ذكر)ەوە هاتوە، (ذكر)یش پێچەوانەی لەبیر چوونەوەیە، {خۆت وا لێبکەی ئەو شتە لە مێشکی خۆتدا ئامادە بکەی}، ئەویش بریتیە: لە ئامادەبوونی وێنەی زانستیی شتێك {واتە: وێنە تیۆرییەکەی} لە عەقڵدا، وە بۆیەش ڕێژگەی (تَفَعُّل)ی بۆ هەڵبژێرراوە، چونکە پاش مۆڵەتێك و بە پلە پلەیی پەیدا دەبێ، بۆیە ئەو شێوە تەعبیرەی بۆ هەڵبژێرراوە، {پاشان (إبن القَيم) ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئایا پەند وەرگرتن لەکوێی بیرکردنەوەدایە؟} پێگەکەی بریتیە لە پەیدا بوونی شتێکی دیاریی کراو، دوای ئەوەی کە دەیپشکنی و لێی دەگەڕێی.

---

(١) مدارج السالكين - ج١، ص٤٧٤.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

واتە: بیرکردنەوە بریتیە لە پشکنین و گەڕان بەدوای شتێکدا، بەڵام (تَذكُّر) بریتیە لە گەیشتن بەو شتەی کە لێی گەڕاوی.

**ئەمەش دوو نموونەی ئایەتەکانی قورئان لەبارەی پەند لێوەرگرتنی قورئانەوە:**

**یەکەم:** خوا تبارك وتعالى لە سوورەتی (ص) ئایەتی (٢٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾.

واتە: (ئەمە) کتێبێکە ناردوومانەتە خوار بۆ لای تۆ، بە پیت و پێزە، بەرهەم دارە، بۆ ئەوەی لە ئایەتەکانیەوە ڕامێنن، وە بۆ ئەوەی خاوەن عەقڵان بەهرەی لێ وەربگرن و پەندی لێ وەربگرن. { پێی بگەنە ئەو ئامانج و مەبەستانەی، کە پێویستە پێیان بگەن }.

**دووەم:** هەروەها لە سوورەتی (إبراهيم) ئایەتی (٥٢)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٢﴾ ﴾.

واتە: ئەمە پەیامێکە، ڕاگەیاندنێکە بۆ خەڵك، وە بۆ ئەوەی پێی وریا بکرێنەوە، پێی بترسێنرێن، وە {بەهۆی ئەو قورئانەوە} بزانن کە تەنها یەك پەرستراو هەیە، {یانی: پەرستراوێك کە شایستەی پەرستران بێ، یەکە، ئەویش خوایە (سبحانە و تعالى)، جگە لەو یان وەك خۆتە، یان لەخۆشت نزمترە}، وە بۆ ئەوەی ئەوانەی خاوەن عەقڵن پەندی لێ وەربگرن. {دوای ئەوەی پێیان دەگات و تێوەی ڕادەمێنن و، بیری لێ دەکەنەوە}.

■ ٦٠ ■

## لەگەڵ خۆدا تێکۆشان (مُجاهدة النَّفس)

یەکی دیکە لەو خەسڵەت و ئاکارە جوانانەی کە ئینسان دەبێ مامەڵەیان پێ لەگەڵ خوادا (سبحانه و تعالى) بکا، ئەوەیە، کە لەگەڵ نەفسی خۆیدا تێبکۆشێ، نەفسی خۆی ڕابێنێ لەگەڵ خێرو چاکەدا، هەم بە فێرکردنی، هەم بە پەروەردەکردنی.

شارەزایانی زمان لە بارەی چەمك و واتای وشەی (مُجاهَدة)ەوە گوتوویانە: {المُجاهَدة: مَصْدر: جاهَدَ يُجاهِد جِهاداً ومُجاهَدةً، وهو مَأخوذ مِن مادّة (ج، هـ، د) الَّتي تَدُلُّ عَلى المَشَقَّة، يُقال: جَهَدتُ نَفسي وأَجْهَدْتُ، والجُهد: الطّاقة، والمُجاهَدة: فِطامُ النَّفس عَنِ الشَّهَواتِ، ونَزْعُ القَلبِ عَن الأَماني وَالشَّهوات}[1].

واتە: (المُجاهدة) چاوگە لە: (جاهَدَ يجاهِد جِهاداً ومُجاهَدة)وە هاتوە، ئەمیش لە ماددەیەش (ج، هـ، د)ەوە وەرگیراوە، ئەم ماددەیەش زەحمەت و قورسیی دەگەیەنێ، واتە: ئەرك کێشان دەگەیەنێ، دەگوترێ: (جَهَدتُ نفسي وأَجْهَدْتُ) {واتە: هەم بە (ثلاثي) دەگوترێ، هەم بە (رُباعي) هەر یەك مانایان هەیە، خۆم ئەزیەت دا، ئەرکم کێشا، لەگەڵ خۆمدا تێکۆشام، قورساییم خستە سەر خۆم، وشەی (جَهْد) بەمانای ئەوەیە}[2]، بەڵام (جُهْد) بەمانای وزە دێت.

---

(١) لسان العرب ج٣ ص ١٣٣- ومقاييس اللغة، ج١ ص ٤٨٦.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(مُجاهَدَة)ش ئەوەیە کە ئینسان نەفسی خۆی دوور بخاتەوە لە ئارەزووەکانی، وە دڵی لەو خۆزگەو ئارەزووانە، کە ناڕەواو ناهەقن، دوور بخاتەوەو لێیان دابڕێ.

(الكَفَوي)یش لە پێناسەی (مُجاهَدة النَّفس)دا گوتوویەتی: {مُجاهَدةُ النَّفس: هيَ حَمْل النَّفس عَلى المُشاقِّ البَدَنيَّة ومُخالَفةِ الهَوى، وَقيل: بَذْلُ المستَطاعِ في أمر المُطاع (أي المَولى عزَّ وَجَل)}[1]، واتە: لەگەڵ خۆدا تێکۆشان: بریتیە لەوە کە نەفسی خۆت ناچار بکەی ناڕەحەتییەکان تەحەممول بکا، وە پێچەوانەی ئارەزووەکانی (ئارەزووە ناشەرعییەکان) بجووڵێتەوە، وە گوتراوە: ئەوەی لەتوانادا هەیە، بەکاری بهێنی لە وزەو توانا پەنهان و ئاشکرایەکانی خۆت، بە جێبەجێ کردنی فەرمانی کەسێك، کە دەبێ بە قسەی بکرێ، واتە: خوای بەرزو مەزن.

## جۆرەکانی نەفس:

نەفس سێ جۆرە، وەك خوای زاناو توانا لە قورئاندا ناوی هێناون، سێ ناوونیشان، یاخود سێ حاڵەتی بۆ داناون، وەك زانایانی بواری تەزکیەو تەصەووف ئاماژەیان پێکردوە، نەفس سێ حاڵەتی هەن:

**حاڵەتی یەکەمی نەفس: (الأمّارة بالسوء).**
**حاڵەتی دووەمی نەفس: (اللوّامة).**
**حاڵەتی سێیەمی نەفس: (المطمئِنّة).**

**ئنجا ئەو سێ حاڵەتەی نەفس، لەو ئایەتە موبارەکانە وەرگیراون:**

**١- (الأمّارة بالسوء):**

خوای میهرەبان دەفەرموێ:

﴿.. إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ ..(٥٣)﴾ یوسف.

واتە: نەفس زۆر فەرمان دەکا بە خراپە، مەگەر پەروەردگارم بەزەیی بنوێنێ...

---

(١) التوقيف على مهمات التعاريف، ص ٢٩٧.

دیارە (أمّارة) صیغەی موبالەغەی (امرە)یە، هەڵبەتە نەفسێكیش زۆر فەرمانی خراپە كردن بە خاوەنەكەی بكات، دیارە ئەوە نەفسێكە خاوەنەكەی خۆی لەگەڵ ماندوو نەكردوەو، وەك بەردی چاك نەكراوو نەقاڕیی نەكراوە، خاوەنەكەی هەوڵی لەگەڵ نەداوەو، چۆنە هەر بەو شێوەیەیە، بۆیە نەفس ئەگەر خۆی لەگەڵ ماندوو نەكەی و، جڵەوی لێ توند نەكەی زۆر فەرمان دەكا بە خراپە، كە ئەوەش حاڵەتی هەرە نزمی نەفسە.

٢- (اللوّامــة):

خوای زاناو شارەزا لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ۝٢﴾ القیامة.

هەندێ لە توێژەرەوان، ئەم (لا)یە بە (لا)ی نەفی دادەنێن، واتە: بۆ لابردنی سوێندەكە! بەڵام لە ڕاستییدا بەو شێوەیە نیە، بەڵكو خوای بەرزو مەزن كە دەفەرموێ: {لَآ} واتە: نا وا نیە كە ئێوە دەیڵێن، سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت، وەسوێند دەخۆم بە نەفسێك كە زۆر لۆمە دەكا، {لۆمەی خاوەنەكەی دەكا}، ئەوەش حاڵەتێكی میانجییە لەنێوان حاڵەتی زۆر فەرمان كردن بە خراپەو ئارام گرتندا.

٣- (المُطـمئِنّــة):

خوا (سبحانه و تعالى) لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ۝٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ۝٢٨﴾ الفجر.

واتە: ئەی نەفسی ئارام و ئۆخژن بۆ هاتوو! {ئەی نەفسی سەقامگیر لەسەر جادەی شەرع و دامەزراو لەسەر ڕاستە شەقامی خوا}، بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، تۆش (لەخوا) ڕازی و خواش لەتۆ ڕازییە.

**لەگەڵ خۆدا تێکۆشانیش چەند قۆناغ و پلەیەکی هەن، زانایان گوتوویانە چوار قۆناغی هەن:**

**قۆناغی یەکەم:** زانینی ڕێی ڕاست (تَعَلُّمُ الهُدى).

**قۆناغی دووەم:** کار پێکردنی (العَمَلُ بهِ).

**قۆناغی سێیەم:** بانگەواز کردن بۆ لای هەق (والدَّعْوة إلى الحَق).

**قۆناغی چوارەم:** خۆ ڕاگریی لەسەر سەختییەکانی بانگەواز (والصَّبر عَلى مَشاقِّ الدَّعوة).

ئەم چوار قۆناغانەش لە سوورەتی (العصر) وەرگیراون، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلْعَصْرِ ۝١ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ۝٣﴾ العصر.

**کەواتە: لەگەڵ خۆدا تێکۆشان، ئەو چوار قۆناغەی هەن:**

خوا دەفەرموێ: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، سوێند بە عەصر (ڕۆژگار)، مرۆڤ لە زیانبارییدا نقوم بووە. {دوایی هەندێکیان هەڵداوێرێ، بە چوار مەرج و دەفەرموێ} جگە لەو کەسانەی:

١- (ءَامَنُوا۟): بڕوایان هێناوە، واتە: هیدایەتی خوایان وەرگرتوەو فێری بوون و، ئیمان و قەناعەتیان پێ هێناوە.

٢- (وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ): کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، واتە: بەپێی ئەو هەقە بەڕێوە دەچن.

یانی: ئەو هەقەی لە خواوە هاتوە، وەریان گرتوەو تێی گەیشتوون، وە کاریشیان پێی کردوە.

٣ و ٤- (وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ): وە خەڵك ڕادەسپێرن بەهەق، وە ڕایاندەسپێرن بە خۆڕاگریی.

ئەمەش لەدەرەوەی خۆیان، بۆیەش لە قۆناغی سێیەم و چوارەمدا دەفەرموێ: خەڵك ڕادەسپێرن بە حەق، وە بە خۆڕاگریی، چونكە هەمیشە حەق گوتن و، ئەنجامدانی حەق، لەگەڵ ناحەقدا، وە لەگەڵ ئەوانەدا كە چاویان لە ناحەقییە، جا چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە بێ، كە كوفرو شیرك و نیفاقە، چ لەڕووی مامەڵەوە بێ، كە بریتیە: لە زوڵم و ستەم و قۆرخكاریی، هەمیشە حەق لەگەڵ ناحەقدا، تێك دەگیرێ و ڕوو بەڕوو دەبێتەوە، وە هەمیشە ئەهلی باطل بە ئەهلی حەق قەڵسن، بۆیە هیچ چارێكت نیە، دەبێ خۆڕاگرو جێگیرو نەلەخشاوبی، بۆیەش خوا (سبحانه و تعالى) بەو چوار مەرجە، مرۆڤی لە زیانباری دەرباز كردوە، دەفەرموێ: كەسانێك لەو زیانبارییە دەرباز دەبن، كە ئەو چوار مەرجەیان تێدابن: {ئیمان، كردەوەی باش، خەڵك ڕاسپاردن بە حەق، وە خۆڕاگریی لەسەر خەڵك بانگ كردن بۆ حەق}.

**ئنجا با دوو دەقی قورئان و سوننەت لەسەر {لەگەڵ خۆدا تێكۆشان} بە نموونە بێنینەوە:**

**یەكەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی لەگەڵ خۆدا تێكۆشان، دەفەرموێ:

{الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ} أخرجه الترمذي برقم (١٦٢١) وقال: حسن صحيح، وابن حبان برقم (٤٦٢٤)، وأخرجه أيضًا: ابن المبارك في الجهاد برقم (١٧٥)، وأحمد برقم (٢٣٩٩٧)، والطبراني برقم (٧٩٧)، والبيهقي في كتاب الزهد الكبير برقم (٣٦٩)، والديلمي برقم (٦٦٢٩)، قال الألباني: صحيح، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح.

واتە: تێكۆشەر كەسێكە لەگەڵ خۆیدا تێدەكۆشێ.

كار لەسەر خۆی دەكاو جڵەوی خۆی توند دەكات و لە ناحەق دەیگێڕێتەوە.

دووەم: خوای بەرزو زاناش لە سوورەتی (العنکبوت) ئایەتی (٦)دا، دەفەرمویٚ:

﴿ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦ ﴾.

واتە: بێگومان هەرکەسێ تێکۆشا، ئەوە بۆخۆی تێدەکۆشێ، {سوودەکەی بۆ خۆیەتی، خۆی لە تێکۆشانی خۆی بەهرەمەندە}، بێگومان خوا بێنیازە لەجیهانییان.

یانی ئەگەر خەڵك خۆشی ماندوو نەکا، حەقیش وەرنەگرێ و کاری پێ نەکا، وە خەڵکیشی بۆ بانگ نەکاو لەسەریشی خۆڕاگر نەبێ، وە سەرەنجام: هەموویان تووشی زیانباریی ببن، خوای بێنیاز پەکی لەسەر کەس نەکەوتوە، چونکە بێگومان خوای پاك و بێگەرد، پێش ئەوەی ئێمە بخوڵقێنێ، چۆن بووە، ئێستاش هەر وایە، وە دوای ئەوەی هیچ کەس نامێنێ لەسەر ئەم زەوییەو لاپەڕەی ئەم دنیایە هەڵدەدرێتەوەو، تۆماری ئەم دنیایە دەپێچرێتەوە، خوای پەروەردگار هەر وەك خۆیەتی، بەڵام ئەوە ئێمەین لە چاکەی خۆمان، بەهرەمەندین، وە لە خراپەو لادانمان، زەرەرمەندین.

■ ٦١ ■

## داوای لێبوردن
## لەخوا کردن (الإِستغْفار)

کەسێك کە هەتا ئێستا خراپەکاریی کردوەو شەیتان فریوی داوە، یاخود هەست بە کەم تەرخەمیی دەکات لە بەرامبەر خوادا، داوای لێبوردن لە خوا دەکات، چونکە وەك من لە کتێبی: {گەڕانەوە بۆ لای خوا}[1]دا باسم کردوە: مەرج نیە گەڕانەوە بۆ لای خوا، تەنها لە گوناح و تاوانەوە بێ، بەڵکو جاری وایە ئینسان لە کوفرو شیرك و نیفاقەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئیمان و تەوحید، وە جاری وایە لە گوناهانەوە دەگەڕێتەوە بۆ تاعەت، جاری واش هەیە لە سستیی و کەمتەرخەمییەوە، دەگەڕێتەوە بۆ گورج و گۆڵیی، وە جاری واش هەیە لە پلەیەکی نزمی ئیمانەوە، دەگەڕێتەوە، بۆ پلەیەکی بەرزتری ئیمان.

کەواتە: تەوبە هەموو کەس پێویستی پێیەتی، هەندێ کەس وا دەزانێ تەنیا ئەوانەی گوناهبارو خراپەکارن، پێویستییان بە تەوبەیە، بەڵام لە ڕاستییدا وا نیەو هەموو کەس پێویستیی بە گەڕانەوە بۆلای خوا هەیە.

ئنجا با باسی چەمك و واتای وشەی: (الإستغفار) بکەین:

(إبن منظور) دەڵێ: {الإِستغفارُ: مَصدرُ قَولِهم: إِسْتَغْفَرَ يَسْتَغْفِرُ إِستِغْفاراً، وَهو

---

(١) ئەو کتێبە هەتا ئێستا پێنج جاران چاپ کراوەتەوەو هەزاران نوسخەی لێ بڵاو بۆتەوە.

مَأخوذ مِن مادَّة (غ، ف، ر) الَّتي تَدلُّ عَلى السَّتر في الغالِب الأَعَم .... وَأصلُ الغَفر: التَّغطية والسَّتر}[1]، واتە: وشەی (إستغفار) چاوگە، كە دەڵێ: (إسْتَغْفَرَ، يَسْتَغْفِرُ، إستِغْفاراً) داوای لێبوردنی كرد، داوای لێبوردن دەكا، داوای لێبوردن كردن، ئەویش لە ماددەی (غ، ف، ر)ەوە، وەرگیراوە، كە داپۆشین دەگەیەنێ بە گشتی، وە مانای ئەصڵیی وشەی (غَفر) بریتیە لە داپۆشین و پۆشینی شتێك.

{والإستغفار: طَلَبُ الغُفرانِ، والغُفران: تَغطيةُ الذَّنب بِالعَفو عَنه} واتە: (إستغفار) (س)ەكە (س)ی تەڵەبە، واتە: داوای لێبوردن كردن، داواكردنی گوناح پۆشران، كەسێك كە داوای پۆشرانی گوناحەكەی دەكا، پۆشرانی گوناهیش، ئەوەیە ببەخشرێ و ببووردرێ.

**ئەمەش دوو نموونە لە ئایەتەكانی قورئان لەبارەی: {داوای لێبوردن لەخوا كردن}ەوە:**

**یەكەم:** خوای لێبوردە لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٩٠)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ ﴾

واتە: وە داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن، پاشان بۆ لای بگەڕێنەوە، {پێشێ دەبێ داوای لێبوردن بكەی بە زار، ئنجا دەبێ بە كردەوە بگەڕێیەوە}، بە دڵنیایی پەروەردگارم بەبەزەیی خۆشویستەرە[2].

**دووەم:** هەروەها لە سوورەتی (المزمل) ئایەتی (٢٠)دا، خوا (سبحانە و تعالی) دەفەرموێ:

﴿ .. وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿٢٠﴾ ﴾.

واتە: داوای لێبوردن لە خوا بكەن، بێگومان خوا لێبووردەی بەبەزەییە.

---

(١) لسان العرب - ج٥، ص٢٥.

(٢) وشەی (وَدود) بەمانای (مُحِب) بەكوردیی: خۆشویست، یان خۆشویستەر. بڕوانە: المصباح المنير، للفيومي، ص ٣٣٧، (تودَّدَ إليهِ: تَحَبَّبَ، وهو ودودٌ أي: مُحِبٌّ. يَسْتَوي فيه الذَّكَر والأُنثى).

■ ٦٢ ■

## لەناخەوە بەرەو
## خوا بادانەوە (الإِنابة)

(أحمد بن يوسف بن عبدالدائم) لەبارەی چەمك و واتای وشەی: (إنابة)ەوە دەڵێ: {الإنابة: نابَ ينوبُ نَوْباً، وأناب يُنيبُ إنابةً: رجع مرةً بَعدَ أُخرى ... والإنتيابُ: إفتِعالٌ مِنه، يُقال: فُلان يَنْتابُ فُلاناً أَي: يَقصدُهُ}[1]، واتە: وشەی (إنابة) چ لە (ثلاثي)ەكەیەوە بێ (نابَ ينوبُ نوباً)، چ لە (رباعي)ەكەیەوە (أناب ينيبُ إنابة)، هەردووكیان یەك واتایان هەیە واتە: جار لەدوای جار گەڕایەوە بۆ لای خوا، (إنتياب)یش (إفتعال)ە، لە (ناب)ەوە، دەگوترێ: (فلان يَنْتابُ فلاناً، أَي يقصدُهُ)، واتە: فڵان دەچێ بۆ لای فڵان كەس، جار لەدوای جار، یاخود بە ئامانجەوە دەچێ، یاخود دەیەوێ بچێ بۆ لای.

بەڵام ئەوەی من لێی حاڵی بووم، وشەی (إنابة) بریتیە لە گەڕانەوە بۆلای خوا لە دڵ و دەروون و ناخەوە. ئێستاش با تەماشای چەند ئایەتێك بكەین، لەبارەی (إنابة)ەوە:

یەكەم: لە سوورەتی (الزمر) ئایەتی (٥٤)دا، خوای بەرزو مەزن، دەفەرموێ: ﴿ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ .. ﴿٥٤﴾ ﴾.

---

(١) عمدة الألفاظ في تفسير أشرف الألفاظ، ج٤، ص٢٢٩.

واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان لە ناخەوە، وە بۆی ملکەچ بن.

دووەم: لە سوورەتی (الشورى) ئایەتی (١٣)دا، خوا تبارك و تعالى دەفەرمویٚ:

﴿ ...ٱللَّهُ يَجْتَبِيٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾.

واتە: خوا هەرکەسیٚ بویٚ بەرەو خۆی گوڵبژێری دەکا، وە بەرەو خۆی ڕێنمایی هەرکەسیٚ دەکات لە ناخەوە بۆ لای بگەڕێتەوە.

{یانی: هەرکەس دڵی خۆی پڕ بکات لە سام و هەیبەت و خۆشەویستیی و بەگەورە گرتنی خواو، لە ناخەوە بەرەو خوا بگەڕێتەوەو وەرچەرخیٚ، خواش ڕێنمایی دەکا}[1].

---

(١) زۆر جار خەڵکانێك ئەوەیان لیٚ دەبێتە ئیشکال کە خوای کاربەجیٚ دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ .. ﴿٩٣﴾ ﴾ النحل. واتە: وە ئەگەر خوا ویستبای دەیکردنە یەك کۆمەڵ، بەڵام هەر کەسی بویٚ گومڕای دەکات و، هەرکەسی بویٚ ڕێنمایی دەکات.. کە ئەمە زۆر دووبارە بۆتەوە لە قورئاندا، لێرەدا خوا (سبحانه و تعالى) بە ڕەهایی (مطلق)ی فەرموویەتی و، تێمان دەگەیەنیٚ کە خستنە سەر ڕێی ڕاست و گومڕایی، هەمووی بە ویستی خوایە، بەڵام ئایا خوای کاربەجیٚ لە گۆترە ئەوە دەکا؟!

نەخێر، لەشوێنی دیکە ڕوونی دەکاتەوە: دەربارەی بە ئەوانەی دەیانخاتە سەر ڕێی ڕاست، دەفەرمویٚ: ﴿ ..وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: ئەوانە دەخاتە سەر ڕێی ڕاست کە زۆر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو مل کەچن لە ناخەوە، وە دەربارەی ئەوانەش کە گومڕایان دەکا، دەفەرمویٚ: ﴿ ...وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ .. ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: خوا ئەو کەسانە گومڕا دەکا، کە ستەمکارن.

■ ٦٣ ■

## گەڕانەوە بۆ لای خوا (التَّوبة)[1]

(إبن فارس) لەبارەی چەمكی زمانەوانیی وشەی (توبة)وە دەڵێ: {التَّوبة: مِن مادّة (ت، و، ب) الَّتي تَدُلُّ عَلى الرُّجوع}[2]، واتە: (توبة) لە (ت، و، ب)ەوە، هاتوە، مانای ئەصڵیی ئەو وشەیە، گەڕانەوە دەگەیەنێ.
وە تەوبە لە زاراوەی شەرعدا، بەم شێوەیە پێناسە كراوە:

{راغب الأصفهاني} دەڵێ: {التَّوبة في الشَّرع: تَرْكُ الذَّنبِ لِقُبحِه، والنَّدَم عَلى ما فَرطَ مِنه، والعَزيمةُ عَلى تَركِ المَعاوَدة، وتدارُكُ ما أمْكَنهُ أن يَتدارَكَ مِن الأَعمالِ بالإِعادة}[3]، واتە: تەوبە لە زاراوەی شەرعدا بریتیە لە وازهێنان لە گوناح لەبەر ناقۆڵایی و دزێویی و خراپیی[4]، وە پەشێمان بوونەوەی لەوەی كە لەدەستی

---

(١) لە چەند شوێنێكدا بە تێرو تەسەلیی باسی {گەڕانەوە بۆ لای خوا}م كردوە، بۆ زیاتر شارەزا بوون و ئاشنا بوون، دەتوانی بگەڕێیەوە سەریان و زیاتر بەهرەمەند بی:
- كتێبی {گەڕانەوە بۆ لای خوا}.
- بەرگی شەشەمی {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}.
- تەفسیری ئایەتی ژمارە (١٧)ی سووڕەتی (النساء).

(٢) مقاييس اللغة - ج١، ص ٣٥٧.

(٣) مفردات ألفاظ القرآن - ص ٧٦.

(٤) نەك لەبەر ئەوەی زیانی بۆ جەستەت هەیە، واز لە گوناح بێنی، بەڵكو لەبەر ئەوەی

چووە، وە دڵی خۆ ساغ كردنەوەو ئیرادەی خۆ بەهێز كردن لەسەر ئەوە، كە نەگەڕێتەوە بۆ ئەو گوناحە، وە هەرچی كە دەشگونجێ لە كردەوان كە لەدەستی چوون، بیانگێڕێتەوە. (چ حەقی خوا بێ، چ حەقی خەڵك).

چەندان ئایەتی قورئان هەن پێمان ڕادەگەیەنن، كە تەوبە بۆ هەموو كەس پێویستە، بۆ نموونە: خوا دەفەرموێ:

﴿.. وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ النور.

واتە: وە هەمووتان تێكڕا ئەی ئیماندارینە! بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، بەڵكو سەرفراز بن، {لە ئەنجامی تەوبەدا ئینسان سەرفرازو بەختەوەر دەبێ}.

**- ئایا جیاوازیی لەنێوان (التوبة) و (الإنابة) و (الأوبة)دا، چییە؟**

**بەچەند شێوەیەك زانایان باسیان لە جیاوازیی نێوان ئەو سێیانە كردوە:**

١- ئەو سێ وشانە هەرسێكیان لە قورئاندا هاتوون، هەندێ لە زانایان جیاوازییەكەیان بەو شێوەیە دەرخستوە، گوتوویانە:

{یقال: لِمن خافَ العِقابَ، هوَ صاحبُ تَوبةٍ.
ویقال: لِمن یتوب بطَمَع في الثَّوابِ، هوَ صاحِب إنابةٍ.
ویُقال: لِمن یتوب لمحض مُراعاةِ الله، هوَ صاحبُ أَوْبةٍ}.

---

خوا پێی ناخۆشە وازی لێ بێنی، ئنجا ئەو كات بە تاعەت بۆتۆ لەقەڵەم دەدرێ، هەروەها بۆ ئەوە بەرۆژوو نەبی، تاكو لەشت ساغ بێ، بەڵكو بۆ ئەوە بەرۆژوو بی، كە خوا فەرمانی كردوە!، هەرچەندە هەموو فەرمانەكانی خوا، ئەگەر جێبەجێیان بكەی، بەدەنت قازانج دەكا، تاك و خێزان و كۆمەڵگا لێی بەهرەمەند دەبن، وە گوناح و تاوانیش، تۆ لە ڕووی جەستەوە زەرەری لێ دەكەی، لەڕووی عەقڵەوە، لەڕووی دەروونەوە، لەڕووی تاكیی، خێزانیی، كۆمەڵایەتیی، لە دنیاو لە قیامەت، بەڵام تۆ بۆیە تاعەت ئەنجام دەدەی، كە خوا فەرمانی پێكردوەو تاكو پاداشتت هەبێ، وە بۆیە واز لە گوناهو تاوان دەهێنی، چونكە خوای كاربەجێ قەدەغەی كردوەو تاكو پاداشتت هەبێ و سزایان نەبی.

واتـــــە:

أ- هەرکەسێ لە ترسی سزادان دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای بەرزو مەزن، ئەوە خاوەنی تەوبەیە.

ب- وە هەرکەسێ بە ئومێدی ئەوەی خوا پاداشتی بداتەوە، (نەك تەنها لە ترسی دۆزەخ)، دەگەڕێتەوە، ئەوە خاوەنی (إنابة)یە.

جـ- وە کەسێ تەنها لەبەر ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، ئەدەب لەگەڵ خوادا بەکار دەهێنێ، {ڕەچاوی مافی خوا دەکا، کە خوا شایستەی ئەوەیە بەندایەتیی بۆ بکرێ، بپەرسترێ و، سپڵەیی بەرانبەری نەکرێ، ئەگەر بەهەشت و دۆزەخیشی دروست نەکردبایە، هەر نەدەبوو سەرپێچیی لێ بکرێ}، ئەو کەسەش خاوەنی (أَوْبة)یە.

٢- هەروەها سەبارەت بەم سێ زاراوەیە، گوتراوە:

أ- {(التَّوبة): صِفَة عامّة المُؤمنين}، واتە: تەوبە سیفەتی ئیماندارانە بەگشتی، وەك خوا تبارك و تعالی دەفەرموێ:

﴿ .. وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ .. ﴿٣١﴾ ﴾ النور.

واتە: ئەی ئیماندارینە تێکڕاتان بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، بەڵکو سەرفراز بن.

ب- {(الإنابة): صِفة الأَولياءِ والمُقرَّبين}، واتە: (إنابة) سیفەتی نزیکان و دۆستانی خوایە، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ .. وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ ق.

واتە: کەسێ بەدڵێکی لە ناخەوە گەڕاوەوە هاتۆتەوە بۆ لای خواو بۆ خزمەت خوا.

جـ- {(والأَوبة) صِفةُ الأَنبياءِ والمُرسَلين}، واتە: (أوبة) سیفەتی پێغەمبەران و نێرراوانی خوایە (سەلامی خوایان لێبێ)، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی سولەیمان (سەلامی خوای لێبێ) دەفەرموێ:

﴿ ...نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾ ص.

واتە: باشترین بەندەی خوا بوو، زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە[1].

٣- (ڕای خۆم) دەربارەی لێکدانەوەو بەراوردی ئەو سێ وشەیە، ئاوایە:

أ- (الإنابة): بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە ناخەوە.

ب- (التَّوبة): بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای خوا، بە ڕواڵەت، دیارە بە ڕواڵەت دەبێ ناخیشی لەگەڵدا بێ.

جـ- (الأَوبة): دەگونجێ مانایەکی بەهێزتر بگەیەنێ لە تەوبە، بۆیە خوای پەروەردگار یەکێ لە پێغەمبەرانی خۆی پێ وەسف کردوە، کە سولەیمانە (سەلامی خوای لێبێ).

وە داوای لێبوردن لە خوا کردن، بریتیە لە ئیعلان کردنی گەڕانەوە بۆ لای خوا، وە بریتیە لە زەمینە خۆش کردن بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا.



---

(١) ئەم جیاوازییە لە (لسان العرب)دا هاتوە لە ماددەی (أوب و توب)دا.

■ ٦٤ ■

## دڵ ئارام بوون بەخوا (الطّمأنينَةُ بِالله):

**شارەزاو پسپۆڕانی زمان ئاوا واتاو مەبەستی وشەی (طمَأْنينَة)یان شیکردۆتەوە:**

أ- (**إبن فارس**) گوتوویەتی: {الطّمأنينَةُ: إسم مِن الإطمِئنانِ الّذي هُوَ مَصدر: إطمَأَنَّ الشَّيء يَطْمَئِنُّ إطمِئْناناً، إذا سَكَنَ وَذلك مَأْخوذ مِن مادَّة: (ط، م، ن) بزيادة الهَمزة، يُقال: إطمَأَنَّ المَكانُ: ثَبَت واسْتَقَرَّ، واطمأَنَّ الرَّجُل: سَكَن... واطمأنَّ وَتَطامَنَ، مُتقارِبانِ لَفظاً ومَعنىً}[١]، واتە: (طمْأَنينَة) ناوە بۆ (إطمِئنان)، (إطمِئنان)یش چاوگە، ئەو شتە ئارام بوو، ئارام دەبێ، یان دادەسەکنێ، ئەویش لە ماددەی (ط، م، ن) وەرگیراوە، هەمزەشی لێ زیاد کراوە، کە دەگوترێ: (إطمأَنَّ المَكانُ) واتە: ئەو شوێنە جێگیر بوو، واتە: سەقامگیر بوو، دامەزرا، وە کە دەگوترێ: (اطمأَنَّ الرَّجُل) واتە: پیاوەکە ئارام بوو، وە وشەی (اطمأنَّ) و (تطامَنَ) هەم لەڕووی بێژەوەو، هەم لەڕووی ماناوە، لێك نزیكن.

ب- (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: {الطّمأْنينَةُ: هيَ السُّكون بَعد الإنزِعاج}[٢]، واتە: (طمَأْنينَة) بریتیە لە ئارامییەك دوای بێزاریی، دوای جموجۆڵ.

---

(١) مقاييس اللغة ج٣، ص ٤٢٢.

(٢) المفردات، ص ٣٠٧.

ج- (**فيروز آبادي**) دەڵێ: {الطُّمأنينَةُ والسَّكينة كُل مِنْهُما يَستَلزِم الأُخرى، لكِن إِستِلْزام الطُّمأنينةِ السَّكينَةَ أَقوى مِنَ العَكس، ثُم إنَّ الطُّمَأنينة أَعَمُّ مِن السّكينة، والسَّكينةُ تَكون حيناً بعد حين، الطُّمَأَنينَة لا تُفارِق صاحِبَها وَكَأَنَّها نِهايةُ السَّكينة}[1]، واتە: وشەی (طمأَنينَة) و (وسكينة) هەركاميان ئەوی دیكە دەگرێتە خۆی، بەڵام (طمأَنينة) زیاتر (سكينَة) دەگرێتە خۆی، لەوەی بە پێچەوانەوە، وە پاشان (طمَأنينة) گشتی ترە لە (سَكينَة)، وە (سَكينَة) جارو بارە، جارو بار دەبێ، جاروبار نابێ، بەڵام (طمأَنينَة) هەمیشە لەگەڵ خاوەنەكەی دایە.

بۆیە دەبینین خوای كاربەجێ كە باسی سەكینەت دەكا دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ .. ﴿٤﴾ ﴾ الفتح.

واتە: خوا ئەو كەسەیە كە، سەكینەتی دابەزاندە نێو دڵی بڕواداران ...

یانی: لەكاتێكی دیاریی كراودا سەكینەت دابەزیە سەر ئیمانداران.

بەڵام تەماشا دەكەین (طمَأنينة) بە (إسم فاعل) (مُطمَئنة) دێنێ و دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ﴾ الفجر.

ئەی ئەو نەفسەی ئارامت گرتوە، واتە: حاڵەتی (إطمِئنان)ت بۆ پەیدا بووە، وا پێدەچێ حاڵەتی ئارام گرتن (الطمأَنينَة) كۆتایی قۆناغی ئەو (السَّكينَة)یەبێ، كە بۆ ئینسان دێ، لە حاڵەتێكی تایبەتدا.

خوای پەروەردگار دەربارەی (ئارام بوونی دڵ بەخوا) لەچەند ئایەتێكدا دواوە، كە دوو نموونەیان لێ دێنینەوە:

یەكەم: لە سوورەتی (الرعد) ئایەتی (٢٨)دا، دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەی كە ئیمانیان هێناوەو دڵیان بەیادی خوای ئارام دەگرێ، ئاگادار

---

(١) بصائر ذوي التمييز ج٣ ص ٥١٧.

بن! دڵان بە یادی خوا ئارام دەگرن، {بەیادی خوا، دڵخۆشییان بۆ دێ و شادمان دەبن}.

دووەم: خوا لە سوورەتی (الفجر) ئایەتەکانی (٢٧-٣٠)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ٢٧ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ٢٨ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ٢٩ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ٣٠ ﴾.

واتە: ئەی نەفسی ئارام گرتوو! بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، تۆ لەو ڕازی ئەویش لەتۆ ڕازییە، بچۆ نێو بەندەکانی منەوەو، بچۆ نێو بەهەشتەکەمەوە.

■ ٦٥ ■

## کاری خۆ سپاردن بەخوا
## (تَفويضُ الأَمرِ إلى الله)

(الرازي) گوتوویەتی: {التفويض: فَوَّضَ إلَيهِ الأَمْر تَفويضاً: رَدَّه إليه}[١]، واتە: کارەکەی بۆ لای وی گێڕایەوە، کارەکەی بەوی سپارد، عایدی وی کرد.

**ئایا جیاوازیی لەنێوان (تَوَكُّل) و (تَفويض)دا چییە؟**

(تَوَكُّل و تفويض) پشت بەخوا بەستن و کاری خۆ بەخوا سپاردن، لەیەك نزیكن، لەنێوان ئەهلی تەزکیەدا لەو بارەوە، جیاوازیی هەیە، بۆ وێنە:

(**إبنُ القيم**) پێی وایە (تَوَكُّل) بەهێزترە لە (تَفويض) وە دەڵێ: (تَوَكُّل) بریتییە لە: كرۆكی (تفويض)، وە ڕای دیکەش هەیە، لەو بارەوە.

بەڵام من پێم وایە: {کاری خۆ بەخوا سپاردن} (تفويض) پلەی بەرز ترە، چونکە تۆ ئەگەر کاری خۆت بەخوا سپارد، حەواڵەی خوات کرد، مانای وایە تۆ حاڵەتی سەکینەت و دڵ ئارامییت بۆ دێ، پێم وایە: ئەوە لە حاڵەتی پشت بەخوا بەستن بەهێزترە، وە حاڵەتی کاری خۆ حەواڵەی خوا کردن، (تفويض) پشت بەخوا بەستن (توکُّل)یش دەگرێتە خۆی.

---

(١) مختار الصحاح، ص ٤٤٨.

با لەبارەی ئەو سیفەتە بەرزو گەورەیەشەوە - واتە: (تفویض)- ئایەتێك بە نموونە بێنینەوە:

لە سوورەتی (غافر) ئایەتەكانی: (٤٤-٤٥)دا، خوا (سبحانه و تعالى) لەسەر زمانی ئەو پیاوە چاكەی كە دیفاع لە مووسا (سەلامی خوای لێبێ)، دەكا، لەبەرامبەر فیرعەوندا، لە كۆتایی قسەكانیدا دەڵێ:

﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ ۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ﴾.

واتە: (ئەو بەندە چاكە دەڵێ): لەمەودوا ئەوەی من پێتان دەڵێم، بیرتان دێتەوە، وە منیش كاری خۆم حەواڵەی خوا دەكەم، وە بێگومان خوا بینەری بەندەكانیەتی {دەیانبینێ و ئاگای لێیانە}، سەرەنجام خوا لەو پیلانە خراپانەی ئەوان بۆیان دەگێڕا، پاراستی، وە سزایەكی خراپ دەوری دارو دەستەی فیرعەونیدا.

## ■ ٦٦ ■

# لەخوا ڕازی بوون (الرِّضا عَنِ الله)

**شیکردنەوەی پسپۆڕانی زمان بۆ چەمك و واتای وشەی (رضا):**

أ- (**إبن فارس**) دەڵێ: {الرِّضا عَنِ الله: الرِّضا مَصدَر: رَضِيَ يَرضى، وَهوَ مَأخوذ مِن مادّة: (ر، ض، و) الّتي تَدل عَلى خِلاف السَّخْطِ}[1]، واتە: (الرِّضا عَنِ الله) ڕازی بوون لە خوا، چاوگە لە: (رَضِيَ يَرضى رِضاً)ەوە هاتوە، كە لە ماددەی (ر، ض، و)ەوە هاتوە، ئەو ماددەیەش دەلالەت لە پێچەوانەی تووڕە بوون دەكا، دەلالەت لەسەر ڕازی بوون و پەسند كردنی شتێك دەكا.

ب- (**الجَوهَري**) دەڵێ: {الرِّضوان: الرِّضا، وَكَذلِك الرُّضوان والمَرضاةُ مِثلُه، والرِّضوان: الرِّضا الكَثير}[2]، واتە: وشەی (رِضوان) یانی (الرِّضا) بە مانای ڕەزامەندیی، هەروەها (رُضوان)یش هاتوە، (مَرضاة)یش بەهەمان شێوە، یەك مانایان هەیە، ئنجا وشەی (رِضوان) واتە: ڕازی بوونی زیاتر.

وەك گوتمان: (فعل) ئەگەر پیتەكانی زیاتر بن، ماناكەشی زیاترە، (رِضا) پیتەكانی كەمترن لە (رِضوان) بۆیە (رِضوان) ماناكەی بەهێزترە، واتە: ڕازی بوونێكی باشتر زۆرتر.

---

(١) مقايس اللغة، ج٢، ص ٤٠٢.

(٢) الصحاح، ص ٢٣٥٣.

ج- **(الجرجانـي)** دەڵێ: {الرِّضا: هوَ سُرورُ القَلبِ بِمُرِّ القَضاءِ، وقيلَ: الرِّضا: إرتِفاعُ الجَزَعِ في أيِّ حُكمٍ كان، وقيلَ: استقبال الأَحكامِ بالفَرَحِ، وَقيل: سُكون القَلبِ تَحتَ مجَاري الأَحكام}[1]، واتە: (رِضا) بریتیە لە دڵخۆش بوون بەو قەدەرە تاڵانەی کە بەسەرت دێن، {بەڵای تاڵت کە بەسەردێ تۆ دڵت پێ خۆش بێ، لەبەر ئەوەی لەخواوەیەو پاداشتی لەدواوەیە} وە گوتراوە: (رِضا) بریتیە لە لاچوونی هەڵپە هەڵپ و نارەحەت بوون بەرامبەر بەهەر بڕیارێکی خوا، وە گوتراوە: بریتیە لە پێشوازیی کردنی حوکمەکان بە دڵخۆشیی، وە گوتراوە: بریتیە لە دڵ ئارام گرتن لەژێر باری بڕیارەکان (ی خوای پەروەردگار)دا.

د- **(المُناوي)** دەڵێ: {الرِّضا: طيبُ نَفْسيٌّ لِلإنسانِ بِما يُصيبُه أو يَفوتُه، مَعَ عَدمِ التَّغيُّر}[2]، واتە: (رِضا) بریتیە لە دەروون خۆشیی نەفس خۆشیی ئینسان بەوەی کە تووشی دێ، یاخود لەدەستی دەچێ {لە بەرژەوەندییەکان} بێ ئەوەی بگۆڕێ.

ئنجا با بزانین خوای پەروەردگار دەربارەی ڕازی بوونی بەندەکان لە خوای بەرزو مەزن، چی دەفەرموێ؟:

**یەکەم:** خوا لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (١٠٠)دا، دەفەرمووێ:

﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

واتە: وە پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران و پشتیوانان، وە لەوانەی کە بەباشیی شوێنی وان کەوتوون، خوا لێیان ڕازییەو، ئەوانیش لەخوا ڕازیین، وە خوا چەند بەهەشتێکی بۆ داناون ڕووبار بەژێر کۆشکەکانیاندا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، ئەوە سەرکەوتن و بەمراز گەیشتنی گەورەیە.

---

(١) التعريفات، ص ١١١، والتوقيف على مهمات التعاريف، للمناوي ص ١٧٨.

(٢) التوقيف، ص ١٧٨.

دووەم: هەروەها لە سوورەتی (الفجر) ئایەتەکانی (٢٧-٣٠)دا کە پێشتریش هێنامانن، خوای پەروەردگار نەفسی ئینسانێکی ئیماندار کە بەیادی خوا ئارامی گرتوە، دەدوێنێ و دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾ ﴾.

(رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ) واتە: تۆ لە خوا ڕازی لەسەر ئەو بەهەشت و نیعمەتەی کە بەتۆی بەخشیوەو، خواش لەتۆ ڕازییە، ئنجا ئێستا شایستەی ئەوەی کە بچیە نێو بەندەکانی منەوە، وە بچیە نێو بەهەشتەکەمەوە.

دیارە لەخوا ڕازی بوون، یانی: لە هەموو شتێکی خوا ڕازی بی، لەشەریعەتەکەی، لە حوکمەکەی، لە پەیامەکەی، لەو بەڵاو موصیبەتانەی کە بەسەرت دێن، لەو ڕووەوە کە لەخواوە دێن، ڕازی بی، تووڕە نەبی، مەرج نیە لە خودی کارەکە ڕازی بی، کەسێك زوڵمێکت لێدەکا، ڕازی مەبە، بەڵام لە خوا تووڕە مەبە، لە زاڵمەکەو لە کردەوەکەی تووڕەبە، بەڵام دڵت بەرامبەر بەخوا نەگۆڕێ، هەر لەبەر ئەوەی ستەمەکە بە ویستی ڕەهای خوایە!.

■ ٦٧ ■

# خواستنی ڕەزامەندیی خوا
## (إبتغاءُ رِضوانِ الله)

(الرازي) لەبارەی ڕوونکردنەوەی چەمك و مەبەستی (إبتِغاءُ رِضوانِ الله) وە، گوتوویەتی:{إبتِغاءُ رِضوانِ الله: بَغى ضالَّتهُ يَبغيها بُغاءً وبُغايَةً: أي طَلَبها ... وابتَغَيْتُ الشَّيءَ وتبغَّيْته: طلَبتُهُ}[1]، واتە: (إبتِغاءُ رِضوانِ الله) واتە: گەڕان بەدوای ڕەزامەندیی خوادا، هەوڵ دان بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا، دەگوترێ: (بَغى ضالَّتهُ) واتە: شتێکی کە لێ ون بووە، بەدوایدا دەگەڕێ، (بُغاءً وبُغايَةً) واتە: داوا کردن، (وابتَغَيتُ الشَّيءَ وتبغَّيْته) واتە: داوای شتێکم کردو بەدوایدا چووم.

{إبتغى: إفتَعل مِنَ البَغي، وقَد غَلَب إختِصاصُها لِلإجتهادِ في الطَّلَب، فإنْ كانَ ذلك المَطلوب مَحموداً فابتِغاؤُهُ كَذلِك، وكَذا عَكسُه، مثل: ﴿..ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا ..﴿٢٨﴾﴾ الإسراء، ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ ..﴿٤٨﴾﴾ التوبة}[2]، واتە: وشەی (إبتغي) (إفتَعل)ەیە لە (بَغي)، (بَغي) یانی داواکردن، بەزۆریی وشەی (بَغي) یان (ابتِغاء) تایبەتە بەوەوە، کە ئینسان لە داواکردنی شتێکدا

---

(١) مختار الصحاح، ص ٦٥.

(٢) عمدة الحفاظ في تفسير أشرف الألفاظ، ج١، ص ٢١٥.

زۆر خۆی ماندوو بکاو تێبکۆشێ، ئنجا ئەگەر ئەو شتەی داوا دەکرێ، ستایش کراوو شتێکی باش بێ، ئەوە داواکردن و بەدواداچوونیشی شتێکی باشە، وە ئەگەر شتێکی خراپ بێ، بەدواداچوون و داواکردنیشی شتێکی خراپە.

**خوای کارزانیش بۆ هەردووکیان (إبتغاء)ی بەکارهێناوە:**

أ- بۆ داواکردنی شتی باش فەرموویەتی:

﴿ .. ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا .. ﴿٢٨﴾ ﴾.

واتە: بەهۆی داواکردنت بۆ ڕەحمەتی پەروەردگارت، کە ئومێدت پێیەتی.

ب- بە نسبەت خراپەشەوە، دەفەرموێ:

﴿ لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ مِن قَبۡلُ .. ﴿٤٨﴾ ﴾.

واتە: ئەوانە پێشتر بەدوای ئاژاوەگێڕییدا گەڕان.

**ئنجا با سێ (٣) وێنە لە ئایەتەکانی قورئان، لەو بارەوە بێنینەوە:**

یەکەم: خوا لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٠٧)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾.

واتە: لە خەڵك هەیە خۆی دەفرۆشێ لەپێناوی وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا، وە خوا بەرامبەر بەبەندەکانی میهرەبانە.
کەواتە: خوا مەدحی ئەو کەسە دەکا کە نەفسی خۆی فیدای ڕەزامەندیی خوا دەکات.

دووەم: هەروەها خوا عز وجل لە سوورەتی (المائدة) ئایەتەکانی (١٥-١٦)دا، دەفەرموێ:

﴿ ... قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ

مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾.

(دیارە ڕووی دواندن لە خاوەن کتێبەکانە) واتە: لە خواوە ڕووناکییتان بۆ هاتوە، وە کتێبێکی ڕوون کەرەوەتان بۆ هاتوە، کە هەر کەسێ بەدوای ڕەزامەندیی خوادا، بگەڕێ، خوا بەرەو ڕێیەکانی ئاشتیی ڕێنمایی دەکا، وە لە تاریکییان بەرەو ڕووناکیی دەریان دێنێ، بە مۆڵەتی خۆی، وە بەرەو ڕاستە شەقامی خۆی هیدایەتیان دەدا، (دەیانخاتە سەر ڕاستە شەقامی خۆی).

سێیەم: هەروەها خوای تاك و پاك لە سووڕەتی (الحشر) ئایەتی (٨)دا، لە باسی مەدحی کۆچکەراندا، دەفەرموێ:

﴿ ..يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ئەوانە بەخشش و ڕەزامەندیی خوا دەخوازن، وە یارمەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن، ئا ئەوانە ڕاست دەکەن (ڕاستانن).

دیارە ئێمە بۆیە {ڕازیی بوون لە خوا، وە هەوڵدان بۆ ڕەزامەندیی خوا}مان کردوە کۆتا سیفەت و ئەدەب و ڕەوشتی بەرزی مامەڵە کردنی بەندە لەگەڵ خوای خۆیدا، چونکە کۆتا شتێك کە ئینسان پێی دەگات، بریتیە لەوەی لەخوا ڕازی بێ، وە خۆشی وا لێبکا، کە خوا لێی ڕازی بێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە لەهەموو شتێکدا لە خوا ڕازی بین، وە کارێکی وا بکەین، خواش لێمان ڕازی بێ، وە سەرەنجام بمانخاتە ئەو بەهەشتەوە، کە بۆ ئەو کەسانەی داناوە، کە لێیان ڕازییە.

# ڕێ خۆشكردن

ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان مەبەست پێیان: ئەو ڕەوشت و ئاكارانەن كە مرۆڤی مسوڵمان لە پەیوەندیی لەگەڵ دەوروبەردا، لەگەڵ خەڵكدا خۆییان پێ دەڕازێنێتەوەو، لە خۆیدا بەرجەستەیان دەكا، بۆ ئەوەی كە بەڕەوشت و ئەدەبێكی بەرزو جوان، لەگەڵ خەڵكدا هەڵس و كەوت بكات، دیارە من سەرجەم ئەو ڕەوشت و ئاكارە بەرزو جوانانەی، كە پێویستە ئینسانی مسوڵمان لەخۆیدا بیانهێنێتە دی و، خۆییان پێ برازێنێتەوە، لەبواری مامەڵەو هەڵس و كەوتی لەگەڵ خەڵكدا، لەگەڵ كۆمەڵگادا، سەرژمێرم كردوون، سەرجەم حەفتاو سێ (٧٣) دانەم لێ گوڵبژێر كردوون، كە دەشگونجێ زیاتر، یان كەمتر بن، بەو واتایەی، كە هەندێكیان بچنە نێو هەندێكیانەوە، یان هەندێكیان بكرێن بەدوو، بەڵام سەرجەم ئەوانەم بە پێویست زانیوە كە لێرەدا سەرژمێریان بكەم.

ئنجا ئێمە سەرەتا ئەو حەفتاو سێ (٧٣)یە، بەڕیز سەرژمێر دەكەین، پاشان بە ڕیزێك كە لێرەدا نووسیومانە، یەك لەدوای یەك سەرو تیشكیان دەخەینە سەر:

١- دادگەریی (العَدل).

٢- چاكەكاریی (الإحسان).

٣- ڕێزگرتن (التَّكریم).

٤- دڵسۆزیی (النَّصیحة).

٥- تەبایی و گونجاویی (الأُلفة والإنسجام).

٦- سینە فراوانیی و لێبوردەیی (السَّماحة).

٧- لێزانیی و دانایی (الحِكمَة).

٨- چاكسازیی كردن (الإصلاح).

٩ و ١٠- خاكێتیی و، هێمنیی، (التَّواضع، والسَّكينَة).

١١ و ١٢- نەرم و نیانیی و، زمان شیرینی (الرِّفق، وَطيب الكَلام).

١٣ و ١٤ و ١٥- سۆزو پەرۆشیی و، بارقوولّیی و، هێدیی و مەندیی (الشَّفَقة، والحِلم، والتَّأني).

١٦- میانجێتیی (التَّوسُّط).

١٧- ڕوو گەشیی (البَشاشَة).

١٨- گەشبینیی (التَّفاؤل).

١٩ و ٢٠ و ٢١ و ٢٢- هاوسەنگیی لە خەرج كردن داو، ماڵ بەخشین لە فەڕەحنایی و سەغڵەتییداو، قەناعەت كردن بە كەمێكی حەڵاڵ و، خۆ پارێزیی بەرانبەر سامانی حەڕام (الإعتدال في الإنفاق، والإنفاق في السَّرّاء والضرّاء، والقناعة، والعِفة تجاه المال الحرام).

٢٣ و ٢٤ و ٢٥- گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی و، هاوكاریی كردنی نزیكان و، چاكە كردن لەگەڵ باب و دایكدا (صِلَة الرَّحِم، وَإيتاءُ ذي القُربى، والإحسانُ إلى الوالِدَين).

٢٦ و ٢٧- بانگەواز كردن بۆ چاكەو، فەرمان كردن بە پەسەندو، ڕێگریی كردن لە ناپەسند (الدَّعوةُ إلى الخَير، وَالأمْرُ بِالمَعروف، والنَّهي عَنِ المُنكر).

٢٨ و ٢٩- هاوكاریی كردن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی و، یەكدی ڕاسپاردن بە هەق و خۆڕاگریی (التَّعاون عَلى البرِّ والتَّقوى، والتَّواصي بِالحَق وَالتَّواصي بِالصَّبر).

٣٠ و ٣١ و ٣٢- دڵپاكیی لەگەڵ بڕوادارانداو، دڵخۆشبوون بە دابین كردنی بەرژەوەندییان و، بەسەرخۆدا هەڵبژاردنیان (نَقاءُ القَلْبِ مَعَ المُؤمِنين، والسُّرورُ بِتَحقيقِ مَصالِحِهم، والإيثارِ مَعَهم).

٣٣ و ٣٤ و ٣٥- لەبن باڵی خۆ گرتنی بڕواداران و، بەزەیی بەرانبەر نواندنیان و، کاروبار بەڕاوێژ بەڕێوە بردن، (الذِّلَّة مَعَ المُؤمنِين، وَالرَّحْمَة بِهِم، وَإِدارَة الأُمورِ بِالشُّورى).

٣٦ و ٣٧ و ٣٨- ڕقی خۆ کپ کردنەوە، لێبوردن لەکاتی توڕەییداو، چاوپۆشیی کردن (كَظْمُ الغَيظ، والمَغفِرة عِنْدَ الغَضَب، وَالعَفو والصَّفح).

٣٩ و ٤٠ و ٤١- بەڕێزەوە بەلای قسەو ڕەفتاری پووچدا گوزەر کردن و، بەچاکە خراپە لابردن و، پشت لە نەفامان کردن (المُرورُ بِاللَّغو مُروراً كَرِيماً، وَدَفعُ السَّيِّئة بِالحَسَنة، والإِعراضُ عَنِ الجاهلين).

٤٢ و ٤٣ و ٤٤ و ٤٥- بەرگریی کردن لەکاتی ستەمداو، بەهێز بوون لەبەرانبەر کافرانی دوژمنداو، زبریی لەسەر کافرانی شەڕ فرۆش و، چەسپاویی و نەلەخشاویی لەکاتی هەڕەشەی دوژمنان و، لەکاتی بەرەنگار بوونەوەی سەختییاندا (الإِنتِصارُ عِندَ البَغْي، وَالعِزّة عَلى الكافِرين، والشِّدّةُ عَلى الكُفّار، والثَّباتُ عِندَ تَهديدِ الأعداءِ ومواجَهَةِ الشَّدائد).

٤٦ و ٤٧ و ٤٨ و ٤٩- متمانە بەخۆبوون و لەسەر پێی خۆ وەستان و، گەیاندنی سپاردەو، ڕاستگۆیی لە بەڵێنداو، پەیمان بردنە سەر (الثِّقةُ بِالنَّفسِ والإِعْتِمادُ عَلى الذّاتِ، وَأَداءُ الأَمانَةِ، وَصِدقُ الوَعدِ، والوَفاءُ بِالعهد).

٥٠- زۆر خەفەت بار نەبوون بە نەهات و، زۆر دڵخۆش نەبوون بە هات، (عَدَمُ الأَسى عَلى الخَيْرِ الفائِت، وَعَدمُ الفَرَح بِنَيْل الخَير).

٥١ و ٥٢- شایەدییدانی بەهەق و، بێباکیی لە سەرکۆنەی لۆمەکاران (أَداءُ الشَّهادةِ بِالحَقِّ، وَعَدَمِ الخَوفِ مِن لَومَةِ اللاّئِمين).

٥٣- چاو ورد کردنەوەو بەرپێی خۆ بینین (التَّبَيُّن).

٥٤- خەم و پەژارە ڕەواندنەوە (تَفريجُ الكُرُبات).

٥٥- وریا کردنەوەو دڵخۆشکردن (الإِنذار والتَّبشير).

٥٦- ئاسانیی لە خەڵك وەرگرتن (أَخْذُ العَفوِ مِنَ النّاس).

٥٧- بە ئارامیی و سەنگینی ڕۆیشتن (المَشْيُ بِسَكينَةِ وَوِقار).

٥٨ و ٥٩ و ٦٠- بە ئینساف بوون و شتی خەڵك بە کەم نەگرتن و، دان بەچاکە داهێنان و، عوزر هێنانەوەو داوای لێبوردن کردن (الإنصافُ وَعَدمِ بَخْس النّاسِ أَشياءَهُم، الإعْتِرافُ بِالفَضل، والإعتذار).

٦١- گوێ گرتن بۆ قسەی هەر کەسێك و شوێنکەوتنی باشترینی (الإستِماعُ لِكَلامِ الآخرين واتِّباعُ أَحْسَنه).

٦٢ و ٦٣- تەنیا قسەی باش لەگەڵ خەڵك کردن و، هەڵبژاردنی باشترین شێوازی دەربڕین (مُحادَثَةُ النّاسِ بِما هوَ حَسَن فَحَسب، واختِيارُ أَفضَلِ الأَساليب التَّعبيرية).

٦٤ و ٦٥- گفت و گۆی هێمنانەو، شەڕە قسە کردن بە چاکترین شێوە (الحِوارُ الهادِيء، والجِدالُ بالَّتي هيَ أَحْسَن).

٦٦- لە نیگای خۆ گرتنەوەو داوێنی خۆ پاراستن (الغَضُّ مِنَ البَصر وحِفظُ الفَرج).

٦٧- خۆ پاکڕاگرتن لە کاتی هاوسەر گیریی نەکردن دا (الإستِعْفافُ عِند عَدَم الزَّواج).

٦٨- بە شەرم و شکۆ بوون لە هەموو هەڵس و کەوتێکدا (التَّخلُّق بِالحَياءِ في كافَّة التَّصرُّفات).

٦٩ و ٧٠ و ٧١ و ٧٢- پۆشتە بوونی ئافرەت و، جوانیی خۆ دەرنەخستنی جگە لەوەی بە شێوەی ئاسایی دەردەکەوێ و، نەڕۆیشتنی بەشێوەیەك کە جوانیی پەنهانی دەربخات و، بە نازو نووزی سەرنج ڕاکێشانە قسە نەکردنی و، نیشتەجێ بوونی لە ماڵداو، لە کاتی دەرچوونی پێویستدا، خۆ نەڕازاندنەوەی (تَسَتُّر المَرأةِ وَعدمِ إِبداءِ زينَتِها، إلاّ ما ظَهَر مِنها عَادَةً، وَعَدمِ مَشيها بِصورَة جالِبةٍ لِلأَنظارِ لِزينَتِها الباطِنة، وَعَدمِ التَّغنُّجِ في الكَلام بِصورَة مُلفِتة، والإستقْرارُ في البَيتِ، وعَدَمِ التَّبرُّج عِندَ الخُروج).

٧٣- خاوەن چاکە بوون (الفَضل).

ئێستاش پاش سەرژمێر كردنی ئەو حەفتاو سێ (٧٣) ڕەوشت و ئاكارە پەسندانەی كە شەریعەت فەرمانی بە مرۆڤی مسوڵمانی كردوە، مامەڵەیان پێ لەگەڵ خەڵكدا بكات، بە گشتیی و لە هەموو بازنەكاندا: بازنەی تەسكتر، وەك دایك و باب و، ماڵ و خێزان، پاشان بازنەی لەو فراوانتر، وەك خزمان و دەرو دراوسێ، پاشان بازنەی فراوانتر، وەك كۆمەڵگا، پاشان بازنەی فراوانتر، وەك تێكڕای خەڵك، تەنانەت ئەوانەش كە دوژمن و ناحەزن و، سەنگەری دژایەتیی دەگرن، دەست دەكەین بە تیشك خستنە سەریان و ڕوونكردنەوەی چەمك و واتایان لە ڕووی زمانەوانییەوە، پاشان پێناسە كردنیان:



## دادگەریی (العَدل)

زانایان زۆر پێناسەی جۆراو جۆریان بۆ دادگەریی (عَدل) کردوە، وە دادگەریی لەگەڵ یەکسانیی (مساواة)دا زۆر نزیك و تێك هەڵکێشن، بەڵام وەك یەکیش نین، با تەماشای قسەی هەندێ لە زانایان بکەین دەربارەی پێناسەی دادگەریی:

أ- (إبن فارس) دەڵێ:{العَدل: مَصدر: عَدَل يَعدِل عَدْلاً، وهوَ مَأخوذٌ مِن مادّة (ع د ل) الَّتي تَدلُّ عَلى مَعنَيَيْن مُتقابِلَين: الإستواءُ، والإعوِجاج، يَرجِع لَفظُ العَدل هُنا إلى المَعنى الأَوَّل، وَالعَدل خِلافُ الجَور، وَهوَ ما قامَ في النُّفوسِ أَنَّهُ مُستَقيم، والعَدْل مِن النَّاس: المَرضيّ المستوِي الطَّريقة. وَيَستوي في هذا الوَصف: المُفرَدُ، والمُثنَّى، والجَمع، والمُذَكر، والمُؤنث: يُقال: رَجل عَدْلٌ، وَرَجُلانِ عَدْلٌ، وَرِجالٌ عَدلٌ، وامرأَة عَدل...}[1].

واتە: وشەی (العدل) چاوگە، لە (عدَل يعدِل عدلاً)ەوە هاتوە، لە ماددەی (ع، د، ل) وەرگیراوەو دوو واتا دەگەیەنێ:

**یەکەمیان:** یەکسان بوون و ڕێك بوون.

**دوووەمیان:** خوارو خێچیی.

---

(١) مقاييس اللغة، ج٤، ص ٢٤٦.

بەڵام وشەی (عدل) لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ مانای یەکەمیان {کە یەکسان بوونە}، وە (عَدْل) پێچەوانەی (جَور)ە واتە: ستەم، (عَدل) ئەوەیە کە لەقەناعەتی هەر کەسێك و خەڵکدا بە گشتی دیار بێ کە ئەوە ڕێك و ڕاستە، وە کە دەگوترێ: فلان کەس (عَدل)ە، واتە: کەسێکە خەڵك لە هەڵس و کەوتی ڕازییە، هەڵس و کەوتێکی ڕێك و ڕاستی هەیە، وە وشەی (عَدل) کە بەکار دەهێنرێ لە زمانی عەرەبیدا، بۆ تاك، بۆ دوان، بۆ کۆ، بۆ نێرینە، بۆ مێیینە، بەکاردێ، دەگوترێ: (رجل عَدْلٌ، ورجلان عَدْلٌ، ورجال عدلٌ، وامْرأة عَدل).

ب- (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: {العَدل والعِدلُ يَتَقاربانِ، لكِن العَدل يُستَعمَلُ فيما يُدْرَكُ بالبَصيرة، والعِدْلُ فيما يُدْرَكُ بِالحاسّة كالمَوزونات والمَعدودات والمكيلات}[1]. وشەی (عَدل) واتە: داد، دادگەریی، وە (عِدلُ) واتە: لابار، هەر بارێك کە لە ولاخ دەنرێ، دو (عِدل)ی هەن واتە: دوو لای هەن.

(**راغب**) دەڵێ: ئەو دوو وشەیە لێك نزیکن، بەڵام وشەی (عَدل) بەکار دەهێنرێ بۆ ئەو شتانەی کە بەعەقڵ دەزانرێن، وە (عِدْل) بۆ ئەو شتانەی کە بەچاو دەبینرێن، وەك ئەو شتانەی کە دەکێشرێن، یان دەژمێررێن، یاخود دەپێورێن، {واتە: شتی ماددیی و بەرهەست}.

ج- هەروەها هەندێکی دیکە لە زانایان بەم حەوت شێوانە پێناسەیان کردوە:

١- العَدل: {الحُكمُ بِالحَق}. واتە: (دادگەریی) دادوەریی کردنە بە هەق.

٢- العَدل: {بَذلُ الحُقوقِ الواجِبَةِ، وتَسويَةُ المُستَحِقِّينَ في حُقُوقِهِم}. واتە: (دادگەریی) بریتیە لە پێدانی ئەو مافانەی کە واجب بوون لەسەرت، وە یەکسان کردنی ئەوانەی کە مافێکیان هەیە، وەك یەك مافەکانیان پێ بدرێن.

٣- العَدل: {هُوَ أَن تُعطيَ مِن نَفسِكَ الواجِب وتَأْخُذَهُ}. واتە: (دادگەریی) ئەوەیە کە: ئەوەی لەسەرت پێویست بووە، بیبەخشی، وە ئەوەشی بۆت پێویست بووە، وەری بگری.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٣٢٥.

٤- العَدل: {الأَمرُ المُتوسِّط بَين الإِفراطِ والتَّفريط}. واتە: (دادگەریی) بریتیە لە: هەر كارێكی میانجیی لەنێوان تێپەڕاندن و بەزایەداندا.

٥- العَدالة في الشَّريعة: {عِبارَة عَن الإِستِقامةِ عَلى طَريقِ الحَقِّ، بالإِجتِنابِ مِمّا هوَ محَظورٌ ديناً}. واتە: (دادگەریی) لەزاراوەی شەریعەتدا، بریتیە لە ڕێك وەستان لەسەر شەریعەت، لەسەر ڕێگای حەق، ئەویش بەوە كە هەرچی قەدەغە كراوە لەشەریعەتدا، خۆتی لێ دوور بگری.

٦- العَدل: {هوَ القِسطُ عَلى سَواء}، واتە: دادگەریی بریتیە لە یەكسان كردن و وەك یەك تەماشا كردن.

٧- العَدل: {هوَ أَخذُ ما لَك، وَإِعْطاءُ ما عَلَيك}[1] واتە: (دادگەریی) ئەوەیە كە: ئەو مافەی هەتە، وەری بگری، وە ئەو هەقەی لەسەرتە، بیبەخشی.

دیارە وشەی دادگەریی و یەكسانیی (العَدل والمُساواة) لەڕووی ماناوە لەیەك نزیكن، دەگوترێ: {ساواهُ، يساويه: أي عادَلهُ}، واتە: وەك یەكن، یان وەك یەكی لێكردن.

(راغب الأصفهاني) لەو بارەوە دەڵێ: {المُساواة: المُعادَلة المُعْتبَرَة بالذَّرعِ وَالوَزنُ والكَيل، وقد يَختَلفان: كالتَّسوية بَين المُختلفِين، وقد يَتَّفِقان: كالتَّسوية بَين المُتماثِلَين، وَالمُساواة بَين المُتماثِلَين، هِيَ الغايةُ الَّتي تَسعى العَدالةُ إلى تَحقيقِها}[2]، واتە: یەكسانیی بریتیە لە وەك یەك لێكردن لەو شتانەدا كە بە گەز دەپێورێن، یاخود دەكێشرێن، یاخود پێوانە دەكرێن، ئنجا جاری وا هەیە یەكسانیی و دادگەریی لەیەك جیا دەبنەوە، وەك ئەوە كە تۆ چەند شتێكی لەیەك جیا، یەكسان بكەی، {ئەوە لێرەدا دادگەریی نیە، دادگەریی نیە كە تۆ ئەو شتانەی لەیەك جیان، وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵدا بكەی}[3]، وە جاری واش هەیە یەكسانیی و دادگەریی، بەیەكەوە جووت دەبن، وەك یەكسان كردنی ئەو شتانەی وەك یەكن، {ئەگەر یەكسانیان بكەی ئەوە دادگەرییە}، وە یەكسان كردنی شتە وەك یەكەكان،

---

(١) نضرة النعيم ج٧ ص ٣٧٩٠ - ٣٧٩٤.

(٢) نضرة النعيم ج٧، ص ٢٧٩٥.

(٣) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست.

ئەو ئامانجەیە کە دادگەریی دەیەوێ بیهێنێتە دی.

**خوای پەروەردگار لەزۆر ئایەتی قورئاندا، فەرمانی كردوە بە دادگەریی، با چەند وێنەیەك بهێنینەوە:**

یەكەم: خوا لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٩٠)دا، دەفەرمویٚ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ...﴿٩٠﴾﴾.

واتە: خوا فەرمان دەکا بە دادگەریی و چاکەکاریی و بەخشین بە نزیکان.

دووەم: لە سوورەتی (الشورى) ئایەتی (١٥)دا، خوا تبارك و تعالى بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ، کە بڵێ:

﴿.. وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ..﴿١٥﴾﴾.

واتە: وە فەرمانم پێکراوە لە نێوانتاندا دادگەریی بکەم.

سێیەم: لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٣٥)دا، خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرمویٚ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ ...﴿١٣٥﴾﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! زۆر بەدادگەریی هەڵسن.

**تێبینی:**

لێرەدا شایانی باسکردنە: کە (عَدل) و (قِسط) مانایان زۆر لەیەك نزیکە، بەڵام وەك (**د. محمد یاس خضر الدوري**) دەڵێ: {العَدلُ والقِسطُ قَريبان، ولكِن العَدل يُقتَرنُ بالأُمورِ المَعنَويّة المَعقولة، والقِسطَ يُقتَرنُ بالأُمورِ الحِسِّيَّة لِكَي يَنشَأ العَدل بينها، ﴿..وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ ..﴿١٥٢﴾﴾ الأنعام. ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ..﴿٤٧﴾﴾ الأنبياء. ﴿...فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٩﴾﴾ الحجرات. فالعَدل في الصُّلح ثُمَّ القِسطُ في الضّمان!}[1]، واتە: وشەی (عدل)

---

(١) دقائق الفروق اللغوية في البيان القرآني، ص ١٥٣٧.

لەگەڵ (قِسط) مانایان زۆر لەیەك نزیكە[1]، بەڵام وشەی (عَدل) لەگەڵ شتی مەعنەویی دادێ، كە بەعەقڵ دەرك دەكرێ، وە وشەی (القِسط) زیاتر بۆ ئەو شتانە بەكاردێ، كە بەرهەستن، بۆ ئەوە لە ئەنجامی (قِسط)دا (عدل) بێتە دی، بۆ وێنە: خوا (سبحانە و تعالی) دەفەرموێ:

﴿ ..وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ .. ﴿١٥٢﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: كێشان و پێوان بكەن بە (قسط)، لێرەدا (قِسط) بۆ شتی بەرهەستە، هەروەها دەفەرموێ:

﴿ وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ .. ﴿٤٧﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: تەرازووە دادگەرەكان دادەنێین لە قیامەتدا، دیسان ئەوەی بەتەرازوو دەپێورێ بۆ شتی بەرهەستە، هەروەها دەفەرموێ:

﴿ ...فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجرات.

سەرەتا دەفەرموێ: صوڵح و ئاشتەوایی لەنێوانیاندا بكەن، بە (عَدل)، دوایی دەفەرموێ: (وَأَقۡسِطُوٓاْۖ) مافیان بۆ بژێرنەوە، ماف گێڕانەوەكە {خوێن دان، صوڵح كردن، یان پارەدان} ئەوە شتی بەرهەستە.

كەواتە صوڵحەكە دەبێ بە (عدل) بكرێ، دوایی بە (قِسط) ئەو شتانەی دەكەونە نێوانیان، جێبەجێ بكرێ.

شایانی باسیشە بۆیە ئێمە دادگەریی (عَدل، قسط)مان كردۆتە سەر ڕشتەی ئەو سیفەت و ئاكارە بەرزو پەسندانەی، كە مامەڵەیان پێ لەگەڵ خەڵكدا دەكرێ، چونكە لە هەموویان گەورەترو گرنگترو كاریگەرترە لە هێنانەدی كۆمەڵگایەكی تۆكمەو تەباو بەختەوەرو سەرفرازدا، وە لە هەمووشییان قورسترەو ئەرك و زەحمەتی پتری دەوێ.

---

(١) هەڵبەتە هەندێ لە زانایان دەڵێن: وشەی هاوواتا (مترداف)ن و هەردووكیان بەمانای داد، یان دادگەریی دێن، بەڵام من پێم وایە هیچ دوو وشەیەك لە قورئاندا هاو واتا (مترادف) نین، وە ئەو زانایە بۆچوونەكەی جوانە، لەبارەی (قسط) و (عدل)ەوە.

■ ٢ ■

## چاكەكاریی، (الإحسان)

أ- (**الرازي**) لەبارەی چەمك و واتای (إحسان)ەوە، دەڵێ: {الإحسان: الحُسْنُ ضِد القُبحِ، حَسُنَ الشَّيءُ بالضَّمِّ حُسْنا، وَرَجُل حَسَنٌ، وامرأة حَسَنةٌ، وحَسَّن الشَّيءَ تَحسِيناً: زَيَّنَهُ، وَأَحْسَنَ إِليهِ وَبهِ، وهوَ يُحْسِنُ الشَّيءَ أَي: يَعلَمه وَيَستَحسِنُه، أَي: يَعُدُّه حَسَناً، والحَسَنةُ ضِدُّ السَّيِّئةِ، والمَحَاسِنُ ضِدُّ المُساوِئ، والحُسْنَى ضِدُّ السَّوءى}[1].

واتە: وشەی (إحسان) لە (حُسن)ەوە هاتوە، (حُسن)یش پێچەوانەی (قُبحِ)ە {واتە: ناقۆڵایی و ناشیرینی}، دەگوترێ: (حَسُنَ الشيء حُسْنا) واتە: ئەو شتە جوان بوو، یان چاك بوو، وە دەگوترێ: (ورجل حَسَنٌ وامرأة حَسَنة) پیاوێکی باش یان ئافرەتێکی باش، وە کە دەگوترێ: ئەو شتەی (تحسين) کرد، واتە جوانی کرد، یان دەگوترێ: (وأحْسَنَ إليه وبه) چاکەی لەگەڵدا کرد، (يحسن الشيء) واتە: بەچاکیی دەیزانێ، وە (المَحَاسِنُ) پێچەوانەی (المُساويء)ە، وە (الحُسْنَى) پێچەوانەی (السّوءى)یە. {کە بۆ (مؤنَّث)ە، واتە: سەرەنجامی چاك، وە سەرەنجامی خراپ}.

ب- (**فيروز آبادي**) دەڵێ: {والإحسانُ يُقال: عَلى وَجهَين. أَحدُهُما: الإنعام على الغَير: أَحْسَن إِلى فُلانٍ. والثَّاني: إِحسانٌ فِي فِعلهِ، وذلك إِذا عَلِم عِلْماً حَسَناً، أَو عَمِل عَمَلاً حسناً}[2]. واتە: ئیحسان بە دوو واتایان بەکاردێ:

---

(١) مختار الصحاح، ص ١٣٢.

(٢) بصائر ذوي التمييز، ج٢ ص٤٦٥.

**یەكەمیان:** چاكەكردن لەگەڵ جگە لە خۆتدا.

**دووەمیان:** یاخود لە خودی خۆتدا كارێك بە چاكیی بكەی، یاخود شتێك چاك بزانی و بە چاكیی ئەنجامی بدەی.

دیارە چاكسازیی یان چاكەكاریی، دەچێتە نێو هەموو بوارەكانی ژیانەوە، بۆ وێنە: خۆڕاگریی لە تەنگانەندا، وە لەكاتی جەنگدا، هەروەها چاكەكاریی لەكاتی وتو ویژدا، لەكاتی تێكۆشان لەگەڵ خۆدا، لەكاتی ناكۆكییدا، لەپەیوەندییە سیاسیی و كۆمەڵایەتییەكاندا، لە بواری ئابووریی و كەسابەتدا، چاكەكاریی دێتە نێو هەموو بوارەكانی ژیان.

**ئێستاش با چەند دەقێكی شەریعەت لەو بارەوە بێنینەوە:**

**یەكەم:** خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (١٢٥)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ .. ﴿١٢٥﴾ ﴾.

واتە: وە ئایا دینداریی كێ چاكترە لە هی كەسێك، كە ڕووی خۆی بەخوا سپاردوەو چاكەكاریشە؟! یانی: لەنێوان خۆی و خوادا، تەسلیم و ملكەچە بۆخوا، وە لەگەڵ خەڵكیشدا چاكەكارە، یاخود ڕووی خۆی بەخوا سپاردوە، وەك ئیخلاص و خۆ یەكلا كردنەوە، وە چاكەكاریشە لە دینداریيەكەیداو دینداریيەكەی بە چاكیی دەكا.

**دووەم:** هەروەها خوا لە سووڕەتی (لقمان) ئایەتی (٢٢)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ .. ﴿٢٢﴾ ﴾ لقمان.

واتە: وە هەركەسێ ڕووی خۆی بەخوا بسپێرێ {واتە: خۆی تەسلیمی خوا بكا} وە چاكەكاریش بێ، ئەوە دەستی بە قولفەیەكی زۆر مەحكەم گرتوە.

**سێیەم:** وە خوای بەخشەر لە سووڕەتی (القصص) ئایەتی (٧٧)دا، لەسەر زمانی گەلی قاڕوون، ڕوو بە قاڕون، دەفەرموێ:

﴿..وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ.. ﴿٧٧﴾﴾ القصص.

واتە: وە چاکە بکە، وەك چۆن خوا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردوە.

**چوارەم:** هەروەها باسی (إحسان) لە ژمارەیەك دەقی سوننەتیشدا هاتوە، بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو فەرموودەیەیدا، کە بە فەرموودەی جبریل (سەلامی خوای لێبێ)، ناسراوە، دوای ئەوەی (جبريل) (سەلامی خوای لێبێ لێی) دەپرسێ: ئیحسان چییە؟ (مَا الْإِحْسَانُ)؟ دەفەرموێ: {أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ}[1]، واتە: ئیحسان ئەوەیە، کە خوا بپەرستی بەشێوەیەك کە دەیبینی، یاخود پێت وابێ ئەو تۆ دەبینێ.

هەڵبەتە پاش دادگەریی (عدل)یش، چاکەکاریی (إحسان) لەگەڵ خەڵکی گرنگترین و گەورەترین و کاریگەرترین ڕەوشت و ئاکاری پەسندە، کە دەبێ بابای مسوڵمان مامەڵەی پێ لەگەڵ خەڵکدا بکات.



---

(١) پێشتر تەخریج کراوە.

■ ٣ ■

## ڕێزگرتن (التكريم)

وەك چۆن ئینسان دەبێ دادگەر بێ لەگەڵ خەڵکداو، بە دادگەریی مامەڵەیان لەگەڵدا بکا، وە دەبێ بەچاکەکاریی مامەڵەیان لەگەڵدا بکا، بەهەمان شێوەش دەبێ بە ڕێز لێگرتن و حورمەت بۆ دانانەوە مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکات بە گشتی، ئەو دوانەی کە لە پێشوودا باسم کردن: دادگەریی، وە چاکەکاریی، گشتیین: دەبێ لەگەڵ هەموو کەسدا دادگەر بی، وە چاکەکاربی، بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئینتیمای ئایینی و مەزهەبیی و فیکریی و نەتەوەیی و ڕەگەزیی و ...هتد، هەروەها ڕێز لێگرتنیش بەهەمان شێوە.

ئنجا با بزانین: وشەی ڕێزلێگرتن (التَّكريم) لە زمانی عەرەبیدا ماناکەی چۆنە؟!:

(**إبن فارس**) و (**فيروز آبادي**) گوتوویانە: {التَّكريم: مَصدر قَولِهم: كَرَّمتُهُ وهوَ مَأخوذ من مادّة: (ك، ر،م) الّتي تدل على معنيين:

أ- شَرف الشَّيء في نَفسه: رَجلٌ كَريم، وَنَباتٌ كريم، والكَرَم.

ب- الكَرْمُ وهوَ القِلادةُ وسُمِّي العِنَبُ كَرْماً، لِأَنّه مجُتمع الشُّعب مَنظوم الحَبِّ.

والتَّكريمُ والإكرام بِمعنىً، والإسم منه: الكَرامة.

والتَّكريم: كرَّمه وأَكْرَمهُ: عَظَّمهُ ونزَّهَهُ}[1].

واتە: وشەی (تكريم) چاوگی ئەو قسەیەیانە کە دەگوترێ: (كرَّمتُهُ)، واتە: ڕێزم لێگرت، ئەمیش لە ماددەی (ك ر م)ەوە هاتوە، کە دوو واتایان دەگەیەنێ:

أ- ئەو شتە لە خودی خۆیدا شتێکی باش و پەسند بێت، دەگوترێ: (رَجُل كَريم، وَنَباتٌ كَريم، والكَرَم). واتە: پیاوێکی بەڕێز، ڕووەکێکی بەڕێز، وە بەخشندەیی.

ب- (الكَرْمُ) ئەو ملوانکەیە کە لە مل دەکرێ، وە ترێ بۆیە پێی دەگوترێ: (كَرْمُ) لە زمانی عەڕەبییدا، چونکە چەند هێشوویەك بەیەکەوە کۆ دەبنەوە، یاخود هەموو بۆڵووەکان بەیەکەوە ڕیز دەبن، وە (تَكريم و إكرام) هەردووکیان بەیەك واتان، وە ناوێك کە لەو وشەیە دروست دەکرێ، بریتیە لە: (كَرامة)، واتە: ڕێزو حورمەت.

وە دەگوترێ: (كرَّمَهُ وأكرَمه) واتە: بە مەزنی گرت، وە پاکی گرت.

با چەند وێنەیەك لە ئایەتەکانی قورئان بهێنینەوە، لەسەر ڕێز لێگرتن (تكريم)ی مرۆڤ:

یەکەم: خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الإسراء) ئایەتی (٧٠)دا، دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلٗا ٧٠﴾.

واتە: وە بێگومان ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە، وە لە وشکانیی و دەریادا هەڵمان گرتوون، وە لە ڕۆزییە خۆش و بەتامەکان پێمان داون، وە بەسەر زۆر لەدروستکراوانماندا هەڵمان بژاردوون.

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ..٧٠﴾ بە گشتی فەرموویەتی و سەربارەش: بەبەڵگەی فەرمایشتەکانی دوای خۆی:

---

(١) مقاييس اللغة ج٥ ص ١٧١- ١٧٢، والقاموس المحيط: ١٤٨٩.

- کە دەفەرمویْ: ﴿..وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ..﴿٧٠﴾﴾ واتە: وە هۆکاری وامان بۆ ڕەخساندوون کە لە وشکانیی و دەریادا پێیان برۆن، کاتی خۆی جۆرەکانی وڵاخ، وەك: کەرو، هێسترو، فیل و، بەلەم و کەشتی چارۆکەدارو ئەو شتانە کە باریان لیْ نراوە، ئێستاش سەیارەو شەمەندەفەرو فڕۆکەو کەشتی و پاپۆڕو هەموو ئەوانە، کافرو مسوڵمان لێیان بەهرەمەندن، کەواتە: هەموو هۆکارەکانی گواستنەوە، لە دەریاو وشکانیی و ئاسماندا، کافرو مسوڵمان لێیان بەهرەمەندن.

- پاشان کە دەفەرمویْ: ﴿...وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ..﴿٧٠﴾﴾، واتە: وە لە ڕۆزییە خۆش و سوودبەخشەکان پێمداون، خوا (سبحانە و تعالی) تەنیا ڕزق و ڕۆزی مسوڵمانانی نەداوە، بەڵکو ئەو ڕزق و ڕۆزیی و ئەو شتانە، کە خۆش و بەتام و بەسوودن، بۆ هەموو مرۆڤەکانی خوڵقاندوون.

- پاشان کە دەفەرمویْ: ﴿..وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾﴾. واتە: وە بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانماندا هەڵمان بژاردوون، ئەوەش دیسان هەموویان دەگرێتەوە.

ئنجا وەك چۆن مرۆڤەکان لەو شتانەدا، کە خوای زاناو شارەزا فەرمووونی، یەکسانن، دەبیْ لە ڕێزلێگرتنەکەشدا یەکسان بن، چونکە خوای دادگەر بەگشتی فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ..﴿٧٠﴾﴾. واتە: وەچەی ئادەممان ڕێز لێناوە، ڕێز لێنانەکەشی لەو شتانەدا کە دوایی فەرمووونی، بەرجەستە بووە، کە وەك گوتم: هەموو مرۆڤەکان تێیاندا یەکسانن.

**دووەم:** لە سووڕەتی (التین) ئایەتی (٤)دا، خوای پاك و تاك دەفەرمویْ:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾.

واتە: بێگومان ئینسانمان لە باشترین شێوەدا هێناوەتە دی.

دیسان بە گشتی فەرموویەتی و باسی مرۆڤ (إنسان)ی کردوە بەگشتی.

سێیەم: لە سوورەتی (فاطر) ئایەتی (٣٩)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ... ﴿٣٩﴾ ﴾.

واتە: (خوا) ئەو كەسەیە كە ئێوەی كردوە بە جێنشین لەسەر زەوی.

**چوارەم:** لێرەوەش بۆمان دەردەكەوێ، كە ئایەتی ژمار (٣٠)ی سوورەتی (البقرة)ش، كە دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً .. ﴿٣٠﴾ ﴾.

كە مشت و مڕێكی زۆر لەنێو توێژەرەوانی قورئاندا هەیە، ئایا دەگونجێ بە ئینسانی نامسوڵمان بگوترێ: جێنشینی خوا؟!، ئەو ئایەتانەی سەرەوە دەری دەخەن كە ئەو مشت و مڕە پێویست نیە، چونكە خوای پەروەردگاریش بەگشتی ئایەتەكەی فەرمووە: وە كاتێك پەروەردگار بە فریشتەكانی فەرموو: من دەمەوێ جێنشینێك لەسەر زەوی دابنێم.

دیارە كە ئەو جێنشینەش ئادەمە، وە لەدوای ئادەمیش، وەچەی ئادەمە، ئنجا وەچەی ئادەم، چ مسوڵمان بن چ كافر، جێنشینی خوان لەسەر زەوی، بەو واتایە كە خوای كاربەجێ تەصەڕوف كردنی لە زەویدا، بەوان سپاردوە، ئنجا هەیانە بەو شێوەیە تەصەڕوف دەكات، كە خوا فەرموویەتی، ئەوانیش ئەوانەن كە ئەهلی ئیمانن و پابەندن بە شەریعەتەوە، وە هەشیانە پێچەوانەی ئەوەوە كە خوا فەرموویەتی، ڕەفتار دەكا، كە ئەهلی كوفرو ستەم و خراپەكارانن.

كەواتە: بەپێی ئەو ئایەتانە دەردەكەوێ: كە ئینسانی مسوڵمان لەسەری پێویستە لەگەڵ هەموو مرۆڤەكاندا بەڕێزەوە، بە ڕێز لێگرتنەوە، بە حورمەت بۆ دانانەوە، ڕەفتارو مامەڵە بكا بەبێ جیاوازیی نێوان مسوڵمان و نامسوڵمان، بەجۆراو جۆری، هەموو ئایین و مەزهەب و بیرو بۆچوونەكانیان، وە بەجیاوازیی ڕەنگ و زمان و ڕەگەزەكانیان، مادام ئەو مرۆڤە، خوای پەروەردگار ڕێزی لێناوە، دەبێ ئینسانی مسوڵمانیش بەڕێزو حورمەتەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكا، وە دیارە پێغەمبەری خاتەمیش كە سەرمەشقی ئێمەیە هەر بەو جۆرە بووە، وەك

لەم فەرمایشتەوە دەردەكەوێ:

پێنجەم: ڕۆژێك جەنازەیەك بەلای پێغەمبەری خوادا ڕەت دەبێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەبەری هەڵدەستێ، ئەوانیش دەڵێن: ئەوە جەنازەی جوولەكەیەكە!، ئەویش دەفەرموێ:

{أَلَيْسَتْ نَفْسًا ؟!} أخرجه أحمد برقم (٢٣٨٩٣)، والبخاري برقم (١٣١٣)، ومسلم برقم (٩٦١).

واتە: ئەدی نەفس (مرۆڤ) نیە؟ بەڵێ، خوای بەبەزەیی ڕێزی لە مرۆڤەكان گرتووە، پێویستە بە زیندوویی و بە مردوویی ڕێزیان لێ بنرێ، لەلایەن هەر كەسێكەوە، كە خۆی بەبەندەی خواو شوێنكەوتووی پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم) دادەنێ.

■ ٤ ■

## دڵسۆزیی (النَّصيحة)

زۆر كەس وشەی (النَّصيحة) بە ئامۆژگاریی (المَوعِظة) تەفسیر دەكا، من لە زۆر لە كتێب و وتارەكانی خۆمدا باسم كردووە، كە ئەوە هەڵەیە، بەڵكو (نَصيحة) بەمانای دڵسۆزییە.

**با سەرنجی قسەی ژمارەیەك لە زانایان بدەین لە بارەوە:**

أ- (**إبن مَنظور**) دەڵێ: {(النَّصيحة) نَصَحَ الشَّيءُ: خَلَصَ، والنّاصِحُ الخالِص منَ العمَل وغيرِهِ، والنُّصح: الإِخْلاصُ والصِّدق في المَشورةِ والعَمل}[1]، واتە: دەگوترێ: (نَصَحَ الشَّيءُ: خَلَصَ) واتە: ساغ بۆوە، (الناصحُ) بریتیە لە شتێك كە ساغ بووبێتەوە لە كردەوە، یاخود لە غەیری كردەوە، وە (النُّصح): بریتیە لە دڵسۆزیی و ڕاستیی، لە ڕاوێژو لە كاردا.

ب- (**الجوهري**) دەڵێ: {قالَ إبنُ الأثير: النَّصيحةُ: كَلِمةٌ يُعَبَّرُ بِها عن جملة: هيَ إِرادةُ الخَير للمَنصوحِ له}[2]، واتە: (إبن الأثير) گوتوویەتی: وشەی (النَّصيحة) وشەیەكە تەعبیری پێ دەكرێ لە ڕستەیەك، ئەویش ئەوەیە: ویستنی چاكە

---

(١) لسان العرب، ج٧ ص٤٤٣٨.

(٢) الصِّحاح، ج١ ص ٤١٠.

بۆ كەسێك كە (نُصح)و (نَصيحة)تی ئاڕاستە دەكرێ، ئەوەی چاكە، ئەوەی بۆ بكەی و، ئەوەی پێ بڵێی.

ج- (الجرجاني) دەڵێ:{النَّصيحة: هِيَ الدُّعاءُ إلى ما فيهِ الصَّلاحُ، والنَّهيُ عَمّا فيه الفَساد}[1]، واتە: (نَصيحة) بریتیە لە بانگ كردن بۆ هەر شتێك كە چاكەی تێدایە، وە ڕێگرتن لە هەر شتێك كە خراپەی تێدایە.

د- (راغب الأصفهاني) دەڵێ: {النُّصح: إخْلاصُ المَحبّة لِلغَير بإظهارِ ما فيه صَلاحُهُ}[2]، واتە: (النُّصح) بریتیە لە دەرخستنی خۆشەویستیی بە دڵسۆزییەوە بۆ ئەوانی دیكە، ئەویش بەوە، كە چی بەرژەوەندیی و چاكەی ئەوانی تێدایە، ئاوا بخرێتە ڕوو.

**ئێستاش با چەند دەقێكی شەریعەت وەك نموونە لەو بارەوە بخەینە ڕوو:**

**یەكەم:** لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٦٨)دا، (هود) (سەلامی خوای لێبێ)، بەگەلەكەی (عاد)، كە گەلێكی كافر بوون، دەفەرموێ:

﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَالَاتِ رَبِّي وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾.

واتە: پەیامەكانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم، وە من بۆ ئێوە (ناصح)ێكی (أمین)م، {واتە: دڵسۆزێكی ئەمیندار}.

**دووەم:** هەر لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٧٩)دا، لەسەر زمانی یەكێ لەپێغەمبەران، كە (صالح)ە (سەلامی خوای لێبێ)، دەفەرموێ:

﴿.. وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَكِن لَّا تُحِبُّونَ النَّاصِحِينَ ﴿٧٩﴾﴾.

واتە: من بۆ ئێوە دڵسۆزییم نواند، بەڵام ئێوە دڵسۆزانتان خۆش ناوێن.

**سێیەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەكیدا، دەفەرموێ:

{الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا: لِمَنْ؟! قَالَ لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ}،

---

(١) التعريفات، ص ٣٦٠.

(٢) الذريعة إلى مكارم الشريعة، ص ٢٩٥.

أخرجه أحمد برقم (١٦٩٨٢)، ومسلم برقم (٥٥)، وأبو داود برقم (٤٩٤٤)، والنسائي برقم (٤١٩٧)، وأبو عوانة برقم (١٠١)، وابن خزيمة في السياسة كما في إتحاف المهرة للحافظ برقم (٢٤٥٦)، وابن حبان برقم (٤٥٧٤)، والبغوي في الجعديات برقم (٢٦٨١)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٢٦٥)، وأبو نعيم في المعرفة برقم (١٢٩١)، وأخرجه أيضًا: الطبراني برقم (١٢٦٧)، وابن عساكر(٥٤/١١).

واتە: دینداریی بریتیە لە دڵسۆزیی، {هاوەڵە بەڕێزەکان خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێن:} گوتمان: دڵسۆزیی بۆ کێ؟ فەرمووی: دڵسۆزیی بۆ خوا، بۆ کتێبی خوا، بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وە بۆپێشەوایانی مسوڵمانان، وە بۆ مسوڵمانان بە گشتی.

**بۆیەش گوتم:** وشەی نەصیحەت نابێ بە ئامۆژگاریی لێك بدرێتەوە، چونکە چۆن ئامۆژگاریی خوا، یاخود قورئان، یان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکرێ؟! بەڵام دەبێ بۆ خوا دڵسۆزبی، هەروەها بۆ قورئان و، بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وە بۆ حوکمڕانی مسوڵمانان و، مسوڵمانان بە گشتی، دەبێ دڵسۆزیی بنوێنی، هەڵبەتە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کە بەڕاستیی ئینسانی مسوڵمان، دەبێ دڵسۆزیی و بە خەمەوە بوون و، بە پەرۆشەوە بوون و، بەتەنگەوە بوون و سوور بوونی، لەسەر خێرو بەرژەوەندیی خەڵکەکە بەگشتی، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، وەك یەك بێت، بۆ هەموو خەڵك دڵسۆز بێ، ئەوەتا ئەو پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێبێ)، چ هوود، چ صالح، چ شوعەیب، (سەلامی خوایان لێبێ)، بەگەلەکانی خۆیان دەڵێن: ئێمە بۆ ئێوە (ناصح)ین، واتە: دڵسۆزین، دیارە دڵسۆزیی نواندنی پێغەمبەران بۆ گەلە کافرەکانیان، ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، کە ئینسانی مسوڵمان دەبێ بۆ هەموو کەس دڵسۆز بێ، بە پەرۆش و بە خەمیەوە بێ، کە خێرو بەرژەوەندیی بۆ بێنێتە پێش، وە لەزەرەرو زیان دووری بخاتەوە.

چونکە هەندێ کەس وا دەزانێ: مسوڵمان تەنیا دەبێ لەگەڵ مسوڵمانان دڵسۆز بێ!! کە لەڕاستییدا ئەوە وانیە، مسوڵمان دەبێ بۆ هەموو خەڵك دڵسۆز بێ، مەگەر لە حاڵێکدا کە ئەوان سەنگەری لێبگرن وە دژایەتیی بکەن، وە بیانەوێ زیانی پێ بگەیەنن، ئەو کاتە دیارە کە کەس لەشەڕ شەکری نەبەخشیوەتەوەو، ئەو کاتە هەڵوێستەکە دەگۆڕێ.

■ ٥ ■

## تەبایی و گونجاویی

## (الأُلفة والإِنسجام)

شارەزاو پسپۆڕانی زمانی عەڕەبی، بەمجۆرە مانای وشەی (أُلفة)یان شیکردۆتەوە:

أ- (إبن فارس) دەڵێ:{الأُلفة: هيَ الإسمُ مِنَ الإئتِلافِ وكِلاهُما مِن مادّة (أ، ل، ف) الّتي تَدلُّ عَلى انضمامِ الشَّيءِ إلى الشَّيءِ، والأَشياء الكَثيرة أَيضاً، وَمن ذلِك الأَلْف، لأَنّه اجتماعُ المِئِينَ..}[1]، واتە: وشەی (الْألفة) ناوە لە (الإئتلاف)ەوە هاتوە، وە هەردووکیان لەماددەی (أ، ل، ف)ەوە هاتوون، کە دەلالەت دەکا لەسەر ئەوەی شتێك بچێتە پاڵ شتێك، یاخود چەند شتێکی زۆر بەیەکەوە بلکێن، هەر لەبەر ئەوەش لەزمانی عەرەبییدا بە هەزار گوتراوە (ألف) چونکە هەزار، سەدەکان کۆ دەکاتەوە.

ب- (إبن الأثير) دەڵێ: {الأُلفة والإِلف: إجتِماعٌ معَ التِئامٍ ومحبّة، أمّا التألُّف: فَهوَ المُداراةُ والإيناس}[2]، واتە: وشەی (الْألفة)و (الإِلف) بریتیە لە کۆبوونەوە لەگەڵ گونجاویی و خۆشەویستییدا، بەڵام وشەی (التألُّف) بریتیە لە موداراکردن و ساچاندن لەگەڵ خەڵك، وە ڕوو پێدانیان، وە دڵخۆشکردنیان.

---

(١) مقاسييس اللغة ج١ ص ١٣١.

(٢) النهاية في غريب الحديث والأثر، ج١ ص ٦٠.

ج- (الجرجانـي) دەڵێ: {الأُلفة: اتِّفاق الآراءِ في المُعاوَنةِ عَلى تَدبيرِ المَعاش}[1]، واتە: ئولفەت بریتیە لەوە کە بیرو ڕایەکان بەیەکەوە بگونجێن، لە هاوکاریی بەیەکەوە کردندا، لە بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەراندا.

خوا (سبحانە و تعالی) و پێغەمبەرەکەشی (صلی الله علیه وسلم) باسی (الأُلفة) وە (الإئتلاف)یان کردوە، ئەمەش چەند نموونەیەك لەو بارەوە:

یەکەم: خوای بێ هاوتاو هاوەڵ لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ ...وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا ..(١٠٣) ﴾.

واتە: وە یادی چاکە خوا بکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، کە ئێوە پێکەوە دوژمن بوون، بەڵام خوا دڵەکانتانی پێکەوە پەیوەست کردن و، سەرەنجام بەهۆی چاکەی خواوە بوونە برا.

دووەم: هەروەها لە سوورەتی (الأنفال) ئایەتەکانی: (٦٢-٦٣)دا دەفەرموێ:

﴿ .. هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ (٦٢) وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ..(٦٣) ﴾.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە تۆی بەهۆی یارمەتی خۆیەوەو، بەهۆی ئیماندارانەوە بەهێز کردوە پشتیوانیی کردووی، وەدڵەکانیانی پێکەوە بەستوون.

سێیەم: وە لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٤٣)دا، باسی جۆرێکی دیکە لەپێکەوە لکانی شتەکان دەکات و دەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا ..(٤٣) ﴾.

واتە: ئایا سەرنجی ئەوە نادەی: چۆن خوا هەورەکان پاڵ پێوە دەنێ، ئنجا بەیەکەوە پەیوەستیان دەکات و موتوربەیان دەکا، پاشان کەڵەکەی دەکات...

---

(١) التعریفات، ص ١٣٥.

**چوارەم:** پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی ئولفەت و تەبایی و گونجاویی، چەند فەرمایشتێکی هەن، بۆ وێنە: دەفەرموێ:

{الْمُؤْمِنُ مُؤَلِّفٌ، وَلَا خَيْرَ فِيمَنْ لَا يَأْلَفُ وَلَا يُؤْلَفُ}، أخرجه الحاكم برقم (٥٩) وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي برقم (٢٠٨٨٦)، والخطيب (٢٨٨/٨)، وأخرجه أيضًا: البيهقي في شعب الإيمان برقم (٨١١٩)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

واتە: ئیماندار گونجێنەرە، وە خێر لە کەسێکدا نیە، کە نەدەتوانێ خەڵك لەگەڵ خۆی بگونجێنێ و، نە لەگەڵ خەڵك بگونجێ.

**پێنجەم:** هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{إنَّ أَحبَّكم إليَّ: أَحاسِنُكم أخلاقًا المُوَطَّئون أَكْنافاً، الذين يَأْلَفُون ويُؤْلَفون، وإن أبغضَكم إليَّ: المَشَّاءونَ بِالنَّميمة، المُفَرِّقُون بينَ الأَحِبّة، المُلْتَمِسُون لِلبُرآءِ العَيْب} أخرجه الطبراني في الأوسط برقم (٧٦٩٧)، وفي الصغير برقم (٨٣٥)، قال الألباني حسن لغيره.

واتە: بێگومان خۆشەویستترینتان لە لای من، ئەوانەتانن کە ڕەوشتیان جوانترە، ئەوانەی کە شان نەرم دەکەن لەگەڵ خەڵك، {یانی: شانە خڕێیان لەگەڵ ناکەن و مل بەملەیان لەگەڵ ناکەن، بەڵکو لەگەڵیان دەگونجێن}، ئەوانەی خەڵك لەگەڵ خۆ دەگونجێنن و، لەگەڵ خەڵکیش دەگونجێن، وە ناخۆشویستترینتان لەلای من، ئەوانەن کە قسە دێنن و دەبەن، ئەوانەی کە خۆشەویستان لێك دەکەن، ئەوانەی بۆ کەسانێك کە بێ عەیبن، عەیبیان بۆ دەدۆزنەوە.

کەواتە: تەبایی و گونجاویی یەکێکە لەو ئاکارو خەسڵەتە بەرزو پەسندانەی، کە پێویستە ئینسانی مسوڵمان لەگەڵ خەڵکدا وەلەگەڵ کۆمەڵگادا، خۆییان پێ برازێنێتەوە.

■ ٦ ■

# سینە فراوانیی و

# ئاسانیی (السَّماحة)[١]

شارەزایان ئاوا پێناسەی (سَماحة)یان کردوە:

أ- {السَّماحة: مِن مادّة (س، م، ح) والّتي تَدلُّ عَلى معنى السّلاسةِ والسُّهولة، يُقال: سَمَحَ وتَسَمَّحَ وسامَحَ: فَعَل شيئاً فسَهَّل فيه، يُقال أيضاً: سمُحَ وأسْمح إذا جادَ وأَعطى عَن كَرمٍ وَسَخاء، وذلِك لِسهُولةِ ذلِك عَليه، والمُسامَحة: المُساهَلة، وتَسامَحوا: تَساهَلوا. السَّماحة تُقال: على معنيين:

* السَّماحَة هيَ بَذلُ ما لا يَجب تَفَضُّلاً، أَو الجودِ عَن كَرَم وَسخاءٍ.

* التَّسامُح مَعَ الغَير في المُعامَلاتِ المُختَلِفة، ويَكونُ ذلِك بتَيسير الأُمورِ والمُلاينة فيها...}[٢]، واتە: وشەی (سماحة) ماددەکەی لە (س م ح)ەوە هاتوە، کە مانای نەرمیی و ئاسانیی دەگەیەنێ، یان شتێك لووس بێ و گرێ و گۆڵی نەبێ، {قرژو قۆڵ

---

(١) هەندێ لە وشە عەرەبییەکان وەک تێبینی دەکەن، من بە دوو وشەی کوردی تەرجەمەیان دەکەم، لەبەر ئەوەی وشەی (سماحة) وەك دوایی دەبینین، هەم مانای سینە فراوانیی دەگەیەنێ، هەم مانای ئاسانیی دەگەیەنێ، بەڵکو جاری وا هەیە مانای لێبوردەییش دەگەیەنێ.

(٢) التعريفات للجرجاني، ص ١٢٧، والنهاية لابن الأثير ج٢ ص ٣٩٨.

نەبێ}، دەگوترێ: (سَمَحَ وتَسَمَّحَ وسامح)، هەرسێكیان واتە: شتێكی كرد كە ئاسانیی تێدا ڕەچاو كرد، وە دەگوترێ: (سمُحَ وأسْمح) واتە: ماڵێك دەبەخشێ، بەبەخشندەیی و چاوتێرییەوە دەیبەخشێ، چونكە ئەو بەخشینە لەسەری ئاسانە، وە (المُسامَحة) واتە: (المُساهَلة) واتە: بەیەكەوە ئاسان بوون، وە وشەی (سَماحة) بە دوو واتایان بەكاردێ:

- ئەوەیە شتێك كە لەسەری پێویست نیە بیبەخشێ، دەیبەخشێ، بەخشینێك بەدڵخۆشییەوە لە خۆیدا بەرجەستەی بكا.

- ئەوەیە كە لەگەڵ غەیری خۆیدا لە هەڵس و كەوتە جۆراو جۆرەكاندا، لێبوردەبێ، ئەویش بەوەی كارو بارەكان ئاسان بكاو لەگەڵیاندا نەرم بێ.

ب- (المیدانـي) دەڵێ: {من مَظاهِر السَّماحة:

* طَلاقةُ الوَجه واستقبالُ النّاس بالبِشر.

* مُبادرةُ النّاس بالتّحيّة والسّلام والمُصافَحة وَحسْن المُحادثة.

* حُسن المُعاشرة والتّغاضي عَن الهَفوات}[1].

واتە: لە دەرهاویشتەكانی (سَماحة):

- ئینسان ڕووخۆش بێ لەگەڵ خەڵك، پێشوازیی یان لێ بكا بەدڵخۆشیی.

- دەست پێشخەر بێ بۆ سڵاو لە خەڵك كردن، تۆقە لەگەڵ كردنیان و، قسەی خۆش لەگەڵ كردنیان، لەوانەدا دەستپێشخەریی بكا.

- لەگەڵ خەڵكدا خۆش ڕەفتار بێ و، چاوپۆشیی بكا لەكەم و كوڕییەكانیان. لەو بارەشەوە با چەند وێنەیەك لە دەقەكانی قوڕئان و سوننەت، بهێنینەوە:

یەكەم: خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (١٠٩)دا دەفەرمووێ:

﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا

---

(١) الأخلاق الإسلامية - ج٢ ص ٤٦٣-٤٧١. الشيخ أحمد الشَّرباصي.

حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ ﴾.

واتە: زۆرێك لە خاوەن کتێبەکان خۆزگەیان خواست: کە ئێوە لەدوای ئەوەی ئیمانتان هێناوە، کافرتان بکەنەوە، بەهۆی حەسەدێکەوە کە لە دەروونیاندا هەیە بەرامبەر بە ئێوە، وە دوای ئەوەی کە هەقیشیان بۆ ڕوون بۆتەوە، ئێوەش لێیان ببوورن و چاوپۆشییان لێ بکەن، تاکو فەرمانی خوا دێ، {واتە: فەرمانی خوا دێ بەوە کە ژیانی دنیا کۆتایی پێ دێ}، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە.

هەندێ لە توێژەرەوان گوتوویانە: تاکو فەرمانی خوادێ، واتە: تاکو فەرمانی خوا دێ بە جەنگ و جیهاد، بەڵام نەخێر، لێرە مەبەست ئەوە نیە، چونکە ئەم ئایەتە لەسوورەتی (البقرة)یە، کە لە مەدینە دابەزیوەو وە ئەو کاتە پێشتر فەرمان بە جەنگ کرابوو!! بۆیە کە دەفەرموێ: {فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟}، بێگومان لە خەڵك بوردن و چاوپۆشیی لە خەڵك کردن، بە کافرو مسوڵمانەوە، ڕەوشتێکی بنەڕەتییە لە مسوڵماندا، وە لەگەڵ جەنگ و جیهاددا تێك ناگیرێ، چونکە جەنگ و لەدژی کەسێك دەکرێ، کە سەنگەری لێ گرتووی، بەڵام کەسێ کە لەکۆمەڵگادا لەگەڵت دەژی، دەبێ لەگەڵیدا لێبوردەو سینگ فراوان بی، کافر بێ، یان مسوڵمان.

دووەم: خوای بەبەزەیی لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٣٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: ئایا ئێوە مشت و مڕمان لەگەڵ دەکەن، دەربارەی خوا؟ لە حاڵێکدا کە ئەو پەروەردگاری ئێمەو ئێوەشە، وە ئێمە کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانە، ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆخۆتان، وە ئێمە بۆخوا خۆ یەکلا کەرەوەین.

سێیەم: خوای بەرزی مەزن هەر لە سووڕەتی (البقرة)دا، ئایەتی (٥٦) دەفەرموێ:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ... ﴿٢٥٦﴾ ﴾

واتە: تۆبزیی کردن نیە لە دینداریيدا.

چوارەم: هەروەها خوای بێ وێنە لە سووڕەتی (الکافرون) ئایەتەکانی (١-٦) دا، فەرموویەتی:

﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾.

مەبەستم ئایەتی کۆتاییە، کە خوا لێرەدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: بڵێ: ئەی کافرینە! ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، من نایپەرستم، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ئێوە ئایینی خۆتان بۆخۆتان، منیش ئایینی خۆم بۆ خۆم، کەواتە: با پێکەوە بژین و تەبا بین، هەرکەسە بەدینی خۆی.

پێنجەم: هەر لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە:

{قِيلَ لِرَسُوْلِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم: أَيُّ الأديانِ أحبُّ إلى اللهِ تَعالى؟! قالَ: الحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ}، أخرجه أحمد برقم (٢١٠٧) قال الهيثمي (٦٠/١): رواه أحمد والطبراني في الكبير والأوسط والبزار، وفيه ابن إسحاق، وهو مدلس ولم يصرح بالسماع، وقال الحافظ في الفتح (٩٤/١): وصله أحمد بن حنبل وغيره من طريق محمد بن إسحاق عن داود بن الحصين عن عكرمة عن ابن عباس، وإسناده حسن، وأخرجه البخاري في الأدب برقم (٢٨٧)، والبزار كما في كشف الأستار برقم (٧٨)، والطبراني برقم (١١٥٧٢)، وأخرجه أيضًا: البخاري معلقًا (٢٣/١)، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کرا: کام دینە لە لای خوا خۆشەویست ترە؟!

فەرمووی: {دینێکی پاکی تەباو گونجاو}، یانی: ئایین و بەرنامەیەك و دیندارییەك، خەڵك بەرەو تەبایی و پێکەوە گونجاویی بانگ دەکا، ئەوە لەهەموو دینداریییەك چاکترە.

شەشەم: هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە:

{أَفْضَلُ الْمُؤْمِنِين: رَجُلٌ سَمْحُ الْبَيْعِ، سَمْحُ الشِّرَاء، سَمْحَ الْقَضَاء، سَمْحُ الإِقْتِضَاء}، أخرجه الطبراني في الأوسط برقم (٧٥٤٤)، قال الهيثمي (٧٥/٤): رجاله ثقات، قال الألباني: موضوع، أنظر حديث رقم : (١٠٣٧) في ضعيف الجامع.

واتە: باشترینی بڕواداران: پیاوێکە کە لە فرۆشتندا ئاسانە، وە لە کڕیندا ئاسانە، وە بەئاسانیی کێشەی خۆی لەگەڵ خەڵکدا چارەسەر دەکا، بە ئاسانیی داوای حەق دەکا {بە تەبایی و بە گونجاویی}.

هەڵبەتە ئەم دەقە ئەگەر لە ڕووی سەنەدیشەوە ڕاست (صحیح) نەبێ و بێهێز بێ، لە ڕووی ماناو نێوەڕۆکەوە گرفتێکی نیە.



## لێزانیی و دانایی (الحِكمة)

**با سەرەتا سەرنجی قسەی زانایان بدەین لەبارەی پێناسەی (حِكمە)ەوە:**

أ- (**إبن فارس**) دەڵێ: {الحِكمَة: حكُمَ: صارَ حَكيماً، مِن مادّة (ح، ك، م) والّتي تَدلُّ عَلى المَنع، أَو المَنْع لِلإصلاح، ومِن هذا الأَصل أُخِذَ الحُكم في مَعنى المَنعِ مِن الظُّلم، وَحكَمَةُ اللِّجام، أَنَّها تَمْنَعُ الدابّة عمّا لا يُريده صاحِبها، والحِكمة لأنّها تَمنعُ مِن الجَهل}[1]. واتە: دەگوترێ: (حكُمَ) واتە: فلان كەس بوو بە حەكیم، لەماددەی (ح، ك، م)ەوە هاتوە، لە ڕیشەدا ئەم وشەیە نەهێشتن دەگەیەنێ، یان نەهێشتن بۆ چاككردن، وە بۆیە وشەی (حُكم) لێرەوە وەرگیراوە، چونكە حوكم ڕێگا دەگرێ لە ستەم، وە ئەو ئاسنەی كە دەخرێتە شەویلاگی وڵاخەوە، پێی دەگوترێ: (حَكَمة)، چونكە ئەو وڵاخە دەگێڕێتەوە لەو شتەی كە خاوەنەكەی نایەوێ، {كەسێك سواری وڵاخێك بووە، لغاوێكی لەزار دەكات، بۆ ئەوەی بەڕێوە نەلەوەڕێت و ڕێیەكە ببڕێ}، وە حیكمەت لەبەر ئەوە ناوی لێنراوە حیكمەت، چونكە خاوەنەكەی لە نەزانیی دەپارێزێ.

ب- هەندێك لە زانایان وەك مانایەكی زاراوەیی، ئاوا پێناسەی حیكمەتیان كردوە: {الحِكمةُ: هيَ استِعمالُ النَّفس الإنسانية بِإقتباسِ العُلومِ النَّظريّة، واكتِسابِ

---

٩١) مقاييس اللغة - ج٢ ص٩١، والمفردات ص ١٢٦.

الملكة التَّامَّة، عَلى الأَفعالِ الفاضِلة عَلى قدر طاقَتِها}[١]، واتە: حیکمەت ئەوەیە کە نەفسی بەشەر، زانیارییە تیۆرییەکان وەدەست بێنێ، وە حاڵەتێکی وا بڕەخسێنێ، کە تەنیا کردەوە باشەکان ئەنجام بدا، لەقەدەر توانای خۆی، {واتە: هەم زانیارییە بە سوودەکان وەدەست بێنێ، هەم کردەوە باشەکان لە خۆیدا بهێنێتە دی، ئەوەندەی لە توانایدایە، ئەگەر وای کرد، ئەوە مانای وایە بۆتە ئینسانێکی حەکیم و مانای وایە خاوەن حیکمەتە}.

ج- لە دەرسەکانی ڕابردوودا[٢] باسمان کرد: کە بەپێی ئایەتەکانی (٢٢-٣٩)ی سووڕەتی (الإسراء) کە خوا (سبحانه و تعالى) (٢٤) خەسڵەتی تێدا خستوونەتە ڕوو، دوازدەی (١٢)ی باش و دوازدەی (١٢)ی خراپ، وە لە کۆتاییەکەیاندا دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ .. ﴿٣٩﴾ ﴾.

واتە: ئەوە ئەو حیکمەتەیە کە خوا بۆتی سروش کردوە. کەواتە: بەپێی ئەو ئایەتانە بێ:

**حیکمەت:** واتە خۆڕازاندنەوە بە ئاکارو ڕەوشتە بەرزو پەسندو باشەکان، وە خۆ بژار کردن لە ڕەوشت و ئاکارە دزێوو خراپەکان، چونکە خوای پەروەردگار دوای خستنە ڕووی دوازدە ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو جوان و، دوازدە خووو خدەو ڕەفتاری خراپ، دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ .. ﴿٣٩﴾ ﴾.

واتە: ئەوە ئەو حیکمەتەیە کە پەروەردگارت بۆتۆی ناردوە.

کەواتە: کە دەگوترێ: حیکمەت بە مانای سوننەت دێ، هیچ بنەمایەکی نیە، (حِكمَة) نە لە ئەصڵی زماندا بەمانای سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دێ، وە نە لەسیاقی ئایەتەکانیشدا وا دەردەکەوێ، چونکە

---

(١) الكليات، للكفوي، ج٢ ص ٢٢٢.

(٢) لە بەشی دەیەمدا.

حیکمەت واتە: دانایی و کارزانیی و وەستایی، ئەگەر تەرجەمەی بکەین دەبێ وا بڵێین، یان بڵێین: خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە باشەکان، وە خۆ بژارکردن لەسیفەتە خراپەکان.

**ئێستاش با سەرنجی ئەو چەند دەقەی شەریعەت بدەین، وەك نموونە لەو بارەوە:**

**یەکەم:** خوای زاناو توانا لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (**٢٦٩**)دا، دەفەرموێ:

﴿يُؤْتِي ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾﴾.

واتە: خوا حیکمەت بە هەرکەسێ دەبەخشێ کە بیەوێ، وە هەرکەسێ حیکمەتی پێ درابێ، ئەوە چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ کراوە.

دیارە ئەو ئایەتە موبارەکە لە سیاقی ماڵ بەخشیندا هاتوە، هەڵبەتە ماڵ بەخشینیش بۆ هەموو کەسە، کە سامانی زیادەی هەبێ!

کەواتە: دەگونجێ حیکمەت بە هەموو کەس بدرێ، تەنیا تاپۆ نەکراوە لەسەر پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، تاکو بگوترێ: وشەی حیکمەت بە مانای سوننەتە!

**دووەم:** هەروەها خوای زاناو شارەزا لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی (**١٢٥**)دا دەفەرموێ:

﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ .. ﴿١٢٥﴾﴾.

واتە: بانگەواز بکە بۆ ڕێی پەروەردگارت بە حیکمەت، کە ئەوەش گشتییە، واتە: بە لێزانیی و دانایی و وەستایی.

**سێیەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً}، أخرجه أحمد برقم (٢١١٩٢)، والبخاري برقم (٥٧٩٣)، والدارمي برقم (٢٧٠٤)، وابن ماجه برقم (٣٧٥٥)، وأخرجه أيضًا: ابن أبي شيبة برقم (٢٦٠٠٥)، وأبو

داود برقم (٥٠١٠)، والدارقطني في الأفراد برقم (٦٠٦).

واتە: لە شیعردا حیکمەت هەیە.

هەڵبەتە لێرەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی پێ جگە لە خۆیەتی، چونکە خوا دەفەرموێ:

﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ ..(٦٩)﴾ يس.

واتە: وەشیعرمان فێر نەکردوەو، بۆیشی ناگونجێ (شیعر بڵێ و لێی ناەشێتەوە).

**چوارەم:** هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەش هاتوە:

{عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ ضَمَّنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِ وَقَالَ: اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ، وَتَأْوِيلَ الْكِتَابِ} أخرجه ابن ماجه برقم (١٦٦)، وابن سعد (٣٦٥/٢)، والطبراني برقم (١٠٥٨٨)، قال الألباني: صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا لە باوەشی گرتم و بەخۆیەوە گوشیم و فەرمووی: {ئەی خوایە! حیکمەت و لێکدانەوەی کتێبی فێر بکە}.

لە (صحيح البخاري): (٧٢٧٠)دا بەم جۆرە هاتوە:

{اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْكِتَابَ}، واتە: ئەی خوایە! کتێبی (قورئانی) فێر بکە.

وە لە (مسند أحمد) (١/ ٢١٤)دا بەم بێژەیە هاتوە:

{اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ}، قال: شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي على شرط مسلم، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح.

واتە: ئەی خوایە! لە ئاییندا شارەزای بکەو لێکدانەوەی (مانای قورئانی) فێر بکە.

**پێنجەم:** لە دەقێکی دیکەی سوننەتدا هاتوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{لَا حَسَدَ[1] إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَىَ هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْحِكْمَةَ، فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا }، أخرجه أحمد برقم (٣٦٥١)، والبخاري برقم (١٣٤٣)، ومسلم برقم (٨١٦)، وابن ماجه برقم (٤٢٠٨)، وابن حبان برقم (٩٠).

واتە: خۆزگە خواستن شایستەیە کە تەنیا لە دوو شتاندا هەبێ، یەکەمیان: پیاوێك کە خوا ماڵ و سامانی پێداوە، وە یارمەتیشی دراوە لە هەقدا خەرجی بکا، دووەمیان: پیاوێك خوا حیکمەتی پێ داوەو ئەویش بەو حیکمەتە ڕەفتار دەکا، وە فێری خەڵکیشی دەکا[2].

---

(١) وشەی (حسد) لێرەدا بەمانای (غبطة)یە، (غبطة)ش ئەوەیە کە تۆش بەئاوات بخوازی وەك ئەوت هەبێ، بێ ئەوەی ئەو نیعمەتە لەبەرامبەرەکەت لابچێ، بەڵام بەپێچەوانەوە: حەسوودیی ئەوەیە تۆ ئاوات بخوازی هی وەك ئەوت هەبێ، وە ئەو نەیبێ. وە حەسوودیی گوناهە، کەواتە: ئەو حەسوودییەی لە فەرموودەکەدا هاتوە، مەبەست پێی خۆزگە خواستنە. بڕوانە: (المصباح المنير، للفيومي) ص ٢٢٩.

(٢) کەواتە: ئەگەر حیکمەت بە مانای دانایی، کارزانیی، لێزانیی، لێك بدرێتەوە، شتێکی بە جێیە، وە ئەوانەی کە دەڵێن: حیکمەت بە مانای سوننەت دێ، لەبەر ئەوەی لەچوار شوێنی لە قورئاندا هەردوو وشەی (الكتاب) واتە: قورئان، لەگەڵ (الحكمة)دا بەیەکەوە هاتوون، بۆ وێنە: لەیەکێك لەو ئایەتانەدا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْـلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ ﴾ الجمعة، ئێمە دەڵێین: ئەوە بەڵگە نیە بۆ ئەو مەبەستە، چونکە: لێرەدا مەبەست باسکردنی ئەرکەکانی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم، کە خوا ئەرکەکانی لە چوار کاردا کورت دەکاتەوە:

ئەرکی یەکەم: (يَتْـلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ) واتە: ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە.

ئەرکی دووەم: (وَيُزَكِّيهِمْ) واتە: تەزکیەیان دەکا، پاك و چاکیان دەکا.

ئەرکی سێیەم و چوارەم: (وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ) واتە: کتێب و حیکمەتیان فێر دەکا، ئنجا لێرەدا (ٱلْكِتَـٰبَ) بەمانای قورئان نیە، چونکە لە ئەرکی یەکەمدا دەفەرموێ: (يَتْـلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ) ئایەتەکانییان بەسەردا دەخوێنێتەوە، ئەوە بەمانای قورئانە، لێرەدا (ٱلْكِتَـٰبَ) واتە: بەرنامەیە، واتە: (حەڵاڵ و حەڕام)یان فێر دەکا، (وَٱلْحِكْمَةَ)ش واتە: دانایی و وەستاییان فێر دەکا، یاخود ئەو ئەدەب و ڕەوشتانەی کە پێویستە خۆیانیان پێ برازێننەوە، وە ئەو خووو خدانەی، کە پێویستە خۆیان لێ بەدوور بگرن، فێریان دەکا.



## چاكسازیی كردن (الإصلاح)

مرۆڤی مسوڵمان پێویستە لەگەڵ سەرجەم پێكهاتەكانی كۆمەڵگادا، لەگەڵ تاك تاكی خەڵكدا خاوەنی هەر دین و بیرو ڕاو زمان و ڕەنگ و ڕەگەزێك بن، چاكەكاربێ و بە چاكسازیی لەگەڵیاندا ڕەفتار بكا.

**ئێستاش با سەرنجی قسەی پسپۆڕانی زمانی عەرەبی بدەین، بۆ زانینی واتای (إصلاح):**

أ- (**إبن منظور**) دەڵێ: {الإصلاح: مَصدر أَصلَح يُصلِح، مِن مادّة (ص ل ح) الّتي تَدلُّ على خِلاف الفَساد صَلُح الشَّيء يَصلحُ صَلاحاً، وَصَلَحَ ... والمَصدر صُلُوح، والإصلاح نَقيضُ الإفساد}[1]. واتە: (إصلاح) چاوگە لە (أصلَح يُصلِح إصلاحاً)ەوە هاتوە، لەماددەی (ص ل ح)ە، كە پێچەوانەی خراپە دەگەیەنێ، دەگوترێ: (صَلُح الشَّيءُ يَصلُحُ صَلاحاً)، چاوگەكەی (صُلُوح)ە، وە (إصلاح) پێچەوانەی (إفساد)ە، واتە: خراپەكاریی، بەڵام (إصلاح) واتە: چاكسازیی.

ب- (**الزَّيعلي**) دەڵێ: {الإصلاح: هوَ عَقدٌ يَرفَع النِّزاعَ، وهوَ بِمعنى المُصالَحة، وهوَ المُسالَمة خِلاف المُخاصَمة}[2]، واتە: (إصلاح) گرێبەستێكە ناكۆكیی لادەبا، كە بەمانای (مصالحة) دێ، واتە: ئاشتەوایی، ئەویش بریتیە لە بەرپاكردنی

---

(١) لسان العرب، ج٢ ص ٥١٦، ٥١٧.

(٢) تبيين الحقائق، شرح كنز الدقائق، ج٥ ص ٢٩- ٣٠.

ئاشتیی، کە پێچەوانەی (مُخاصَمة)یە {واتە: ناکۆکیی و دووبەرەکیی}.

خوای پەروەردگار لەچەند ئایەتێکدا وشەی (إصلاح)ی بەکارهێناوە، هەروەها وشەی ناوبراو لە سوننەتیشدا هاتوە، ئەمەش چەند نموونەیەك لەو بارەوە:

یەکەم: خوای زانا لە سووڕەتی (الأنعام) ئایەتی (٤٨)دا، دەفەرمووێ:

﴿وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾﴾.

واتە: وەپێغەمبەرانمان نەناردوون، مەگەر موژدەدەرو ترسێنەر بن، یاخود دڵخۆشکەرو وریاکەرەوە بن، ئنجا هەرکەسێ بڕوا بێنێ و چاکسازیی بکا، ئەوە هیچ ترسیان لەسەر نیە، وە پەژارەش داناگرن.

کەواتە: بڕواهێنان و چاکسازیی کردن (الإیمان والإصلاح) دوو هۆکاری سەرەکیی سەرفرازیین.

دووەم: هەروەها خوای بێ هاوەڵ لە سووڕەتی (الأنفال) ئایەتی (١)دا، دەفەرمویێ:

﴿...فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ ..﴿١﴾﴾.

واتە: ئنجا پارێز لەخوا بکەن و پەیوەندییەکانی نێوانتان چاك بکەن، { ئاشتەوایی لەنێوان خۆتاندا بکەن }.

سێیەم: هەروەها لە سووڕەتی (الأعراف) ئایەتی (٥٦)دا، دەفەرموێ:

﴿وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ .. ﴿٥٦﴾﴾.

واتە: سەرزەمین تێك مەدەن، دوای ئەوەی چاکسازیی تێدا کراوە، {بەو واتایە کە خوای بەخشەر ئەو سەرزەمینەی پڕ کردوە لە نازو نیعمەت، ئێوە مەچن بەهۆی شەڕو کوشتارو دووبەرەکیی و، مافی خەڵك زەوت کردنەوە، تێکی مەدەن}، وە لەخوا بپاڕێنەوە بە ترس و ئومێدەوە.

**چوارەم:** وە لە سووڕەتی (الأعراف) ئایەتی (١٧٠)دا، خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرمویٚ:

﴿ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾ ﴾.

واتە: وە ئەوانەی کە دەست بە کتیٚبەوە دەگرن، وە نویٚژ بەرپا دەکەن، بیٚگومان ئیٚمە پاداشتی چاکسازان زایە ناکەین.

**پیٚنجەم:** پیٚغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژیٚك ڕووی لە حەسەنی نەوەی کردو فەرمووی:

{إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنْ الْمُسْلِمِينَ}، أخرجه أحمد برقم (٢٠٥١٧)، والبخاري برقم (٢٥٥٧)، وأبو داود برقم (٤٦٦٢)، والنسائي برقم (١٤١٠)، وأخرجه أيضًا: الطبراني برقم (٢٥٨٨)، والحاكم برقم (٤٨٠٩)، والبيهقي برقم (١٦٤٨٦).

واتە: ئەم کوڕەی من گەورەیە (بەڕیٚزە، بەحورمەتە)، نزیکە کە خوا ئاشتەوایی و چاکسازیی پیٚ بکا، لەنیٚوان دوو کۆمەڵی مەزنی مسوڵماناندا[1].

---

(١) ئەو صوڵحەش ئەوەبوو کە ئەو ساڵەی کە پیٚی گوتراوە: ساڵی کۆبوونەوەو کۆمەڵ بوون (عام الجماعة) (حەسەنی کوڕی عەلی) خوا لیٚی ڕازی بیٚ، کە بەشیٚك لە مسوڵمانان بەجیٚنشین و خەلیفەیان دانابوو، تەنازولی کرد بۆ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، لەپیٚناوی ئاشتەوایی و پیٚکەوە ژیانی مسوڵمانان و، کۆتایی هیٚنان بەو شەڕو جەنگەی کە لەنیٚوانیاندا هەبوو، لەنیٚوان عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوا لیٚی ڕازی بیٚ) وە موعاویەدا، کە خەتاش هی موعاویە بوو، ئەو سنوور شکیٚنیی کردبوو، ئەگەرنا عەلی خەلیفەی چوارەم بوو، مسوڵمانان هەڵیان بژاردبوو، بەهەرحاڵ حەسەن تەنازولی بۆ کردو صوڵحی لەگەڵ کرد، هەرچەندە دوایی موعاویە پابەند نەبوو بە مەرجەکانی صوڵحەکەیەوە، کە یەکیٚ لەمەرجەکان ئەوەبوو موعاویە کەس ڕانەسپیٚریٚ و وەسیەت بۆ کەس نەکا پاش خۆی، بەڵکو مسوڵمانان خۆیان یەکیٚ هەڵبژیٚرن، کەچی موعاویە ئەو مەرجەی شکاندو خۆی هەر لەژیاندا بوو: یەزیدی کوڕی ڕاسپاردو بەزۆر بەیعەتی بۆ وەرگرت، وە لەو کاتەوە ئەو ڕەنگە خراپە ڕیٚژرا، کە ئیٚستاش مسوڵمانان باجەکەی دەدەن، کە بریتیە لەوەی حوکمڕانیی و کار بەڕیٚوەبردن، لە جیاتی ڕاویٚژ (شوری) بوو بە میراتیی و بوو بنەماڵەیی، ئەوە لەسەردەمی ئومەوییەکانەوە داکەوت و، تا ئیٚستاش زۆر لە دەستەڵاتدارانی، کە بەسەر مسوڵمانانەوە حاکمن، هەر لەسەر

■ ٩ و ١٠ ■

## خاکێتیی و، هێمنیی
## (التواضع، و السكينة)

سەرەتا باسی خاکێتیی (تواضع) دەکەین و، لەو بارەوە سەرنجی قسەی زانایان دەدەین:

### ٩- خاکێتیی (التواضع):

أ- (إبن فارس) دەڵێ: {(التواضع): مَصدر تَواضَعَ أي: أظْهَر الضَّعة، وهو من مادة: (و، ض، ع) الّتي تَدلُّ عَلى الخَفضِ للشَّيء وحَطِّه، يُقال: وَضعَتهُ بِالأَرضِ وَضْعاً ... والوَضيع: الرَّجل الدَّنيُّ}[1]، واتە: وشەی (تواضع) چاوگی (تواضعَ)ەیە، واتە: خاکێتیی و کەمیی پیشاندا، نزمیەتیی پیشاندا، کە لە ماددەی (و، ض، ع)ەوە هاتوە، کە ئەویش نزم کردنەوەو دابەزاندنی شتێك دەگەیەنێ، وەك دەگوترێ: (وَضَعتهُ بِالأَرض وَضْعاً) واتە: ئەو شتەم لەسەر زەوی دانا، وە (الوَضيع) واتە: پیاوێکی کەم، کە لێرەدا بە حاڵەتی (ذَم) بەکار هاتوە.

ب- (إبن حَجَر) دەڵێ: {التَّواضُع: إظهارُ التَّنزُّل عَن المَرتبةِ لِمن يُراد تَعظيمُه}[2]،

---

ئەو بناغە لارە، بەردەوامن.

(١) مقاييس اللغة ج٦ ص ١١٨.

(٢) فتح الباري، ج١١- ص٣٤١.

واتە: بۆ کەسێك کە دەویسترێ ڕێزی لێ بنرێ و بە گەورە بگیرێ، ئەو لەو پلەیە بێتە خوارو، خۆی بەکەم پیشان بدا.

دیارە وشەی (تواضع) لە قورئاندا نەهاتوە، بەڵام ماناکەی هاتوە، وە لە سوننەتدا ئەو وشەیە بەکار هاتوە، ئەوەش چەند نموونەیەك لەو دەقانە:

یەکەم: خوای پەروەردگار لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٥٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ.. ﴿١٥٩﴾ ﴾

واتە، (ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم)) بەهۆی بەزەیی خواوە، تۆ بۆیان نەرم بووی، وە ئەگەر هاتباو قسە ڕەق و دڵ ڕەق بوای، لەدەورت دەپرژان.

کەواتە: (تواضع) واتە: نەرمیی، ئینسان لەجیاتی ئەوەی قسەی ڕەق بێ، قسەی نەرم بێ، وە لەجیاتی ئەوەی دڵی ڕەق و زبر بێ، دڵی نەرم بێ.

دووەم: لە سوورەتی (لقمان) ئایەتی (١٨)دا، لوقمان ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکا، وەك خوای زاناو توانا بۆمان باس دەکاو دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ ﴾.

واتە: ڕووی خۆت لە خەڵك وەرمەچەرخێنەو، بەفیز بە زەویدا مەڕۆ، بێگومان خوا هیچ کەسی شانازییکەری بە فیزو کەشخەی خۆش ناوێ.

سێیەم: پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکدا، دەربارەی (تواضع) فەرموویەتی:

{مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ رَجُلًا بِعَفْوٍ إِلَّا عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ}، أخرجه أحمد برقم (٧٢٠٥)، ومسلم برقم (٢٥٨٨)، والترمذي برقم (٢٠٢٩) وقال: حسن صحيح، وابن حبان برقم (٣٢٤٨)، وأخرجه أيضًا: الدارمي برقم (١٦٧٦) وأبو يعلى برقم (٦٤٥٨)، والبيهقي في السنن الكبرى برقم (١٦٤٢٣)، وفي شعب الإيمان برقم (٨٠٧١).

واتە: هیچ ماڵ و سامانێك بەهۆی بەخشین کەم ناکا، وە هەر بەندەیەك بەهۆی ئەوەوە کە چاوپۆشیی دەکا، خوا عیززەتی زیاد دەکا، وە هیچ کەسێ لەبەر خوا خۆی بەکەم ناگرێ، مەگەر خوا بەرزی دەکاتەوە.

### ١٠- ئـارامیی (السَّكينة):

**ئنجا با سەرنجێكی قسەی زانایان بدەین، لەبارەی چەمكی (سكينه)ەوە:**

أ- (**إبن فارس**) دەڵێ: {السَّكينة مَأخوذة مِن مادّة: (س، ك، ن) الّتي تَدلُّ عَلى خِلاف الإضطرابِ والحَركَة. يُقال: سَكَن الشّيءُ، إذا ذَهَبت حَرَكته فاستَقرّ وثَبت، والسَّكينةُ هيَ الوَقارُ وقيل: الوَداعة والوَقار}[1]، واته: سەكینەت لە ماددەی (س، ك، ن) وەرگیراوە، كە پێچەوانەی جموجۆڵ و هەڵپە هەڵپ دەگەیەنێ، دەگوترێ: (سَكَن الشّيءُ)، ئەگەر جموجۆڵەكەی لاچوو، چەسپاو سەقامگیر بوو، وە سەكینەت: بریتیە لە سەنگینیی، وە گوتراوە: بریتیە لە بەڕێزیی و سەنگینی.

وە ئەوە كە مرۆڤ واز لەوە بێنێ، زیان بە خەڵكی بگەیەنێ.

ب- (**الجرجـاني**) دەڵێ: {السَّكينة: ما يَجدُه القَلبُ مِن الطُّمَأنينةِ عِندَ تَنزُّل الغَيبِ، وَهيَ نورٌ في القَلبِ يَسكُن إلى شاهِدهِ وَيطْمَئن}[2]. واتە: سەكینەت بریتیە لەو ئارامییەی كە دڵ هەستی پێ دەكا، لە حاڵەتێكی نادیاردا بۆی دێ، ڕۆشنایییەكە دێ بۆنێو دڵ و ئینسان بەهۆیەوە ئارام دەگرێ.

ج- **منیش دەڵێم**: (سَكينة) ئینسان مەگەر خۆی بیبینێ، ئەگەرنا بە دەربڕین چاكی لێ حاڵی نابێ، وەك زۆر جار ئەهلی تەصەووف دەڵێن: {مَن ذاقَ، عرَف}، واتە: هەركەسێ چێژتی، دەزانێ. لەبەرئەوە ئەگەر خۆت نەیچێژی، بە تەعبیرو وشە چاكی لێ حاڵی نابێ.

**ئنجا با چەند ئایەتێكی قورئان و فەرموودەیەكی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە بە نموونە بێنینەوە:**

**یەكەم:** خوای پەروەردگار دەربارەی سەكینەت، لە سووڕەتی (الفتح) ئایەتی

---

(١) مقاييس اللغة، ج٣ ص٨٨.

(٢) التعريفات، ص ١٢٥.

(٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ .. ﴿٤﴾ ﴾.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە سەکینەتی، {واتە: هێمنیی و ئۆخژنی} دابەزاندە سەر ئیماندران، تاکو لەگەڵ ئیمانەکەیاندا، ئیمانیان زیاد بکا.

کەواتە: ئیمان زیادیش دەکاو کەمیش دەکا.

**دووەم:** هەروەها لە سوورەتی (الفتح) ئایەتی (٢٦)دا، دەفەرموێ:

﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ .. ﴿٢٦﴾ ﴾.

واتە: {وە یاد بکەوە} کاتێ کافرەکان دەمارگیریی و تووڕەییان خستە دڵی خۆیانەوە، بەڵام خوا هێمنیی ڕژاندە سەر دڵی پێغەمبەرەکەی و دڵی ئیمانداران، وە پابەندی کردن بە تەقواوە، وە ئەوان پێی شایستە بوون، وە شیاوی ئەو تەقوایە بوون.

**سێیەم:** پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) وشەی سەکینەتی بەکارهێناوە، بۆ وێنە دەفەرموێ:

{إِذَا أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فَلَا تَأْتُوهَا تَسْعَوْنَ ، وَأْتُوهَا تَمْشُونَ عَلَيْكُمْ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا} أخرجه عبد الرزاق برقم (٣٤٠٣)، وأحمد برقم (٧٢٢٩)، والبخاري برقم (٨٦٦)، ومسلم برقم (٦٠٢)، وأبو داود برقم (٥٧٢)، والترمذي برقم (٣٢٧)، والنسائي برقم (٨٦١)، وابن ماجه برقم (٧٧٥)، وابن حبان برقم (٢١٤٨). وللحديث أطراف أخرى منها : {إِذا أَتَيْتُمُ الصَّلاة}، {إِذا ثُوِّب لِلصَّلاة}، {إِذا سَمِعتُمُ الإقامَة}.

واتە: هەرکات نوێژ بەرپا کرا، بەپەلەپەل بەرەو نوێژ مەچن، بەڵکو بە ڕۆیشتنی ئاسایی بچن، وە با هێمنییتان پێوە دیاربێ، ئنجا ئەوەندەی فریای کەوتن،

ئەنجامی بدەن، وە ئەوەندەش کە فریای نەکەوتن دوایی {کە ئیمام سڵاوی دایەوە} تەواوی بکەن.

**چوارەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ:

{يَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا}، أخرجه أحمد برقم (١٢٣٥٥)، والبخاري برقم (٥٧٧٤) ومسلم برقم (١٧٣٤)، والنسائي في الكبرى برقم (٥٨٩٠).

واتە: ئاسان بکەن و، وە زەحمەت مەخەن، وە دڵخۆشیی خەڵك بکەن و، خەڵك مەسڵەمێننەوە.

لەڕاستییدا ئەم دوو ڕەوشت و ئاکارەش، هەردووکیان زۆر گرنگ و پێویستن، بۆ مامەڵەی ئینسانی مسوڵمان، لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگادا: هەم خاکیێتیی و خۆ بەکەمگریی، هەم هێمنیی و ئارامیی.

■ ١١ و ١٢ ■

## نەرم و نیانیی و، زمان شیرینی
## (الرِّفقُ، وَطيبُ الكَلام)

### ١١- نەرم و نیانیی (الرفق):

**با سەرنجی قسەی چەند زانایەك بدەین كە چۆن چەمكی (رفق) شیدەكەنەوە؟:**

أ- (إبن فارس) دەڵێ: {(رِفق) الرّاء والفاءُ والقافُ (ر، ف، ق) أَصلٌ واحِدٌ يَدُلُّ عَلى موافَقَةٍ وَمُقارَبةٍ بِلا عُنْف. فَالرِّفق: خِلافُ العُنْف، والرِّفق لِيْنُ الجانِب، ولَطافَةُ الفِعل}[1]، واتە: وشەی (رِفق) لە ( ر، ف، ق)ەوە هاتوە، گونجاویی و نزیكیی دەگەیەنێ، بەبێ توندو تیژیی، وە (رِفق) پێچەوانەی (عُنف) {توندو تیژیی} یە، وە (رِفق) بریتیە لەوە كە ئینسان نەرم بێ، وە كردەوەی نەرم و نیان و هێمن و مەندانەبێ.

ب- (إبن حَجَر) دەڵێ:{هوَ لِيْنُ الجانِب بِالقَول والفِعل، والأَخذُ بِالأَسْهُلِ، وَهوَ ضِدُّ العُنف}[2]، واتە: (رفق) بریتیە لەوە كە ئینسان هەم قسەو، هەم كردەوەی نەرم بێ، وە بەردەوام لای ئەوە بگرێ كە ئاسانترە، وە (رفق) كە دیارە پێچەوانەی توندوتیژییە.

---

(١) مقاييس اللغة، ج٢ ص ٤١٨.

(٢) فتح الباري، ج١ ص ٤٤٩.

ج- (أبو حامِد الغَزالـي) دەڵێ: {اِعلَم أنّ الرِّفقَ مَحمودٌ وَيُضادُهُ العُنف، والحِدَّةُ والعُنف نَتيجةُ الغَضَب والفَظاظةِ، والرِّفْقُ واللِّيْنُ نَتيجَةُ حُسنِ الخُلق والسَّلامة}[1]، واتە: بزانە كە نەرم و نیانیی، شتێكی ستایش كراوو پەسەندە، وە پێچەوانەكەشی بریتیە لە توندو تیژیی و تووڕەیی، وە توندو تیژیی دەرەنجامی تووڕەیی و قسە ڕەقیی و دڵ ڕەقییە، وە نەرم و نیانییش دەرەنجامی ڕەوشت جوانیی و سەلامەتییە.

**ئەمەش چەند دەقێكی قورئان و سوننەت لەو بارەوە، وەك نموونە:**

**یەكەم:** خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٥٩)دا، بەپێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ.. ﴿١٥٩﴾ ﴾.

واتە: ئنجا بەهۆی بەزەیی خواوە بۆیان نەرم بووی، وە ئەگەر قسە ڕەق و دڵ ڕەق بوای، لەدەورت دەپرژان.

كەواتە: پێغەمبەری ئێمە (صلى الله عليه وسلم) بە دەقی ئایەت لەگەڵ خەڵكدا، نەرم و نیان بووە، هەم قسەشی نەرم بووەو، هەم دڵیشی پڕ بووە لە سۆزو بەزەیی.

**دووەم:** لە سووڕەتی (طه) ئایەتەكانی (٤٣- ٤٤)دا، خوای كاربەجێ باسی مووساو هاروونی برای دەكا (سەلامی خوایان لەسەر بێ)، دەفەرموێ:

﴿ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾.

واتە: بچن بۆلای فیرعەون، چونكە یاخی بووە، وە قسەیەكی نەرمی لەگەڵدا بكەن، بەڵكو بیری بكەوێتەوە، (لە خوا) بترسێ.

**سێیەم:** پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەكدا دەفەرموێ:

{إِنَّ الرِّفْقَ لَا يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ}، أخرجه مسلم برقم (٢٥٩٤)، وأخرجه أيضًا: الطيالسي برقم (١٥١٦).

---

(١) إحياء علوم الدين، ج٣ ص١٨٤.

واتە: نەرم و نیانیی لە هیچ شتێکدا نابێ، مەگەر جوانی دەکا، وە لەهیچ شتێ هەڵناگیرێ، مەگەر ناشیرینی دەکات.

چوارەم: هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{مَنْ يُحْرَمُ الرِّفْقَ، يُحْرَمُ الْخَيْرَ كُلَّهُ}، أخرجه أحمد برقم (١٩٢٢٩)، ومسلم برقم (٢٥٩٢)، وأبو داود برقم (٤٨٠٩)، وابن ماجه برقم (٣٦٨٧)، وابن حبان برقم (٥٤٨)، وأخرجه أيضًا: البخاري في الأدب المفرد برقم (٤٦٣)، والطبراني برقم (٢٤٤٩) والبيهقي برقم (٢٠٥٨٤).

واتە: هەرکەسێ لە نەرم و نیانیی بێبەش بێ، لە هەموو خێرێك بێبەشە.

جاری وایە کەسێك چاکە دەکا، تاعەت دەکا، دەبەخشێ، بەڵام لەبەر تووڕەیی و، زمان شڕیی و، هەڵچوون، هەموو چاکەکان لەخۆی تێك دەداتەوە.

پێنجەم: هەر دەربارەی نەرم و نیانیی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ يَحْرُمُ عَلَى النَّارِ، أَوْ بِمَنْ تَحْرُمُ عَلَيْهِ النَّارُ: عَلَى كُلِّ قَرِيبٍ هَيِّنٍ سَهْلٍ}، أخرجه الترمذي برقم (٢٤٨٨)، وقال: حسن غريب، والطبراني برقم (١٠٥٦٢)، وابن حبان برقم (٤٧٠). قال الألباني: صحيح.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵانی فەرموو: ئایا هەواڵتان پێ بدەم کێ لە ئاگری دۆزەخ قەدەغەیە؟ یاخود کێ ئاگری دۆزەخی لێ قەدەغە دەکرێ؟

(دیارە چاوەڕێ نەبووە بڵێن: بەڵێ، فەرموویەتی:) ئاگری دۆزەخ قەدەغەیە لە هەرکەسێك کە نزیك بێ، وەهێدیی و مەندو نەرم بێ، وە ئاسان بێ. {پێچەوانەکەی ئەوەیە کە لە خەڵکی دوور بێ، وە توندو تیژ و قرژ و قۆڵ بێ، وە تووڕەو تۆسن بێ}.

## ١٢- زمان شیرینیی (طيبُ الكَلامِ):

ئینسان دەبێ لەگەڵ خەڵکدا زمانی شیرین بێ گفت و لفتی خۆش بێ.

(الرازي) لەبارەی چەمکی وشەی (طيب)ەوە دەڵێ: {الطَّيِّبُ: ضِد الخَبيثِ، وَطَابَ يَطيبُ طِيبَةً بِكسرِ الطَّاءِ و تَطْياباً بِفتحِ التَّاء}[1]. واتە: (الطيبُ) پاك و چاك، پێچەوانەی (الخبيث)ە، کە بەمانای پیس و زیانبەخشە.

**ئنجا با سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئان و چەند دەقێکی سوننەتیش بدەین لەو بارەوە:**

**یەکەم:** خوای بەرزی زانا لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٨٣)دا، دەفەرموێ:

﴿.. وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا ..﴿٨٣﴾﴾.

واتە: وە قسەی باش لەگەڵ خەڵکدا بکەن.

واتە: زمانتان لەگەڵیان شیرین بێ، قسەتان لەگەڵیان خۆش بێ، ئنجا کە فەرموویەتی: (لِلنَّاسِ) واتە: لەگەڵ خەڵك بەگشتی، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە.

**دووەم:** پێشتریش ئەو ئایەتەی سوورەتی (آل عمران)مان هێنا، ئایەتی (١٥٩)، خوا دەفەرموێ:

﴿...وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ..﴿١٥٩﴾﴾.

واتە: وە ئەگەر قسە ڕەق و دڵ ڕەق بای، لەدەورت دەپرژان.

کەواتە: ئەی پێغەمبەر! بەهۆی ئەوەوە ئەو خەڵکەت بەدەورەوەیە، کە قسەت لەگەڵیان نەرمەو، هێدیی و ئارامی، وە دڵیشت لەگەڵیان پڕ ڕەحم و بەسۆزە.

---

(١) مختار الصِّحاح، ص٣٥٥.

سێیەم: هەروەها هەر لەو بارەوە کە ئینسانی مسوڵمان دەبێ ئاگای لە زمانی خۆی بێ و، نابێ زمانی شڕو دڕ بێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلَا اللَّعَّانِ، وَلَا الْفَاحِشِ، وَلَا الْبَذِيءِ}، أخرجه البخاري في الأدب المفرد برقم (٣١٢)، وأحمد برقم (٣٨٣٩)، والترمذي برقم (١٩٧٧)، وقال: حسن غريب، وأبو يعلى برقم (٥٠٨٨)، وابن حبان برقم (١٩٢)، والطبراني برقم (١٠٤٨٣)، والحاكم برقم (٢٩)، وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥١٤٩)، قال الألباني: صحيح.

واتە: ئیماندار تانە لێدەرو، نەفرین کەرو، جنێودەرو، زمان پیس (یاخود زمان) شڕ نیە.

کەواتە: پێچەوانەی ئەوانەیەو: قسەی خۆشەو زمانی شیرینە، وە وشەو تەعبیری بە نەزاکەت نەبێ بەکار ناهێنێ.

هەندێ کەس زمانی خۆی بەڕەڵڵا دەکاو خۆشی بە بانگخواز دەزانێ، وشەی بازاڕیی بەکار دەهێنێ و کەس لە زمانی سەلامەت نیە!! کە لە ڕاستییدا ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەسفی ئیمانداری پێ دەکا، با ئەو کەسانەی کە قسەشیان بەرانبەر دەگوترێ، نامسوڵمانیش بن، مسوڵمان نابێ بەرامبەر بە نامسوڵمانانیش وشەی بێ نەزاکەت بەکار بهێنێ، ئەگەر ئەو کەسەش بەرامبەر بەتۆ وشەی خراپ و بێ نەزاکەتی بەکار هێناو لەخۆی وەشاندەوە، بەڵام تۆ نابێ لەخۆتی بوەشێنیەوە، نابێ وشەی بێ نەزاکەت بەکار بێنی، وەك عەرەب دەڵێن: (الهَدايا على قَدَرِ مُهْدِيها)، واتە: دیاریی و خەڵاتەکان لەقەدەر ئەو کەسانەن کە دیاریی و خەڵاتەکان دەنێرن.

تۆش دەبێ لەخۆت وریابی و، لەقەدەر خۆت و بەرنامەکەت بی.

دەڵێن: جارێك عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بەلای کۆمەڵێکدا ڕەت دەبێ، ئەوان گاڵتەی پێ دەکەن و جنێوو قسەی ناشیرینی پێ دەڵێن، ئەویش دەست بەرز دەکاتەوەو دوعایان بۆ دەکا، ئەوانەی کە لە خزمەتی دان (حەوارییەکان) دەڵێن: ئەی پەیامبەری خوا! ئەوانە قسەت پێ دەڵێن!

عیسا دەفەرموێ: دەزانم، بەڵام ئەوان جنێویان پێیە، منیش دوعام پێیەو، هەرکەسە لەوەی، کە پێیەتی دەیبەخشێ.

چوارەم: هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ:

{وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ} أخرجه أحمد برقم (٨١٦٨)، والبخاري برقم (٢٨٢٧)، ومسلم برقم (١٠٠٩)، وابن حبان برقم (٣٣٨١).

واتە: قسەی باش، خێرو پاداشتی هەیە، {واتە: صەدەقەو خێرێکە، دەیکەی}.

## ■ ١٣ و ١٤ و ١٥ ■

# سۆزو پەرۆشیی و، بارقووڵیی و زوو توڕە نەبوون، هێدیی و مەندیی و پەلە نەكردن (الشفقة، والحِلم، والتَّأنِّي)

### ١٣- سۆزو پەرۆشیی (الشَّفَقة):

سەرەتا با بزانین شارەزاو پسپۆڕانی زمانی عەرەبی، لەبارەی چەمك و واتای وشەی (شَفَقة)وە، چییان گوتوە؟!

أ- گوتوویانە: {الشَّفَقة: هيَ الإسم مِنَ الإشْفاقِ، وكَذلِك الشَّفَق، وَهيَ مِن مادَّة (ش، ف، ق) الّتي تَدلُّ عَلى رِقَّةٍ في الشَّيء فَمِن ذلِك قَولُهُم: أَشْفَقتُ مِنَ الأَمر، إذا رَقَقْتَ وَحَذَرْتَ، والشَّفق: بَقيَّةُ ضَوءِ الشَّمس وَحُمْرَتُها في أوّل اللّيْل إلى قَريب مِن العَتَمَةِ}[1]، واتە: وشەی (الشَّفَقة) ناوە لە (الإشْفاق)ەوە هاتوە، وە هەروەها وشەی (شَفَق) لەوەوە هاتوە لە ماددەی (ش ف ق)، كە نەرمیی شتێك دەگەیەنێ، دەگوترێ: (أَشفَقت مِنَ الأَمر) واتە: لێی ترسام دڵم بۆی پەرۆش بوو، وە (شَفق) بەسوورایی تیشكی خۆر دەگوترێ، لە سەرەتای شەوگارەوە تاكو نوێژی خەوتنان.

ب- (راغب الأصفهانـي) دەڵێ: {الإشفاقُ والشَّفقة: عِنايةٌ مُختَلَطة بِخوف، لأَنَّ المُشْفق

---

(١) مقاييس اللغة، ج٣ ص ١٩٧، والصحاح للجوهري ج٤ ص ١٥٠١.

يُحِبُّ المُشفَقَ عَلَيه وَيَخافُ ما يَلحَقهُ مِن أذىً، فإذا عُدِّي بـ(مِن) فَمَعنى الخَوفَ فيهِ أَظهَر، وإذا عُدِّي بـ(في) فَمعنى العِناية فيهِ أَظهر}[1]، واتە: وشەی (إشفاق)و (شَفَقة) بریتیە لە خەم لێخواردنێکی تێکەڵ لەگەڵ ترس، چونکە بابای (مُشفق) سۆزو پەرۆش دەنوێنێ، دیارە ئەو کەسەی کە سۆزو پەرۆشی بەرامبەر دەنوێنێ، خۆشی دەوێ، وە مەترسیی ئەوەی لێدەکا، ئازارێکی پێ بگا، بۆیە ئەگەر (أشفَقَ) بە (مِن) تەعەددا[2] بکا، {بڵێ: (أَشْفَقَ مِنهُ)} زیاتر مانای ترس دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بە (فی) تەعەددا بکا، {بڵێ: (أَشْفَقَ فيهِ)} زیاتر مانای خەم لێخواردن و بەتەنگەوە بوون دەگەیەنێ.

ج- (المُناوي) دەڵێ: {الشَّفقة: هيَ صَرفُ الهِمَّة إلى إزالةِ المَكروهِ عَنِ النّاس}[3]، واتە: (شَفَقة) بریتیە لەوە کە ئینسان هیممەتی خۆی بخاتە کار، بۆ ئەوەی کە هەرچی بۆ خەڵك خراپەو پێیان ناخۆشە، لێیان لابدات.

لە قورئانیشدا ئەم وشەیە بەکارهێنراوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الطور) ئایەتی (٢٦)دا دەفەرموێ:

﴿ قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبۡلُ فِيٓ أَهۡلِنَا مُشۡفِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾.

واتە: گوتیان: (ئەوانە دیارە بەهەشتییەکانن): ئێمە پێشتر لەنێو کەس و کاری خۆماندا، سۆزو ترسمان هەبوو {لەو چارەنووسەی کە ئێستا هاتۆتە پێش، بۆیە سەلامەت بووین، بەڵام ئەوەی بێباك و بێ منەت بووە، ئەوە دیارە تووشی سزا بووە}.

---

(١) المفردات، ص ٤٦٩.

(٢) تەعەددای کرد (تَعَدّی) زاراوەیەکی عەرەبییە، واتە: پێویستی بە (مفعول به) دەکات.

(٣) الجرجاني في التعريفات، ص ١٢٧.

## ١٤- بار قووڵیی (الحلم):

لەڕاستییدا (حِلْم) پێچەوانەی (سُرعة الغَضب)ە، یانی: زوو تووڕە بوون و زوو هەڵچوون، بۆیە من گوتوومە: (حلیم): بار قووڵ، واتە: ئینسان قووڵ بێت و زوو هەڵنەچێ و زوو تووڕە نەبێ.

**ئنجا با بزانین شارەزایانی زمانی عەرەبیی چۆن پێناسەی (حِلْم) دەکەن و، چەمکی ئەو وشەیە چۆن شیدەکەنەوە؟!:**

أ- (**إبن فارس**) دەڵێ: {الحِلْمُ: مَصدر حَلُمَ فُلانٌ، أَي: صارَ حَليماً، مِن مادَّة (ح ل م) الَّتي تَدُلُّ عَلى تَركِ العَجَلةِ، وَيُقال حلُمتُ عَنه أحْلمُ، فأنا حَليم، وَهوَ خِلاف الطَّيش}[1]، واتە: وشەی (حِلْم) چاوگی (حَلُمَ)یە، (حلُمَ فلانٌ، أي صار حليماً) واتە: فلان کەس بوو بە کەسێکی (حلیم) لە ماددەی (ح ل م)ەوە هاتوە، کە واز لە پەلەکردن هێنان دەگەیەنێ، پێچەوانەی (طیش) واتە: زوو هەڵچوون و زوو تووڕە بوون.

ب- (**راغب الأصفهانـي**) دەڵێ:{الحِلْم: ضَبط النَّفسِ والطَّبعِ عندَ هَيجانِ الغضب}[2]. واتە: (حِلْم) بریتیە لە خۆگرتن و خۆ کۆنترۆڵ کردن لەکاتی هەڵچوون و تووڕەییدا.

جـ- (**الجاحظ**) دەڵێ: {الحِلم: تَرك الإنتقامِ عنْدَ شِدّة الغَضَبِ مَع القُدرةِ عَلى ذلك}[3]، واتە: (حِلم) بریتیە لە وازهێنان لە تۆڵە ستاندنەوە، لەکاتی زۆر تووڕە بوونیشدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە توانای هەیە.

ئەگەر کەسێك توانای نەبێ تۆڵە بستێنێتەوە، با واز لە تۆڵە ستاندنەوەش بێنێ، پێی ناگوترێ: (حلیم)، چونکە ئەوە لەناچاریی و بێ دەستەڵاتییە،

---

(١) مقاييس اللغة ج٢ ص ٩٣، ولسان العرب ج٢ ص ٩٧٩.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ١٢٩.

(٣) تهذيب الأخلاق، ص ٢٣.

بەڵام کەسێك بتوانێ تۆڵە بستێنێ و توانای هەبێ، بەڵام نەشیستێنێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (حلیم).

**ئەوەش چەند دەقێکی شەریعەت لەبارەی (حِلْم)ەوە، وەك نموونە:**

**یەکەم:** خوای بەبەزەیی وشەی (حلیم)ی بۆخۆی بەکار هێناوە، بۆ وێنە لە سوورەتی (التغابن) ئایەتی (١٧)دا، دەفەرموێ:

﴿.. وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾﴾.

واتە: بێگومان خوا سوپاس گوزارەو بار قووڵە، {یانی: زوو تووڕە نابێ}.

**دووەم:** هەروەها وشەی (حِلم)ی بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ) بەکار هێناوە، بۆ وێنە: لە (التوبة) ئایەتی (١١٤)دا فەرموویەتی:

﴿...إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾﴾.

واتە: بێگومان ئیبراهیم زۆر لە خوا دەپاڕایەوەو زۆر ترسی هەبوو، وە زۆر بار قووڵ و هێدیی و مەند بوو.

**سێیەم:** وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکدا، بە (أَشجِّ عَبدالقیس) کە یەکێك بووە لە سەرۆك هۆزەکان، فەرموویەتی:

{إِنَّ فِيكَ خَصلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالْأَنَاةُ} أخرجه مسلم برقم (١٧)، والترمذي برقم (٢٠١١)، وقال: حسن صحيح غريب، وأخرجه أيضًا: البيهقي برقم (٢٠٠٥٩).

واتە: تۆ دوو سیفەتت تێدان، خوا خۆشی دەوێن، کە بریتین لە: بار قووڵیی و هێدیی و مەندیی و، پەلە نەکردن.

## ١٥- هێدیی و مەندیی (الأناة):

**با سەرنجێکی قسەی زانایان بدەین، لەبارەی چەمکی (أنـاة)ەوە:**

أ- (**محمد الطاهر بن عاشور**) لەو بارەوە گوتوویەتی: {التَّأَنِّي: عَدَم العَجَلةِ فِي طَلَبِ شَيْءٍ مِنَ الأَشياءِ، والتمَهُّل فِي تَحصيلهِ والتَّرفُّقِ فيهِ}[1]، واتە: (تَأَنّـي) بریتیە لەوە کە ئینسان پەلە نەکا لە بەدەستهێنانی شتێك لە شتەکان، وە بە کاوەخۆیی لە پەیدا کردنیدا، وە بەنەرمیی بۆی بچێ.

ب- (**راغب الأصفهانـي**) دەڵێ: {الأَناة: أَنَيْتُ الشَّيء إيناءً: أخَّرتهُ عَن أَوانه، والأَناة: التُّؤدة، تأنَّى فلانٌ تأنِّياً، وأنى يَأْنِي فَهو آنٍ، أي: وقورٌ. واسْتَأْنَيته: انتَظَرت أَوانَهُ... ويُقال: إمْرأةٌ أَناةٌ، أي: رَزِينَةٌ لا تَصْخَبُ وَلا تُفحِشُ...}[2]، واتە: شتەکەم لەکاتی خۆی دواخست، وە (أناة) واتە: بەکاوەخۆ، بە شێنەیی، دەگوترێ: (تأني فُلان تأنِّياً) یانی: فڵانکەس دواکەوت، (وأَنّى يأني فهو آنٍ، أي: وقورٌ) واتە: فڵانکەس سەنگینەو پەلە ناکا، (واستَأنيته: انْتَظَرْت أَوانَهُ) واتە: چاوەڕێم کرد تاکو کاتی خۆی بێ، وە دەگوترێ: (إمرأةٌ أناةٌ) واتە: ئافرەتێکی سەنگینە، دەنگ هەڵناهێنێ و وشەی ناشیرین بەکارناهێنێ.

**ئەمەش چەند دەقێکی قورئان و سوننەت لەو بارەوە، وەك نموونە:**

یەکەم: خوا لە سوورەتی (مریم) ئایەتی (٨٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴿٨٤﴾ ﴾

(ئەم ئایەتە مانای (أَناة) دەگەیەنێ) واتە: لێیان بەپەلە مەبە، پەلەیان لێ مەکە، ئێمە بۆیان دەژمێرین، {یانی: (کات) یان (سزا)یان بۆ دەژمێرین}.

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٦ ص ٣١٦.

(٢) المفردات، ص ٣٩.

دووەم: هەروەها لە سوورەتی (القيامة) ئایەتی (١٦)دا، دەفەرموێ:

﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ١٦﴾.

واتە: زمانتی پێ مەجووڵێنە بۆ ئەوەی پەلە بکەی، {لێگەڕێ تاکو جبریل لێ دەبێتەوە}.

سێیەم: پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ:

{التَّأني مِنَ اللَّهِ وَالْعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ}، أخرجه الترمذي برقم (٢٠١٢) وقال: غريب، والطبراني برقم (٥٧٠٢)، قال الألباني: ضعيف.

واتە: هێدیی و مەندیی پەلە نەکردن، لە خواوەیە، وە پەلە کردن، لە شەیتانەوەیە.

■ ١٦ ■

## میانجێتیی (التَّوسُّط)

ئینسانی مسوڵمان دەبێ هەوڵ بدا لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا، خەتی نێوەڕاست بگرێ، نە تێپەڕێنێ، نە کورتی بێنێ، نە زێدەڕۆیی بکا، نەکەمتەرخەمیی بکا.

**شارەزایان و پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی ئاوا پێناسەی (تَوسُّط)یان کردوە، گوتوویانە:**

{التَّوسُّط: مَصدر، تَوسَّط الشَّيء مِن مادّة (و س ط) الّتي تَدلُّ عَلى العَدل والنَّصَفِ، وَأَعدَلُ الشَّيءِ: أَوسَطُه وَوَسطُه ... والوَسيط: الحَسيب والحَسَن، ومِنه سُمِّيتِ الصَّلاةُ الوسْطى، لِأَنَّها أَفضَل الصَّلوات وأَعْظَمُها أَجراً، وَوَسطُ الشَّيءِ: مالَه طَرَفان مُتساويا القَدر}[1].

واتە: (تَوَسُّط) چاوگە لە (توسَّط الشَّيء) یانی: چووە نێوەڕاستی شتەکە، لە ماددەی (و س ط)ەوە وەرگیراوە، کە دادگەریی و ئینساف دەگەیەنێ، دەڵێ: (وأَعدَلُ الشيءِ: أوسَطُه ووسطُه) نێوەڕاستی شتێك، وە باشترینی ئەو شتە، هەروەها (الوَسیط) بریتیە: لە کەسێکی خاوەن حەسەب و باش، بۆیە بە یەکێ لە نوێژەکان گوتراوە: (الصلاة الوسْطى) کە زۆربە دەڵێن: نوێژی عەسرە، کە باشترین نوێژە، وە گەورەترین پاداشتی هەیە، وە نێوەڕاستی هەر شتێك، ئەوەیە ئەو شتە دوولای یەکسانی هەبن.

---

(١) لسان العرب، ج٨ ص ٤٨٣١- ٤٨٣٤- ومقاييس اللغة، ج٦ ص ١٠٨- والمفردات، ص ٥٢٢.

هەروەها (**راغب**) دەڵێ: {التَّوسُّط: القَصْدُ المَصوُنُ مِنَ الإفراطِ والتَّفريط، أَن يَتحرّى المُسلم الإعتدالُ، وَيَبتَعِد عَنِ التَّطَرُّف قَولاً وفِعلاً بِحيث لا يُقَصِّرُ ولا يُغالي}[1]، واتە: (تَوَسُّط) ئەوەیە كە ئینسان بپارێزرێ لە تێپەڕاندن و بەزایەدان، ئەویش بەوە كە مسوڵمان هەوڵبدا بۆ حاڵەتی هاوسەنگیی بگەڕێ، وە خۆی دووربگرێ لە پەڕگیریی لە قسەو لە كردەوەیدا، بە شێوەیەك كە نە كەمتەرخەمیی بنوێنێ، نە زێدەڕۆییش بكات.

**ئەمەش چەند دەقێكی قورئان و سوننەت لەبارەی میانجێتییەوە:**

**یەكەم:** خوای بەدیهێنەر لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٤٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ... ﴿١٤٣﴾ ﴾.

واتە: وە بەو جۆرە ئێوەمان كردوە بە كۆمەڵێكی میانجیی (هاوسەنگ)، بۆ ئەوەی كە ئێوە شاهێدبن بەسەر خەڵكەوە، پێغەمبەریش بەسەر ئێوە شاهێد بێ.

**دووەم:** هەروەها لە سوورەتی (الفرقان) ئایەتی (٦٧)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ ﴾.

واتە: وە {بەندەكانی خوای خاوەن بەزەیی} ئەوانەن كە: ئەگەر ماڵی خۆیان بەخشی، نە زێدەڕۆیی بكەن، نە چرووكیی بنوێنن، وە لەو نێوانەدا میانجیی بن.

**سێیەم:** پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتێكدا دەفەرموێ:

{أَوْثَق عُرى الإيمانِ: المُوالاةُ في اللهِ، وَالمُعاداةُ في الله، وَالحُبُّ في الله، والبُغْضُ في الله}[2]

---

(١) نضرة النعيم، ج٤ ص ١٣٥٣، والمفردات ص ٥٣٣.

(٢) پێشتر تەخریج كراوە.

واتە: باشترین قوڵفەکانی ئیمان: دۆستایەتیی گرتنە لەبەر خواو، دوژمنایەتییە لەبەر خوا، وە خۆشویستنە لەبەر خواو، ڕق لێ بوونەوەیە لەبەر خوا.

**چوارەم:** هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا، هەر لەو بارەوە دەفەرموێ:

{إِنَّ الْهَدْيَ الصَّالِحَ، وَالسَّمْتَ الصَّالِحَ، وَالِاقْتِصَادَ، جُزْءٌ مِنْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا مِنْ النُّبُوَّةِ} أخرجه أحمد برقم (٢٦٩٨)، وأبو داود برقم (٤٧٧٦)، والبيهقي برقم (٢٠٥٩٠)، والطبراني برقم (١٢٦٠٩)، وأخرجه أيضًا: البخاري في الأدب المفرد برقم (٧٩١)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٨٠١٠)، قال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره، قال الألباني: حسن.

واتە: بێگومان ڕێبازی باش و، شێوەی ڕێك و پێك و چاك و، دەست پێوە گرتن و میانجێتیی لە خەرجکردندا، بەشێکە لە بیست و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتیی.

(الهَدْيَ): الطَّريق (إِنَّ أَحْسَنَ الهَدْيِ هَديُ مُحَمَّدٍ)[1].

(**السَّمْت**): الطريق، وهوَ أَيْضاً: هَيْئَةُ أَهلِ الخَير[2].

کەواتە: وشەی (هَدْي) بەمانای (ڕێباز) دێ.

وە وشەی (سَمْت) بەمانای (ڕێباز)و بەمانای (شێوەو دیمەنی خەڵکی باش) دێ.

کەواتە: ئینسان دەبێ هەوڵ بدا میانجیی و، هاوسەنگ بێ، نە تێپەڕێنێ، نەکورتی بێنێ، لە هەڵس و کەوت و مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا، لە هەموو بوارەکاندا.

---

(١) عمدة الحفاظ، ج٤ ص ٢٤٧.

(٢) مختار الصِّحاح، ص ٢٨٠.

■ ١٧ ■

# ڕوو گەشیی (البشاشة)

**پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی ئاوا مانای وشەی (بَشاشة)یان شیكردۆتەوە:**

أ- {البَشاشَة: مَصدر بشَّ من مادّة: (ب ش ش) الَّتي تَدلُّ عَلى اللِّقاء الجَميل والضَّحِك إِلى الإنسان سُروراً به، والبَشُّ: اللُّطْفُ في المَسألة والإقبال عَلى الرَّجل، يُقال: رَجُلٌ هَشٌّ بَشٌّ: أي طَلْقُ الوَجهِ طيِّب، ويُقال: تَبَشْبَشَ بهِ أي: آنَسهُ وواصَلَهُ}[1].

واتە: وشەی (بَشاشَة) چاوگە لە (بشَّ)ەوە هاتوە، لە ماددەی (ب ش ش) ئەویش دەلالەت دەكا لە دیداری جوان و پێكەنین لە كاتێكدا كە ئینسان بەكەسێكی دیكە دەگا، وە (البَشُّ) بریتیە لە نەرم و نیانیی لە داواكردندا، دەگوترێ: (رجُلٌ هَشٌّ بَشٌّ) واتە: ڕووی خۆشە، وە ڕووی جوانە لەگەڵی، وە دەگوترێ: (تَبَشْبَشَ) واتە: هۆگری خۆی كردو، لەگەڵیدا بەباشە ڕەفتاری كرد.

ب- هەروەها زانایان بەم شێوەیەش پێناسەیان كردوە: {البَشاشة: هيَ سُرور يَظهر في الوَجهِ، يُدَلُّ بهِ عَلى ما في القَلبِ، مِن حُبِّ اللِّقاءِ والفَرَح بِالمُقابَلة}[2].

واتە: (بَشاشة) بریتیە لە دڵخۆشییەك، كە لەسەر ڕوو دەردەكەوێ، وە نیشانەی

---

(١) تاج العروس، ج٤ ص ٢٨٣، والصِّحاح للجوهري، ج٣ ص ٩٩٦.

(٢) نضرة النعيم، ج٣ ص ٨١٢.

ئەوەیە کە لەدڵدا خۆشەویستیی دیدارو وە شادمانیی هەیە، بەوە کە ئەو ئینسانە لەگەڵ ئەوی دیکەدا یەکدی دەبینن، {پێی خۆش بووە کە یەکدی دەبینن و پێی شادمان بووە}.

**ئەمەش چەند دەقێکی قورئان و سوننەت لەبارەی ڕووگەشیی و ڕوو خۆشییەوە:**

**یەکەم:** خوای بەخشەر لەو بارەوە لە سووڕەتی (القيامة) ئایەتەکانی: (٢٢-٢٣) دا، دەفەرموێ:

﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾.

واتە: لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی دوایی) چەند ڕوویەك گەشن، تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەکەن.

**دووەم:** پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی گرنگیی ڕووی گەش و خۆشەوە فەرموویەتی:

{لَا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ} أخرجه أحمد برقم (٢١٥٥٩)، ومسلم برقم (٢٦٢٦)، والترمذي برقم (١٨٣٣) وقال: حسن صحيح، وأخرجه أيضًا: ابن حبان برقم (٥٢٣) والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٣٤٦٠).

واتە: هیچ شتێك لە چاکە بەکەم مەگرە، ئەگەر هەر ئەوەندەش بێ کە بە ڕووی خۆش بگەیە برای خۆت[1].

**سێیەم:** هەروەها جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیی (خوا لێی ڕازی بێ )دەڵێ:

{مَا حَجَبَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلَا رَآنِي إِلَّا تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي} أخرجه البخاري برقم (٢٨٧١).

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیی دەڵێ: لەو کاتەوە کە مسوڵمان بووم،

---

(١) دیارە مەجلیسەکە مەجلیسی پیاوان بووە، ئەگەرنا دەبێ بەڕووی خۆش بگەیە خوشکی خۆتیش، یان ئافرەت کە بە ئافرەت دەگات هەمیشە پێویستە ڕووی خۆش و گەش بێ.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) منی نەخستۆتە پشت پەردە {واتە: وای نەکردوە کە نەمبینێ}، وە هیچ کاتێکیش منی نەبینیوە، مەگەر لە ڕوومدا زەردەخەنەی کردوە.

لێرەدا دیارە جەریر دەربارەی خۆی وای گوتوە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هیچ کات نەخۆی لەکەس شاردۆتەوە، نەخۆی لەکەس پشت پەردە کردوە، وەك زۆر لەبەرپرسانی ئێستای دنیا، کە خەڵك بەچەند ڕۆژو مانگ ناتوانێ بیانبینێ! بەڵکو بە پێچەوانەوە هەمیشە لەنێو خەڵکدا بووە، وە هەمیشەو لەگەڵ هەموو کەسدا بەزەردەخەنەو ڕوو خۆش بووە، هەزاران سەڵەوات و سەلام و بەڕەکاتی خوای لەسەر بێ، ئێمەش کە خۆمان بە ئۆممەتی ئەو دەزانین، دەبێ هەوڵ بدەین لەقەدەر خۆمان، کەم و زۆر وەك ئەو بچین، وە بەڕێی ئەودا بچین، خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ.

■ ١٨ ■

## گەشبینیی (التَّفاؤُل)

ئینسان دەبێ هەمیشە بە گەش بینیی بۆ خەڵك و دنیا بڕوانێ، دیارە گەش بینیی (تفاؤل) پێچەوانەی ڕەش بینیی (تشائم)ە.

**پسپۆڕانی زمان لەڕووی زمانەوانییەوە، ئاوا پێناسەی (تفاؤل)یان كردوە:**

أ- {التّفاؤل: الفَأل: ضِدُّ الطِّيَرَةُ، والجَمع فُئُول، والتفاؤل مصدر تفاءَل، والفَأْلُ هو الكلمة الصالحة، والكلمة الطيِّبة، أو الكلمة الحسنة}، واتە: (فَأْل): گەشبینیی، پێچەوانەی (الطِّيَرَة)یە واتە: ڕەشبینیی، كۆیەكەشی (فُئُول)ە، وە (تَفاؤل) لەسەر كێشی (تَفاعُل)ە، چاوگی (تفاءَل)ەیە، واتە: گەشبینیی نواند، وە (فَأْل) یانی: گەشبینیی، یان وشەیەكی باش و خۆشە، یان وشەیەكی پەسندە.

ب- وە لە ڕووی زاراوەیی (إصطلاح)یەوە ئاوا پێناسەی (تفاؤل)یان كردوە، گوتوویانە: {التَّفاؤُل: إنشراح قَلبِ الإنسانِ وإِحسانُهُ الظَنَّ، وَتَوَقُّعُ الخَيرَ بِما يَسْمَعُه مِن الكَلِم الصّالِح، أَو الحَسن، أَو الطيِّب}[1]، واتە: (تفاؤل) بریتییە لە سینە گوشاد بوونی ئینسان، وە گومانی چاك بردنی، وە ئومێدەوار بوونی بە چاكەو خێر، بەوەی كە وشەیەكی گونجاو، یان وشەیەكی باش، یان وشەیەكی خۆش دەبیستێ، {لەوەوە ئەنجامگیرییەكی باش دەكا}.

---

(١) نضرة النعيم ج٣ ص ١٠٤٥، ١٠٤٦.

بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە صوڵحی حودەیبییەدا، كاتێك سوهەیلی كوڕی عەمر كە نوێنەری قوڕەیشیەكان بوو، هات، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: {سَهل أمركم}[1]، كارتان ئاسان دەبێ، وەك گەشبینییەك، فەرمووی و دوایی كارەكەش ئاسان بوو.

بە نسبەت دەقەكانی شەریعەتەوە: لە قورئاندا وشەی (تفاؤل) نەهاتوە، بەڵام تەعبیری وا هاتوە كە گەشبینیی دەگەیەنێ، وە لە سوننەتدا وشەی ناوبراو هاتوە، بۆ نموونە:

یەكەم: لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٧٣)دا خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرمویٰ:

﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەی كاتێك خەڵكێك هاتنە لایان گوتیان: خەڵك بۆتان كۆبوونەتەوە، ئەوانیش بڕوایان بەو هەواڵە زیادی كرد، وە گوتیان: (حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ) واتە: خوامان بەسەو باشترین كار پێسپێرراویش ئەوە، {واتە: بێباكییان دەربڕی}[2].

دووەم: هەروەها خوای بێ هاوەڵ لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٥٩)دا، دەفەرمووێ:

﴿ ..وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

واتە: وە گوتیان: خوامان بەسە، خوا لە بەخششی خۆی پێمان دەدا، هەروەها پێغەمبەرەكەی، وە ئێمە بەرەو خوا ئارەزوو مەندین و تامەزرۆین.

---

(١) السيرة النبوية، لإبن هشام، ج٣ ص ١٦٨.

(٢) بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، كە بەسەرهاتێكی هەیە، ئێمە لەبەرگی دووەمی: {تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز}دا كە سوورەتی (آل عمران)ی گرتۆتە خۆی، باسمان كردوە، بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج١ ص ٣٣٢-٣٣٣.

سێیەم: پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی:

{لَا عَدْوَى وَلَا طِيَرَةَ وَأُحِبُّ الْفَأْلَ الصَّالِحَ}، أخرجه أيضًا : أحمد برقم (١٠٣٢٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

واتە: نەخۆشیی گرتنەوە نیە[١]، وە نابێ ڕەشبینیی هەبێ وە سەرسامم بە (فَأْل). {(طِيَرَة) لەوەوە هاتوە کە ئەگەر ویستبایان سەفەر بکەن، باڵندەیەکیان هەڵدەفڕاند، ئەگەر بەلای ڕاستدا بڕۆیشتبایە، دەیانگوت: ئەوە بەرەو خێرو خۆشییەو سەفەرەکەمان دەکەین، وە ئەگەر بەلای چەپدا ڕۆیشتبایە، دەیانگوت: نەگبەتییەو بەلای چەپدا ڕۆیشتوەو سەفەرەکەیان نەدەکرد، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: نابێ مسوڵمان ڕەشبین بێ، وە ئەو شتانە بکاتە مایەی ڕەشبینیی و مایەی ئەوەی کارێك نەکا}، وە سەرسامم بە (فَأْل). (فَأْل)یش ئەوەیە کە وشەیەکی خۆش ببیستێ و لەوەوە ئەنجامگیرییەکی باش بکات، کە ئەمە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ گەشبینیی ئینسان، دەبێ ئینسانی مسوڵمان لە ژیانیدا گەشبین بێ، بەردەوام چاوەڕێی خێرو چاکە بکا، نەك هەمیشە گرژو مۆن بێ و لە دڵە ڕاوکە دابێ، هەر وشەیەك ببیستێ تەفسیرو مانایەکی خراپی بۆ بکا، بەتەئکید هەرکەسێ لە ڕەشبینییدا بژی، زیاتر تووشی ئەو دەرەنجامانە دەبێ کە پێی ناخۆشن، وە هەر کەسێ گەشبینانە بیر بکاتەوەو چاوەڕێی خێر بکا، تووشی ئەو دەرەنجامە باشانە دەبێ، کە لەدەروونی خۆیدا هەڵیان دەگرێ، بەزۆریی وایە کە ژیانی ئینسان، ڕەنگدانەوەی بیروڕاو قەناعەت و حاڵەتی دەروونیی خۆیەتی.

کەسێك کە هەموو خەڵك بە خراپ دەزانێ، لە ئەنجامدا تووشی خراپە دەبێ، وە کەسێك کە ئومێدی خێری بە خەڵك زیاترە، وە گەشبینە بەرانبەریان، ئەوە زیاتر لەسەر دەستیان تووشی خێر دەبێ.

---

(١) لێرەدا دەبێ مەبەستی پێ ئەو نەخۆشییانە بێ، کە درم (مُعْدي) نین، بۆ ئەوەی کە خەڵك هەر لەخۆوە لێی دوور نەکەونەوە، یاخود مەبەست ئەوەیە، کەسێك کە نەخۆشیی درم دەگرێتەوە، بەبێ ویستی خوای پەروەردگار نیەو، ئەگەر خوا نەیەوێ، نایگرێتەوەو تووش نابێ.

## ١٩ و ٢٠ و ٢١ و ٢٢

## هاوسەنگیی لە خەرج کردن داو، ماڵ بەخشین لە فەرەحنایی و سەغڵەتییداو، قەناعەت کردن بەکەمێکی حەڵاڵ و، خۆ پارێزیی بەرانبەر سامانی حەرام

## (الإعتدال في الإنفاق، والإنفاق في السَّرّاء والضرّاء، والقناعة، والعِفة تجاه المال الحرام)

### ١٩- هاوسەنگیی لە خەرج کردندا (الإعتدال في الإنفاق):

(الرازي) لەبارەی چەمکی (إعتدال)ەوە دەڵێ:{تَعْدِيلُ الشَّيءِ: تَقويمِه، يُقال: عَدَّلَهُ تَعْدِيلاً فاعْتَدَلَ، أَي قَوَّمه فاسْتَقام}[1].

{والإعتدال: إفتعالٌ من العَدل}، واتە: (إعتدال) یانی: (تعدیل)ی شتێك كە ئەویش بەمانای ڕاست و ڕێك و هاوسەنگ كردنییەتی، دەگوترێ: (عَدَّلَهُ فاعْتَدَلَ) یانی: (قَوَّمه فاسْتَقام) دیارە (تَقْويم) بەمانای ڕاستكردنە، ئنجا (إعتدال)یش كە لەسەر كێشی (إفتعال)ە لە (عدل)ەوە هاتوە، كەواتە: (إعتدال) یانی: ڕێك كردن و هاوسەنگ كردن.

---

(١) مختار الصِّحاح، ص ٣٦٨.

ئنجا (الإعتدالُ في الإنْفاق) یانی: ڕەچاو کردنی حاڵەتی هاوسەنگیی لەخەرج کردندا، ئینسان نە تێپەڕێنێ، نە کورتی بێنێ و لەو شوێنەدا کە پێویستە ببەخشێ.

**ئنجا با دوو نموونەش لە ئایەتەکانی قورئان لەو بارەوە بێنینەوە:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الفرقان) ئایەتی (٦٧)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾ ﴾.

واتە: وە ئەوانەی کە ماڵ و سامانی خۆیان خەرج کرد، زێدەڕۆیی ناکەن، وە ڕژدیی و چرووکیی ناکەن، {یانی: لەنێوان زێدەڕۆیی و ڕژدیی و چرووکیدا خەتێکی نێوەڕاستیان گرتوە}.

**دووەم:** هەروەها لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٢٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا ﴿٢٩﴾ ﴾.

واتە: وەدەستت مەنووقێنە بە ملتەوەی بنووسێنی، وە زۆریش بڵاوی مەکە، {چونکە ئەگەر وابکەی} دەرەنجام لۆمە کراوی خەفەت بار دەبی.

یانی: لە حاڵێکدا کە دەستت بە ملتەوە دەنووسێنی و نابەخشی، لۆمەت دەکرێ، وە لە کاتێکدا هیچ بەدەست خۆتەوە ناهێڵی، تووشی خەفەت و پەشێمانیی دەبی، کەواتە: حاڵەتی هاوسەنگ ئەوەیە، کە مرۆڤ نەدەست بقووچێنێ، بەجۆرێك کە هیچی لێ نەیەتەدەر، وە نەیەکجاریش دەستی بڵاوبکاتەوەو هیچ بۆخۆی نەهێڵێ!

٢٠- بەخشین لە فەرەحنایی و سەغڵەتییدا (الإنفاق في السَّرّاء والضَّرّاء):

با سەرەتا مانای وشەی (إنفاق) شی بکەینەوە لە ڕوانگەی زمانزانانەوە:

{نَفَق الشَّيء: فَنِيَ ... والنَّفَقةُ مِنَ الإنفاق وَهوَ: الإخراج، والإنفاق: إخراجُ المالِ الطيِّب في الطَّاعاتِ والمُباحات}[1]، (نَفِقَ) واتە: ئەو شتە نەما، وە (نَفَقة) لە (إنفاق)ەوە هاتوە واتە: (إخراج)، ئەویش ئەوەیە کە تۆ ماڵ و سامانت دەربێنی، بریتیە لەدەرهێنان و خەرجکردنی ماڵێکی حەڵاڵ لە فەرمانبەریی خوادا، وە لەشتێکدا کە ڕەوایە تێیدا خەرج بکرێ.

خوای بەخشەر دەربارەی ئەوانە کە ماڵی خۆیان لە کاتی فەرحانیی و تەنگانەدا دەبەخشن، لە کاتێکدا کە تەنگ دەستن، وە لە کاتێکدا کە هەبوون، دەفەرموێ:

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ .. ١٣٤﴾ آل عمران.

واتە: خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە، وە بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بەقەدەر ئاسمانەکان و زەوییە، بۆ پارێزکاران ئامادە کراوە، ئەوانەی کە لە کاتی هات و نەهاتدا، یان لەکاتی هەبوون و نەبووندا، یان لەکاتی فەرحانی و تەنگانەدا، دەبەخشن.

---

(١) لسان العرب، ج٨، ص ٤٥٠٨، ومقاييس اللغة، ج٥ ص ٤٥٤.

## ٢١- قەناعەت كردن بە كەمێكی حەلاڵ (القناعة):

**سەرەتا با بزانین پسپۆڕانی زمان چۆن پێناسەی (قَناعة)یان كردوە؟!:**

أ- (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: {القَناعة: قَنِع يَقنعُ قَناعةً وقنعاناً: إذا رَضِيَ... القَناعة: الرِّضا بالقِسم، أو الإجتزاءِ باليَسيرِ مِنَ الأَعراضِ المُحتاج إليها}[1]، واتە: (قَناعة) بەحاڵەتی ڕازیبوونی ئینسان دەگوترێ، هەروەها (قَناعة) بریتیە لە ڕازیی بوون بەبەشی خۆت، وە وازهێنان بە كەمێك لەو شتانەی كە پێویستیت پێیانەو چاوت لە زۆری نەبێ.

ب- ئاواش پێناسە كراوە: {القَناعَة: الإقتصارُ عَلى ما سَنحَ مِنَ العَيْش، والرِّضا: بِما تَسَهَّل مِنَ المَعاش}[2]، واتە: قەناعەت بریتیە لە ئیكتیفا كردن بەوەی كە ژیان بواری پێدەدا، وە ڕازیی بوون بەوە كە لە ژیان و گوزەراندا بۆت دەگونجێ.

ج- (**الكَفَوي**)یش دەڵێ:{القَناعة: الإقتصارُ عَلى الكَفاف}[3]، واتە: قەناعەت بریتیە لەوە كە مرۆڤ بە شتێك كە بەشی دەكا بەوەندە واز بێنێ و چاوی لە زیاد نەبێ.

**ئەمەش دوو نموونە لە دەقەكانی شەریعەت لەبارەی (قَناعة)ەوە:**

یەكەم: وشەی (قانع) لە قورئاندا هاتوە لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٣٦)دا خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿...وَأَطْعِمُواْ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ..﴿٣٦﴾﴾.

واتە: خواردن بدەن بە (قانع) و بە كەسێكیش كە (مُعْتَرّ)ە، (ٱلْقَانِعَ) ئەو كەسەیە چاو لە دەستی خەڵك ناكاو بەبەشی خۆی ڕازییە، بەڵام (المُعتر) كەسێكە دەست لەبەر خەڵك پان دەكاتەوەو چاوەڕوانیی لێیان هەیە.

---

(١) المفردات، ص ٢١٤و ٤١١.

(٢) تهذيب الأخلاق، ص ٢٢.

(٣) التوقيف، على مهمات التعريف، ص ٢٧٥.

هەندێکیش گوتوویانە: (قانع) سواڵکەرەو (مُعْتر) داوا ناکات، بەڵام چاوەڕوانیی لێت هەیە کە هاوکاریی بکەی[1].

**دووەم:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ، وَرُزِقَ كَفَافًا، وَقَنَّعَهُ اللَّهُ بِمَا آتَاهُ} أخرجه أحمد برقم (٦٥٧٢)، ومسلم برقم (١٠٥٤)، والترمذي برقم (٢٣٤٨)، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه برقم (٤١٣٨).

بێگومان سەرفراز کەسێکە کە مسوڵمانە، وە ڕزق و ڕۆزییەکی دراوەتێ کە بەشی دەکا، نە کەمە نەزیادە، وە خواش قەناعەتی پێداوە لەسەر ئەوەی کە پێیبەخشیوە.

پەندێکی عەرەبییش هەیە دەڵێ: {القَناعة: كَنز لا يَفنى} واتە: ڕازیی بوون بەبەشی خۆت، خەزێنەیەکە قەت تەواو نابێ.

**سێیەم:** هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە:

{طُوبَى لِمَنْ هُدِيَ إِلَى الْإِسْلَامِ، وَكَانَ عَيْشُهُ كَفَافًا وَقَنَعَ }، أخرجه ابن المبارك في الزهد برقم (٥٥٢)، والترمذي برقم (٢٣٤٩) وقال: حسن صحيح، والطبراني برقم (٧٨٦)، والحاكم برقم (٩٨) وقال: صحيح على شرط مسلم، وابن حبان برقم (٧٠٥)، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (٢٣٩٨٩)، قال الألباني: صحيح، وقال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح.

واتە: خۆشیی بۆ ئەو کەسەی کە ڕێنمایی کراوە بۆ ئیسلام {واتە: مسوڵمانە}، وە ژیانەکەشی ڕێك و پێکە، ئەوەیە کە بەشی بکا لەبەری نەبڕێ، وە لێی زیاد نەبێ، وە ڕازییش بووە بەو بەشەی خۆی.

---

(١) بڕوانە: صفوة البيان لمعاني القرآن، ص ٤٢٩، للشيخ: حسين محمد مخلوف.

## ٢٢- خۆپاریزیی بەرامبەر سامانی حەرامدا (العِفّة تِجاه المَال الحَرام):

**سەرەتا با سەرنجی قسەی زانایان بدەین چۆن پێناسەی (عِفَّة)یان كردووە؟!:**

أ- (**إبن فارس**) دەڵێ: {العِفّة: مَصدَر قَولِهم: عَفَّ عنِ الشَّيءِ يَعِفُّ عِفَّةً، مِن مادّة: (ع ف ف) الّتي تَدُل عَلى الكَفِّ عَنِ القَبيح، يُقال: عَفَّ عَنِ الحَرامِ يَعِفُّ عَفّاً وعِفةً وَعَفافاً وَعفافةً: كفَّ}[1]، واتە: (عِفّة) لە ڕیشەدا چاوگی: (عَفَّ عَن الشيَّء يَعِفُّ عِفَّةً)ە، كە لە ماددەی (ع ف ف)ەوە هاتوە، ئەویش دەلالەت لەوە دەكا دەست لە شتێكی خراپ بگێڕیەوەو، خۆتی لێ بپارێزی، دەگوترێ: (عفَّ عَنِ الحَرام)، خۆی لە حەڕام پاراست، بە (يَعِفُّ عَفّاً عِفَّةً وَعِفافاً وَعَفافَةً) بەمانە هەموویان هاتوە، واتە: دەست گرتنەوە.

ب- (**راغب الأصفهانـي**)یش دەڵێ: {أَصْل العِفّة: الِاقتصارُ عَلى تَناولِ الشَّيء القَليل الجاري مَجرى العَفافَة، والعِفَّة، أَي: البَقية مِنَ الشَّيء، أَو مَجرى العَفعَف، وَهوَ ثَمر الأَراك، والاِسْتِعفاف: طَلَب العِفَّة}[2] واتە: وشەی (العِفّة) لە ڕیشەدا ئەوەیە كە ئینسان بە كەمێ لە شت وازبێنێ، ئەو كەمە بریتیە لە (العَفافة) وەك كەمێك لە شتێك دەمێنێتەوە، یاخود (عَفاف) بریتیە لە درەختی ئەڕاك، (الإستِعفاف)یش بریتیە لە هەوڵ دان بۆ وەدەستهێنانی عیففەت.

ج- (**إبن منظور**)یش دەڵێ:{العِفّة: الكَفُّ عَمّا لا يَحِلّ ويَجْمُلُ، والعِفّة النَّزاهة}[3]، واتە: (عِفّة) بریتیە لە دەستگێڕانەوە لە شتێك كە حەڵاڵ نیەو جوان نیە بۆ ئینسان، وە (عِفّة) واتە: پاكیی و خۆ لەسەر پاكیی ڕاهێنان.

د- (**راغب الأصفهانـي**) لە شوێنێكی دیكەدا دەڵێ: {العِفّة: حُصول حالَةٍ للنَّفس

---

(١) مقاييس اللغة، ج٤ ص٣.

(٢) المفردات، ص ٣٣٩.

(٣) لسان العرب، ج٤ ص ٣٠١٥.

تَمتَنِع بِها عَن غَلَبةِ الشَّهوةِ، والمُتَعَفِّف هوَ المُتعاطي لِذلك بِضَربٍ مِنَ المُمارَسَةِ والقَهْر}[1]،
(عِفَّة) حاڵەتێکە بۆ ئینسان دروست دەبێ، کە خۆی پێ بپارێزێ لەوە کە ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بێ، (مُتَعَفِّف)یش کەسێکە بە جۆرێك لە فشار لەخۆ کردن ئەو حاڵەتەی بۆ دێتە دی.

**ئەمەش دوو نموونە لە دەقەکانی قورئان و سوننەت، لەو بارەوە:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار وشەی (تَعفُّف)ی بەکارهێناوە، لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٧٣)دا دەفەرموێ:

﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ..﴿٢٧٣﴾ ﴾.

واتە: (ماڵ و سامان) ببەخشن بەو کەسانەی کە لەڕێی خوادا حەپس کراون {واتە: بەهۆی جەنگ و جیهادەوە، دەرفەتی گەڕان و سووڕان بەدوای کارو کەسابەتیاندا، نیە}، ئەوانەی کە ناتوانن بە زەویدا بڕۆن، کەسێك کە نایانناسێ، بە دەوڵەمەندیان تێ دەگا، بەهۆی خۆ بەپاك ڕاگرتنەوە، {بەهۆی نەفس بەرزییەوە}، بەڵام تۆ بەنیشانەیان دەیانناسی، {واتە: ئەگەر لێیان ورد بیەوە، ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری خوایە کە زۆر سەرناس بووە}، بەڵام کەسێ کە پێیان شارەزا نەبێ، ئەوەندە نەفس بەرزو خۆ پاك ڕاگرن و چاویان لەدەستی خەڵك نیە، بە دەوڵەمەندیان لێ حاڵییە، وە بەزۆر داواکردنەوە داوا لە خەڵك ناکەن، {وەك هەندێ کەس}.

**دووەم:** پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی خۆ لەماڵ و سامانی حەڕام پاراستن، دەفەرموێ:

{أَرْبَعٌ إِذَا كُنَّ فِيكَ، فَلَا عَلَيْكَ مَا فَاتَكَ مِنْ الدُّنْيَا: حِفْظُ أَمَانَةٍ، وَصِدْقُ حَدِيثٍ،

---

(١) الذريعة إلى مكارم الشريعة، ص ٣١٥.

وَحُسْنُ خَلِيقَةٍ، وَعِفَّةٌ فِي مَطْعَمٍ} أخرجه أحمد برقم (٦٦٥٢)، والطبراني برقم (١٤١)، وحسن إسنادهما المنذري (٣٤٥/٢)، والهيثمي (١٠/٤،١٤٥/ ٢٩٥)، وأخرجه الخرائطي في مكارم الأخلاق برقم (١٦٥)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٢٥٨)، وقال: هذا الإسناد أتم وأصح، وأخرجه أيضًا: الحكيم الترمذي (ص٢٣٠)، وابن أبي الدنيا في مكارم الأخلاق برقم (٢٧١)، والديلمي برقم (١٥٠٥)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لانقطاعه، قال الألباني: و هذا سند حسن، بل صحيح، فإن ابن لهيعة و إن كان ضعيفاً، فإنه من رواية عبد الله بن وهب عنه، وهي صحيحة.

واتە: چوار سیفەت ئەگەر لەتۆدا هەبوون، ئەگەر لە دنیادا هیچی دیکەت نەبێ، ئەو چوار سیفەتەت بەسن {هێندە گرنگن}، چوار سیفەتەکەش:

**سیفەتی یەکەم:** ئەگەر ئەمانەتێکت پێ سپێردرا، بیپارێزی.

**سیفەتی دووەم:** وە کە قسەت کرد، ڕاست بێژبی.

**سیفەتی سێیەم:** وە ڕەوشتت بەرزو جوان بێ.

**سیفەتی چوارەم:** وە لە خواردن و خواردنەوەدا بەرچاو تێر (عَفیف) بی، چاوت لە حەڕام نەبێ.

## ■ ٢٣ و ٢٤ و ٢٥ ■

## گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی و، هاوکاریی کردنی نزیکان و، چاکە کردن لەگەڵ باب و دایکدا
## (صِلة الرَّحِم، وإيتاءُ ذي القُربى، والإحسان إلى الوالِدَين)

لێرەدا سێ بازنەی تەسکی پەیوەندییەکان باسکراون، کە بریتین لە: خزمان و نزیکان و باب و دایك.

### ٢٣- گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی (صِلة الرَّحِم):

**لە پێشدا با بزانین زانایان چۆن پێناسەی (صلة الرَّحم)یان کردووە؟!:**

أ- (**إبن فارس**) دەڵێ: {الصِّلةُ والوَصْل: مَصدَر وَصَلَ يَصِلُ صِلَةً وَوَصلاً، وَتَدُلُّ مادّة (و ص ل) عَلَى ضَمٍّ شَيءٍ إلى شَيءٍ حَتّى يَعلَقُه}[1]، واتە: (صِّلة، وَصل) چاوگی (وَصَلَ يَصِلُ صِلَةً وَوَصلاً)ە، کە لە ماددەی: (و ص ل)ەوە، هاتووە، ئەوە دەگەیەنێ کە شتێك بە شتێکەوە بلکێنرێ، تاکو پێیەوە پەیوەست دەبێ.

هەروەها سەبارەت بە وشەی (الرَّحِم) (**إبن فارس**) دەڵێ: {والرَّحِم إِسمٌ مُشتَقٌّ مِن مادَّة (ر ح م) الَّتي تَدُلُّ عَلى الحِلم والعَطِف وَالرَّأفَة، والرَّحِمُ والرِّحْمُ: عِلاقَةُ القَرابة،

---

(١) مقاييس اللغة، ج٦، ص ١١٥.

والرَّحمة والرُّحمُ: الرِّقَّة والتَّعطُّف}[1]، واته: (الرَّحِم) له ماددەی (ر ح م) پێکهاتوه، که نەرمیی و سۆزو بەزەیی دەگەیەنێ، وه (رَحِم ورِحْم) بریتیه له پەیوەندیی خزمایەتیی، وه (رحمة ورُحْم) مانای سۆزو نەرم و نیانیی دەگەیەنێ.

ب- (النووي) سەبارەت به گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی (صِلة الرحم) دەڵێ: {صِلة الرحم: هي الإحسان إلى الأَقارب عَلى حَسَب حالِ الواصِل والمَوْصولِ، فَتارةً تَكونُ بِالمالِ وَتارَةً بِالخِدمة وَتارَةً بِالزِّيارةِ وَالسَّلام وَغَير ذلِك}[2]، واته: پەیوەندیی خزمایەتیی گەیاندن، بریتیه له چاکەکردن لەگەڵ خزماندا، بەپێی حاڵی ئەو کەسەی که چاکە دەکاو، ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵدا دەکرێ، جاری وایه بەماڵ و سامان دەبێ، وه جاری وایه به خزمەت دەبێ، {وەك باب و دایك، که نەخۆش دەبن، یان بەتەمەن دەبن}، جاری وا هەیه به سەردان و به سەلام لێکردن و هاموشۆ دەبێ، وه بەغەیری ئەوانەش دەبێ.

**خوای بەبەزەیی وه پێغەمبەرەکەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی فەرموویانه:**

یەکەم: خوا له سووڕەتی (النِّساء) ئایەتی (١)دا، دەفەرموێ:

﴿ ..وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾.

واته: وه پارێز لەو خوایه بکەن که داوای شتی پێ لەیەکدی دەکەن، وه پارێز له پەیوەندییەکانی خزمایەتیی بکەن، بێگومان خوا بەسەرتانەوه چاودێره، {واته: پارێز له پەیوەندییەکانی خزمایەتیی بکەن، که بیانپچڕێنن}.

دووەم: هەروەها خوای بەرز له سووڕەتی (الرعد) ئایەتەکانی: (١٩ تا ٢١) دا، دەفەرموێ:

﴿ ... إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ.. ﴿٢١﴾ ﴾.

---

(١) مقاييس اللغة، ج٢، ص ١٩٨.

(٢) صحيح مسلم بشرح النووي، ج ١٦ ص ١١٣.

واتە: تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن، {یان بەهرە وەردەگرن لە ئامۆژگارییی}، ئەوانەی كە پەیمانی خوا بەجێدێنن، وە پەیمانی پتەو ناشكێنن، وە ئەوانەی كە ئەوەی خوا فەرمانی پێ كردوە، بگەیەنرێ، دەیگەیەنن، {كە مەبەست پێی گەیاندنی خزمایەتیی و نزیكایەتییە}.

**سێیەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{الرَّحِمُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَقُولُ: مَنْ وَصَلَنِي وَصَلَهُ اللَّهُ، وَمَنْ قَطَعَنِي قَطَعَهُ اللَّهُ}، أخرجه مسلم برقم (٢٥٥٥)، وأخرجه أيضًا: ابن أبي شيبة برقم (٢٥٣٨٨)، وأبو يعلى برقم (٤٤٤٦)، والديلمي برقم (٣٣٢٢).

واتە: خزمایەتیی (رَحِم) بە عەرش و بارەگای خواوە هەڵواسراوە، دەڵێ: هەركەسێ منی گەیاند، خوا بیگەیەنێ، {واتە: بیگەیەنێ بە ڕەحمی خۆی}، وە هەركەسێ منی پچڕاند، خوا بیپچڕێنێ، {واتە: لە ڕەحم و بەزەیی خۆی بیپچڕێنێ}.

**چوارەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ}، أخرجه البخاري برقم (١٩٦١)، ومسلم برقم (٢٥٥٧)، وأبو داود برقم (١٦٩٣).

واتە: هەركەسێك دەیەوێ ڕزق و ڕۆزی فراوان بێ، وە تەمەنی درێژ بێ، با پەیوەندیی خزمایەتیی بگەیەنێ.

٢٤- هاوکاریی کردنی نزیکان (إيتاءُ ذي القُربى):

زانایان ئاوا باسی {إيتا ءِ ذي القُربى} دەکەن:

(الرازي) دەڵێ: {إيتاءِ ذي القُربى، القَرابةُ والقُرْبى: القُربُ في الرَّحم، وَهوَ في الأَصل مَصدَر؟ تَقول: بَينَهُما قَرابَةٌ و قُرْبٌ و قُرْبَى و مَقْرَبَةٌ بَفَتحِ الرّاء وضَمِّها، وقُرْبَةٌ بِسكُون الرّاء، وَقُرُبَةٌ بِضَمِّ الرّاء}[1]، دەڵێ: (قَرابةُ وقُرْبى) بریتیە: لە نزیکیی لەخزمایەتییەوە، کە ئەوەش چاوگە، دەگوترێ: لەنێوانیاندا (قَرابَة) هەیە، یان (قُرْبٌ) هەیە، هەموویان بەیەك واتان.

ئەمەش سێ دەق، وەك نموونە لەبارەی: (إيتاءِ ذي القُربى)ەوە، لە قورئان و سوننەتدا:

یەکەم: خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی (٩٠)دا، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ .. ﴿٩٠﴾﴾.

واتە: بێگومان خوا فەرمان دەکا بە دادگەریی و چاکەکاریی و بەبەخشین بە نزیکان.

{ئەوانەی خاوەنی نزیکین لەگەڵ تۆ، کە دیارە زیاتر پێ مەبەست ئەوانەن کە خزمایەتییان هەیە، چ خزمایەتیی پشتێ، چ خزمایەتیی بەرێ}.

دووەم: خوا لە سووڕەتی (الروم) ئایەتی (٣٨)دا، دەفەرموێ:

﴿فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٣٨﴾﴾.

واتە: مافی خۆیان ببەخشە بە کەسێك کە خاوەنی خزمایەتییە، وە بەنەدار، وە بەڕێبوار، ئەوە باشترە بۆ کەسانێك کە ڕووو ڕەزامەندیی خوا داوا دەکەن، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن.

---

(١) مختار الصحاح، ص ٤٥٨.

سێیەم: هەروەها پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الْقَرَابَةِ اثْنَتَانِ: صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ} أخرجه ابن أبي شيبة برقم (١٠٥٤١)، وأحمد برقم (١٦٢٧٨)، والدارمي برقم (١٦٨١)، والترمذي برقم (٦٥٨)، وقال: حسن، والنسائي برقم (٢٥٨٢)، وابن ماجه برقم (١٨٤٤)، وابن خزيمة برقم (٢٣٨٥)، وابن حبان برقم (٣٣٤٤)، والطبراني برقم (٦٢٠٤)، والحاكم برقم (١٤٧٦)، والبيهقي برقم (٧٥٢٤)، وأخرجه أيضًا: ابن أبي عاصم في الآحاد والمثاني برقم (١١٣٦)، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

واتە: چاکە کردن و خێرکردن بە نەدار، تەنها خێرو چاکەیە، بەڵام بە کەسێك کە خزمایەتیی هەیە دوانە: هەم خێرو چاکەیەو، هەم گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتییشە، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (خێر بە خوێش، نەك بە دەروێش)، واتە: تاکو خزمێکی هەژار هەبێ، مەیدە بە کەسێکی دیکە، چونکە خزمەکە هەم چاوەڕوانیی لەتۆ هەیە، هەم تۆش ئەو دەناسی و لە نزیکەوە دەزانی، کە هەژارو نەدارە، بەڵام ئەوەی، کە سواڵ دەکاو دێتە بەردەرگات، نازانی داخۆ چ کارەیە؟!.

## ٢٥- چاکە کردن لەگەڵ باب و دایکدا (الإحسان إلى الوالِدَين):

سەرەتا پێناسەی (الإحسان) و (البرّ) لەلایەن شارەزایانی زمانەوە دەکەین:

أ- (إبن فارس) دەڵێ: {الإحسان ضِدُّه الإساءة}، {مِن مَعاني البِرِّ: الصِّدق والصِّلة والطّاعةُ وَحسْن الخُلق والإتِّساع في الإحسان}[١] واتە: (إحسان) یانی: چاکە کردن، دژی (إساءة)یە، یانی: خراپەکردن.

لە مانایەکانی (بِرّ): ڕاستیی و پەیوەندیی خزمایەتیی گەیاندن و فەرمانبەریی و ڕەوشت جوانیی و فراوانیی لە چاکەکارییدا.

شایانی باسیشە وشەی: (برُّ الوالدين) لە قورئاندا نەهاتووە، تەنیا لە سوننەتدا هاتوە، بەڵام (الإحسانُ إلى الوالِدين) لە قورئان و سوننەتیشدا هاتوە، هەردووکیشیان بەمانای: {چاکە کردن لەگەڵ باب و دایکدا} دێن.

ب- لەبارەی (برُّ الوالدين)ەوە (فيروز آبادي) دەڵێ: {هوَ الإحسانُ إلى الوالِدين، والتَّعَطُّف عَليهما والرِّفقُ بِهِما، والرِّعايةُ لأَحْوالِهما، وَعدَمِ الإساءَة إلَيْهِما، وإكرامِ صَديقِهِما مِن بَعدِهِما}[٢]، واتە: چاکە لەگەڵ دایك و بابدا بریتیە لەوەی لەگەڵیان بەسۆز بی، لەگەڵیان نەرم بی، ئاگاداری حاڵ و باڵیان بی، خراپەیان لەگەڵ نەکەی، وە لەدوای خۆشیان ڕێز لە هاوەڵەکانیان بگری.

با لەو بارەوە ئەم بەسەرهاتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بێنین: ڕۆژێکیان پیرەژنێك میوانی بوو، ئەویش زۆر ڕێزو حورمەتی لێگرت، پاش بەڕێکردنی، دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئەو پیرەژنە کێیە ئەوەندە ڕێزی لێ دەگری؟

فەرمووی: ئەو ئافرەتە لەڕۆژگاری خەدیجەدا (خوا لێی ڕازی بێ) هامووشۆی ماڵی ئێمەی دەکرد، فەرمووی:

---

(١) مقاييس اللغة، ج١ ص ٧٨.

(٢) بصائر ذوي التمييز، ج٢ ص ٢١١.

{وَإِنَّ حُسْنَ العَهْدِ مِنَ الإِيمان}، أخرجه الحاكم برقم (٤٠)، وقال: صحيح على شرط الشيخين، قال الألباني: صحيح.

واته: وه بەدڵنیایی وەفاداریی لە ئیمانەوەیە.

**ئێستاش با چەند دەقێکی قورئان و سوننەت لەو بارەوە بە نموونە بێنیەوە:**

**یەکەم:** لەو بارەوە خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (مريم) ئایەتەکانی: (١٢-١٤)دا دەفەرموێ:

﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾ وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ﴿١٣﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ﴿١٤﴾﴾.

واته: ئەی یەحیا! کتێب بەهێز بگرە، وە بە نەباڵغیی حیکمەتمان پێ دابوو، وە لەلایەنی ئێمەوە بە سۆزو بەزەیی بوو، وە خاوەنی نەفسێکی پاك بوو، وە پارێزکار بوو، وە لەگەڵ باب و دایکیدا چاك بوو، وە خۆ فەرز کەرو سەرپێچییکار نەبوو.

**دووەم:** وە خوای بێ هاوتا لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٣٦)دا، دەفەرموێ:

﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا .. ﴿٣٦﴾﴾.

واته: وە خوا بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ دامەنێن، وە لەگەڵ باب و دایکتاندا چاکە بکەن.

**سێیەم:** خوا لە سوورەتی (الأحقاف) ئایەتی (١٥)دا، دەفەرموێ:

﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ .. ﴿١٥﴾﴾.

واته: ئینسانمان ڕاسپارد کە چاکە لەگەڵ باب و دایکیدا بکا.

**چوارەم:** لەو بارەوە فەرموودە زۆرن، یەکێ لەوانە:

{قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (الصَّلَاةُ عَلَى مِيقَاتِهَا) قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ:

(ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ)، قُلْتُ ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)، فَسَكَتُّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَوْ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي}، أخرجه أحمد (٤٣١٣) قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) پرسی: چ کردەوەیەك لای خوای زاڵی پایەبەرز خۆشەویستترە؟ فەرمووی: {نوێژ لەکاتی خۆیدا} گوتم: دوای ئەوە؟ فەرمووی: {دوایی چاکە لەگەڵ دایك و بابدا}، گوتم: دوای ئەوە؟ فەرمووی: {جەنگ و تێکۆشان لەپێناوی خوادا}.

**پێنجەم:** هەروەها لەو بارەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{لا يَزِيدُ فِي العُمْرِ إلاّ البِر، وَلا يَرُدُّ القَدَرَ إلاّ الدُّعاء، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ الرِّزْقَ بِالذَّنْبِ يُصِيبهُ} أخرجه ابن ماجه برقم (٤٠٢٢)، قال البوصيري (١٨٧/٤): هذا إسناد حسن، والحكيم (٢٣٢/٣). وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (٢٢٤٦٦)، والطبراني برقم (١٤٤٢)، والحاكم برقم (١٨١٤) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٠٢٣٣)، قال الألباني: حسن دون (وإن الرجل).

واتە: هیچ شتێك تەمەن درێژ ناکا، مەگەر چاکەکاریی { بەتایبەت چاکە لەگەڵ باب و دایك، کە لە هەموو کەس لەپێشترن }، وە هیچ شتێك بەڵا ناگێڕێتەوە، مەگەر پاڕانەوە (دوعا و)، وە جاری وایە پیاوێك بێبەش دەبێ لە بژێوێك، بەهۆی گوناهێکەوە کە دەیکات.

■ ٢٦ و ٢٧ ■

## بانگەواز کردن بۆ چاکەو، فەرمان کردن بە پەسەندو، ڕێگریی کردن لە ناپەسند، (الدَّعوة إِلى الخَير، والأَمر بِالمَعروف، والنَّهي عَنِ المُنكر)

٢٦- بانگەواز کردن بۆ چاکە (الدعوة إلى الخير):

پێشتر باسی بانگەواز کردنمان کرد بۆ لای خوا (سبحانه و تعالى)، لەڕیزی ئەو ڕەوشتانەدا کە ئینسان دەبێ مامەڵەیان پێ لەگەڵ خۆی و خوادا پێ بکا، بەڵام ئەمەیان جیایە: (بانگەواز کردن بۆ چاکە).

**سەرەتا لەبەر ڕۆشنایی قسەی زانایاندا سەرنجی چەمك و واتای هەرکام لە وشەی: (الدَّعوة) و (الخير) دەدەین:**

أ- بە نسبەت وشەی (الدَّعوة)وە، **(إبن منظور)** دەڵێ: {الدَّعوَة تكون مَصدراً لِقولِهم دَعا فُلانٌ إلى كَذا دَعوةً، وَهوَ مِن مادّةِ (د ع و) الَّتي تَدُلُّ عَلى: إمالةِ الشَّيءِ إِلَيْك بِصَوْت وَكلام يَكون مِنك}[1]، واتە: بانگەواز بریتیە لەوە کە تۆ کەسێ بەلای خۆتدا ڕابکێشی، بەهۆی دەنگ و قسەیەك کە لەلای تۆوە دەبێ.

---

(١) لسان العرب، ج١٤، ص ٢٥٨.

ب- بۆ وشەی (الخَیر)یش (**الجوهري**) دەڵێ: {الخَیْرُ ضِدُّ الشَّرِّ، والإِختیار: الإِصْطِفاء، وكَذلك التَّخَیُّر}[1]، واتە: (خَیر) واتە: سوود، چاكە، پێچەوانەی زیانەو خراپە، وە (إِخْتیار) و (تَخَیرُ) هەردووكیان یانی: هەڵبژاردن، هەڵبژاردنی شتی باش.

ج- (**راغب الأصفهانـي**) دەڵێ:{المَقصُود بِالخَیر: كُل ما فیهِ نَفْعُ النَّاسِ وصَلاحُهُم، لأَنَّ الخَیر: ما یَرغَبُ فیهِ الكُل}[2]، واتە: مەبەست لە چاكە (الخَیر) ئەوەیە كە سوودی هەبێ بۆ خەڵك، وە بەرژەوەندیی وانی تێدا بێ، چونكە (خیر) هەر شتێكە كە هەموو كەس ئارەزوو مەندیەتی.

كەواتە: بانگەواز كردن بۆ چاكە، ئەوەیە كە تۆ یەكێ لە ڕەوشت و ئەدەبەكانت لەبواری مامەڵەو هەڵس و كەوتت لەگەڵ خەڵكدا، ئەوەبێ: خەڵك بانگ بكەی بۆ هەرشتێك كە سوودو كەڵكی ئەوانی تێدایە، ئاگاداریان بكەیەوەو هەوڵ بدەی قەناعەتیان پێ بێنی، هەڵبەتە گەورەترین خێرو چاكەش ئەوەیە، كە تۆ خەڵك لەخوا نزیك بخەیەوە، بەڵام چەمكی ﴿يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ﴾ كە لە ئایەتەكەدا هاتوە، فراوانترە لە خەڵك بانگ كردن بۆ لای خوا، چونكە جاری وا هەیە خەڵك بانگ دەكەی بۆ ڕەوشتێكی جوان، یان بۆ كەسابەتێكی حەڵاڵ، یان بۆ كارێكی خێر، یان بۆ نواندنی هەڵوێستێكی ڕاست.

**نموونەیەك لە قورئان لەو بارەوە:**

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ ..(١٠٤)﴾.

واتە: وە با لەنێو ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن، كە خەڵك بانگەواز دەكەن بۆ چاكە، {هەر شتێك كە سوودی خەڵكی تێدا هەیە} وە فەرمان بە شتی پەسەند دەكەن، وە ڕێگریی لە شتی ناپەسەند دەكەن.

---

(١) مختار الصحاح، ص ١٨٢.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٣٠٠.

٢٧- فەرمان بە پەسندو، ڕێگریی لە ناپەسند
(الأَمرُ بِالمَعروفِ والنَّهيُ عَنِ المُنكر):

سەرەتا با سەرنجی چەمك و واتای (معروف) و (منكر) بدەین، لەبەر ڕۆشنایی قسەی شارەزایانی زمانی عەرەبییدا:

أ- بەنسبەت وشەی (المَعروف)ەوە، (إبن منظور) دەڵێ: {المَعروف: كالعُرْفِ وَهوَ كُلُّ ما تَعْرِفُه النَّفس مِنَ الخَيْرِ وتَطمَئِنُّ إِلَيْه} واتە: (مَعروف) هەروەها (عرف) یش بریتیە لەوە کە نەفسی ئینسان (نەفسێکی چاك و پاك) پێی ئاشنایە، وە هۆگری دەبێ و پێی ئارام دەبێ.

ب- بەڵام بۆ وشەی (المُنكر) دەڵێ: {المُنكر: خِلافُ المَعروفِ، وَقَد تَكَرَّرَ في الحَديث الإِنْكارُ والمُنْكَرُ، وَهو ضِدُّ المَعروف، وَكُلُّ ما قَبَّحه الشَّرع وحَرَّمَهُ وَكَرَّهه، فَهو مُنْكَرٌ}[1]، واتە: (منكر) دژی (معروف)ە،وە لە فەرموودەدا وشەی (إِنْكار) و (مُنْكَر) هاتوە، وە هەر شتێك کە شەرع بە خراپی بزانێ و قەدەغەو ناپەسەندی بکا، ئەوە دیارە بە (مُنكر) لە قەڵەم دەدرێ.

ئنجا ئایا فەرمان کردن بە پەسند یانی چی؟ وە قەدەغە کردنی ناپەسند یانی چی؟!

شەرعزانان (فُقهاء) بە زۆر جۆر پێناسەی: { فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند }یان کردوە بۆ نموونە:

١- {الأَمرُ بِالمَعروف: هوَ الإِرشادُ إِلى المراشِد المُنَجِّية، والنَّهي عَنِ المُنكَر: زَجرٌ عَمّا لا يُلائِمُ الشَّريعة} واتە: فەرمان بە پەسند، ئەوەیە کە تۆ خەڵك ڕێنمایی بکەی، بۆ ئەو شتانەی کە سوودیان لێ دەبینن، وە ڕێگریی کردن لە ناپەسند، ئەوەیە کە تۆ تێیانەوە بخوڕی و، بیانسڵەمێنیەوە لە هەر شتێك کە پێچەوانەی شەریعەتە،

---

(١) لسان العرب، ج٥ ص ٢٣٢، ٢٣٣.

یاخود لەگەڵ شەریعەتدا ناگونجێ.

٢-{الأَمْرُ بِالمَعْروف: الدَّلالَةُ عَلى الخَيْر، والنَّهي عَنِ المُنكر: المَنعُ عَنِ الشَّرِّ}، واتە: فەرمان بە پەسند: ئەوەیە خەڵك بەرەو چاكە ڕێنمایی بكەی، وە ڕێگریی لەناپەسند: ئەوەیە كە تۆ خەڵك لە خراپە بگێڕیەوە.

٣- {الأَمْرُ بِالمَعروفِ: أَمرٌ بِما يوافِقُ الكِتاب والسُّنَّة، والنَّهيُ عَنِ المُنكَر: نهيٌ عَمَّا تَميلُ إِلَيْهِ الشَّهوة} واتە: فەرمان بە پەسند ئەوەیە كە تۆ فەرمان بە هەر شتێك بكەی كە قورئان و سوننەت فەرمانی پێ دەكەن، {كە تەنیا فەرمان بەشتی پەسندو چاك دەكەن}، وە ڕێگریی لە ناپەسند، ئەوەیە كە تۆ خەڵك قەدەغە بكەی لە شتێك كە ئارەزووی شەیتانیی بەلایدا دەچێ.

**ئەمەش چوار دەقی قورئان و سوننەت لەو بارەوە، وەك نموونە:**

**یەكەم:** خوای كاربەجێ لە لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٧١)دا، لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ .. ﴿٧١﴾ ﴾.

واتە: پیاوانی ئیماندارو ژنانی ئیماندار، هەندێكیان پشتیوان و دۆستی هەندێكیانن، فەرمان بە پەسند دەكەن ڕێگریی لە ناپەسند دەكەن.

**دووەم:** هەروەها - وەك پێشتریش هێنامان - لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٤)دا دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ .. ﴿١٠٤﴾ ﴾.

واتە: وە با كۆمەڵێك لە ئێوە هەبن: بانگەواز بۆ چاكە بكەن، وە فەرمان بەپەسند بكەن و، ڕێگریی لە ناپەسند بكەن...

سێیەم: هەر لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١١٠)دا، دەفەرموێ:

﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ..﴿١١٠﴾﴾.

واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ مرۆڤایەتیی پەیدا کراون، فەرمان بە هەرچی پەسندە دەکەن، وە ڕێگریی لە هەرچی ناپەسندە دەکەن.

**چوارەم:** فەرمایشتی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە زۆرن، بۆ وێنە:

{وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنْ الْمُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْهُ، ثُمَّ تَدْعُونَهُ، فَلَا يُسْتَجَابُ لَكُمْ}، أخرجه أحمد برقم (٢٣٣٤٩)، والترمذي برقم (٢١٦٩) وقال: حسن، وأخرجه أيضًا: البيهقي في شعب الإيمان برقم (٧٥٥٨)، والديلمي برقم (٧٠٥٩)، قال الشيخ الألباني: حسن.

واتە: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە: دەبێ فەرمان بە پەسند بکەن و، ڕێگریی لە ناپەسند بکەن، یاخود بە پێچەوانەوە: نزیکە خوا سزاتان بۆ بنێرێ، پاشان هەرچەندە لێی بپاڕێنەوە، وەڵامتان نەدرێتەوە.

## ■ ٢٨ و ٢٩ ■

# هاوكاریی كردن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی و، یەكدی ڕاسپاردن بە هەق و خۆڕاگریی (التَّعاونُ عَلى البرِّ والتَّقوى، والتَّواصي بِالحق، والتَّواصي بِالصَّبر)

## ٢٨- هاوكاریی كردن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی (التَّعاونُ عَلى البِرِ والتَّقوى):

زاناو شارەزایان ئاوا پێناسەی: {هاوكاریی كردن لە چاكەكاریی و پارێزكاریی} دەكەن:

أ- (إبن منظور) دەڵێ: {التَّعاون: مَصدَر تَعاوَنَ، وَهوَ مَأْخوذ مِن (العَون) الَّذي يُراد بِهِ المُظاهرة عَلى الشَّيء يُقال: فُلانٌ عَوني أَي: مُعيني، وقَد أعَنتهُ، والعَوْنُ أَيضاً الظَّهير عَلى الأَمرِ، الواحِدُ والإثنانُ والجَمعُ والمُذَكَّرُ والمُؤَنَّثُ فيهِ سواء}[١]، واتە: وشەی (تعاون) چاوگە لە (تعاوَن)ەوە هاتوە، كە ئەویش لە (عَون) وەرگیراوەو مەبەست پێی پشتگیریی یەكدی كردنە بۆ شتێك، دەگوترێ: فلان كەس (عَوْن)ی منە، یان (مُعین)ی منە، واتە: هاوكاری منە، وە وشەی (عَون) بە مانای پشتگیریی دێ، لەسەر كارێك، كە یەك و، دوان و، كۆو، نێرینەو، مێیینە، تێیدا یەكسانن.

---

(١) لسان العرب، ج٥ ص ٣١٧٩.

ب- (**إبن الأثير**) دەڵێ: {البِرُّ: مَصدر بَرَّ يَبُرُّ، مِن مادّة: (ب ر ر) تَدُلُّ عَلى مَعانٍ عَديدة، مِنها: الصِّدق وَالبِرُّ: والخَير وَالصَّلاح}[1]، واتە: وشەی (برّ) چاوگە لە وشەی (بَرَّ يَبُرُّ)ەوە هاتوە، لە ماددەی (ب ر ر) پێك هاتوەو، چەند مانایەك دەگەیەنێ، لەوانە: ڕاستگۆیی، چاکەکاریی، وە چاکە، چاکسازیی.

ج- دەربارەی وشەی: (التقوى)، (**إبن فارس**) دەڵێ: {التَّقوى: هيَ الإسم مِن قَولِهِم: اتَّقى، والمَصدر: الإتِّقاء وكِلاهُما مِن مادَّة: (و ق ي) كَلِمةٌ واحِدة، تَدلُّ عَلى دَفْعِ شَيءٍ عَن شَيءٍ بِغَيره}[2]، واتە: (تقوى) ناوە، لەو قسەیەیان: (اتَّقى)، وە (اتَّقى) وە (تَقوى) هەردووکیان لە ماددەی (و ق ي)ەوە هاتوون و، ئەوە دەگەیەنێ: شتێك بە شتێك پاڵ پێوە بنرێ و لێی دوور بخرێتەوە.

د- (**راغب الأصفهاني**)ش دەڵێ: {وَصارَ التَّقوى في تَعارف الشَّرع: حِفظُ النَّفسِ عَمّا يُؤثِمُ}[3]، واتە: لە زاراوەی شەرعدا تەقوا واتە: خۆپاراستن لە هەر گوناهبارکارێك. هەروەها لەبارەی پێناسەی (برّ)ەوە گوتوویانە: {البِرُّ: ما يَنفَع النَّاس، والتَّقوى: ما يَقي غَضَبَ الله}، واتە: (بِرّ) هەر شتێکە کە سوودی بۆ خەڵك هەبێ، (تَقوى)ش ئەوەیە کە تووڕەیی خوات لێ دووربخاتەوە.

ئنجا با دوو نموونەش لە دەقەکانی شەریعەت لەبارەی (تَقوى)ەوە بێنینەوە:

یەکەم: خوای زاڵی زانا دەربارەی ئەوە کە دەبێ مسوڵمانان، وە ئەندامانی کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی بەیەکەوە هاوکاربن، لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی، دەفەرموێ:

﴿..وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ..﴿٢﴾﴾ المائدة.

واتە: وە هاوکاریی یەکدی بکەن، لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی، وە هاوکاریی، یەکدی مەکەن لەسەر گوناهو دەستدرێژیی.

---

(١) النهاية في غريب الحديث والأثر، ج١ ص ١١٦.

(٢) مقاييس اللغة، ج٦ ص ١٣.

(٣) المفردات، ص ٣٥٠.

**دووەم:** پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە دەفەرموێ:

{الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ، وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ، يَكُفُّ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ، وَيَحُوطُهُ مِنْ وَرَائِهِ} أخرجه أبو داود برقم (٤٩١٨)، والبيهقي برقم (١٦٤٥٨)، وأخرجه أيضًا: البخاري في الأدب المفرد برقم (٢٣٩)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٧٦٤٥)، والديلمي برقم (٦٥٧١)، قال الألباني: حسن.

واتە: بڕوادار ئاوێنەی بڕوادارە، وە بڕوادار برای بڕوادارە، شتێك خەریك بێ لەدەستی بچێ، بۆی دەگێڕێتەوە، {واتە: ناهێڵێ تووشی زیان ببێ}، وە لەپشتیەوە ئاگای لێیەتی و دەیپارێزێ.

## ٢٩- یەكدی ڕاسپاردن بە حەق و خۆڕاگریی (التَّواصي بِالحَقِّ والتَّواصي بِالصَّبر):

زانایان بەم جۆرە چەمكی وشەی: (تَواصی)یان شیكردۆتەوە: بۆ نموونە (الرازي) دەڵێ: {أوْصَى لَهُ بِشيءٍ، وَأوْصى إِلَيهِ: جَعَلَهُ وَصِيَّهُ، والإسمُ الوَصَايَة بِفَتحِ الواوِ وَكَسرِها، وأوْصَاهُ ووَصَّاهُ تَوْصِيَةً بِمَعنىً، والإسم الوَصَاة، وتَوَاصَى القَومُ أوصى بَعضُهُم بَعْضاً}[1]، واتە: وشەی (أوْصىَ لَهُ بِشيَءٍ وَأوصى إِلَيْهِ) واتە: كردی بە وەصیەتی خۆی، یاخود ئامۆژگاریی كردو ڕایسپارد، وە ناوێك كە لەوە وەردەگیرێ بریتیە لە: (وَصَايَة، وِصاية)، وە (أوْصَاهُ ووَصَّاهُ تَوْصِيَةً) هەمووی بەیەك واتایە، دەگوترێ: (تَوَاصَى القَوم: أَوْصى بَعضُهُم بَعْضاً) واتە: هەندێكیان، هەندێكیان ڕاسپاردو ئامۆژگاریی یەكدییان كرد.

خوای پەروەردگاریش سوورەتێكی لەوبارەوە ناردوە، بەناوی (العصر)، دەفەرموێ:

﴿وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ۝٣﴾.

واتە: ﴿سوێند بە عەصر ۝١ مرۆڤ لە زیانباریی دایە ۝٢ جگە لەوانەی كە بڕوا دێنن وە كردەوە باشەكان ئەنجام دەدەن، وە یەكدی ڕادەسپێرن بە هەق، وە یەكدی ڕادەسپێرن بە خۆڕاگریی ۝٣﴾.

---

(١) مختار الصِّحاح، ص ٦٢٢.

## ■ ٣٠ و ٣١ و ٣٢ ■

## دڵپاکیی لەگەڵ بڕواداراندا، دڵخۆشبوون
## بە دابین کردنی بەرژەوەندییان و، بەسەرخۆدا هەڵبژاردنیان
## (نَقاءُ القَلبِ مَعَ المُؤمِنين، والسُّرورُ بِتَحقيقِ مَصالِحِهم، والإِيثارِ مَعَهُم).

٣٠- دڵپاکیی لەگەڵ بڕواداراندا (نَقاءُ القلب مع المؤمنين):

(الرازي) کە زانایەکی پسپۆڕی بواری زمانی عەرەبییە، لەبارەی چەمکی وشەی (نَقَاء)ەوە، دەڵێ: {نَقِيَ الشَّيءُ نَقاوَةً، فَهو نَقِيٌّ، أي: نَظيفٌ، والنَّقَاءُ: النَّظافَةِ والتَّنْقِية: التَّنظيف}[1]، واتە: دەگوترێ: (نَقِيَ الشَيءُ نَقاوَةً) واتە: ئەو شتە بەباشی خاوێن بۆوە، (والنَّقَاءُ: النَّظافة)، (نَقَاء) واتە: پاکیی یان خاوێنی، (التَّنْقِية: التَّنظيف) واتە: (تَنقية) پاك کردنەوە یان خاوێن کردنەوە.

ئەمەش دوو نموونەی ئایەتەکانی قورئان لەو بارەوە:

یەکەم: خوای پاك و تاك لە سوورەتی (الشعراء) ئایەتەکانی: (٨٨-٨٩)دا، دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾.

---

(١) مختار الصحاح، ص ٦٢٢.

واتە: ئەو ڕۆژەی كە نەسامان و نە كوڕان سوود ناگەیەنن، {واتە: سوود بەخاوەنەكانیان ناگەیەنن}، مەگەر كەسێك بە دڵێكی ساغەوە هاتبێتەوە لای خوا.

ئنجا ئایا دڵی ساغ یانی چی؟ {أَصْلُ السَّلامِ والسَّلامَة: التَّعَرِّي مِن الآفاتِ الظَّاهرة والباطِنَة، بِقلبٍ سَليم: أَي: مُتَعرٍّ عَن الدَّغَلِ، وَهو الدُّخول المُريب}[1]، واتە: وشەی (سلام، وسلامة): بریتیە لە پاكیی لە نەخۆشیی و دەردی ڕواڵەتیی و دەروونیی، (بقلبٍ سليم) واتە دڵێكی پاك بووەوە لە (دَغل)[2]، كە ئەمیش بریتیە لە هەرشتێكی نامۆ كە ڕەگەڵ شتێكی دیكە دەكەوێ.

**دووەم:** لە سووڕەتی (الحشر) ئایەتی (١٠)دا، خوای زاناو شارەزا لەسەر زمانی ئەوانەی كە لەدوای كۆچكەران و پشتیوانان دێن، چ لە هاوەڵان و چ لە پشتیوانان و باقی جیلەكانی ئۆممەت، دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾.

واتە: ئەوانەی كە لەدوایانەوە دێن {لەدوای كۆچكەران و پشتیوانان} دەپاڕێنەوە، دەڵێن: پەروەردگارمان! لە ئێمەو لەو برایانەمان خۆشبە كە بە ئیمان پێشمان كەوتوون، وە كینە مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بە ئیمانداران، { چ كۆچكەرو پشتیوانان، چ هەر ئیماندارێكی پێش ئەوان }، پەروەردگارمان! بێگومان تۆ زۆر میهرەبانی، وە زۆر بەبەزەیی.

هەڵبەتە مسوڵمانان دەبێ پێشێ لەگەڵ خوادا دڵی پاك بێ، شیرك و شوبهەو نیفاقی تێدا نەبێ، پاشان لەگەڵ مسوڵمانانیشدا دڵی پاك و چاك بێ، كە لێرەدا مەبەست لە دڵپاكیی لەگەڵ ئیمانداراندا ئەوەیە، كە كینەو غەرەزو بوغزو سەرجەم ئەو سیفەتە خراپانەیان لە دڵ و دەرووندا نەبێ بەرانبەر ئیمانداران، كە پێش بەرانبەرەكان، خۆیان لێیان زەرەرمەندن، وەك پێشینان دەڵێن: (سیفەتی

---

(١) عمدة الحفاظ في تفسير أشرف الألفاظ، ج٢ ص ٢١٥.

(٢) واتە: شتێكی نائاشنا بەو ماددەیە كە ڕەگەڵی دەكەوێ.

خراپ مارێكە لە باخەڵی خاوەنەكەیدا)، واتە: پێش هەر كەسێكی دیكە زیان بەخاوەنەكەی دەگەیەنێ، بابای حەسوود، بابای بەد گومان، كەسی بوغزاویی، پێش هەموو كەس لە سیفەتە خراپەكەی زەرەر مەندە، بۆیەش گوتراوە: { للَّهِ دَرُّ الحَسَد ما أَعْدَلَهُ ... بَدأَ بِصاحِبِهِ فَقَتَلَهُ} واتە: حەسوودی چەند دادگەرە .. بەخاوەنەكەی دەستی پێكردوەو كوشتوویەتی! بەڵێ، سیفەتی خراپ بەر لەوەی زیان بە بەرامبەرەكەی بگەیەنێ، زیان بە خاوەنەكەی دەگەیەنێ.

### ٣١- دڵخۆشبوون بە دابین كردنی بەرژەوەندیی بڕواداران (السُّرور بِتحقيق مَصالِحِ المُؤمنين):

یەكەم: خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (الحشر) ئایەتی (٩)دا، ئاماژەی بەوە كردوە لە مەدح و ستایشی ئیمانداران پشتیوانان (الأنصار)داو، دەفەرمووێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ ..(٩) ﴾.

واتە: وە ئەوانەی كە لەپێش كۆچكەراندا مەنزڵگای ئیمانیان داناوە {واتە: لە مەدینە}، حەز بەچارەی ئەوانە دەكەن، كە دێن بۆ لایان، وە لەسینەیاندا هەست بە سەغڵەتیی ناكەن، بەهۆی ئەوەوە كە پێیان دراوە. {بەڵكو پێی دڵخۆشن}.

واتە: ئەگەر لە جەنگدا بە شێوەیەك لە شێوەكان، هاوكاریی كۆچكەرەكان بكرێ، نەك هەر پێیان ناخۆش نیە، بەڵكو پێیان خۆشەو دڵخۆش و شادمان دەبن.

دووەم: پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەكدا دەفەرمووێ:

{لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ}، أخرجه ابن المبارك برقم (٦٧٧)، وأحمد برقم (١٣٩٠١)، والبخاري برقم (١٣)، ومسلم برقم (٤٥)، والترمذي برقم (٢٥١٥) وقال: صحيح، والنسائي برقم (٥٠١٦)، وابن ماجه برقم (٦٦)، والدارمي برقم (٢٧٤٠) .

واتە: یەكێ لە ئێوە ئیمان ناهێنێ، تاكو ئەوەی بۆخۆی پێی خۆشە، بۆ برای مسوڵمانیشی پێی خۆش نەبێ[1].

بەڵكو هەندێ لە زانایان گوتوویانە: (حتى يحب لأخيه) تەنها مەبەست پێی برای مسوڵمانی (أخيه المسلم) نیە، بەڵكو مەبەست پێی: برای مرۆڤی (أخيه الإنسان)یەتی.

كەواتە: تۆ دەبێ لەگەڵ هەموو مرۆڤەكاندا بە خۆشییان دڵخۆش بی و بەناخۆشییان دڵتەنگ بی، مادام شەڕ پێ فرۆش و سەنگەر لەدژگر نەبن و، كەسانێك نەبن دژایەتیی ئەهلی ئیسلام بكەن، دەبێ تۆ بەخۆشیی هەموو كەس دڵخۆش بی، وە بەناخۆشیی هەموو كەس دڵناخۆش بی، چ پیاو بێ، چ ئافرەت، چ مسوڵمان بێ، چ نامسوڵمان، بەڵام دیارە بە پلەی یەكەم بۆ ئەهلی ئیمان.



---

[1] دیارە وەك لەزۆر شوێنی دیكەشدا باسم كردوە، كە كوڕەكە كوڕی پیاوان بووە، ئەگەرنا مرۆڤی مسوڵمان چی بۆخۆی پێخۆشە، دەبێ بۆ خوشكی مسوڵمانیشی پێی خۆش بێ.

٣٢- بەسەر خۆدا هەڵبژاردنی بڕواداران (الإيثار مع أهل الإيمان):

ئێمە دوو وشەمان هەن لە زمانی عەرەبیدا:

١- (إِيثار) واتە: بەسەر خۆدا هەڵبژاردن، بەشی خۆت بدەی بە خەڵك.

٢- وە (أَثره) بەپێچەوانەوە: ئەوەیە بەشی خەڵکیش بۆخۆت بێنی.

ئنجا با سەرەتا لەبەر ڕۆشنایی قسەی پسپۆڕانی زمانی عەرەبیدا، سەرنجی چەمك و مەبەستی وشەی بەسەر خۆدا هەڵبژاردن (إیثار) بدەین، پاشان ئایەتێکی قورئانیش بە نموونە دێنینەوە:

أ- (إبن فارس) دەڵێ: {الإيثارُ مَصدر قَولِهم: آثَرهُ عَليه يُؤثِره إيثاراً بِمَعنى: فَضَّله وَقدَّمَه، وَهو مِن مادَّة: (أ ث ر) الَّتي تَدلُّ عَلى تَقديم الشَّيءِ، مِنهُ قَولِهم: (الأَثير) أَي: الكَريم عَلَيكَ الَّذي تُؤْثِرُهُ بِفَضلِك وَصِلَتِك}[1]، واتە: وشەی (الإِيثار) چاوگە لەو قسەیانەوە کە دەڵێن: (آثَرهُ عَلَيه يُؤْثِره إِيثاراً) واتە: هەڵی بژارد بە سەریدا، هەڵی دەبژێرێ، هەڵبژاردن، واتە: هەڵیبژاردو پێشی خست، ئەویش لە ماددەی (أ ث ر)ەوە، هاتوە کە پێشخستنی شتێك و هەڵبژاردنی شتێك دەگەیەنێ، کە دەگوترێ: (الأثير) واتە: لەلام لە پێشەو بەڕێزە، کەسێك کە تۆ هەڵدەبژێری بەسەر خۆتدا، وە پێشی دەخەی لەسەر خۆت و خەڵکی دیکە، بە هاوکاریی کردنت و بە چاکەت.

ب- (إبن الأثير) دەڵێ: {هوَ تَقديمُ الغَيرِ عَلى النَّفس فِي حُظوظِها الدُّنيوية، رَغبةً فِي الحُظوظِ الدِّينية}[2]، واتە: (إیثار) بریتیە لەوە کە جگە لە خۆت بەسەر خۆتدا هەڵبژێری، لە بەرژەوەندییە دنیاییەکاندا، بە مەبەست و ئارەزووی ئەوە کە تۆ لە بەرژەوەندییە دینییەکاندا پێش بکەوی، کە خوا پاداشتت بداتەوە.

---

(١) مقاييس اللغة، ج١ ص ٥٣.

(٢) النهاية في غريب الحديث والأثر، ج١ ص ٢٢١.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە ئینسان كاتێك كە ژیانی دنیای لەلا كەم بێ و، دوارۆژی لەلا گەورە بێ، ئنجا دەتوانێ ئەو سیفەتە بەرزە لەخۆیدا بێنێتە دی.

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحشر) ئایەتی (٩)دا، پێناسەو وەسفی پشتیوانان دەكا، بەو سیفەتە بەرزەو دەفەرموێ:

﴿... وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾.

واتە: (پشتیوانان) كۆچكەران بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن، هەرچەندە خۆشیان ئاتاج و نەدار بن، {بەڵام ئەوان بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن}،وە هەر كەسێك لەچرووكیی خۆی بپارێزێ، هەر ئەوانەن سەر فراز.

بەڕاستیی خەڵك بەسەر خۆدا هەڵبژاردن، لەكاتێكدا كە مرۆڤ خۆی پێویستیی بەو شتەیە، خەسڵەتێكی زۆر بەرزەو ئینسان بە ئاسانیی نایگاتێ.

تۆ شتێك زۆر پێویستیت پێی بێ و پەكت لەسەر ئەو شتە كەوتبێ، بەڵام یەكی دیكەش پەكی لەسەری كەوتبێ، ئەو بەسەر خۆتدا هەڵبژێری، ئەوە شتێكی گەورەیە.

دەگێڕنەوە لە سێ لە هاوەڵان، كە لە پەنایەك بریندار بوون و لە گیانەڵڵا دابوون، ئنجا كەسێك تۆزێك ئاوی پێبووە بەشی یەك كەس، بردوویەتی بۆ یەكەمیان، گوتوویەتی: بیدە بەوی دیكە، بۆ ئەوەی دیكەی بردوە، گوتوویەتی: بیدە بەو برایەی دیكەم، تاكو سەرەنجام هەرسێكیان گیانیان سپاردوەو هیچیان ئاوەكەیان نەخواردۆتەوە! ئەوە سیفەتەیكە لە لووتكەی سیفەتە بەرزەكاندایە، خوای پەروەردگار یارمەتیمان بدا بەرەو ئەو لووتكە بەرزانە بڕۆین و بەخواریێ ڕازیی نەبین.

## ■ ٣٣ و ٣٤ و ٣٥ ■

# لەبن باڵی خۆ گرتنی بڕواداران و، بەزەیی بەرانبەر نواندنیان و، كاروبار بەڕاوێژ بەڕێوە بردن (الذِّلَّة مَعَ المُؤمنين، والرَّحمةُ بِهم، وَإدارةُ الأُمورِ بِالشُّورى).

٣٣- لەبن باڵی خۆ گرتنی بڕواداران (الذلَّةُ على المؤمنين):

سەرەتا سەرنجی چەمك و واتای زمانەوانیی وشەی (الذلَّة) دەدەین:

(الرازي) دەڵێ:{الذُّلُّ: ضِدُّ العِزِّ، وَقَد ذَلّ يَذِلُّ بِالكَسر، ذُلاًّ و ذِلَّةً و مَذَلَّةً، فَهوَ ذَلِيلٌ، وَهُم أَذِلاَّءُ وأذِلَّةٌ، والذِّلُّ بِالكَسرِ: اللِّينُ، وهوَ ضِدُّ الصُّعوبة، يقال: دابَّة ذَلُولٌ بَيِّنَةُ الذِّلِّ، والجمع: ذُلُلٍ وأذِلَّهُ}[1]، واتە: وشەی (ذُل)مان هەیەو (ذِل)مان هەیە، ئنجا وشەی (ذُلّ) یانی گەردن كەچیی، پێچەوانەی (عِزّ)ە، بەدەماریی، (ذَلَّ) (يَذِلُّ) واتە: گەردنكەچ و نەرم و نیان بوو، (أَذِلاَّءُ وأذِلَّةٌ) هەردووكیان كۆن، واتە: زەلیلن.

بەڵام (ذِلّ) بە كەسر واتە: (اللِّين)و پێچەوانەی (الصُّعوبَة)یە، واتە: قورس و زەحمەت، دەگوترێ: (دابّةٌ ذَلُولٌ، بيِّنة الذِّلِّ) واتە: وڵاخێكی زۆر دەستەمۆیە، هەندێ وڵاخ هەیە زۆر بە زەحمەت باری لێ دەنرێ، زۆر بە زەحمەت قبووڵ

---

(١) مختار الصحاح، ص ٢٠٦.

دەكا باری بخرێتە سەر پشت، بەڵام هەیە پێچەوانەی ئەوەیەو پێی دەگوترێ: (ذَلُولٌ) ئنجا كۆی (ذَلُولٌ) بریتیە لە (ذُلُلٍ وَأذِلَّةُ)، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی مێشەنگین (نَحْل) دەفەرموێ:

﴿ .. فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً .. ﴿٦٩﴾ ﴾ النحل.

واتە: ئەی هەنگ! ئەو كارانەی پەروەردگارت بە حوكمی خوا ڕسك و غەریزە، فێری كردووی، ئەنجامیان بدە، بە ملكەچیی..

لە سووڕەتی (المائدة) ئایەتی (٥٤)دا، خوای زاناو شارەزا باسی ئەو سیفەتە دەكا، كە دەبێ ئینسانی مسوڵمان لەگەڵ ئیمانداراندا، میهرەبان و لەبن باڵی خۆگرو پەنادەر بێ، دەفەرموێ:

﴿ .. أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ... ﴿٥٤﴾ ﴾.

(أذَلَّةُ) كۆی (ذلیل)ە، وەك گوتم: پێچەوانەی (عزیز)ە، مسوڵمان لەگەڵ ئیمانداراندا دەبێ بە دەمار نەبێ و پتەوو ڕەق نەبێ، بەڵكو نەرم و نیان و هێدیی و مەند بێ.

## ٣٤- لەگەڵ ئیمانداراندا بە ڕەحم و سۆزو بەزەیی بوون (الرحمةُ بِالمُؤمنِين):

(الرازي) دەڵێ: {الرَّحمة: الرِّقَّة والتَّعطُّف}[1]. واتە: (الرَّحمة) بریتیە لە نەرمیی و، ناسكیی، وە سۆزو پەرۆش.

لە سووڕەتی (الفتح) ئایەتی (٢٩)دا، خوای پەروەردگار بەتایبەت باسی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دەكات، وە بەگشتی وەسفی هەموو ئەوانە دەكا كە لە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دان تاكو كۆتایی ژیانی دنیا، وەك لە هەندێ وتارو نووسینی خۆمدا گوتوومە، دەفەرموێ:

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ٢٩ ﴾.

واتە: موحەممەد ڕەوانە كراوی خوایە، وە ئەوانەی لەگەڵیدان، لەسەر كافراندا توندو تیژن و، لەنێو خۆیاندا بە ڕەحم و بەزەیین ...

ئنجا لەڕاستییدا (وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ) بەتایبەت تەنیا كۆچكەران و پشتیوانان ناگرێتەوە، وە بەگشتی تەنیا هاوەڵانی بەڕێز ناگرێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ، بەڵكو هەر كەسێ دەگرێتەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) دابێ، لەخزمەت بەرنامەو شەریعەتەكەی دابێ، لە خزمەت ڕەوشت و ئاكارو ڕەفتارەكەی دابێ، با فاصیلەی زۆری زەمەنییش كەوتبێتە بەین، وە

---

(١) مختار الصِّحاح، ص ٢٣٨.

با فاصیڵەی زۆری جوگرافییش كەوتبێتە بەین، مادام لە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دابێ، وەك ئەو ڕێبازو ڕەوشت و ئاكارە كە ئەو لەسەری بووە، كەواتە: هەر لە خزمەت پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دایەو ئایەتەكە دەیگرێتەوە.

بەڵام بە پێچەوانەوە: كەسێك با دراوسێی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووبێ و، با زۆریش لێی نزیك بووبێ، وەك جوولەكەو مونا فیقەكان و موشریكەكان، بەڵام چونكە ئیمانیان پێ نەهێناوە، هەرچەندە لێی نزیك بوون، لەڕووی كات و شوێنەوەو هاوچەرخی بوون، بەڵام ئەو ئایەتە نایانگرێتەوە، چونكە ئەوان وەك بەرنامەو ڕێباز لەگەڵی نەبوون، بەڵێ، (وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ) وێڕای هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ، هەر مسوڵمانێكی دیكەش دەگرێتەوە لەپیاوان و ئافرەتان، كە لە خزمەت بەرنامەو شەریعەت و ئاكارو ڕەوشتەكەی دان.

ئنجا ئەوانەی كە لە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دان (رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ ) لەنێو خۆیاندا بە ڕەحم و بەزەیین و بەپەرۆشن.

## ٣٥- کاروبار بەڕاوێژ بەڕێوە بردن (إِدارَةُ الأُمورِ بِالشُّورى):

**سەرەتا با چەمك و واتای وشەی (شوری) لەبەر تیشکی قسەو شیکردنەوەی پسپۆڕانی زماندا، ڕوون بکەینەوە:**

أ- **(إبن فارس)** دەڵێ: {الشُّورى والمُشاورة مِن مادّة: (ش و ر) الَّتي تَدل عَلى أَخذ شَيءٍ مِن شَيء، وَهو مُشتَقٌّ مِن شَوْرِ العَسل}[١]، واتە: (شُوری، وَمُشاوَرة) لە ماددەی (ش و ر) پێك هاتوە، کە وەرگرتنی شتێك لە شتێك دەگەیەنێ، ئەویش لە (شَور العَسل) وەرگیراوە، کە هەنگوین لە شانەکەی خۆی دەردێنی، هەندێکیش گوتوویانە: (شارَ النَّحْلُ العَسَل) هەنگەکە هەنگوینەکەی کۆکردەوە، یانی: شیلەی گوڵانی مژی و کۆی کردەوەو کردی بە هەنگوین.

ئنجا دەڵێ: {وَلِهذهِ المادّة مَعنى آخَر: إِبداءُ الشَّيء وَإظهارِهِ وعَرضُهُ، مِثل قَولِهِم: شُرتُ الدابَّة شَوراً، إِذا عَرَضْتها، والمَكان الَّذي يُعرض فيهِ الدَّواب هُو المِشوارْ}[٢]، واتە: مانایەکی دیکەی (شَور) بریتیە لە پێشاندان و دەرخستنی شتێك، وە ڕانواندنی، وەك ئەوەی کە دەڵێن: (شُرْتُ الدابَّة شَوراً) واتە: وڵاخەکەم ڕانواندو دەرم خست، بزانم داخۆ چ وڵاخێکە؟ وە ئەو شوێنەی کە وڵاخیان تێدا ڕانواندوەو عەرز کردوە بۆ ئەوەی کڕیارەکان بیبینن، پێی گوتراوە (مِشوار).

ب- **(راغب الأصفهاني)**یش مانای زاراوەیی (شوری) دەردەخات و دەڵێ: {الشُّورى: إِستِنباطُ المَرءِ الرَّأي مِن غَيرِهِ فيما يَعْرِضُ لهُ مِن مُشكِلاتِ الأُمورِ، وَيَكون ذلِك فِي الأُمورِ الجُزئيَّةِ الَّتي يَتَرَدَّد المَرءُ فيها بَيْنَ فِعلِها وتَركِها}[٣]، واتە: (شوری) - ڕاوێژ- بریتیە لەوە کە ئینسان بۆچوونێك هەڵهێنجێ، ڕاو بۆچوونێك لە غەیری خۆی وەربگرێ، دەربارەی ئەو گرفتانەی کە دێنە پێشی، وە ئەویش لەو کارو بارە جوزئییانەدا دەبێ، کە ئینسان لەنێوان کردن و نەکردنیاندا دڵنیا نیە، بیانکات،

---

(١) مقاييس اللغة، ج٣ ص ٢٢٦.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣) الذريعة إلى مكارم الشريعه، ص ٢٩٤.

یان نەیانکات؟ ڕاوێژ کردن لەو شتانە دەبێ.

**ئنجا با دوو ئایەتی قورئانیش لەو بارەوە وەك نموونە بێنینەوە:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لەو بارەوە کە ڕاوێژ کردن سیفەتێکی بنچینەیی ئینسانی ئیمانداروکۆمەڵی ئیمانداره، له سوورەتی (الشورى) ئایەتی (٣٨)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨ ﴾.

واته: وه ئەوانەی بەدەم پەروەردگارییانەوە چوون، وه نوێژیان بەرپا کردوه، وه کاروباریان بە ڕاوێژه، وه لەوەی پێمانداون دەبەخشن.

ئەگەر سەرنج بدەین ﴿ ..وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ.. ٣٨ ﴾ لە زاراوەی زمانی عەرەبیدا بە ڕستەیەکی ناویی (الجُملة الإِسمِيّة) هاتوه، کە ئەویش دەلالەت لەسەر چەسپاویی، دەکات، واته: ئەوە کە کاروباریان بە ڕاوێژ بەڕێوە دەبەن، سیفەت و ئاکارێکی چەسپاوه لەنێو مسوڵماناندا، کە بەبێ ڕاوێژو پرس و ڕا بەیەکدی کردن، کارو باریان بەڕێوە نابەن و، حاڵەتی دیکتاتۆریی و خۆ فەرز کردنیان نیه.

**دووەم:** له سوورەتی (الطلاق) ئایەتی (٦)دا خوای تاك و پاك، تەنانەت لەبارەی ئەوەشەوە کە ژن و پیاو لەیەك جیا دەبنەوەو، منداڵی شیرە خۆرەیان هەیە، دیاریکردوه کە بە ڕاوێژ ساغی بکەنەوە، چۆن چۆنی سەرپەرشتیی منداڵەکان بکەن، لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿ ...وَأۡتَمِرُواْ بَيۡنَكُم بِمَعۡرُوفٖۖ وَإِن تَعَاسَرۡتُمۡ فَسَتُرۡضِعُ لَهُۥٓ أُخۡرَىٰ ٦ ﴾.

(إِءتِمار) یانی: ڕاوێژ کردن، واته: لەنێوان خۆتاندا بەشێوەیەکی چاك ڕاوێژ بکەن، {پرس و ڕا بەیەکدی بکەن، دەربارەی ئەوە کە ئەو منداڵە چۆن شیری پێ بدرێ و بەخێو بکرێ؟} وه ئەگەر سەختگیریی پێکەوە بکەن، با ژنێکی دیکە شیری بداتێ!

کەواته: کارو بار بە ڕاوێژ بەڕێوە بردن، یەکی دیکەیە لە سیفەت و ئاکارە پێویستەکانی هەر ئینسانێکی مسوڵمان، وه مسوڵمانان بەگشتی بۆ مامەڵەیان لەنێو خۆیاندا.

■ ٣٦ و ٣٧ و ٣٨ ■

# ڕقی خۆ كپ كردنەوەو، لێبوردن لەكاتی توڕەییداو، چاوپۆشیی كردن (كَظْمُ الغَيظِ، المَغفِرة عِندَ الغَضب، والعَفو والصَّفح).

## ٣٦- ڕقی خۆ كپ كردنەوە (كَظْمُ الغَيظ):

سەرەتا سەرنجی وشەی (كَظم الغَيظ) دەدەین لە ڕووی چەمك و واتای زمانەوانییەوە:

أ- دەربارەی وشەی: (كَظم) (إبن فارس) دەڵێ:{الكَظم: مَصدر قَولِهم: كَظَم يَكظِمُ، مِن مادّة (ك ظ م) الّتي تَدُلُّ عَلى مَعنى واحِدٍ: وَهو الإمساكُ والجَمْعُ لِلشَّيء}[١]، واتە: وشەی (كَظم) چاوگە لە (كَظَم يَكظِمُ)، لە ماددەی (ك ظ م)، ئەویش بریتیە لە گرتنەوەی شتێك و كۆكردنەوەی شتێك.

ب- دەربارەی وشەی (الغَيظ) دەڵێ:{الغَيظ: مَصدرُ قَولِهم غاظَ يَغيظُ، مِن مادَّة (غ ي ظ) الَّتي تَدُلُّ عَلى مَعنى واحِدٍ، وَهوَ (كَرْبٌ يَلحَقُ الإنسانَ مِن غَيره، يُقال: غاظَني يَغيظُني}[٢]، واتە: وشەی (غَيظ) چاوگە لەو قسەیانەوە، كە دەڵێ: (غاظ يغيظ) یانی: پەست و تووڕەی كردوە، پەست و تووڕەی دەكات، لە ماددەی (غ ی ظ)

---

(١) مقاييس اللغة، ج٤ ص ٤٥٠.

(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕ.

ئەویش یەك واتا دەگەیەنێ، کە بریتیە لەوەی خەفەتێك بەهۆی یەکێکی دیکەوە تووشی مرۆڤ ببێ، دەگوترێ: (غاظني يغيظني) واتە: پەست و تووڕەی کردم، تووڕەو پەستم دەکات.

ج- هەروەها دەربارەی: (كَظْمُ الغَيظ) دەڵێ:{كَظْم الغَيظ: تَجرُّع الغَيظِ عِندَ افتلاءِ النَّفس مِنه، كَظَم غَيظُه: سَكَت عَليهِ وَلَم يُظْهِرْهُ لا بِقولٍ ولا بِفعلٍ، والفَرق بَينَ الغَيظِ والغَضَبِ، أَنَّ الغَيظَ لا يَظْهَر عَلى الجَوارِح، والغَضَبُ يَظهَر}[1]، واتە: (كَظْم الغَيْظ) ئەوەیە کە تۆ ڕقی خۆت قووت بدەیەوە، کپی بکەیەوە لە کاتێکدا کە نەفست لێی پڕ بووە، بەڵام وەك چۆن مەشکەیەك کوندەیەك پڕ دەکەی لە ئاوو سەرەکەی دەبەستی و ناهێڵێ بێتە دەرێ، ئاوا دەروونی تۆش پڕە لە پەستیی، بەڵام کە نەتهێشت لەڕێی زمانتەوە دەرچێ، دەگوترێ: (كَظَم غَيظُه) واتە: بێ دەنگ بوو، وە تووڕەییەکەی خۆی دەرنەخست، نە بەقسەو نە بەکردەوە، ئنجا جیاوازیی نێوان (غَيظ) و (غَضب) ئەوەیە، کە (غَيظ) لەسەر ئەندامەکان و ڕواڵەتی ئینسان دەرناکەوێ، بەڵام (غَضب) دەردەکەوێ.

بەڵام ئینسانی عاقڵ هەست دەکاو دەڵێ: فلان کەس زۆر تووڕەو پەستە، بەڵام خۆی ڕاگرتوەو تووڕەییەکەی دەرنەبڕیوە.

خوای پەروەردگاریش ستایشی ئەو کەسانە دەکا، کە تووڕە بوونی خۆیان قووت دەدەنەوەو خۆیان مەرزەم دەکەن و دەفەرموێ:

﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ .. ﴿١٣٤﴾﴾.

واتە: ئەوانەی تووڕەبوونی خۆیان قووت دەدەنەوە.

خوای پەروەردگار ئەو سیفەتە بە سیفەتێکی پارێزکاران دادەنێ.

---

(١) نضرة النعيم، ج٨ ص ٣٢٣٧.

## ٣٧- لێخۆشبوون لەكاتی تووڕە بووندا (المَغفِرة عِند الغَضَب):

سەرەتا با سەرنجی مانای زمانەوانیی وشەی: (غُفران وَمَغْفرة) بدەین:

(راغب الأصفهانـي) دەڵێ: {الغُفران: مَصدَر قَولِهم: غَفَر اللهُ لِفُلانٍ غُفراناً، وَيُرادِفه المَغفرة والغَفر، وأَصل ذلك: التَّغطية والسَّتر، والغُفران: تَغطيَةُ الذَّنبِ بِالعَفْو عَنه}[1]، واتە: (غُفران) چاوگە لەو قسەیانەوە هاتوە، كە دەڵێ: (غَفَر اللهُ لِفُلانٍ غُفراناً) یانی: خوا لە فلانكەس ببووریَ، هەروەها وشەی (مَغفِره و غَفر) هاوواتای (غُفران)نن، {یان لێی نزیكن}، وە ئەصڵی وشەی (غَفْر) بەمانای داپۆشین و پۆشینی شتێك دیَ، وە وشەی (غُفران) بریتیە لە داپۆشینی گوناح، بەوە كە چاوپۆشیی لیَ بكریَ و لێی ببوردریَ.

خوای لێبوردە ستایشی ئەو كەسانە دەكا، كە لە كاتی توڕەییدا، چاوپۆشیی لە خەڵك دەكەن و لێبوردنیان هەیە، وەك لە سوورەتی (الشورى) ئایەتی (٣٧)دا دەفەرمویَ:

﴿..وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ﴿٣٧﴾﴾.

واتە: وە كاتێك كە تووڕەبن، دەبوورن.

خوای زاناو شارەزا نەیفەرمووە: (والَّذينَ لا يَغْضَبون)، واتە: ئەوانەی كە تووڕە نابن! چونكە تووڕە بوون لە شوێنی خۆیدا، پێویستە، جاری وا هەیە تووڕە دەبی، بەڵام واباشە لەو كەسەی لێی تووڕە بووی ببووری چاوپۆشیی بكەی، وە لەو كاتەدا ستایش كراو (مَمدوحَ)ە، كە تووڕەبوونەكەی خۆت جێبەجیَ نەكەی، ئەگەرنا تووڕە نەبوون، سیفەتێكی پەسند نیە، بەڵیَ ڕقی خۆ قووت دانەوە پەسندەو، لێبوردن لەكاتی توڕەییدا پەسندە، بەڵام خوای بەرزو مەزن، هەرگیز مەدحی ئەو كەسانەی نەكردوە، كە تووڕە نابن، چونكە بەبیَ تووڕە بوون، ئینسان

---

(١) المفردات، ص ٣٦٢.

بەرگریی پێ لەخۆی ناکرێ، وە تووشی زەبوونیی و بێ دەسەڵاتیی دەبێ، کە ئەوەش سیفەتێکی خراپە، لەو بارەوە پەندێکی عەرەبی هەیە دەڵێ:

(مَن اسْتُغْضِبَ ولَم يَغْضَبْ فَهو حِمارٌ، وَمن اسْتُرْضِيَ وَلَم يَرضَ فَهوَ شَيْطان)

واتە: هەر کەسێ تووڕە بکرێ و تووڕە نەبێ، ئەوە کەرە، وە هەرکەسێ ڕازیی بکرێ و ڕازی نەبێ، ئەوە شەیتانە.

دیارە ئینسان دەبێ ئینسان بێ، نە ئەو سیفەتەی هەبێ، ئەگەر تووڕەش بکرێ، هیچ کاردانەوەیەکی خراپی نەبێ و، هیچ بەرگرییەکی نەبێ! وە نەوەك شەیتانیش بێ، هەرچەند عوزری بۆ بهێنرێتەوەو داوای لێبوردنی لێ بکرێ، ئەو هەر لەسەر مان گرتنی خۆی بەردەوام بێ.

## ٣٨- چاوپۆشیی کردن (العَفو والصَّفح):

**سەرەتا با بزانین پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی، چۆن چەمك و واتای وشەی (عَفو) و (صَفح)یان شیکردۆتەوە کە ئێمە لە کوردییدا وشەی (چاوپۆشیی)مان لە بەرانبەردا داناون:**

أ- **(إبن الأثير)** دەڵێ: {أَصل العَفو: المَحْوُ والطَّمْسُ، وَقال الخَليل: العَفو: تَرْكُكَ إِنساناً استَوْجَبَ عُقوبةً، فَعَفوت عنه}[1]، واتە: وشەی (عَفو) لە ڕیشەدا بریتیە لە کوژاندنەوەو سڕینەوە، بەڵام (خليل بن أحمد الفَراهيدى) دەڵێ: (عَفو) ئەوەیە کە تۆ واز لە مرۆڤێك بێنی کە شایستەی سزادانێکە، بەڵام تۆ چاوپۆشیی لێ بکەی.

ب- **(فيروز آبادي)** دەڵێ: {العَفو والصَّفح مُتقارِبان في المَعنى، إلاّ أَنَّ الصَّفحَ أَبلغُ مِن العَفو، فَقد يَعفو الإِنسان ولا يَصفَح، وَصَفَحتُ عَنه، أَولَيْتُهُ صَفحةً جَميلةً}[2]، واتە: وشەی سڕینەوە (عَفو)، وە چاوپۆشیی (صَفح) لە ماناد‌ا لێك نزیکن، بەڵام وشەی چاوپۆشیی (صفح) مانای زیاترە لە سڕینەوە (عَفو)، چونکە جاری وایە خراپەکەی دەسڕیەوە، بەڵام چاوپۆشیی لێ ناکەی، چاوپۆشیی ئەوەیە سەرەڕای ئەوەی هەڵەکەی دەسڕیەوە، هەڵەکەیشت لەبەر چاو نەبێ، بەپێچەوانەی (عَفو)ەوە، کە گوناهەکەت لەبەر چاوە، دەگوترێ: (أَولَيْته صَفحةً جميلة) واتە: لاپەڕەیەکی تازەم لەگەڵی کردەوە، وەك ئەوەی، ئەو هەڵەیەی هەر نەکردبێ.

**ئەمەش دوو نموونەی ئایەتەکانی قورئان لەو بارەوە:**

**یەکەم:** خوای لێبوردە لە سووڕەتی (المائدة) ئایەتی (١٣)دا، دەفەرمووێ:

---

(١) مقاييس اللغة، ج٤ ص ٦١.

(٢) بصائر ذوي التمييز، ج٣ ص ٤٢١.

﴿... فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣﴾.

واتە: لێیان ببوورە، {هەر ئەوەندەش نا}، بەڵکو چاوپۆشییشیان لێ بکە، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆش دەوێن.

دووەم: هەروەها لە سووڕەتی (الشورى) ئایەتی (٤٠)دا، دەفەرموێ:

﴿... فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠﴾.

واتە: هەر کەسێ ببوورێ و چاکسازیی بکا، ئەوە پاداشتی لەلای خوایە، بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێن.

**تەماشا بکەن!**

خوا فەرموویەتی: (فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ) چونکە تۆ جاری وا هەیە لە کەسێ دەبووری، بەڵام لێبوردنەکەت نابێتە هۆی چاکسازیی، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوە، کە ئەو مرۆڤە بچێ ستەم لە کەسێکی دیکەش بکا، دەبێ لێبوردنێك بێ، ببێتە هۆی چاکسازیی و دەرەنجامەکەی چاك بێ، نەك ببێتە هۆی لەسەر ستەم سوور بوونی ئەو کەسەو، بچێ دەستدرێژیی بکاتە سەر یەکێکی دیکە، هەر لێبوردنێك ئیصلاحی بەدوادا نەیەت، پەسەند نیە.

■ ٣٩ و ٤٠ و ٤١ ■

## بەڕێزەوە بەلای قسەو ڕەفتاری پووچدا گوزەر کردن و، بە چاکە خراپە لابردن و، پشت لە نەفامان کردن

## (المُرورُ بِاللَّغوِ مُروراً كَرِيماً، وَدفعُ السَّيِّئة بِالحَسنة، والإِعراضُ عَنِ الجاهِلِين)

### ٣٩- بەڕێزەوە بەلای قسەو ڕەفتاری پووچدا گوزەر کردن (المرور باللغو مروراً كريماً):

ئەم سێ ڕەوشتەش، هەرسێکیان تا ڕاددەیەکی زۆر بەیەکەوە پەیوەستن.

بەنسبەت بە پێناسەو شیکردنەوەی واتای وشەی (لغو)ەوە (إبن منظور) دەڵێ: {اللَّغو واللَّغا: السَّقطُ وما لا يعتدُّ بِهِ مِن كَلامٍ وَغيْره، ولا يُحْصَلُ مِنه عَلى فائِدةٍ ولا نَفعٍ}[1]، واتە: وشەی (لَغو ولغا) هەر شتێکە کە خەڵك فرێی دەداو گرنگیی پێ نادرێ، لە قسەو لە کردەوە، وە هەر قسەو کردەوەیەکە، هیچ سوودو کەڵکێکی نەبێ.

کەواتە: وشەی (لَغو) هەر قسەو کردەوەیەکی پووچی بێ سوود دەگەیەنێ.

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الفرقان) ئایەتی (٧٢)دا، لە مەدح و ستایشی کەسانێکدا، کە خۆشی دەوێن، دەفەرموێ:

---

(١) لسان العرب، ج١٥، ص ٦٥٠١.

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامٗا ٧٢ ﴾.

واتە: وە ئەوانەی كە ئامادەی درۆ نابن، {ئامادەی كۆڕێك نابن كە درۆی تێدا دەكرێ، یاخود لادان و هەڵەو پەڵەی تێدا دەكرێ}، وە كاتێ بەلای قسەو كردەوەی پووچدا گوزەر دەكەن، بەڕێزو حورمەتەوە گوزەر دەكەن، {واتە: بەشداریی لە شتی پووچدا ناكەن، ڕێزو حورمەتی خۆیان دەپارێزن}.

## ٤٠- بەچاكە خراپە لابردن (دَفعُ السَّيِّئةِ بِالحَسَنة):

چەمك و واتای ئەم ڕەوشتەش بەمجۆرەیە: قسەیەكی خراپ دەبیستی، ڕەفتارێكی خراپت بەرامبەر دەكرێ، پێویستە چۆن باشە، ئاوا ئەو خراپەیە لاببەی و پاڵی پێوە بنێی.

(السیئة) قسەو كردەوەو هەڵوێستی خراپە، (الحَسَنة)ش قسەو كردەوەو هەڵوێستی چاكە، ئنجا لەبەرامبەر خراپەدا چاكە كردن، سیفەتێكی زۆر بەرزی ئینسانی مسوڵمانە.

بۆیەش خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (القصص) ئایەتی (٥٤)دا، دیسان لە مەدح و ستایشی كەسانێكدا كە خوا خۆشی دەوێن، وە بەلایەوە مسوڵمانی پەسندن، دەفەرموێ:

﴿ .. وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٥٤ ﴾.

واتە: وە بەچاكە خراپە پاڵ پێوە دەنێن، {واتە: بە چاكە وەڵامی خراپە دەدەنەوە}، وە لەوەی كە پێمان داون دەبەخشن.

دیارە ئینسانی بەخشندە (كریم) تەنیا سامان و ماڵ نابەخشێ، بەڵكو هەقە مەعنەوییەكەی خۆیشی دەبەخشێ، كەسێك قسەیەكی نەفامانەو نەزانانە دەكاو، هەڵوێستێكی نەفامانەی بەرامبەر دەنوێنێ، ئەو ناچێ وەك ئەو بكا، ئەگەر تۆ وەك ئەو بكەی، ئەوە وەك یەكتان لێ دێتەوە، دەبێ هەوڵ بدەی لەو چاكتر بی، ئەویش بەوە دەبێ، كە خراپەكەی ئەو بە چاكە وەڵام بدەیەوە.

خوێندوومەتەوە یەکێ لە زاناو پیاو چاکانی پێشین (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، دەبیستێتەوە کە نەفەرێك غەیبەتی کردوە، ئەویش بە خزمەتکارێکی خۆیدا بەرچنێك میوەی بۆ دەنێرێ، میوەی جوان و ڕێك، کاتێك ئەو کەسە دیارییەکەی پێدەگات، دێتەوە یادی کە غەیبەتی کردوە، دوایی لێی ڕادەسپێرێ دەڵێ: ئەو دیارییە چی بوو بۆ منت ناردبوو؟!

ئەویش دەڵێ: بیستم شەیتان زەفەری بەتۆ بردوە لەبەرامبەر مندا، من نەمهێشت زەفەر بەمن بەرێ لەبەرامبەر تۆدا، وە تۆ کە چاکەکانی خۆت بۆمن ناردوە، بەهۆی ئەو غەیبەتەوە، منیش گوتم: با دیاریی بۆ بنێرم.

ئنجا بەڕاستیی ئەوەش ڕەوشتێکی بەرزو پەسندەو، ئینسان دەبێ فشار لەخۆی بکا، ئەگەرنا ئەوە بەهەموو کەس نایەتە دی، هەیە نەك هەر لەبەرامبەر خراپەدا، خراپە دەکا، بەڵکو خراپتر دەکا، کەسێ قسەیەکی پێ گوتوە، ئەو دوو قسەی پێ دەڵێتەوە، هەیە کەسێ کە هەڵەیەکی بەرامبەر کردوەو داوای لێبوردنی لێدەکا، هەر لێی نابوورێ!، بەڵکو بۆی دەکاتە کینەو بوغزو لە دڵی خۆیدا دەیپەچنێ، ئنجا ئەوە لەکوێ و، ئەوە لەکوێ کە کەسێ قسەیەك یان کردەوەیەك، یان هەڵوێستێکی خراپت بەرامبەر دەنوێنێ، تۆ بچی چاکەیەکی لەگەڵدا بکەی[1]!!.



---

(١) سوپاس بۆ خوا منیش چەندان جار کە بیستوومە کەسێك زەم و غەیبەتی کردووم، دیارییم بۆ ناردوە.

## ٤١- پشت لە نەفامان كردن (الإعراض عن الجاهلين):

دەگوترێ: {أَعرَض: ولَّى مُبدياً عُرضَهُ}[1]، (أعْرَض) واتە: كەلەكەی خۆی تێكرد، (إعراض) ئەوەیە كە ڕوو لەكەسێ وەرگێڕی و لای خۆتی تێبكەی، دیارە ڕوو وەرگێڕان لە ئینسانی باش، تاوانە، بەڵام ڕوو وەرگێڕان لە ئینسانی خراپ، كە وەك ئەو نەكەی و چاوپۆشیی لێ بكەی و لەگەڵی نەچیە تەرازووەوە، ئەوە شتێكی پەسندو باشە.

**ئەمەش دوو نموونەی ئایەتەكانی قورئان لەو بارەوە:**

**یەكەم:** خوای بێ هاوەڵ لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٩٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾.

واتە: ئەوەی كە ئاسانە لەخەڵك وەری بگرەو، فەرمان بە پەسند بكە، وە ڕوو لەنەفامان وەرگێڕە، {واتە: وەك ئەوان مەكە}.

**دووەم:** خوای بەبەزەیی لە سوورەتی (الفرقان) ئایەتی (٦٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ .. وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾.

واتە: بەندە چاكەكانی خوای بەبەزەیی، ئەوانەن كاتێ خەڵكی نەفام دواندنی (دیارە خەڵكی نەفام، نەفامانە دەدوێ)، دەڵێن سەلام.

هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: {(قَالُوا۟ سَلَٰمًا) أي: قالوا قَولاً ذا سَلامةٍ}، واتە: قسەیەكی سەلامەتیان لەگەڵدا دەكەن، یانی: وەك ئەوان قسەی بریندارکەرو ڕووشێنەر ناكەن، بەڵكو قسەیەكی سەلامەت، ئامۆژگارییەك، قسەیەكی خێریان لەگەڵدا دەكەن.

هەندێكیش گوتوویانە: واتە: دەڵێن: سەلامتان لێ بێ و، لەگەڵیان پێوە ناچن.

---

(١) عمدة الحفّاظ، ج٣ ص ٥٥.

## ٤٢ و ٤٣ و ٤٤ و ٤٥

## بەرگریی کردن لەکاتی ستەمداو، بەهێز بوون لەبەرانبەر کافرانی دوژمنداو، زبریی لەسەر کافرانی شەڕ فرۆش و، چەسپاویی و نەلەخشاویی لەکاتی هەڕەشەی دوژمنان و لەکاتی بەرەنگار بوونەوەی سەختییاندا

(الإنتصارُ عِند البَغي، والعِزّةُ عَلى الكافِرين، والشدّة عَلى الكُفّار، والثَّباتُ عِندَ تَهديد، الأَعداءِ وَمواجَهَة الشَّدائد)

### ٤٢- بەرگریی کردن لەکاتی ستەمدا (الإنتصارُ عِندَ البَغى):

سەرەتا پێناسەی چەمك و واتای وشەی (بغي) و (إنتصار) دەكەین:

أ- لە پێناسەی وشەی (البَغي)دا (راغب الأصفهانـي) دەڵێ: {البَغي: طَلَب تَجاوزِ الإقتصاد فيما يُتَحرّى، تجَاوَزَهُ، أَم لَم يَتَجاوَزْه}[1] واتە: (بَغي) داواكردنی تێپەڕاندنی حاڵەتی میانجییە لە شتێكدا كە خەفتانی تێدا دەكرێ، ئنجا تێپەڕێنێ، یان نا.

ب- هەروەها (المُناوي) دەڵێ: {البَغي: هوَ طَلَب الإستعلاءِ بِغَير حَق}[2]، واتە: (بَغي) واتە: داواكردنی خۆ بەرز كردنەوە بە ناهەق.

---

(١) المفردات، ص ٥٥.

(٢) التوقيف على مهمات التعاريف، ص ٨١.

ج- لە پێناسەی (الإنتصار)یشدا (الرازی) دەڵێ: {الإنتصار: الإنتقام}[1]، (الإنتصار) واتە: تۆڵە ستاندنەوە.

**ئەمەش نموونەیەك لە ئایەتەکانی قورئان لەو بارەوە:**

خوای دادگەر لە سووڕەتی (الشوری) ئایەتی (٣٩)دا، لە مەدح و ستایشی ئیمانداراندا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾.

واتە: وە ئەوانەی کاتێ کە ستەمیان لێ دەکرێ {دەستدرێژییان دەکرێتە سەر} تۆڵە دەستێننەوەو، بەرگریی لەخۆیان دەکەن.

وەك مریشکی مەصڵەحە، سەری خۆیان نەوی ناکەن و مل بۆ چەقۆ ڕاناگرن، بەڵکو بەرگریی لەخۆیان دەکەن و، بەرپەرچی ئەو ستەم و دەستدرێژییە دەدەنەوە.

هەندێ کەس وا دەزانێ مسوڵمان دەبێ هەمیشە هەر سەلامەت بێ، هەمیشە دەبێ هەر بێ زەرو فەقیر بێ! نەخێر وانیە مسوڵمان نابێ وابێ مێش لەخۆی دەرنەکات، بەڵێ، دەبێ لەگەڵ مسوڵماناندا نەرم و نیان بێ، ئەویش ئەوانەیان کە چاویان لە ستەم و دەستدرێژیی نیە.

خوای بەرزو بەدەسەڵات فێرمان دەکا، کە بەرگریی لەخۆکردن و تۆڵەستاندنەوە، یەکێ لە سیفەتە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵی مسوڵمانە، بەر لەوەی دەوڵەتیشیان هەبێ، چونکە سووڕەتی (الشوری) سووڕەتێکی مەککەییە، خوای پەروەردگار ستایشی ئیماندران دەکا لە مەککە، کە یەکێ لە سیفەتەکانیان ئەوەبووە، کاتێ ستەمیان لێکراوە، بەرگرییان لەخۆیان کردوە.

---

(١) مختار الصِّحاح، ص ٥٧٠.

## ٤٣- بەهێز بوون لەبەرامبەر کافرانی دوژمنکاردا (العِزّة علَى الكافِرينَ الأعداء):

**پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی لەبارەی چەمك و مەبەستی وشەی (عِزّة)ەوە گوتوویانە:**

{العِزّة: المَنعةُ وَشدّة الغَلبة، (وَعَزَّني في الخِطاب): غَلَبني، والعَزيز: الغالِب المُمتنع عَلى مَن يُريدهُ بِالقَهر والغَلَبة}[1]، واتە: وشەی (عِزّة) بریتیە لە ڕێگا نەدان، وە ئەوە کە ئینسان زاڵ بێ بەسەر بەرامبەرەکەیدا، ڕستەی: (وَعَزَّني في الخِطاب) واتە: بەسەرمدا زاڵ بووە لە دواندندا، (عَزيز) کەسێکە کە ڕێگا نەدا بەکەسێك، کە دەیەوێ خۆی بەسەردا فەرز بکاو بەسەریدا زاڵ بێ.

**ئەمەش نموونەیەکی ئایەتەکانی قورئانی بەڕێز لەبارەی (عِزّة)ەوە:**

خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٥٤)دا، مەدح و ستایشی ئیماندارانی کردوەو دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ..﴿٥٤﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەرکام لەئێوە لە دینەکەی پاشگەز بێتەوە، ئەوە خوا لەمەودوا کۆمەڵێك دەهێنێ: خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ، لەگەڵ ئیمانداراندا میهرەبان و ملکەچن، بەڵام لەبەرامبەر کافراندا، {کافرانی دوژمن و شەڕ فرۆش} بەدەمارو بەهێزن.

دیارە ئێمە بەهۆی سیاقی ئایەتەکانەوە دەزانین کە مەبەست لە (ٱلْكَٰفِرِينَ) کافرانی شەڕفرۆش و دوژمنکارن.

---

(١) عمدة الحفّاظ، ج٣ ص ٢٥٦.

## ٤٤- توند بوون لەسەر کافرانی شەڕفرۆش
(الشدّة على الكفّار -المحاربين-):

دەربارەی مانای وشەی (شدّة)، پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی گوتوویانە: {أَصل الشِّدّة: العَقد القَويُّ، وشَدَدتُ الشَّيء: قوَّيتُ عقْدَه، وشَدَّ فُلانٌ واشتدَّ: أسْرعَ}[1]، واتە: وشەی (شدّة) لەبنەڕەتدا بە گرێیەکی مەحکەم دەگوترێ، یان گرێبەستێکی مەحکەم، (قوَّيتُ عقْدَه) واتە: گرێیەکەم قایم کرد، وە دەگوترێ: (وشَدَّ فُلانٌ واشتدَّ) واتە: خێرا ڕۆییشت.

خوای زاڵی کاربەجێ لە سوورەتی (الفتح) ئایەتی (٢٩)دا، مەدحی ئیمانداران دەکا، دەفەرموێ:

﴿...أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ.. ﴿٢٩﴾﴾.

واتە: لەبەرامبەر کافران توندن، بەهێزو پێزن، {نەك نەرم و نۆڵ بن}.

ئنجا من بۆیە قەیدی (المُحارِبين)م بۆ زیاد کردوە: {الكفّار (المُحارِبين)} واتە: کافرانی شەڕفرۆش، چونکە لە سیاقی ئایەتەکەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کە ئەوانە تەنیا کافرانی شەڕکەرو شەڕفرۆشن، کە نابێ نەرم و نیانییان لەگەڵ بنوێنری، بەڵکو دەبێ توندیی و هێزو پێز لەدژیان بەکار بهێنرێ، پێشینانیش دەڵێن: (کەنگرو ماست بەوەختی خۆی).

---

(١) عمدة الحفاظ، ج٢ ص ٢٥٦.

## ٤٥- چەسپاویی و نەلەخشاویی لەکاتی هەڕەشەی دوژمنان و لەبەرانبەر سەختییاندا، (الثَّبات عِندَ تَهديد الأَعْداء وَمواجَهة الشَّدائِد):

**زانایان لەبارەی چەمك و واتای وشەی: (ثبات)ەوە گوتوویانە:**

{الثَّبات والثُّبوت: ضِدُّ الزَّوال، وَرَجل ثَبْتٌ وثَبيتٌ: أَي لا يَزول عَن النَّصر في الحَرب}[1]، واتە: هەردووك وشەی (ثَبات وَثُبوت) پێچەوانەی لاچوونن، دەگوترێ: (ورجل ثَبْتٌ وثَبيتٌ) واتە: پیاوێکی (ثَبْتٌ) یان (ثَبيتٌ)، یانی: واز لە سەرکەوتن ناهێنێ لە جەنگدا، هەمیشە پێ چەسپاوەو مەیدان چۆڵ ناکات، تاکو سەردەکەوێ.

ئەمەش دوو نموونەی ئایەتەکانی قورئان لەبارەی: چەسپاویی و نەلەخشاویی مرۆڤی مسوڵمانەوە، لەبەرانبەر هەڕەشەی دوژمنان و لەبەرانبەر سەختییاندا:

یەکەم: خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الأنفال) ئایەتی (٤٥)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! کاتێك تووشی کۆمەڵێك بوون (کۆمەڵێکی شەڕفرۆش لە جەنگدا بەرەنگاریان بوونەوە) چەسپاوو نەلەخشاوبن، وە زۆر یادی خوا بکەن، بەڵکو سەرفراز بن.

دووەم: خوای باڵادەست لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٧٣)دا، لەو بارەوە کە ئینسانی مسوڵمان لە بەرانبەر هەڕەشەو گوڕەشەی دوژمنان و، لە بەرامبەر سەختیی و ناڕەحەتییاندا، دەبێ خۆڕاگربێ، دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾.

---

(١) عمدة الحفّاظ، ج١ ص ٢٧٣.

واتە: ئەوانەی کاتێك خەڵك پێیان گوتن: خەڵك بۆتان کۆبوونەتەوە، {واتە: دوژمنان لێتان کۆبوونەتەوە} لێیان بترسێن، ئەو هەڕەشەیە {نەك هەر نەیترساندن بەڵکو} ئیمانی زیاد کردن و گوتیان: خوامان بەسەو باشترین کار پێسپێرراویش خوایە.

کەواتە: مرۆڤی ئیماندار دەبێ لەکاتی هەڕەشەی دوژمنداو لە بەرانبەر سەختییاندا، چەسپاوو نەلەخشاو بێ، نەك لەگەڵ هەر پخەیەکدا، واز لە ڕێبازی خۆی بێنێ و، لەگەڵ هەر هەڕەشەیەکدا، پاشگەز بێتەوەو بەرەو دوا بکشێتەوە، بەڵکو دەبێ کێو بجووڵێ، ئەو نەجووڵێ.

## ■ ٤٦ و ٤٧ و ٤٨ و ٤٩ ■

### متمانە بەخۆبوون و لەسەر پێی خۆ وەستان و، گەیاندنی سپاردەو، ڕاستگۆیی لە بەڵێنداو، پەیمان بردنە سەر

### (الثِّقَّة بِالنَّفس والإعتِمادُ عَلى الذّات، وَأَداءُ الأَمانة،وَصِدق الوَعد، والوَفاءُ بِالعَهد)

٤٦- متمانە بەخۆبوون و لەسەر پێی خۆ وەستان (الثِّقة بالنفس والإعتماد عَلى الذّات):

**با لەپێشدا چەمکی هەرکام لە وشەی (ثقة) و (إعتماد) لە زمانی پسپۆڕانی زمانی عەڕەبییەوە شی بکەینەوە:**

أ- لەبارەی وشەی (ثقة)ەوە گوتوویانە: {وثِقتُ به أَثِقُ ثِقةً: إذا سَكَنت إِليْه، واعتَمَدت عَليه}[1]، واتە: (وثِقتُ به أَثِقُ ثِقةً) یانی: تۆ کاتێ بەهۆی شتێکەوە ئارام بی، وە پشتی پێ ببەستی.

ب- دەربارەی: (الإعتمادُ عَلى الذّات) (**الرازي**) دەڵێ: {إِعْتمَد عَلى الشَّيء: إتَّكأ، واعتَمد عَليهِ في كَذا إتَّكَلَ}[2]، (إِعْتَمد عَلى الشيَّء) واتە: پشتی پێدا، پاڵی وێدا، وە (إِعْتَمد عَليْهِ في كَذا) واتە: پشتی پێ بەست و پاڵی وێدا.

---

(١) عمدة الحفاظ، ج٤ ص ٢٨٣.

(٢) مختار الصحاح، ص ٣٩٨.

ئەم سیفەتەشم لە سوورەتی (الفتح) ئایەتی (٢٩) دەرهێناوە، کە خوای بەرزو مەزن ستایش و وەسفی ئەوانە دەکا، کە لە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، دان و درەختێکی بەهێزو پێزو چڕو پڕیان دەچوێنێ و دەفەرموێ:

﴿ ..وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ ..﴿٢٩﴾ ﴾

واتە: .. وە وێنەیان لە ئینجیلدا، وەك درەختێکە لق و پۆپەکانی خۆی دەرکردوون، بەهێزو پتەو بووە، لەسەر بنك و قەدی خۆی وەستاوە ...

لەوەوە دەرم هێناوە کە ئیماندار دەبێ پشت بەخۆی ببەستێ، وە لەسەر پێی خۆی بوەستێ و وە متمانەی بەخۆیبێ، چونکە: خوای پەروەردگار ستایشی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، وە ئەوانەی شوێنی وان دەکەون، بەوە دەکا، کە وەك درەختێکن لقەکانی چڕو پڕن و، لەسەر بنك و قەدی خۆی وەستاوە.

## ٤٧- سپاردە گەیاندن (أداء الأمانة):

(الكَفوي) دەربارەی پێناسەی (الأمانة) دەڵێ: {كُل ما يُؤتَمَن عَلَيهِ، كَأَموالٍ وَحُرَمٍ وَأسرارٍ، فَهو أَمانة}[1]، واتە: هەر کەسێ لەسەر شتێك بکرێتە ئەمیندارو پێی بسپێردرێ: ماڵ و سامان بێ، حورمەت بێ، نهێنیی بێ، ئەوە پێی دەگوترێ: ئەمانەت.

خوای پەروەردگار لە وەسفی ئیمانداراندا، کە ئەمانەت پارێزن، لە سوورەتی (المَعارج) ئایەتی (٣٢)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾

واتە: وە ئەوانەی کە سپاردەکانیان و پەیمانەکەیان دەپارێزن {ئاگایان لێیانەو چاودێرییان دەکەن}، بەڵێ ئینسانی ئیماندار، ئەمیندارو سپاردە پارێزە.

---

(١) الكليات، ص ١٧٦.

## ٤٨- ڕاستگۆیی لە بەڵێندا (الصدق في الوعد):

ئینسان لە بەڵێندا -كاتێ گفتی بە كەسێكدا - پێویستە ڕاستگۆ بێ، وە بەڵێنەكەی بەرێتە سەر، خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (مریم) ئایەتی (٥٤)دا، لە مەدح و ستایشی پێغەمبەر ئیسماعیل دا (سەلامی خوای لێبێ)، دەفەرموێ:

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥٤ ﴾.

واتە: وە لە كتێبدا یادی ئیسماعیل بكە، كە گفت و بەڵێنی زۆر ڕاست بوو، وە ڕەوانەكراوو پێغەمبەر بوو.

تەماشا بكەن! پێشێ ڕاستگۆیی لە گفت و بەڵێندا، باس كردوە، ئنجا باسی ڕەوانە كراویی و پێغەمبەرایەتیی ئیسماعیلی كردوە، دیارە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ)، بۆیە كراون بەپێغەمبەر، چونكە لە لووتكەی سیفەت و ڕەوشتە بەرزو جوانەكان دا بوون.

## ٤٩- پەیمان بردنە سەر (الوفاء بالعهد):

**شارەزایانی زمانی عەڕەبیی بەم جۆرە چەمك و واتای (الوَفاءُ بِالعَهد)یان شیكردۆتەوە:**

أ- (إبن فارس) دەربارەی (وَفاء) دەڵێ: {الوَفاءُ مَصدر قَولِهم: وَفى يَفي وَفاءً، مِن مادّة (و ف ي) الّتي تَدلُّ عَلى (إكمالٍ وإتمام). وَمِنه الوَفاء: إتمامُ العَهْد وإكمال الشَّرط. ويَقولون: أوْفَيْتُكَ الشَّيءَ، إذا قَضَيْتَه إيّاهُ وافياً. وتوفَّيْتُ الشَّيءَ واستَوْفَيْته، إذا أخذتَه كُلَّه، حتَّى لَم تَترُكْ منهُ شيئاً}[1]، واتە: (وَفاء) چاوگە، لەو قسەیانەوە هاتوە كە دەڵێ: (وَفى يَفي وَفاءً) لە ماددەی (و ف ی) كە مانای تەواو كردن و بردنە سەر دەگەیەنێ، وە لە وەفایە، كە پەیمان بگەیەنرێتە سەر، وە مەرجێك كە دیاریی كراوە، بگەیەنرێتە جێ، وە گوتراوە: (أوْفَيْتُكَ الشَّيءَ، إذا قَضَيْتَه إيّاهُ وافياً) واتە:

---

(١) مقاييس اللغة، ج٦ ص ١٢٨.

شتەکەم بۆ تەواو کردی، (وتوفَّيْتُ الشَّيءَ واستَوْفَيْته) ئەگەر حەقەکەی خۆت بەتەواویی وەربگری و هیچی لێ بەجێنەهێڵی.

ب- (الجَوهري) دەڵێ: {الوَفاء ضِدُّ الغَدر}[1]، واتە: (الوَفاء) پێچەوانەی: پەیمان شکاندن (غَدر)ە.

ج- (راغب الأصفهاني) دەڵێ: {الوَفاء بِالعَهد: إِتْمامهُ وَعَدم نَقض حِفظه}[2].

واتە: (الوَفاء بِالعَهد) ئەوەیە کە: پەیمانەکەت تەواو بکەی و هەڵینەوەشێنیەوە، وە بیپارێزی.

خوای پەروەردگار لەسوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٣٤)دا دەفەرموێ:

﴿...وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً ﴿٣٤﴾﴾.

واتە: وە پەیمان ببەنە سەر، چونکە بەدڵنیایی پەیمان لێی دەپرسرێتەوە.



---

(١) الصِّحاح، ج٦ ص ٢٥٢٦.

(٢) المفردات ص ٥٢٨.



## زۆر خەفەت بار نەبوون بە نەهات و، زۆر دڵخۆش نەبوون بە هات (عَدمُ الأَسى عَلى الخَيرِ الفائِت، وعَدم الفَرحِ بِنَيل الخَير)

ئەمیش یەکێکە لە ئەدەب و ڕەوشتە جوان و پەسندەکانی ئینسانی ئیماندار: کە وەختێك شتێکی لەدەست دەچێ، زۆر خەفەت نەخوا، وە وەختێك شتێکیشی دێتە دەست، زۆر دڵخۆش نەبێ و، نەلەخشاوو دامەزراو بێ، لەبەردەم هات و نەهاتدا.

شارەزایان ئاوا چەمك و واتای وشەی: (أسى) و (الفَرَح)یان شیکردۆتەوە:

{الأسى: الحُزن، يُقال: أَسيتُ عَليه أَسىً}[1].

{الفَرح: إنشراحُ الصَّدر وأَكثر ما يَكون بِلَذَّة دُنيَويّةٍ عاجَلةٍ}[2]، واتە: (الأسى) یانی: خەفەتباریی و دڵتەنگیی، دەگوترێ: (أَسَيتُ عَليه أَسىً) واتە: خەفەتم بۆ خوارد. بەڵام (فرح): بریتیە لەسینە گوشاد بوون و دڵخۆش بوون، بەهۆی خۆشیی و چێژێکی بەپەلەی دنیاییەوە، بەزۆریی بەو مەبەستە بەکاردێ.

---

(١) عمدة الحفاظ - ج١ ص٩٢.

(٢) هەمان سەرچاوە، ج٣، ص ٢١٠.

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الحدید) ئایەتەكانی: (٢٢-٢٣)دا، دەفەرمویٚ:

﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٢٢ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ٢٣ ﴾.

واتە: هیچ بەڵایەكتان تووش نایە لە زەمیندا و لە نەفسی خۆتاندا، مەگەر لە كتێبێك و لیستێكدایە، پێش ئەوەی دەریخەین، ئەوە لەسەر خوا ئاسانە، ئەوەمان بۆیە پیٚ گوتن، تاكو خێرو خۆشییەكتان كە لەدەست دەچیٚ، زۆر بۆی خەفەتبار نەبن، وە سوودێكتان كە دێتە دەست، زۆر پێی دڵخۆش نەبن، وە خوا هیچ فیزو كەشخەكەرێكی شانازییكەری خۆشناویٚ.

## ٥١ و ٥٢

# شایەدییدانی بەهەق و، بێباكیی
# لە سەركۆنەی لۆمەكاران
# (أَداءُ الشَّهادةِ بِالحَق، وَعَدم الخَوفِ مِن لَومَةِ اللاّئِمين)

### ٥١- شایەدییدانی بەهەق (أداء الشَّهادة بالحق):

مەبەست لە شایەدیدانی بەهەق (أداء الشَّهادة بالحق) ئەوەیە كەسێك، كە ئاگای لە شتێكەو بانگ دەكرێ بۆ شایەدیی، شایەدییەكی حەق و ڕاست و ڕوون بدات.

**زانایانیش لەبارەی چەمك و واتای (شَهادة)وە، گوتوویانە:**

{الشَّهادة والشُّهود: حُضور مَع مُشاهَدة، وَذلك إِمّا بِالبَصَر، وَإِمّا بِالبَصيرة}[١]، واتە: وشەی (شَهادة وشُهود) یانی: ئامادەبوون لەگەڵ دیتندا، ئەویش چ دیتنی بەچاو، چ دیتنی بە عەقڵ و دڵ.

شایەد (شاهد) كەسێكە زۆرباش ئاگای لە ڕووداوێكەو، لێی دڵنیایە، كە چۆن بووە.

---

(١) عمدة الحفاظ، ج٢ ص ٢٩٥.

ئەمەش دوو ئایەتی قورئانی بەرزو مەزن وەك نموونە لەبارەی گەورەیی و گرنگیی {شایەدییدانی بەهەق}ەوە، وەك یەكێك لە ڕەوشت و خەسڵەتە بەرزو پەسندەكانی مرۆڤی مسوڵمان لەبواری مامەڵە كردنی لەگەڵ خەڵكدا:

**یەكەم:** خوای دادگەر لە سووڕەتی (المعارج) ئایەتی (٣٣)دا، ستایشی ئەو كەسانە دەكا كە شایەدیی بەهەق دەدەن:

﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَـٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

واتە: وە ئەوانەی كە بەشایەدیی دانەكەی خۆیان هەڵدەستن.

**دووەم:** هەروەها خوای كارزان لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٢٨٢)داو لەئایەتی (الدَین)دا، كە درێژترین ئایەتە لەقورئاندا، لەڕستەیەكی ئەو ئایەتەدا، دەفەرموێ:

﴿ ... وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُوا۟ .. ﴿٢٨٢﴾ ﴾.

واتە: وە نابێ شایەدەكان لاملیی بكەن، كاتێك كە بانگ كران بۆ شایەدیی دان. هەڵبەتە بۆیە بەدوای ئەودا، ئەو سیفەتەی پەنجاو دووەمین (٥٢) {بێ باكیی لە لۆمەی سەركۆنەكاران}م، هێناوە، چونكە زۆر جار شایەدیی دانی بەحەق، دەبێتە هۆی ئەوەی كەسێكت لێ بڕەنجێ، چونكە لەو شایەدییەی تۆ زەرەرمەندە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئەو كەسە ستەمی كردوە، ئنجا كەسێك كە دوژمنە، بەڵام هەقەكە هی ئەوەو لێی بەهرەوەمەند دەبێ، ئینسان ڕەنگە لەوەدا سەركۆنە بكرێ كە: چۆن دەبێ زیان بە دۆستەكەی بگەیەنێ و، سوود بە دوژمنەكەی بگەیەنێ؟ بەڵام نەخێر لە حەقدا دەبێ ئینسان گوێ نەداتە دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی، حەق حەقەو دەبێ وەك خۆی بگوترێ.

## ٥٢- بێ باکیی لە لۆمەی سەرکۆنەکاران (عدم الخوف من لومة اللائمين):

خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٥٤)دا، لە سیاقێکدا کە باسی شەش سیفەت دەکا، بۆ کۆمەڵێك کە دەیانهێنێ، دوای ئەوەی خەڵك لەدینەکەیان هەڵدەگەڕێنەوە، یەکێ لە سیفەتەکانیان ئەوەیە دەفەرموێ:

﴿ .. وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ .. ﴿٥٤﴾ ﴾.

واتە: وە بێباکن، ناترسێن لە لۆمەی سەرکۆنەکاران.

کەسانێك کە بەناهەق سەرکۆنەو لۆمەت دەکەن، دەبێ گوێ بە سەرکۆنەکەیان نەدەی، بەڵام کەسێ ڕەخنەیەکی بە حەقت لێ بگرێ و لەسەر حەق سەرزەنشتت بکا، دەبێ زۆر سوپاسیشی بکەی، بەڵام کەسێ بەناهەق ڕەخنەت لێ دەگرێ، لەبەر ئەوەی بە پێوەری لاری ئەو، هەڵوێستەکەت تەواو نیە، نابێ تۆ دەستبەرداری هەقێك بی، هەر لەبەر ئەوەی کەسێك بە ناحەق ڕەخنەت لێ دەگرێ و لۆمەت دەکا.

■ ٥٣ ■

## چاو ورد كردنەوەو
## بەرپێی خۆ بینین (التبَین)

**شارەزایانی زمان لەبارەی چەمك و واتای (تَبَین)ەوە، گوتوویانە:**

{التبين: مَصدر تَبيَّن، إذا تَثَبَّت في الأَمر، يُقال: تبيَّنْتُ الأَمرَ: تَأَمَّلْتُه وتوَسَّمْتهُ، التَّبَيُّن مرتبةٌ مِن مَراتِبِ وصولِ العِلمِ، يُراد بِها ما يَحصِلُ مِنَ العِلم بَعد الإلتباس}[1].

واتە: وشەی (تبین) چاوگە لە (تَبَین)ەوە، كاتێك ئینسان لە شتێكدا ورد دەبێتەوە، وە چەسپاو دەبێ و بەپەلە حوكم نادا، دەگوترێ: (تبيَّنت الأمر) واتە: لە كارەكەوە ڕامام و لێی ورد بوومەوە، وە (تَبَین) پلەیەكە لە پلەكانی گەیشتن بە زانیاریی، كە مەبەست پێی ئەو زانیارییەیە كە دوای ئەوەی تەم و مژێك بەسەر بابەتێكەوە بووە، دوایی لێی ورد دەبیەوەو لێكۆڵینەوەی زیاتر دەكەی تاكو تەواو زیاتر لێی دڵنیا دەبی، بەرچاووت ڕوون دەبێتەوە.

دیارە بەرچاو ڕوون بوونەوەو وردبوونەوە لە شت، یەكێكە لە سیفەتە گرنگەكانی ئینسانی مسوڵمان لە بواری مامەڵەی لەگەڵ خەڵكدا، وە زۆر كێشەو گرفت لەئەنجامی ئەوەدا پەیدا دەبن، كە خەڵك سەركێڵەو ڕواڵەت بینە، پەلە دەكا لەحوكم دان و قسە كردندا.

---

(١) لسان العرب ج١٣ ص ٦٧- ٦٨، و الكليات للكفوي ج١ ص ٨٩.

بۆیە خوای کاربەجێ لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی (٦)دا، دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوْمَۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! کاتێ بابایەکی لارێ هەواڵێکی بۆ هێنان، ساغی بکەنەوەو ڕوونی بکەنەوە، نەوەك بە نەزانیی، کۆمەڵێك تووشی بەڵایەك بکەن، ئنجا پەشێمان ببنەوە لەسەر ئەوەی کردووتانە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەش ئەوە بوو کە یەکێ لە هاوەڵان کە دیارە تازە مسوڵمان بووە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناردی بۆ شوێنێك بۆ ئەوەی زەکات کۆ بکاتەوە، خەڵکەکەش بە پێشوازییەوە هاتن، ئەویش لەبەر ئەوەی دوژمنایەتیی پێشتری لەگەڵیان هەبوو لەسەردەمی نەفامییدا، یەکسەر هاتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) ئەوانە نەك هەر زەکات نادەن، بەڵکو ویستیان بمکوژن! پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) یەکی دیکە لە هاوەڵانی ناردو ئەو هەواڵەکەی ساغ کردەوە، مەسەلەکەیان بۆ ڕوون کردەوە، بۆیە خوای زاناو شارەزا ئەو ئایەتەی ناردە خوار، کە لەسەرەوە هێنامان[1].



---

(١) بڕوانە: أسباب النزول، للواحدي: ٢٢٢، وە بڕوانە: پەراوێزی (زاد المسير في علم التفسير) ص ١٣٣١، کە گوتوویەتی: هەرکام لە (أحمد) لە (المسند)و (طبري) و (طبراني) هێناویانە، ئەو کەسەش کە یەکەمجار نێرراوە {الوليد بن عقبة} بووە.

■ ٥٤ ■

## خەم و پەژارە ڕەواندنەوەی خەڵك
## (تفريج الكُرُبات)

سەرەتا سەرنجی شیکردنەوەی پسپۆڕان دەدەین، بۆ چەمکی هەرکام لە وشەی: (تفريج) و (كُرُبات):

أ- (إبن منظور) لە شیکردنەوەو پێناسەی وشەی (تفريج)دا دەڵێ:{التَّفريج: مَصدر فَرَّج مِن مادّة (ف ر ج) والفَرْجُ: الخَلَلُ بَيْنَ الشَّيئَين والجَمع فُروج، والتفريج: كَشف الهَمِّ وإذهابُ الغَمِّ وَرفع الضَّرر}[1]، واتە: (تفريج) چاوگە لە (فَرَج)ەوە هاتوە، لە ماددەی (ف ر ج)، (فَرْج)یش بە کەلێنی نێوان دوو شت دەگوترێ، وە کۆیەکەی (فُروج)ە، (تَفريج) لابردنی خەم و، نەهێشتنی پەژارەیەو لابردنی زەرەرو زیانە.

ب- (إبن فارس) بۆ پێناسەی وشەی (الكُربات) دەڵێ:{الكُربات: جَمع كُربَةٍ والكَرْبُ مَصدَرُ كرَبَ، مِن مادّة: (ك ر ب) الَّتي تَدلُّ عَلى الشِّدّة وَالقوّة}[2].

واتە: (الكُربات) کۆی (كُرْبة)یە، وە (كَرْب) چاوگی (كَرَبَ)ە‌یە، لە ماددەی (ك ر ب) کە توندیی و هێز دەگەیەنێ.

---

(١) لسان العرب، ج٢ ص ٣٤٢.

(٢) مقاييس اللغة، ج٥ ص ١٧٤.

جـ- (إبن حجر العسقلانـي)یش لە ماناكردنی وشەی: (تَفريجُ الكُربات)دا دەڵێ: {رَفع الضَّرر وإذهابُ ما يَدهَمُ المرءَ، مِمّا يَأخُذ بِنفسِه فَيغُمُّه وَيُحزِنُهُ}[1]، واتە: لابردنی زیان و نەهێشتنی خەفەتێكە كە بەملی ئینساندا دێ، وە دڵ و دەروونی داگیر دەكاو خەفەتبارو پەژارەداری دەكا.

**ئەوەش دوو نموونە لە دەقەكانی شەریعەت لەو بارەوە:**

**یەكەم:** وشەی (كَرْب) لە سووڕەتی (الأنعام) ئایەتی (٦٤)دا هاتوە، خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ:

﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ٦٤ ﴾.

واتە: بڵێ: هەر خوا لەو بەڵایە {كە پێشتر باسی كراوە} وە لەهەر خەفەت و بەڵاو گرفتێكی دیكەش دەربازتان دەكا، كەچی دوایی ئێوە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن.

**دووەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێكدا دەفەرموێ:

{الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ، مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} أخرجه أحمد برقم (٥٦٤٦)، والبخاري برقم (٢٣١٠)، ومسلم برقم (٢٥٨٠)، وأبو داود برقم (٤٨٩٣)، والترمذي برقم (١٤٢٦) وقال: حسن صحيح غريب، والنسائي في الكبرى برقم (٧٢٩١)، وابن حبان برقم (٥٣٣)، وأخرجه أيضًا: والبيهقي برقم (١١٩٠٨).

واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە (ئەوە وەك پیاوان، وەك ئافرەتانیش: ئافرەتی مسوڵمان خوشكی ئافرەتی مسوڵمانە، وە هەروەها مسوڵمانانی پیاوو ئافرەت: پێكەوە خوشك و بران)، ستەمی لێ ناكا، وە تەسلیمی دوژمنی ناكا، {واتە: پشتی بەرنادا}، وە هەركەسێك یارمەتی برای مسوڵمانی بدا، {واتە: پێویستیی

---

(١) فتح الباري، ج١١ ص ١٥٠.

جێبەجێ بكا} خوا پێویستیی بۆ جێبەجێ دەكا، وە هەر كەسێك خەمێك لە مسوڵمانێك بڕەوێنێ و لە گرفتێك دەربازی بكا، خوا لە خەم و گرفتێك لە خەم و گرفتەكانی ڕۆژی قیامەتی لێ دەڕەوێنێ، وە هەركەسێ مسوڵمانێ بپۆشێ، خوا لە قیامەتدا دەیپۆشێ.

پۆشین لێرەدا مەبەست پۆشینی مەعنەوییە، واتە: عەیبێكی بپۆشێ، كەم و كوڕییەكی هەیە لێی ئاشكرا نەكات، خوای پەروەردگاریش كەم و كوڕیی ئەو دەپۆشێ.



## وریا كردنەوەو دڵخۆشكردن
## (الإِنذارُ والتَّبشِير)

ئینسانی مسوڵمان دەبێ لەگەڵ دەورو بەرەكەیدا، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە بەگشتی، دڵسۆزو بەخەم بێ و، وریایان بكاتەوەو، بیانترسێنێ لە شتی خراپ، لە سەرەنجامی خراپ، وە دڵیان خۆش بكا بە شتی باش و بە ئاییندەی باش، واتە: هەم دەبێ هەوڵ بدا، دووریان بخاتەوەو بیانسڵەمێنێتەوە، لەو شتانەی كە بۆ ئەوان خراپن، وە هەم دەبێ هەوڵ بدات، هانیان بداو دڵیان خۆش بكا، بۆ ئەو شتانەی كە مایەی قازانجیانن، لە دنیاو دوارۆژدا.

(راغب الأصفهانـي) دەڵێ: {الإنذارُ: إخبارٌ فيهِ تَخويف، كَما أَنَّ التَّبشيرَ إخبارٌ فيهِ سُرور}[1]، واتە: (إنذار) بریتیە لە هەواڵ پێدانێك كە ترساندنی تێدا بێ، وە (تَبشیر)یش بریتیە لە هەواڵ پێدانێك دڵخۆشكردنی تێدا بێ.

ئەمەش دوو نموونە لە ئایەتە بە پێزەكانی قورئان، لەو بارەوە كە دەبێ مرۆڤی مسوڵمان ئەركی وریا كردنەوەو ترساندن (إنذار) وە موژدە پێدان و دڵخۆشكردن (تبشیر) وەك دوو ڕەوشتی ڕیشەدار، لە مامەڵەی لەگەڵ خەڵكدا لەخۆیدا بەرجەستە بكات:

---

(١) المفردات، ص ٧٤٢.

یەكەم: خوای باڵا دەست لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (١٢٢)دا، دەفەرمویٚ:

﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ (١٢٢)﴾.

واتە: وە بڕوادارن نابێ ویٚكڕا دەربچن، (ویٚكڕا دەربچن بۆ جەنگ و جیهاد، یاخود بۆ ئەوەی زانیاریی پەیدا بكەن) بەڵكو دەبێ لە هەر كۆمەڵێكی زۆر، كۆمەڵێكی كەمیان دەربچن بۆ ئەوەی لە ئاییندا شارەزا بن، وەدوایی خەڵكەكەی خۆیان ئاگادار بكەنەوەو بترسێنن، هەركاتێك گەڕانەوە لایان، بۆ ئەوەی وریا بن و سوود لەو ترساندن و وریا كردنەوەیەی ئەوان وەربگرن.

دووەم: لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (١٠٢)دا، خوای میهرەبان باسی دڵخۆشكردن (تبشیر) دەكاو دەفەرمویٚ:

﴿قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ (١٠٢)﴾

واتە: بڵێ (ئەم قورئانە) گیانی پاك لە پەروەردگارتەوە دایبەزاندوە، تاكو ئەوانەی كە ئیمانیان هێناوە، پێچەسپاویان بكا، وە تاكو ڕێنمایی و مژدەو دڵخۆشیی بێ بۆ مسوڵمانان.

كەواتە: وەك چۆن قورئان بەدەست پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) مـوژدەدەر (بَشیر) و ترسێنەر (نَذیر) بووە، دەبێ بەدەست مسوڵمانیشەوە هەروابێ و، وە وەك چۆن ئەو ڕەوشت و ئاكارانەی، كە قورئان مسوڵمانانیان بۆ هاندەدا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەموویانی لەخۆیدا بەرجەستە كردوون، مسوڵمانانیش دەبێ ئەو سیفەت و ئاكارانە لەخۆیاندا بێننەدی، لە مامەڵە كردنیان لەگەڵ كۆمەڵگادا.

■ ٥٦ ■

## ئاسانیی لە خەڵك وەرگرتن
## (أَخْذُ العَفوِ مِنَ النَّاس)

مەبەست لەو ڕەوشتە ئەوەیە: کە ئینسان لە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکدا، سەختگیر نەبێ و ئاسانکارو ئاسان وەرگر بێ.

زانایان دەربارەی چەمکی وشەی (عَفو) گوتوویانە: {عَفو المَال: ما يَفضُل عَن النَّفَقة، وَمنه قَوله تعالى: ﴿...وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ...﴿٢١٩﴾﴾ البقرة، {أَي: ما سَهُلَ إنفاقُه}[١]، واتە: (عَفو المال) ئەو ماڵەیە کە لەخۆت زیادەو پێویستیت بە خەرج کردنی نیە، بۆیە خوای بەرز کە دەفەرموێ: لێت دەپرسن: چی ببەخشن؟ بڵێ: (عَفو) واتە: ئەوەی کە لێتان زیادە، چونکە ماڵێك کە لێت زیادەو پێویستیت پێی نیەو پەکت لەسەری نەکەوتوە، ئاسانە بیبەخشی، بۆیە ناوی لێنراوە: زیادە، ئاسان (عَفو)، بەڵام ماڵێك کە خۆت پێویستیت پێیەتی و پەکت لەسەری کەوتوە، بەخشینی ئاسان نیە، کەواتە: ئەوەی کە ئاسانە بیبەخشی، بیبەخشە.

**ئەمەش دوو نموونەی ئایەتەکانی قورئان، لەو بارەوە:**

---

(١) مختار الصحاح، ص ٣٨٩، وعمدة الحفاظ ج٣ ص ٩٧.

یەکەم: خوای بەبەزەیی لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٩٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ١٩٩ ﴾.

واتە: ئەوەی کە ئاسانە، وەریبگرە (لە خەڵك)، وە فەرمان بە پەسند بکە، وە ڕوو لە نەفامان وەربگێڕە.

شارەزایانی زمان گوتوویانە:{(خُذِ ٱلۡعَفۡوَ) أَي: خُذ المَيسورَ مِن أَخلاق الرِّجال، وَلا تَستَقصِي عَلَيْهم}[1]، واتە: ئەوەی لە ڕەوشت و ئاکاری پیاوان، ئاسانەو بەئاسانیی بە دەستیانەوە دێ، ئەوەیان لێ وەربگرە، وە سەخت گیر مەبە لەگەڵیان، تاکو ئەوپەڕی برۆی و نارەحەتیان بکەی: {ئینسانی مسوڵمان دەبێ خەڵك سەغڵەت نەکا، وە خەڵك تووشی گرفت و نارەحەتیی نەکات}.

دووەم: خوای بێ وێنە لە سوورەتی (ص) ئایەتی (٨٦)دا، بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ٨٦ ﴾ ص.

واتە: بڵێ: من کرێتان لێ داوا ناکەم { پاداشتتان لێ داوا ناکەم } بەرامبەر ئەو پەیامەی دەیگەیەنم، وە من لەوانە نیم، کە قورساییتان بخەمە سەر، {تووشی ئەرك و بارگرانییتان بکەم}.



---

(١) مختار الصِّحاح، ص ٣٨٩، و (عمدة الحُفّاظ) ج٣ ص ٩٧.

■ ٥٧ ■

## بە ئارامیی و سەنگینیی ڕۆیشتن
## (المَشيُ بِسَكينةٍ وَوَقار)

یەكێ لە ڕەوشتەكانی ئینسانی ئیماندار ئەوەیە، كە بەنەرمیی و ئارامیی بە ڕێگادا بڕوا، نەك بە فیزو كەشخە، وە نەك بە مردەلۆخەییش، كە دەڵێین: بە پەلە پەل نەڕوا، بە مردەلۆخەییش نەڕوا، وە كە دەڵێین: بە فیزو كەشخە نەڕوا، دیسان: واش نەڕوا كە خەڵك بەزەیی پێیدا بێتەوە، بەڵكو بە حاڵەتێكی مام نێوەندیی بڕوا، حاڵەتی میانجێتیی بۆ هەموو ئاكارو ڕەوشتەكان، شتێكی پێویست و پەسندە.

**ئەمەش دوو نموونە لە ئایەتەكانی قورئان لەو بارەوە:**

**یەكەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الفرقان) ئایەتی (٦٣)دا، ستایشی ئەو بەندانەی خۆی دەكا كە بە سەنگینیی و ئارامیی بەڕێدا دەڕۆن و دەفەرموێ:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾.

واتە: وە بەندەكانی خوای بەبەزەیی، ئەوانەن كە بەئارامیی {یان بە ویقارو سەنگینیی} بەڕێدا دەڕۆن.

ئینسان دەبێ سەرنجی ڕۆیشتنی خۆشیی بدا، كە لە بەندایەتیی كردنی بۆ خواو، شوێنكەوتنی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بوەشێتەوە، ئینسانی نابێ هەروا لام سەرلایی و هاكەزایی تەماشای خۆی بكا، بەڵكو دەبێ وا تەماشای خۆی بكا، كە بەندەی خوایەكی زۆر بەرزو مەزنە، وە شوێن كەوتووی پێغەمبەرێكی زۆر ڕەوشت بەرزو جوانە.

كەواتە: تۆ دەبێ لەقەدەر خواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بی، لەقەدەر ئەو ئیسلامە بەرزە بی، كە هەموو سیفەتێكی بەرزو جوانی تێدایە، وە لەگەڵ هیچ شتێكی خراپ و نزم و پەستدا نیە، ئنجا دەفەرموێ:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا ...(٦٣) ﴾

**دەربارەی وشەی (هَوْن)، زاناو پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی گوتوویانە:**

{الهَون: التَّرفُّق والتَّثبُّت، أي: يَمشون بِسَكينةٍ وَوَقار، لا أَشَراً ولا تَجَبُّراً}[1]، واتە: (هَون) بریتیە لە نەرمیی و پێ چەسپاویی، واتە: بە ئارامیی و سەنگینیی بەڕێدا دەڕۆن، نەك بە فیزو خۆ پەسەندیی و خۆ ڕاوەشاندن.

**دووەم:** خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (لقمان) ئایەتی (١٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ..(١٩) ﴾.

واتە: وە لە ڕۆیشتندا میانجیی بە، {نە زۆر پەلەپەل بكە، نەزۆر بەسستیی بڕۆ}.

**لە بارەی چەمك و واتای وشەی (قَصد)ەوە، زانایان گوتوویانە:**

{القَصْدُ: إتيانُ الشَّيء، وَقصدَ لهُ وقصدَ إلَيهِ، والقَصْدُ بَينَ الإسراف والتَّقتير، يُقال: فُلان مُقْتَصِدٌ في النَّفقة ... والقَصْدُ: العَدْلُ}[2]، واتە: (قَصْد) بریتیە لەوە كە تۆ شتێك

---

(١) عمدة الحفاظ ج٤ ص ٢٦٦، ومختار الصحاح، ص ٦٠٣.

(٢) مختار الصحاح، ص ٤٦٦.

بکەیە ئامانج و بۆی بچی، (وَقَصدَ لهُ وقَصدَ إلَيهِ) هەردووکیان بەیەك واتا هاتوون، (قَصْد)یش بریتیە لەوە کە تۆ لە بەخشیندا لەنێوان زێدەڕۆیی و چەنگ نووقاندندا، ماڵی خۆت ببەخشی و زێدەڕۆیی و قرچۆکیی نەکەی، دەگوترێ: (فلان مُقْتَصِدٌ فِي النَّفَقَة) واتە: فڵان کەس میانجییە لە بەخشیندا، نە زێدەڕۆو دەست بڵاوە، نە ڕژدو چەنگ قوچاوە، (والقَصْدُ: العَدل) وە (قَصد) بریتیە لە دادگەریی و حاڵەتی هاوسەنگیی.

## ■ ٥٨ و ٥٩ و ٦٠ ■

# بە ئینساف بوون و، شتی خەڵك بە كەم نەگرتن، وە دان بە چاكە داهێنان، وە عوزر هێنانەوەو داوای لێبوردن كردن (الإنصافُ وَعَدم بَخسِ النّاس أَشياءَهم، والإعتِراف بالفَضل، والإعتذار).

### ٥٨- بە ئینساف بوون و شتی خەڵك بەكەم نەگرتن (الإنصافُ وَعَدَم بَخسِ النّاسِ أَشياءَهُم):

(المُناوي) لە بارەی چەمك و واتای وشەی (إنصاف)ەوە، دەڵێ: {الإنصافُ: هو العَدل في المُعامَلة، بِأن لا يَأْخُذَ مِن صاحِبه مِنَ المَنافِع إلاّ ما يُعطيهِ، وَلا يُنيلُه مِنَ المَضارِّ إلاّ كَما يُنيله... والإنصافُ والعَدل تُوءمان نَتيجَتُهما: عُلوُّ الهِمَّةِ، وبَراءةُ الذِّمّة باكْتِساب الفَضائِل وتَجَنُّبِ الرَّذائل}[1]، واتە: (إنصاف) بریتیە لە دادگەریی لە هەڵس و كەوتدا، ئەوەیش ئەوەیە كە تەنیا ئەو سوودانە لە هاوەڵەكەی وەربگرێ، كە ئەویش دەیداتێ، وە تەنیا زیانێكی پێ بگەیەنێ، كە ئەو پێی گەیاندوە، وە ئینصاف و عەدل دوانەیەكن، سەرەنجامەكەیان بریتیە لە هیممەت بەرزیی، وە بریتیە لە خۆپارێزیی، {هیممەتی بەرز بێ، وە خۆی بپارێزێ لە شتی ناشیرینكەر، یان گوناهباركەر}، ئەویش بە وەدەستهێنانی ڕەوشتە بەرزەكان، وە خۆپاراستن لە خوو خدە نزم و پەستەكان.

---

(١) التوقيف على مهمات التعاريف، ص ٦٤.

(الرازي)یش لەبارەی مانای (بَخس)ەوە، گوتوویەتی: {البَخس: النّاقِص، وَقَد بَخَسَهُ حَقَّه، أَي: نَقَصهُ}[1]، واتە: (بَخس) بەمانای شتی ناتەواو دێ، (بَخَسَهُ حَقَّهُ) یانی: حەقەکەی نەدایەوە، یاخود لێی کەم کردەوە.

**ئەمەش دوو نموونە لە ئایەتەکانی قورئانی بەپێز، لەو بارەوە:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المطففين) ئایەتەکانی (**١-٣**)دا، دەفەرموێ:

﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾﴾.

واتە: سزای سەخت بۆ مافی خەڵك بەزایەدەران، ئەوانەی کاتێك شتێك بە پێوانە لە خەڵك وەردەگرن، بەتەواویی لێیان وەردەگرن، بەڵام ئەگەر بۆیان بپێون یان بۆیان بکێشن، زیانیان پێ دەگەیەنن، { واتە: حەقی خۆیان بەتەواویی وەردەگرن، بەڵام حەقی خەڵك بەتەواویی نادەن }.

ئنجا لێرەدا مەرج نیە مەبەست تەنها کێشان و پێوانی بەرهەست و ماددیی بێ، بەڵکو کێشان و پێوانی مەعنەوییش دەگرێتەوە.

**دووەم:** هەروەها خوای دادگەر لەسوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٨٥)دا، وە لە سوورەتی (الشعراء) ئایەتی (١٨٣)دا، هەروەها لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٨٥)دا، لە هەرسێ شوێندا، ئەم تەعبیرەی بەکار هێناوە، کەدەفەرموێ:

﴿وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ ..﴾

واتە: وە شتی خەڵك بەکەم مەگرن و سووکی مەکەن.

شتی خۆت چۆن تەماشا دەکەی، هی خەڵکیش ئاوا تەماشا بکە، کە بەڕاستیی ئەوەش ڕەوشت و ئەدەبێکی جوانە، کە ئینسان شتی خەڵکیش وەك هی خۆی تەماشا بکا.

---

(١) مختار الصحاح، ص ٥٠.

٥٩- دان بە چاکەی خەڵکدا هێنان (الإِعتِرافُ بالفَضل):

مەبەست لەم ڕەوشتە بەرزو پەسندەش -کە مرۆڤی مسوڵمان پێویستە مامەڵەی پێ لەگەڵ خەڵکدا بکات- ئەوەیە کە: ئەگەر کەسێ چاکەیەکی هەیە، دانی پێدا بێنی، چاکەی خەڵك ببینی، وەك چۆن چاکەی خۆت دەبینی، وە خراپەی خۆشت ببینی، وەك چۆن خراپەی خەڵك دەبینی.

زانایان لەبارەی چەمکی وشەی (إعتراف) و (الإعتراف بِالفَضل)ەوە گوتوویانە:

{الإعترافُ بِالفَضل: مَصدر إِعتَرف بِالشَّيءِ أَي: أقرَّ بهِ، وَهو مَأخوذ مِن مادّة (ع ر ف) الَّتي تَدُلُّ عَلى مَعنَيَيْن:

١- تَتَابع الشَّيء مُتَّصلاً بَعضَه بِبَعض، وَمِن ذٰلِك عُرْف الفَرس.

٢- السُّكون والطُّمَأْنينَة، وَمِنه المَعرفَة والعِرفان، والإِعترافُ بِالفَضل: هوَ أن يُقِرَّ المتفَضَّل عَلَيه مِنَ النّاس بفَضل مَن يَصدُر مِنه الفَضْل، ولا يَجْحَدُهُ أو يَتَناساهُ}[1]، واتە: وشەی (إعتراف) چاوگە لە (إعترف بالشيء، أي أقرَّ به) دانی پێدا هێنا کە لە ماددەی (ع ر ف)ە وەرگیراوە، کە دوو واتایان دەگەیەنێ:

١- شتێك بەدوای شتێکدا بێت و بەیەکەوە پەیوەست بن، بۆیەش بەو موانەی سەر پشتە ملی ئەسپ گوتراوە: (عُرف الفَرس)، چونکە ڕیزن و بەدوای یەکدا دێن، { هەروەها بە پۆپڕەی کەڵەشێریش گوتراوە: (عُرف الدِّيك) چونکە ئەویش پۆپڕەکەی، کە چەند نووکێکی پێوەن و بەدوای یەکدا دێن }.

٢- مانای دووەمی (عُرف) ئەوەیە کە ئارامیی و ئۆخژن دەگەیەنێ، بۆیە وشەی مەعریفەت و عیرفان لەوەوە هاتوون، { کاتێ ئینسان یەکێ دەناسێ، پێی ئارام دەبێ و، ئارامیی و ئۆخژنی بۆ دێ بەهۆیەوە }.

---

(١) نضرة النعيم، ج٢ ص ٣٩٧.

كەواتە: (الإعترافُ بِالفَضل) ئەوەیە كەسێك چاكەیەكی لەگەڵدا كراوە، لەلایەن یەكێكەوە، چاكەی ئەو چاكەكارە ببینێ و وە نكووڵیی لێ نەكاو لەبیریشی نەچێتەوە.

كە ئەوەش بەڕاستیی ڕەوشتێكی بەرزو جوانە، ئینسان چاكەی چاكەكاران ببینێ، وە فەرامۆشی نەكا، پێشینان دەڵێن: (دۆست بگرە بە چایەك، مەیدە بەدنیایەك).

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٢٣٧)دا، دەفەرمویێ:

﴿ ...وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ... ﴿٢٣٧﴾ ﴾.

واتە: چاكەی نێو خۆتان فەرامۆش مەكەن.

دیارە مەبەستی ژن و مێردە، كە لەیەك جیا دەبنەوە، بەڵام واتایەكەی گشتییە، كەسێك چاكە لەگەڵ كەسێك دەكا، پێویستە چاكە لەگەڵ كراو، چاكەی چاكەكاری لەیاد بێ، واباشە ئینسان ئەگەر چاكەی لەگەڵ خەڵكدا كرد، چاكەكە لەبیر خۆی بەرێتەوە، گوتراوە: (چاكە بكەو بە ئاوێی دادە)، بەڵام واباشە ئەگەر خراپەیەكی لەگەڵ كەسێدا كرد، هەر لەبیری بێ، بۆ ئەوەی هەمیشە بچێ داوای لێبوردنی لێ بكاو خۆی بە قەرزداری بزانێ.

٦٠- عوزر هێنانەوەو داوای لێبوردن كردن (الإعتذار):

شارەزایانی زمان لەبارەی چەمك و واتای (إعتذر)ەوە، گوتوویانە:

أ- {الإعتِذار: مَصدر إعتذر، مِن مادّة (ع ذ ر) الَّتي تَدُلُّ عَلى مَعانٍ كَثيرة، غَير مُنقادة ومِنها: العُذر وهو رَوْمُ الإنسانِ إصلاحَ ما أُنكِرَ عَليه بِكلام، يُقال مِنه: عَذَرتهُ، أَعذِرُهُ، عُذراً}. واتە: (إعتذار) چاوگی (إعتَذر)یە، كە لە ماددەی (ع ذ ر)ەوە هاتوە، كە چەند مانایەك دەگەیەنێ بەیەكەوە گونجاو نین، یەكێ لە مانایەكانی (عُذر) بریتیە لەوە كە ئینسان هەوڵبدا شتێكی كە كردوە، بیەوێ چاكی بكاتەوە، { بۆ وێنە: خراپەی لەگەڵ یەكێ كردوە، بیەوێ چاكی بكاتەوە }، وە دەگوترێ: (عَذَرتهُ أَعذِرُهُ عُذراً) واتە: پۆزشم بۆ هێنایەوەو داوای لێبوردنم لێكرد، پۆزشی لێ كرد، پۆزش لێكردن.

ب- الإعتذار: {مَحو أَثَرِ الذَّنب، أَو تَحرِّي الإنسان ما يَمْحو بِهِ أَثَرَ ذَنبهِ}[1]، (إعتذار) ئەوەیە كە ئینسان هەوڵ بدات شوێنەواری گوناح بسڕێتەوە، یان هەوڵدانی ئینسانە بۆ سڕینەوەی شوێنەواری گوناح و هەڵەیەك، كە بەرامبەر بە كەسێك كردوویەتی.



---

(١) الصحاح للجوهري، ج٢ ص ٧٣٧-٧٤٠، والمصباح المنير ص ٣٩٨، والتعريفات، ص ٢٩، والكليات، ص ٣٠٨، والتوقيف، ص ٥٥.

■ ٦١ ■

# گوێ گرتن بۆ قسەی هەر کەسێك و شوێنکەوتنی باشترینی (الإستِماع لِكَلام الآخِرين واتِّباع أَحسَنه)

ئینسان دەبێ گوێ بۆ قسەی هەموو کەس بگرێ و، داخراو نەبێ و کراوە بێ، وە هەوڵیش بدات لە قسەی هەرکەسێکدا، باشترینی لێ هەڵبژێرێ، وە شوێنی بکەوێ و تەبەنیی بکاو، لێی بەهرەمەندبێ.

(الرازي) لەبارەی مانای وشەی (إستماع)ەوە، دەڵێ: {إِسْتمع لَه: أَي: أَصْغى وَتَسَّمع إِليه، واسَّمَّع إِليه}[1]، واتە: گوێی بۆ هەڵخست و لێی وەرگرت.

(الرازي)یش دەربارەی وشەی (تبِعَهُ) دەڵێ: {تَبِعَهُ: إِذا مَشى خَلفهُ فَمَضى مَعه، وَكَذا إِتَّبعهُ، وَهُو إِفتَعل}[2]، واتە: شوێنی کەوت و لەدوایەوە ڕۆیشت، وە (إِتَّبع)ەش کە لەسەر کێشی (إِفتَعل)ەیە، هەر یانی: شوێن کەوتن.

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الزمر) ئایەتەکانی (١٧و ١٨)دا، دەفەرموێ:
﴿...فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾﴾،

واتە: موژدە بدە بەو بەندانەم، کە گوێ لە هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام شوێن باشترینی دەکەون، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، وە ئا ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

---

(١) مختار الصحاح، ص ٢٨٢.
(٢) مختار الصحاح، ص ٧٨.

## ■ ٦٢ و ٦٣ ■

## تەنیا قسەی باش لەگەڵ خەڵك كردن و، هەڵبژاردنی باشترین شێوازی دەربڕین
## (مُحادَثةُ النّاسِ بِما هوَ حَسنٌ فَحَسب، واخْتيارُ أَفضَل الأَساليب التَّعْبيرية)

شایانی باسە ئێمە ئەم دوو ڕەوشتە: تەنیا قسەی باش لەگەڵ خەڵك كردن و، هەڵبژاردنی باشترین شێوازی دەربڕین، وێكڕاو بە جووتە باس دەكەین، چونكە زۆر پێكەوە پەیوەست و تێكهەڵكێشن.

بەڵێ، پێویستە ئینسانی مسوڵمان، تەنیا قسەی باش لەگەڵ خەڵكدا بكا، وە دەبێ لە قسە كردنەكەشیدا تەنیا بەوە واز نەهێنێ كە قسەكە باش بێ، بەڵكو شێوازی باشیشی بۆ هەڵبژێرێ، با بەوێنەیەك بۆتان ڕوون بكەمەوە كە قسەی باش، دەبێ شێوازو دەربڕینی جوانی لەگەڵدا بێ: ئەگەر شانە هەنگوینێكی چاك و ئەصڵت پێ بێ، ئەوە لەكوێ بیخەیە سەر سینییەكی جوان و سەرنانەیەكی خاوێنی بەسەردابدەی، یان بیخەیە قاپێكی شكاوو ژەنگاوییەوە! خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ:

﴿ وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ۗ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: قورئانمان بەهەق ناردۆتە خوار، {هاتنە خواری قورئانە حەقە}، (وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ) وە حەقیشی لەنێو خۆیدا هەڵگرتوە، هەم خۆی حەقە، هەم شێوازو كات و شوێنی دابەزینەكەشی، حەق بووە.

ئەمەش سێ نموونە لە ئایەتەكانی قورئانی بەرزو بەپێز، لەبارەی ئەو دوو ڕەوشت و ئاكارە پەسندو دڵگیرەوە:

یەكەم: خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (البقرة)دا ئایەتی (٨٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ ... وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا الصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا الزَّكَوٰةَ .. ﴿٨٣﴾ ﴾.

واتە: وە قسەی باش لەگەڵ خەڵكدا بكەن، وە نوێژ بەرپا بكەن و، زەكات بدەن. خوای كارزان، قسەی باش لەگەڵ خەڵك كردنی، خستۆتە پێش نوێژ بەرپاكردن و زەكات دانەوە، تاكو بزانرێ كە ئیسلامەتیی تەنیا نوێژ بەرپا كردن و زەكاتدان نیە، بەڵكو دەبێ گفت و لفت و شێوازی دواندنیشت، لەگەڵ خەڵكدا چاك و پەسند بێ.

دووەم: خوای گەورەو مەزن لە سووڕەتی (الإسراء) ئایەتی (٥٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا الَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ .. ﴿٥٣﴾ ﴾.

واتە: وە بەبەندەكانم بڵێ: كامە قسەی باشترە، ئەوە بكەن، چونكە شەیتان بەینیان تێك دەدا.

بۆیە وەك چۆن باشترین قسە دەكەی، شێوازی هەرە باشی قسەكردنیش بەكار بێنە، چونكە جاری وا هەیە تۆ مەبەستێكی باشت هەیە، بەڵام كە شێوازی دەربڕینەكەت باش نەبوو، ئەو حەقەی كە دەیڵێی، لێت وەرنا گیرێ.

سێیەم: هەروەها خوا (تبارك و تعالى) لەسووڕەتی (البقرة) ئایەتی (١٠٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا لَا تَقُولُوا رَٰعِنَا وَقُولُوا انظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! مەڵێن: (رَٰعِنَا) {واتە: چاودێرییمان بكە}، بەڵكو بڵێن: (انظُرْنَا) واتە: چاوەڕێیان بكەو چاودێرییمان بكە.

كە واتایان زۆر لێك نزیكە، بەڵام ئەو كاتە جوولەكەكان (رَٰعِنَا)یان بۆ مەبەستی خراپ بەكار دەهێنا، بۆیە خوای كاربەجێ لێی قەدەغە كردن، ئەو وشەو تەعبیرە بەكار بهێنن[1]، با وشەو تەعبیرێكی دیكە بەكاربهێنن، كە شتی خراپی لێ نەفامرێتەوە، كەواتە: ئینسان دەبێ شێوازی دەربڕینیشی چاك بێ، وێڕای ئەوەی كە قسەكەی لە خودی خۆیدا باشە.

---

(١) بڕوانە: المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص ٨٦.

## ٦٤ و ٦٥

# گفت و گۆی هێمنانەو، شەڕە قسە کردن بە چاکترین شێوە (الحِوار الهادِيء، والجِدال بِالَّتي هيَ أَحْسن)

ئینسان جار جار پێویست دەکا لەگەڵ خەڵکدا دیالۆگ بکا، وتووێژو گفتو گۆ بکا، دەبێ ئینسان وتووێژەکەی هێمن و ئارام بێ، هەروەها جاری واشە ناچار دەبێ شەڕە قسە بکات، ئەو کاتەش پێویستە شەڕە قسەکەی باشترین شێوازی بۆ هەڵبژێرێ.

### ٦٤- گفت و گۆی هێمنانە (الحِوار الهادِيء):

شارەزایانی زمانی عەرەبیی بەمجۆرە لەبارەی چەمکی وشەی (حِوار)ەوە، دواون: {الحِوار والمُحاورة: المُراجَعة والمرّادة في الكَلام}[1]، واتە: (حِوار ومُحاورة) بریتیە لەوە کە ئینسان لەگەڵ بەرانبەرەکەیدا قسە بکا، کە ئێستا وشەی دیالۆگی بۆ بەکار دەهێنن، وە وتووێژو گفت و گۆی بۆ بەکار دەهێنن.

**ئەمەش سێ نموونە لە ئایەتەکانی قورئان، لەبارەی وتووێژ (حوار)ەوە:**

---

(١) عمدة الحفاظ، ج١ ص ٤٦٤.

یەكەم: خوای پەروەردگار وشەی (حِوار)ی لە سوورەتی (الكهف) ئایەتی (٣٧)دا، بەكار هێناوە، دەفەرموێ:

﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ ﴾.

واتە: هاوەڵەكەی پێی گوت، لەكاتێكدا كە وتووێژی لەگەڵدا دەكرد: ئایا بێ بڕوابووی بەو كەسەی كە تۆی لە گڵ دروست كردوە، دوایی تۆی لە تۆویلكە (نُطفة)یەك دروست كردوە، دوایی تۆی كردوە بە پیاوێك (پڕ بە كراس)؟!، ئایا بەرامبەر بەو خوایە سپڵە دەبی؟.

دووەم: وە خوا لە سوورەتی (المجادلة) ئایەتی (١)دا، دەفەرموێ:

﴿ ..وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ﴾

واتە: وە خوا گوێی لە وتووێژو گفت و گۆكەتان بووە، (هی پێغەمبەری خواو (صلى الله عليه وسلم) وە (خوله بنت ثعلبة)[1].

سێیەم: لە سوورەتی (یوسف) ئایەتەكانی (٣٩- ٤٠)دا، (یوسف) (سەلامی خوای لێبێ)، ئاوا وتووێژ لەگەڵ دوو هاوەڵە زیندانییەكەیدا دەكا:

﴿ يَـٰصَـٰحِبَىِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَـٰنٍ.. ﴿٤٠﴾ ﴾.

واتە: ئەی دوو هاوەڵە زیندانییەكەم! ئایا چەند پەرستراوێكی جیاواز باشترن {ئینسان بیانپەرستێ} یاخود خوایەكی تەنیای مل پێ كەچكەر؟! ئێوە لەجیاتی خوا، جگە لە چەند ناوێك كە خۆتان و باب و باپیرانتان ئەو ناوانەتان هەڵداوە، ناپەرستن، كە خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوارێ.

دیارە ئەمە شێوازێكە لە شێوازی گفت و گۆی هێمنانە.

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص ١٣٧٢.

## ٦٥- شەڕە قسە بەباشترین شێواز (الجِدالُ بِالَّتي هيَ أَحسن):

ئەگەر سەرنجتان دابێ، خوای پەروەردگار مەگەر چۆن، ئەگەرنا لە قورئاندا هەر باسی شەڕە قسە (جِدال)ی كردبێ، بۆ ئیمانداران، حەتمەن فەرموویەتی بەباشترین شێوە، بیكەن، بۆ وێنە: دەفەرموێ:

﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ..﴿٤٦﴾﴾ العنكبوت.

واتە: وە شەڕە قسە لەگەڵ خاوەن كتێبەكاندا مەكەن، مەگەر بە چاكترین شێواز. هەروەها فەرموویەتی:

﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ..﴿١٢٥﴾﴾ النحل.

هەمیشە دەبێ چاكترین شێواز بۆ شەڕە قسە بكار بهێنرێ، چونكە شەڕە قسە، مەزەنەی ئەوەی لێ دەكرێ، كە بەرامبەرەكەت دڵی توند بێ و هەڵبچێ و تووڕە ببێ، ئنجا ئەگەر شێوازەكەت زۆر جوان نەبێ، ئەوە ڕەنگە بێزار ببێ و، زیاتر بیانووی دەست دەكەوێ، كە ئەو هەقەی پێی دەڵێی، لێت وەرنەگرێ.

**سەرەتا با سەرنجی شیكردنەوەی زاناو پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی بدەین بۆ چەمك و واتای (جِدال):**

أ- (إبن فارس) دەڵێ: {الجِدال بِالَّتي هِيَ أَحْسَن: الجِدال: مَصدر قَولِهِم: جادلَهُ يجادِلهُ جِدالاً ومُجادَلة مِن مادّة (ج د ل) أصلٌ واحدٌ، وهوَ مِن بابِ استِحكام الشَّيء في اسْتِرسالٍ يَكون فيهِ، وامتِدادِ الخُصومة ومراجعةِ الكلام}[1]، واتە: (جِدال) چاوگی ئەو قسەیانە كە دەڵێ: (جادلَهُ يجادِلهُ جدالاً ومجُادلة) لە ماددەی (ج د ل)ەوە هاتوە، كە بەهێزبوون و مەحكەم بوونی شتێك دەگەیەنێ، لەگەڵ درێژ بوونەوەی مشت و مڕ و شەڕە قسەدا.

---

(١) مقاييس اللغة، ج١ ص ٤٣٣.

ب- (**راغب الأصفهانـي**) دەربارەی (جِدال) دەڵێ: {الجِدال: المُفاوضَة عَلى سبَيل المُنازَعة والمغالبة}[١]، واتە: (جِدال) بریتیە لە قسەکردن بەشێوەیەك کە ناکۆکیی تێدا بێت و، هەرکامێکیان بیەوێ بەسەر ئەویدیکەیاندا زاڵ بێ.

ج- (**المُناوي**) دەڵێ: {الجدال: هوَ التَّخاصُم بِما يَشغل عَن ظُهور الحَقِّ وَوضوحِ الصَّواب}[٢]، واتە: (جِدال) بریتیە لە ناکۆکیی و مشت و مڕێك کە وابکات ڕێگا بگرێ لە دەرکەوتنی حەق و، لە دەرکەوتن و ڕۆشنبوونەوەی ئەوەی کە ڕاستە.

چونکە لە (مُجادَلة)دا هەر کامێکیان دەیەوێ خۆی سەربکەوێ، هەتا هەندێ گوتوویانە: (مُجادلة) بە (المَجدوُلة)ەوە هاتوە، واتە: زەوی، کە هەر کامێکیان دەیەوێ ئەوی دیکەیان بە ئەرزێ دابدا.

**ئەمەش چوار نموونە لە دەقەکانی قورئان و سوننەت لەبارەی (جِدال)ەوە:**

**یەکەم:** خوای زاناو توانا لە سوورەتی (العنکبوت) ئایەتی (٤٦)دا، دەفەرموێ:

﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ .. ﴿٤٦﴾﴾.

واتە: وە شەڕە قسە لەگەڵ خاوەن کتێباندا مەکەن، مەگەر بە شێوازێك کە باشترینە.

**دووەم:** هەروەها خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (١٢٥) دا، دەفەرموێ:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ..﴿١٢٥﴾﴾

واتە: بانگەواز بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت {واتە: بە لێزانیی و

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٧٨.

(٢) التوقيف على مهمات التعاريف، ص ١٢٢.

وەستایی}، وە بە ئامۆژگاریی چاك، وە بەباشترین شێوە شەڕە قسەو مشت و مڕیان لەگەڵدا بکە.

سێیەم: بەڵام بە نسبەت کافرانەوە خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الكهف) ئایەتی (٥٦)دا دەفەرموێ:

﴿ .. وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُواْ بِهِ ٱلْحَقَّ ...٥٦ ﴾.

واتە: وە ئەوانەی بێ بڕوان، بە بەتاڵ و ناهەق، شەڕە قسە دەکەن، بۆ ئەوەی حەقی پێ بەرپەرچ بدەنەوە.

چوارەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە، کە شەڕە قسە (جِدال) باش نیە، مەگەر بە ناچاریی، فەرموویەتی:

{مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ، إِلَّا أُوتُوا الْجَدَلَ، ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ ... مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ٥٨ ﴾} أخرجه أحمد برقم (٢٢٢١٨)، والترمذي برقم (٣٢٥٣) وقال: حسن صحيح، وابن ماجه برقم (٤٨)، والطبراني برقم (٨٠٦٧)، والحاكم برقم (٣٦٧٤) وقال: صحيح الإسناد، قال شعيب الأرنؤوط: حديث حسن بطرقه وشواهده، قال الألباني: حسن.

واتە: هیچ کۆمەڵێك دوای ئەوەی لەسەر ڕێنمایی و ڕێی ڕاست بوون، سەریان لێ نەشێواوە، مەگەر بەهۆی شەڕە قسەو مشت و مڕی بێ جێوە، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ .. مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ٥٨ ﴾ الزخرف.

واتە: ئەو وێنەیەیان بۆتۆ نەهێنایەوە، مەگەر وەك شەڕە قسەو بەزاندن، ئەویش ئەوەبوو کە بە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) گوت: ئایا تۆ ناڵێی هەموو ئەوانەی بت دەپەرستن و پەرستراویشیان لە دۆزەخ دان، ئنجا نەصرانییەکان عیسا دەپەرستن، کەواتە: عیساش دەبێ لە دۆزەخ دابێ!!

دوایی خوای زاناو شارەزا لە سووڕەتی (الأنبياء)دا ڕوونی کردەوە، کە مەبەست لە پەرستراوانێك کە لەگەڵ پەرستەرەکانیاندا دەچنە دۆزەخ، بت و صەنەمەکانن،

یاخود ئەوانەن کە ڕازیی بوون لە جیاتی خوا بپەرسترێن، بەڵام عیسا (سەلامی خوای لێبێ)، وە پیاوچاکانێك کە حاشایان کردوە لەو کەسانەی کە لە کەوڵی خۆیان دەیانبەنە دەرو، لە ئاستی خۆیان زیاتر بەرزیان دەکەنەوەو، بەپیرۆزیان دادەنێن و دەیانپەرستن، مادام حاشایان لێکردوون و بەرائەتیان لێکردوون، کەواتە: وە بەر ئەو هەڕەشەیە ناکەون، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: بێگومان ئەوانەی موژدەی هەرە باشی ئێمەیان بۆ پێشکەوتوە، ئەوانە لە دۆزەخ دوور خراوەن. دەنگی قرچەی نابیستن، وە لەنازو نیعمەتێکدا کە نەفسیان ئارەزووی دەکات، بە هەمیشەیی دەمێننەوە.

■ ٦٦ ■

## لە نیگای خۆ گرتنەوەو، داوێنی خۆ پاراستن
## (الغَضُّ مِنَ البَصر، وَحِفظُ الفَرَج)

یەكی دیكە لە ڕەوشتەكانی ئینسانی ئیماندار ئەوەیە، كە لە نیگای خۆی بگرێتەوەو چاو نەبڕێتە ئەو شتانەی كە ئارەزووی دەجوولێنن، چ بۆ پیاوان، چ بۆ ئافرەتان، چاو نەبڕنە جوانییەكانی یەكدی، وە داوێنی خۆشیان بپارێزن.

(راغب الأصفهاني) لەبارەی چەمك و واتای وشەی (غَض)ەوە، دەڵێ: {الغَضُّ: مَصدر قَولِهم: غَضَّ بَصَرهُ يَغُضُّهُ غَضّاً، وَهو مَأخوذ مِن مادَّة: (غ ض ض) الَّتي تَدُلُّ على مَعنَيَين: ١- الكَفّ والنَّقص. ٢- الطَّراوة، وغَضّ البَصَر مِن المَعنى الأوَّل}[1].

واتە: وشەی (غَض) چاوگە لەو قسەیانەوە كە دەڵێ: (غَضَّ بَصَرَهُ يغُضُّه غَضّاً)، واتە: لە چاوی خۆی گرتەوە، لە ماددەی (غ ض ض)ەوە، هاتوە، كە دوو مانایان دەگەیەنێ:

- نەهێشتن و ناتەواویی.
- تەڕو تازەیی.

دیارە (غض البَصر) لە مانای یەكەمیانە، واتە: ئینسان لە نیگای خۆی بگرێتەوەو لێی كەم بكاتەوە.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٣٣٩.

(إبن كثير) دەڵێ: {أَن يَغُضُّوا مِن أَبْصارِهم عَمّا حُرِّم عَليْهم، فَلا يَنظُروا إلاّ إلى ما أَباح لَهُم النَّظر إليه}[1]، واتە: لە نیگای خۆ گرتنەوە، ئەوەیە كە ئینسانی مسوڵمان چ پیاو چ ئافرەت، لە چاوی خۆی بگرێتەوە، لەبەرامبەر شتێكدا كە لێی قەدەغە كراوە، تەماشای بكا، مەگەر ئەو شتانەی كە ڕەوان، ئەگەرنا سەرنجیان نەداو چاویان تێ نەبڕێ.

دەربارەی داوێنی خۆ پاراستن (حِفظ الفَرَج)یش (البَغَوي) دەڵێ:{الفَرْج إسم يَجمع سَوأَة الرَّجل والمَرأة، وَحفْظ الفَرْج: التَّعَفُّفُ عَنِ الحَرام}[2]، واتە: (فَرْج) واتە: پاش و پێشی {یاخود ئەندامی زاو زێی} پیاوو ئافرەت، وە پاراستنی داوێن، بریتیە لە خۆ پاك ڕاگرتن لە بەرامبەر شتێكدا كە قەدەغەیە.

**ئەمەش دوو نموونە لە دەقەكانی شەریعەت لەو بارەوە:**

یەكەم: خوای پاك و تاك، هەم لە بارەی نیگای خۆ گرتنەوە، هەم دەربارەی داوێنی خۆ پاراستن، دەفەرموێ:

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ .. ﴿٣١﴾﴾ النور.

خوای بەبەزەیی بەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: بە پیاوانی ئیماندار بفەرموو: لە نیگای خۆیان بگرنەوە، وە داوێنی خۆیان بپارێزن، وە بەئافرەتانی بڕوادار بفەرموو: لە نیگای چاوەكانیان بگرنەوە، وە داوێنی خۆیان بپارێزن.

ئنجا وەك گوتراوە: {النَّظر بَريدُ الزِّنا}، واتە: ڕوانینی بە ئارەزووەوە، پۆستەی زینایەو لە ئەنجامی سەرنجدانی ناشەرعیی و حەڕامەوە، ئینسان بەرەو داوێن پیسیی دەچێ.

---

(١) تفسير إبن كثير، ج٢ ص ٥٨٩.

(٢) معالم التنزيل ج١٨ ص ٣٠٣.

لەو بارەوە (أحمد شوقي) شاعیر شیعرێکی جوانی هەیە دەڵێ:

{نَظرةٌ فإبْتِسامَةٌ فَسَلامٌ فَكَلامٌ فَمَوْعِدٌ وَلِقاء}، واتە: ڕوانینێکەو، زەردەخەنەیەکە، دوایی سڵاو کردنێکە، دوایی قسە کردنێکە، دوایی جێژوان دانانێکەو، دوایی پێکگەیشتنە.

بۆیە خوای کاربەجێ بۆ هەندێ لەو گوناهانە، یاخود دەربارەی سنوورەکانی خۆی، دەفەرموێ: ﴿.. فَلَا تَقْرَبُوهَا .. ﴿١٨٧﴾﴾ البقرة، واتە: نزیکیان مەکەون.

هەندێ گوناح ئەگەر لێی نزیك بوویەوە، ڕەنگە دوایی بخلیسکێی.

بەڵام بۆ هەندێکی دیکە لە سنوورەکانی دەفەرموێ: ﴿.. فَلَا تَعْتَدُوهَا . ﴿٢٢٩﴾﴾ البقرة، سنوورەکانی مەبەزێنن. یانی: لەو جۆرەیان نزیکیشیان بکەونەوە ئاساییە، گرنگ ئەوەیە نەبەزێنرێن.

دووەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{اضْمَنُوا لِي سِتًّا مِنْ أَنْفُسِكُمْ، أَضْمَنْ لَكُمْ الْجَنَّةَ، أَصْدُقُوا إِذَا حَدَّثْتُمْ، وَأَوْفُوا إِذَا وَعَدْتُمْ، وَأَدُّوا إِذَا اؤْتُمِنْتُمْ، وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ، وَغُضُّوا أَبْصَارَكُمْ، وَكُفُّوا أَيْدِيَكُمْ}، أخرجه أحمد برقم (٢٢٨٠٩)، وابن حبان برقم (٢٧١)، والحاكم برقم (٨٠٦٦)، وقال: صحيح الإسناد، وتعقبه الذهبي في التلخيص وقال: فيه إرسال، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٤٨٠٢)، وأخرجه أيضاً: البيهقي برقم (١٢٤٧١)، قال الهيثمي (١٤٥/٤): رواه أحمد، والطبراني في الأوسط، ورجاله ثقات إلا أن المطلب لم يسمع من عبادة، قال شعيب الأرنؤوط : حسن لغيره وهذا إسناد رجاله ثقات.

واتە: ئێوە شەش شتانم لە نەفسی خۆتاندا گرەنتیی (ضمانة) پێ بدەن، منیش گرەنتیی چوونە بەهەشتتان پێ دەدەم:

١- هەرکاتێ قسەتان کرد، ڕاست بێژ بن.
٢- هەر کاتێك گفتتان دا، گفتی خۆتان بەجێ بێنن.
٣- هەرکاتێك سپاردەتان پێ سپێردرا، دەست پاك بن و بیپارێزن.
٤- داوێنی خۆتان بپارێزن.
٥- چاوی خۆتان بگرنەوە.
٦- وە دەستی خۆتان بگێڕنەوە {لە حەڕام و لە هەر شتێك کە ستەم و خراپەو ناشەرعییە}.

■ ٦٧ ■

## خۆ پاكڕاگرتن لە كاتی هاوسەر گیریی نەكردن دا (الإِستِعفافُ عِندَ عَدَم الزَّواج)

كاتێك كە ئینسان ناتوانێ هاوسەرگیریی بكا، دەبێ خۆی كۆنترۆڵ بكاو خۆی پاك ڕابگرێ.

**سەرەتا با سەرنجێكی شیكردنەوەی زانایان بدەین، بۆ چەمك و واتای وشەی: (إِستِعفاف):**

أ- **(إبن فارس)** دەڵێ: {الإِستِعفاف، العِفّة: مَصدَر قَولِهم: عَفَّ عَنِ الشَّيء يَعِفُّ عِفَّهُ، مِن مادّة: (ع ف ف) الّتي تَدُلُّ عَلى (الكَفِّ عَنِ القَبيح)}[1]، واتە: وشەی (العِفّة) چاوگە لەو قسەیانەوە هاتوە، كە دەڵێ: (عفَّ عن الشَّيء يعِفُّ عِفَّةً) واتە: خۆی لە بەرامبەر ئەو شتەدا پاك ڕاگرت، لە ماددەی (ع ف ف)ەوە هاتوە، كە دەلالەت دەكا لەسەر دەستگرتنەوەو خۆپاراستن لە شتی ناقۆڵاو ناشیرین.

ب- **(راغب الأصفهاني)**یش دەڵێ: {العِفّة: حُصولُ حالَةٍ لِلنَّفس تَمْتَنِع بِها عَن غَلَبَةِ الشَّهوة}[2]، واتە: (عِفّة) بریتیە لە پەیدابوونی حاڵەتێك بۆ نەفس، كە بەهۆی ئەو حاڵەتەوە، نەفس خۆی لەوە دەپارێزێ ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بێ.

---

(١) مقاييس اللغة، ج٤ ص٣.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص٣٣٩.

**ئەمەش دوو نموونەی دەقەکانی قورئان و سوننەت لەو بارەوە:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النور) ئایەتی (**٣٣**)دا، دەربارەی ئەوە کە مرۆڤ دەبێ خۆی پاك ڕابگرێ لە بەرامبەر هەڵس و کەوتە جینسییە قەدەغەکاندا، دەفەرموێ:

﴿ وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغۡنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ.. ﴿٣٣﴾ ﴾ النور.

واتە: وە ئەوانەی کە ناتوانن هاوسەرگیریی بکەن، با خۆیان پاك ڕابگرن و خۆیان کۆنترۆڵ بکەن، تاکو خوا لە بەخششی خۆی بێنیازیان دەکا.

واتە: {تاکو ئەو کاتە توانای هاوسەرگیرییان دەبێ، یاخود: با لەسەرەتاوە مەشق بەخۆیان بکەن و خۆیان ڕابهێنن، تاکو دوایی ئەو خۆپاك ڕاگرتنە، تێیاندا دەبێتە سیفەت و مەلەکەیەکی بەهێز، وە خوای پەروەردگار بێ نیازیان دەکا لەوەی زەحمەت بە خۆیانەوە بکێشن، چونکە دوای ئەوەی ئینسان لەسەر ڕەوشتی بەرزو جوان خۆی ڕاهێنا، تێیدا دەبێ بە مەلەکەیەك، وەك چۆن هەناسە دەدا، ئاوا ئەو ڕەوشتە بەرزو جوانە لەخۆیدا دێنێتە دی، بێ ئەوەی کە تووشی زەحمەت بێ، بەڵام لە ئێستاوە با خۆیان پاك ڕابگرن (وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ).

**دووەم:** پێغەمبەری خواش دەفەرموێ:

{وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفُّهُ اللَّهُ...}[1].

واتە: هەرکەسێ خۆی پاك ڕابگرێ، خوا پاکیی پێ دەبەخشێ و پاکی دەکا {لە ئەنجامی ئەوەدا کار لەسەر خۆی دەکا}.

---

(١) پێشتر تەخریج کراوە.

■ ٦٨ ■

## بە شەرم و شكۆ بوون، لە هەموو هەڵس و كەوتێكدا (التَّخَلُّقُ بِالحَياءِ في كافَّة التَّصرُّفات)

ڕەوشت و ئاكارێكی دیكە بەرزو پەسند، كە دەبێ ئینسان لەگەڵ خەڵك و دەورو بەریدا، خۆی پێ برازێنێتەوە، شەرم و شكۆیە.

**پسپۆڕانی زمان لەبارەی چەمك و واتای وشەی (حیاء)ەوە، گوتوویانە:**

أ- {الحَياء: مَصدَر قَولِهم حيِيَ، وَهوَ مَأخوذ مِن مادّة (ح ي ي) الَّتي تَدل عَلى الإستِحياءِ الَّذي هوَ ضِدُّ الوَقاحة ... يُقال: حَيِيتُ مِنهُ أَحيا، إِذا استَحْيَيتَ}[1]، واتە: (الحَياء) چاوگی ئەو قسەیانە كە دەڵێ: (حيِيَ) وە ئەویش لە ماددەی (ح ي ي)ەوە هاتوە، كە دەلالەت دەكا لەسەر شەرم كردن، كە بریتیە لە پێچەوانەی بێ چاوڕوویی، چاو قاییمی، دەگوترێ: (حَيِيتُ مِنه أَحيا)، واتە: شەرمم كرد، شەرمی لێ دەكەم، هەر كات شەرمت لێ كرد.

ب-{الحَياء: تَغَيُّرٌ وإِنكِسارٌ يَعْتري الإنسان مِن خَوف ما يُعاب بِهِ، أَو إِنْقباضُ النَّفس عَن

---

(١) المفردات، ص ١٤٠- ومقاييس اللغة، ج٢ ص ١٢٢.

القَبائح وتَركِها}[1]، واتە: (حَیاء) حاڵەتێكی بەخۆ داشكانەوەیە، تووشی ئینسان دێ، بەهۆی ئەوەوە، كە ترسی هەبێ لە شتێك لێی بە عەیب بگیرێ، یاخود گوتراوە: بریتیە لەوەی نەفس گرژ بێ لەبەرامبەر شتی ناقۆڵاو ناشیریندا، كە لێی بە عەیب بگیرێ، واز لێهێنانی پێی دەگوترێ: (حَیاء).

**ئەمەش سێ نموونەی دەقەكانی شەریعەت لەبارەی (شەرم و شكۆ)وە:**

**یەكەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (القصص) ئایەتی (٢٥)دا، باسی شەرم و شكۆ دەكاو دەفەرموێ:

﴿ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ .. ﴿٢٥﴾ ﴾

واتە: یەكێ لە دوو كچەكە {ی ئەو پیاوە صاڵحە} هاتن بۆ لای {مووسا} كە بەشەرمەوە دەڕۆیشت.

**دووەم:** پێغەمبەری خواش لە فەرموودەیەكدا، دەفەرموێ:

{أَرْبَعٌ مِنْ سُنَنِ الْمُرْسَلِينَ: التَّعَطُّرُ، وَالنِّكَاحُ، وَالسِّوَاكُ، وَالْحَيَاءُ}، أخرجه أحمد برقم (٢٣٦٢٨)، وابن أبي شيبة برقم (١٨٠٢)، والترمذي برقم (١٠٨٠) وقال: حسن غريب، والطبراني برقم (٤٠٨٥)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٧٧١٩). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف، وقال الألباني: ضعيف.

واتە: چوار شت لە ڕەوشتەكانی پێغەمبەرانن: خۆ بۆنخۆش كردن و، هاوسەرگیریی و، زارو ددان پاك كردنەوەو، شەرم و شكۆ.

**سێیەم:** لە وەسفی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) وەك سیفەتی شەرم و شكۆ، گوتراوە:

{كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا} أخرجه أحمد برقم (١١٧٠١) قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە كچی پشت پەردە بەشەرمتر بوو.

---

(١) فتح الباري، ج١ ص ٥٢، والمفردات، ص ١٤٠.

## ٦٩ و ٧٠ و ٧١ و ٧٢

### پۆشتە بوونی ئافرەت و، جوانیی خۆ دەرنەخستنی جگە لەوەی بە شێوەی ئاسایی دەردەکەوێ و، نەڕۆیشتنی بەشێوەیەك کە جوانیی پەنهانی دەربخات و، بە نازو نووزی سەرنج ڕاکێشانە قسە نەکردنی و، نیشتەجێ بوونی لە ماڵداو، لە کاتی دەرچوونی پێویستدا خۆ نەڕازاندنەوەی

(تَسَتُّر المَرأة وَعَدمِ إبداءِ زينَتِها، إلاّ ما ظَهَر مِنها عادَةً، وَعَدم مَشْيها بِصورةٍ جالِبةٍ لِلأنظار لزينَتِها الباطِنة، وَعَدم التَّغَنُّجِ في الكَلام بِصورَة مُلفِتة، والإستِقرار في البَيت، وَعَدمِ التَّبرُّج عِنْد الخُروج).

٦٩- پۆشتە بوونی ئافرەت و، جوانیی خۆ دەرنەخستنی جگە لەوەی بەشێوەی ئاسایی دەردەکەوێ (تَسَتُّر المَرأة وَعَدمِ إبداءِ زينَتِها، إلاّ ما ظَهَر مِنها عادَةً):

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٣١)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ .. ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: لە چاوی خۆیان بگرنەوە، وە داوێنی خۆیان بپارێزن، وە جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی دەردەکەوێ، {ئەوەی کە بە عادەت دەردەکەوێ (القُرطبي) دەڵێ: (لما كان الغالب من الوجه والكفين

ظهورهما عادة وعبادة ... يمكن إرجاع الإستثناء إليهما)[1]. واتە: لەسۆنگەی ئەوەوە کە بەزۆریی وایە ڕووو لەپە دەستەکان بە عادەت و لەکاتی عیبادەتدا دەربکەون .. دەگونجێ هەڵاواردنەکە بۆ ئەوان بگەڕێتەوە} وە با سەرپۆشەکانیان بەسەر یەخەکانیاندا بدەن، {واتە: ئەوە هیچ دەبێ سەرپۆشیان لەسەر بێ، بەڵام دەبێ سینگ و بەرۆکیشیان داپۆشن}.

٧٠- نەڕۆیشتنی ئافرەت بەشێوەیەك کە جوانیی پەنهانی دەربخات (وَعَدم مَشْيها بِصورةٍ جالِبةٍ لِلأنظار لزينَتِها الباطِنة):

خوای میهرەبان لە سووڕەتی (النور) ئایەتی (٣١)دا، دەفەرموێ:

﴿ ...وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ...(٣١) ﴾

واتە: وە با پێیان بە زەویدا نەکوتن، تاکو ئەو جوانییەی کە پەنهانیان کردوە، سەرنجی خەڵکی بۆلا ڕانەکێشن، {واتە: بەشێوەیەك نەڕۆن کە لارو لەنجە بکەن، یان ئەندامەکانیان دەربخەن و سەرنجی خەڵك ڕابکێشن}.

٧١- بە نازو نووزی سەرنج ڕاکێشانە قسە نەکردنی ئافرەت (عَدمُ التَّغنُّج في الكَلامِ بِصورَة مُلفِتة):

خوای زاناو شارەزا لە سووڕەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٢)دا، دەفەرموێ:

﴿ .. فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ..(٣٢) ﴾.

واتە: وە با قسەی نەرم و ناسك نەکەن، بە شێوەیەك کە ئەوەی دڵی نەخۆشیی تێدایە، تەماعیان تێ بکا.

زانایان گوتوویانە: {(فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ) أي: لا تُلِنَّهُ، يقال: خَضَعَتِ المَرأةُ بِكلامِها، وخَضَعَ بِكَلامِهِ: ألانَتْهُ لَه وألانَهُ لَها}[2]، واتە: با قسەی نەرم و ناسك و بە عیشوەو

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٢ ص ١٩٢، ١٩٣.

(٢) عمدة الحفاظ، ج١ ص ٥٠٩.

ناز نەکەن، ئنجا ئەمە جاری وایە پیاو قسەی وا دەکا، بۆ ئەوەی سەرنجی ئافرەت ڕاکێشێ، جاری وایە ئافرەت قسەی وا دەکا بۆ ئەوەی سەرنجی پیاو ڕابکێشێ، بەڵام زیاتر ئافرەتان سەرنج ڕاکێشن بۆ پیاوان، نەك بە پێچەوانەوە، بۆیە خوای پەروەردگار بەتایبەت باسی ئافرەتانی کردوە.

لە ماناکردنی (طمع)یشدا گوتوویانە:

{الطَّمَع: نُزوعُ الشَّيءِ إلى الشَّيءِ، شَهوةً لَه}[1]، واتە: بە ئارەزووەوە جووڵانی شتێکە بەرەو شتێك.

## ٧٢- نیشتەجێ بوونی ئافرەت لەماڵداو، لە کاتی دەرچوونی پێویستدا، خۆ نەڕازاندنەوەی (الإستِقرارُ في البَيت، وَعَدم التَّبرُّج عِند الخُروج):

دیارە ئەمەش یەکی دیکەیە لە سیفەتە بەرزو جوانەکان، کە دەبێ ئافرەتی مسوڵمان خۆییان پێ بڕازێنێتەوە.

**سەرەتا با مانای وشەی (إستقرار) و (تَبَرُّج) بخەینە ڕوو:**

أ- شارەزایان لەبارەی چەمك و واتای (إستقرار)ەوە گوتوویانە: {القرَار: مصدر (قَرَّ) يَقِرُّ في مَكانٍ كَذا، قَراراً: أَي: ثَبَت ثُبوتاً جامِداً، وَأصْله مِنَ القُرِّ وَهوَ مِنَ البَرد مِن حَيثُ أنَّ البَرد يَقتَضي السُّكونَ، كما أنَّ الحَرَّ يَقتَضي الحَرَكة}[2]. واتە: (قرار) چاوگە لە ((قَرَّ) يَقِرُّ في مَكانٍ كَذا، قَراراً) یانی: لە فڵان شوێن نیشتەجێ بوو نیشتەجێ دەبێ، نیشتەجێ بوون، واتە: بە شێوەیەکی نەجووڵاو چەسپا، ئەویش لە ڕیشەدا لە (قَرّ)ەوە هاتوە، کە بەمانای سەرما دێ و خوازیاری نەجووڵانە، وەك چۆن گەرما خوازیاری جووڵانە.

ب- وە دەربارەی وشەی (التَّبَرُّج) گوتوویانە: {التبرُّج: تَفَعُّل مِن البَرَج، وَهوُ الظُّهور،

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٢ ص ٤١٦.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٣ ص ٢٩٣- ٢٩٤.

وَمِنه بُروجُ السَّماءِ، وبُروجُ الحِصنِ لِظُهورِها ... والبُروج: القُصور}[1]، واتە: (تبرُّج) (تَفَعُّل)ە لە (بَرَج)ەوە، كە ئەویش بریتیە لە دەركەوتن، هەر بۆیەش بەئەستێرەكانی ئاسمان گوتراوە: (بروج) وە بەبورجەكانی قەڵا گوتراوە: (بروج) چونكە دیارن، هەروەها (بروج) كۆی (برج)ە، واتە: كۆشك.

ج- (الطبري) گوتوویەتی: {إنَّ التَّبَرُّجَ هوَ إِظْهارُ الزِّينةِ، وَإِبْرازُ المرأة مَحاسِنِها لِلرِّجال}[2]، واتە: (تَبَرُّج) دەرخستنی جوانییە، وە ئەوەیە كە ئافرەت جوانییەكانی خۆی پێشانی پیاوان بدات.

كە خوای زاناو كاربەجێ لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ .. ﴿٣٣﴾ ﴾.

واتە: لە ماڵەكانی خۆتاندا نیشتەجێ بن، {ڕووی دواندن لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام ئافرەتانی مسوڵمانیش دەگرێتەوە}، وە {كاتێك لەماڵ دەرچوون} بە خۆڕازاندنەوەی سەردەمی نەفامیی، خۆتان مەڕازێننەوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم چەند قسەیەكی نەستەق لە خاوەنی كتێبی (عمدة الحفّاظ) بخوازمەوە لەبارەی نەفامیی (جهل)ەوە:

{الجَهل: ضِدُّ العِلم، والعِلم تَصَوُّر الشَّيء بِما هوَ عَلَيهِ، أَو تَصديق ذلِك، والجَهلُ ضَربان: بَسيطٌ، وَمُرَكَّب وَأَقبَحَهُما الثّاني، لِأَنَّ صاحِبَهُ يجهل وَيَجْهَل أَنَّهُ يَجْهَل.

وقسَّم (راغب الأصفهاني) الجهل إلى ثلاثة أقسام:

الأول: وَهوَ خُلوُّ النَّفس من العلم، هذا هو الأصل.

والثاني: إعتقاد الشيء بخلاف ما هو عليه.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج١ ص ١٧٢.

(٢) جامع البيان، ج ١٠ ص ٢٩٤.

والثالث: فعل الشيء خِلاف ما حَقُّهُ أَن يُفعَل، سواءً اعْتَقَدَهُ صَحيحاً أو فاسداً، كَمَن تَرَك الصَّلاة مُتعَمِداً}[1].

واتە: نەزانیی دژی زانینە، زانینیش پەی بردن بە شتێکە وەك خۆی کە هەیە، یان بەڕاست دانانیەتی.

وە نەزانیی دوو جۆرە: سادە، وە لێکدراو، خراپترینیشیان دوەمیانە، چونکە خاوەنەکەی نازانێ و ناشزانێ، کە نازانێ.

**وە (راغب الأصفهانـي) نەزانیی کردۆتە سێ بەش:**

**یەکەمیان:** خاڵیی بوونی نەفس لە زانیاریی، کە ئەوەش ئەسڵی نەزانینە.

**دووەمیان:** بڕوابوون بە شتێك بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هەیە.

**سێیەمیان:** کردنی شتێك بە پێچەوانەی ئەوەوە کە شایستە بوو، ئنجا یەکسانە بەڕاستی بزانێ یان بە خراپ، وەك کەسێك کە نوێژ نەکات بەئەنقەست (بەبێ عوزر).



---

(١) عمدة الحفاظ، ج١ ص ٣٥٣، ٣٥٤.

■ ٧٣ ■

## خاوەن چاكە بوون (الفَضل)

خاوەن چاكە بوونم كردوە بە كۆتا ڕەوشتی بەرزو پەسندی ئینسانی مسوڵمان، كە مامەڵەی پێ لەگەڵ خەڵك و كۆمەڵگادا دەكا، كە دەبێ هەوڵ بدات خاوەن چاكە (فَضل) بێ و، بەخشندەو چاكەكارو سوودگەیەنەر بێ بۆ دەورو بەری، بە گشتی.

**ئنجا با سەرنجێكی شیكردنەوەی زانایان بدەین بۆ چەمك و واتای وشەی (فَضل):**

أ- (**إبن فارس**) دەڵێ: {الفَضل: مَصدَر قَولِهِم: فَضَل يَفضُلُ مِن مادّة: (ف ض ل) الَّتي تَدل عَلى زيادةٍ في شَيء، الفَضل: الزِّيادَةُ في الخَير}[١] واتە: (فَضل) لە (فَضل يفضلُ)ەوە هاتوە، لە ماددەی (ف ض ل) كە دەلالەت لەسەر زیادیی لە شتێكدا دەكات، (فَضل) واتە: زیادە لە چاكەدا.

ب- (**الجوهري**) دەڵێ: {الفَضلُ والفَضيلة، خِلافُ النَّقص والنَّقيصة، والإفضال: الإحسان}[٢] كە ماناكەی ڕوونە.

ج- (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: {الفَضل: كُل عَطيَةٍ لا تَلْزَمُ من يُعْطي}[٣]، واتە:

---

(١) المقاييس، ج٤ ص ٥٠٨.

(٢) الصِّحاح، ج٥ ص ١٧٩١.

(٣) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٣٨٢.

(فضل) هەر بەخششێکە کە لەسەر بەخشەرەکەی پێویست نەبێ.

د- (الجرجانـي) دەڵێ: {الفَضل: إبتداء إحسان بِلا عِلّة}[1]، واتە: (فَضل) بریتیە لە دەشتپێشخەریی بەخشین و چاکەکردن، بەبێ هۆکار.

**ئەمەش سێ نموونە لە ئایەتەکانی قورئانی بەپێز لەو بارەوە:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٧٤)دا، خۆی بەو سیفەتە بەرزە وەسف کردوەو دەفەرموێ:

﴿ .. وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ ﴾ .

واتە: وە خوا خاوەنی بەخششی مەزنە.

**دووەم:** هەروەها لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٣٧)دا، دەفەرموێ:

﴿ ...ۚ وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡۚ .. ﴿٢٣٧﴾ ﴾.

واتە: وە بەخشش و چاکەی نێوان خۆتان فەرامۆش مەکەن.

**سێیەم:** وە لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٢٢)دا، فەرموویەتی:

﴿ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾.

واتە: وە با خاوەنی چاکەو بەخشین و ساماندارانتان سوێند نەخۆن کە بە خزمان و نەداران و کۆچکەران لە ڕێی خوادا نەبەخشن، وە با ببوورن و چاوپۆشیی بکەن، ئایا حەز ناکەن خوا لێتان ببووریّ! وە خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

دیارە هۆی هاتنە خارەوەی ئەم ئایەتەش ئەوەبوو، کە دوای ئەوەی (مِسْطح بن أثاثة) کە کوڕی پوور (خالة)ی (أبو بكر الصديق) بوو خوا لێی ڕازی بێ،

---

(١) التعریفات، ص ١٧٤.

وەیەكێك بوو لە بەشدارانی بوختان كردن بە دایكی ئیمانداران (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ، (أبو بكر) سوێندی خوارد كە پێشتر هاوكاریی دەكردو دەستگرۆیی دەكرد، وەك خزمێكی نەداری كۆچكەر، لەوەدوا هاوكاریی نەكات.

خوای میهرەبانیش ئامۆژگاریی (أبو بكر)ی كرد كە هاوكاریی لێ نەبڕێ و (أبو بكر)یش كەفارەتی سوێندەكەی داو گەڕایەوە سەر هاوكاریی كردنەكەی بۆی[1].

لە كۆتاییدا دەڵێم:

خوا بەلوتف و كەرەمی خۆی یارمەتییمان بدا خۆمان بە ڕەوشتە بنەڕەتییەكان، وە بە ڕەوشتە مەعنەوییەكان، وە بە ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان، برازێنینەوە، لەمامەڵە لەگەڵ خۆماندا، لە مامەڵە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، وە لە مامەڵەو هەڵس و كەوت لەگەڵ خەڵك و دەورو بەرو كۆمەڵگادا، بەشێوەیەك وابین كە شایستەمان بێ، بڵێین: ئێمە بەندەی خوای پەروەردگاری جیهانەكان و شوێن كەوتووی پێغەمبەری خواین (صلى الله عليه وسلم)، وە پەیڕەوانی ئەو ئیسلامە گەورەیەین، كە هاتوە هەموو شتێكی چاك فێری خەڵك بكا، وە لە هەموو شتێكی خراپ دووریان بخاتەوە، خوا سەرەنجامی دنیاو دوارۆژمان خێر بكا.

سُبحانَكَ اللهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَن لا إله إلاّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتوبُ إِلَيْك

دوا پێداچوونەوەی

٢٥/رجب/١٤٣٧ك - ٢٠١٦/٥/٢ز

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص ٩٣٤.

## بەرهەمەكانی دانەر

**تێبینی: بەپێی ڕیزبەندیی كاتی چاپكرانیان، ڕیزكراون:**

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی١/١٩٨٤، چاپی٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچكان. چاپی١/١٩٨٥، چاپی٣/ ٢٠٠٦.

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- كۆمەڵی خــوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید كێیەوچۆنە؟ چاپی١/١٩٨٨، چاپی٣ /٢٠٠١.

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون. چاپی١/١٩٩٠، چاپی ٥ /٢٠١٢.

تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش.

٨- كوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!. چاپی ١ / ١٩٨٩

٩- حوكمی گەڕانەوە ژێر نیری گاغووت. چاپی١/ ١٩٩٠، چاپی ٢ /٢٠٠٥

١٠- سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی١/١٩٩٠، چاپی ٣ /٢٠٠٥.

١١- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٢- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٣- بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئایندەیەکی گەش و ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٤- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٦- ئیسلام و کێشە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٨

١٧- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی١/١٩٩٩، چاپی ٢ /٢٠٠٧.

١٨- مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی ١-٤. چاپی١/ ٢٠٠٠، چاپی ٢/٢٠٠٩.

١٩- گەڕانەوە بۆ لای خوا "عز وجل". چاپی١/٢٠٠١، چاپی٥ /٢٠١٠.

٢٠- زانایانی ئیسلام کێنء چۆنن ؟!. چاپی١/٢٠٠٢، چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەڕەبیش وەرگێڕراوە.

٢١- بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا. چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٢- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٣- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ چاپی١/٢٠٠١، چاپی ٢ /٢٠١٢.

٢٤- بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی١ /٢٠٠١، چاپی٣ /٢٠١٤

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش.

٢٥- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی.، چاپی ١ /٢٠٠١.

٢٦- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٣.

٢٧- مەوسووعەی: ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا، بەرگی یەکەم چاپی١/٢٠٠٢، بەرگی ١و٢ چاپی ٣/ ٢٠١٣

٢٨- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم. چاپی١/٢٠٠٢، چاپی ٦ / ٢٠١٦

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش.

٢٩- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٠- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز). چاپی١/ ٢٠٠١، چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣١- چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٢- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٣- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك. چاپی ١/ ٢٠٠٢

٣٤- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٥- جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟ چاپی ١/ ٢٠٠٢.

٣٦- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر). چاپی١/٢٠٠٥، چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٣٧- کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی١/ ٢٠٠٥، چاپی ٢ / ٢٠٠٦.

٣٨- ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٣٩- مەوسووعەی: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ١-٦، چاپی ٢٠٠٦/١-٢٠٠٨، چاپی٢ /٢٠١٦.

٤٠- تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان، چاپی١ /٢٠٠٨، چاپی ٢٠١٥/٣.

تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٤١- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا، چاپی ١/ ٢٠٠٦.

تێبینی: بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە.

٤٢- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٣- سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٤- چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٥- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی، چاپی١ /٢٠٠٦.

تێبینی: بۆ فارسییش وەرگێڕراوە.

٤٦- قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنماییەك، چاپی١ /٢٠٠٧.

٤٧- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٨- بانگەواز بۆ لای خوا، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٩- قوتابییان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!، چاپی ٢٠٠٨/١.

٥٠- خواناسیی، ئایین، ئیمان، چاپی ١/٢٠٠٢، چاپی ٢ / ٢٠٠٩.

٥١- واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە، چاپی ١/ ٢٠٠٨.

٥٢- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، چاپی ١/٢٠٠٨، چاپی ٢/٢٠١٥.

تێبینیی: بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە.

٥٣- با لەخزمەت قورئاندابین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لەقورئان بەهرەمەند دەبین؟) وە (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بەقورئان)ە}، چاپی ١/٢٠٠٨و ٢٠١١، چاپی ٢/٢٠١٥

٥٤- سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا، چاپی ١/٢٠٠٩.

تێبینی: ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٥٥- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چاپی ١/٢٠٠٩، چاپی ٣/٢٠١٣.

٥٦- چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا، چاپی ١/٢٠١٠.

٥٧- وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی/٢٠١٠.

٥٨- گەنج لە پرسە هەنووکەییەکاندا (چاوپێکەوتنی ناجیح حەمە فەرەج). چاپی ١ ٢٠١٠.

٥٩- کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم و مژێك، چاپی ١/٢٠١١.

٦٠- حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك، چاپی ١/٢٠١١.

٦١- چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا، چاپی ١/٢٠١٣.

٦٢- خاتوون مەلاژن: ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە. چاپی ١/٢٠١٢.

٦٣- ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی. چاپی ١/٢٠١٢.

٦٤- مەلای گەورە كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك، چاپی ١/٢٠١١.

٦٥- هەڵسەنگاندنێك لەبارەی: هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، چاپی ١/٢٠١٢.

٦٦- یادو بۆنەو جەژنەكان و هەڵسەنگاندنێك، چاپی ١/٢٠١٢.

٦٧- ڕوونكردنەوەی بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی، چاپی١/٢٠١٢، چاپی ٣/٢٠١٤.

٦٨- مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی: ١-٤، چاپی ١/٢٠١٤-٢٠١٦.

٦٩- تەرجەمەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی ١/٢٠١٤.

٧٠- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكەم: سوورەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة)، چاپی ١/٢٠١٢.

٧١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم، سوورەتی: (آل عمران)، چاپی ١/٢٠١٢.

٧٢- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء)، چاپی ١/٢٠١٣.

٧٣- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدە)، چاپی ١/٢٠١٤.

٧٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام)، چاپی ١/٢٠١٥.

٧٥- هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەكانی ڕێكخراوی (داعش)، چاپی ١/٢٠١٤.

٧٦- ڕوونكردنەوەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی یەكەم/٢٠١٥.

٧٧- سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان تێپەڕاندن و بەزایەداندا، چاپی ١/٢٠١٥.

٧٨- با هەڵەو لادانی پەڕگیران، بەرانبەر بەئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان، چاپی ١/٢٠١٥.

٧٩- پەڕگیریی: هۆكارەكانی، شوێنەوارەكانی، چارەسەری، چاپی ١/٢٠١٥.

٨٠- چەند مەڵۆیەك لەخەرمانی تەمەنم، چاپی ١/٢٠١٥.

٨١- بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا، چاپی ١/٢٠١٥.

٨٢- گیانی ژیان، چاپی ١/٢٠١٥.

**كتێبە عەرەبییەكان:**

موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله

كە لەچاپی یەكەمدا (٨) بەرگەو، لەچاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە:

٨٣- الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخلق.

٨٤- الكتاب الثاني: تعريف الإيمان.

٨٥- الكتاب الثالث: الإيمان بالله تعالى: الخالق الرب المالك الإله...

٨٦- الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة وبالجن.

٨٧- الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم.

٨٨- الكتاب السادس: القرآن العظيم.

٨٩- الكتاب السابع: الإيمان برسل الله وأنبيائه الكرام.

٩٠- الكتاب الثامن: خاتم النبيين محمد (صلى الله عليه وسلم): موجز سيرته وبراهين نبوّته.

٩١- الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله.

٩٢- الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى.

٩٣- الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام.

٩٤- الكتاب الثاني عشر: الإسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم.

٩٥- نقض فكرة التطرف. ط١/٢٠١٦.

٩٦- ضيف و قضية (مقابلة مع قنـــاة العربية)، ط١/٢٠٠٦.

٩٧- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم)، ط١/٢٠٠٦.

**ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن:**

٩٨- مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا.

٩٩- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم: سوورەتی: (الأعراف).

١٠٠- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال).

١٠١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة).

١٠٢- ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی هەرێم، گرفت و چارەسەر.

١٠٣- سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەکوردستاندا.

١٠٤- چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٢٠١٥/٥/٣٠.

١٠٥- قەیرانە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستان (پانێڵی ئەنیستیۆتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست)، ٢٠١٤/١١/٦.

١٠٦- کلمتان موجزتان حول مایجري علی الساحة العراقیة، (٢٠١٤ و ٢٠١٥).

## ناوەڕۆك

# مەوسوعەی ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامی

## ئەم مەوسووعەیە

بەرهەمی تێوەڕامان و ئەزموون و موتاڵای ساڵانێکی دوورو درێژە، لەبارەی ئەو ئاکارو ڕەوشتە بەرزو جوان و خەسڵەتە دڵگیرو پەسندانەوە، کە پێویستە مرۆڤی مسوڵمان خۆییان پێ بڕازێنێتەوە، چ لەبواری مامەڵەی لەگەڵ خوای تاك و پاك و، چ لەبواری هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەوروبەرییدا، کە ئێمە لەم مەوسووعەیەدا سەدو پەنجاو پێنج دانەم لێ باسکردوون.

شایانی باسیشە:

١- ڕەوشت و کای ئیسلامیی.
٢- ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی.
٣- خواپەرستی ئیسلامیی.

کە ئەو سێ مەوسووعەیەم بۆ توێژینەوەیان تەرخان کردوون: پێکەوە سێ پایە بنەڕەتییەکەی کەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمان پێك دێنن.





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com